**باس و توێژینەوە بڵاوکـــراوەکان لە گۆڤاری ئەکادیمیای کـــوردی دەربـــڕی بیـــر و بۆچوونـــی توێژەرانـــن نەک دەستەی نووســـەرانی گۆڤار**


- گۆڤاری ئەکادیمیای کوردی.
- بەرگ و سەرپەرشتی هونەری: عوسمان پیرداود کواز
- نەخشەسازی: عیسام موحسین.
- هەڵەچن: شێرزاد فەقێ ئیسماعیل.
شیلان جەلال.
- چاپ: چاپخانەی حاجی هاشم- هەولێر.
- تیراژ: ٧٥٠ دانە.

# لەم ژمارەیەدا

## بەشی كوردی



## بەشی عەرەبی – القسم العربي

# ڕێنماییەكانی بڵاوكردنەوە
# لە گۆڤاری ئەكادیمیای كوردی

١- گۆڤاری ئەكادیمیای كوردی، گۆڤارێكی زانستی وەرزییە، باس و توێژینەوەی زانستی لە بارەی كورد و كوردستان، بڵاودەكاتەوە، بە مەرجێ لە هیچ شوێنێكی دیكە بڵاو نەكرابێتەوە یان بۆ بڵاوكردنەوە وەرنەگیرابێت.
٢- زمانی كوردی زمانی سەرەكی بڵاوكردنەوەیە لە گۆڤارەكە، بەڵام لێكۆڵینەوەی زانستی بە هەردوو زمانی عەرەبی و ئینگلیزیش بڵاودەكاتەوە.
٣- هەر بابەتێك كە بۆ گۆڤاری ئەكادیمیای كوردی دەنێردرێت، دەبێت ناونیشانی باسەكە، ناوی نووسەر، شوێنی كارەكەی، پلە و پایەی زانستی، ئیمێل و ژمارەی تەلەفۆنەكەی لە سەر لاپەڕەی یەكەمی لێكۆڵینەوەكە نووسرابێت.
٤- نووسەر دەبێت پوختەی باسەكەی بە هەردوو زمانەكەی دیكە، جگە لە زمانی نووسینی دەقەكە لە كۆتایی توێژینەوەكە بنووسێت، كە نابێت لە یەك پەڕەی (A4) زیاتر بێت. لەو پوختەیەدا پێویستە گرنگی و ئەنجامە سەرەكییەكانی توێژینەوەكە بخرێنەڕوو.
٥- لە دوای پەسەندكردنی باسەكە لە لایەن هەڵسەنگێنەرانی زانستیەوە، دەستەی نووسەران ڕەزامەندی بڵاوكردنەوەی بە توێژەر دەدات.
٦- بۆ ئەوەی بابەتەكە لەگەڵ ڕێنماییەكانی بڵاوكردنەوەی گۆڤارەكەدا بگونجێت، دەستەی نووسەران مافی سەرلەنوێ داڕشتنەوە و لابردنی هەندێ دەستەواژەی هەیە، بە مەرجێك بیرۆكەی سەرەكی توێژینەوەكە نەگۆڕێت.
٧- ئەگەر باسەكە لە بارەی ساخكردنەوە (پەیدۆزیی، تحقیق) ی دەستنووسەوە بێت، دەبێت پەیدۆزییەكە بە پێی بنەما زانستییەكان بێت و چەند لاپەڕەی كۆپیكراوی دەستنووسەكە و شوێنی وەرگرتنی، كۆد و جۆری دەستنووسەكە (دەستنووس، چاپ، مایكرۆفیلم... هتد) لەگەڵ دابێت.
٨- ئەگەر ڕێبازی لێكۆڵینەوەی زانستی لە هەڵبژاردنی ناونیشانی باسەكە،

توێژینەوەی بابەت، شێوازی بەکارهێنانی سەرچاوە و ڕێکخستنی پەراوێزەکان ڕەچاو نەکرابێتن، ئەوا باسەکە لە گۆڤاری ئەکادیمیای کوردی بڵاوناکرێتەوە. هەروەها ئەو لێکۆڵینەوانەش کە بە زمانێکی پاراوی زانستی نەنووسرا بێتن فەرامۆش دەکرێن.

٩- دەبێت باسەکە دانەیەکی لەسەر (CD) لەگەڵ (٣) دانەی چاپکراوی سەر کاغەز (A4) بە فۆنتی (١٥) ی یۆنیکورد بێت، بە مەرجێک ژمارەی لاپەڕەکانی بە لیستی پەراوێز و سەرچاوەکانەوە لە (٢٥) لاپەڕە زیاتر نەبێت و پەراوێزەکانیشی لە کۆتایی باسەکە دابندرێت.

١٠- ئەگەر بابەتەکە وەرگێڕدراو بوو، دەبێت لە زمانی یەکەمەوە بێت و دەقە ئەسڵییەکەشی لەگەڵدا هاوپێچ کرا بێت.

١١- گۆڤاری ئەکادیمیای کوردی ناساندن و هەڵسەنگاندنی ئەو کتێبانەی لە بارەی کورد و کوردستانەوە نووسراون بڵاودەکاتەوە، بە مەرجێک نووسەر ڕەچاوی پێوەرە زانستییەکانی ئەم بوارەی کردبێت.

١٢- بابەتی نێردراو بۆ گۆڤاری ئەکادیمیای کوردی نادرێتەوە بە خاوەنەکەی.

# لێکدانەوەیەکی پراگماتیکی
# بۆ واتای مۆرفیمە وشەدارێژەکان

**د. نەوزاد ئەنوەر عومەر**
فاکەڵتی پەروەردە- زانکۆی کۆیە

**د. شێروان حسێن حەمەد**
پەیمانگاکان و مەشقکردن

## پێشەکی:

پەیوەندیی نێوان ئاستەکانی زمان بەشێوەیەك تێکچرژاوە کە لە نێوان هەر دوو ئاستێکدا، ئاستێکی تر، سەری هەڵداوە، لە نێوان مۆرفۆلۆژی و واتاسازی بەگشتی و بەتایبەتیش پراگماتیك (مۆرفۆپراگماتیك) هەیە، وەکو زانستێك هەڵوەستە لەسەر لێکدانەوەی واتای پراگماتیکی هەریەك لە مۆرفیمەکان دەکات. کە بەهەر هۆکارێك بووبنە خاوەنی سیمایی واتایی پراگماتیکی. ئەم لێکۆڵینەوەی ئێمەش هەوڵێکە لەم بارەیەوە، واتە لێکدانەوەی واتای پراگماتیکی مۆرفیمە بەندەکانە (بەتایبەتی گیرەکی وشەدارێژ). بەپێی ڕێبازی وەسفی شیکاری نموونەی چەند بوارێکی مۆرفیمە بەندەکان وەرگیراوەو لەسەر بنکە جیاوازەکان واتای پراگماتیکییان پیشان دراوە. لێکۆڵینەوەکەمان لە دوو بەش پێك دێت، بەشی یەکەم هەریەك لە چەمکەکانی مۆرفیمی بەند و جۆرەکانی و چەمك و واتای مۆرفیمی بەند، لەگەڵ واتای پراگماتێك و جۆرەکانی خراونەتەروو. بەشی دووەم بۆ لێکدانەوەی واتای پراگماتێکی چەند مۆرفیمێکی جیاوازی بوارەکان تەرخان کراوە. لە کۆتاییشدا ئەنجام و لیستی سەرچاوەکان و پوختەی باسەکە بەهەر دوو زمانی کوردی و عەرەبی خراونەتەڕوو.

### ١/١) چەمك و واتای مۆرفیم

مۆرفیم ئەو دانە ئەبستراکتەی زمانە، لە هەموو زمانەکاندا، هەیەو خاوەنی چەمکێکە. هەر لە سەرەتای سەرهەڵدان و ئاشکراکردنی بیری مۆرفیمەوە، تاوەکو ئێستا بەچەندین شێوە پێناسەی بۆ کراوە، هەموو

پێناسـەکانیش لەسـەر ناسـاندنەکەی بلۆمفیلـد، هەڵچـنراون، کـە تێیـدا هـاتووە، (مۆرفێم بە بچووکترین یەکەی واتاداری زمانیی دادەنرێت.) ( Bloomfield 1954: 161) ئەم پێناسەیە بوو بە بناغەیەك، بۆ ناساندنی چەمکی مـۆرفێم و لـە زۆربـەی کارە مۆرفۆلۆژییەکانی دواتردا کراوە بە بنەمایەك، بۆ دیاریکردنی چەمکی مـۆرفێم و سنوورەکەی. هەروەها، بەلای ساپیریشەوە (بچووکترین ڕەگەزی واتـایی زمـان، مۆرفێمە.) (پیتر ا. ام. سـورن ١٣٨٨: ١٢١) بـەپێی تێـڕوانین و پێناسـەکانی ئـەم دوو زمانەوانـە، چـەمکی مـۆرفێم هـەمان شـت دەگەیـەنێت و هـەمان مەبەسـتیش بەدەستەوە دەدەن، دەشێ ئەمەش بۆ ئـەوە بگەڕێتـەوە، کـە ئـەم دوو زمانەوانـە سـەر بـە هـەمان قوتابخانـەی زمانـەوانین، کـە بونیادگـەری ئەمریکییـە، چـونکە ژمارەیـەکی زۆری زمانـەوانی ئـەم قوتابخانەیـە لـە مـۆرفێم و دروسـتەی وشـەیان کۆڵیوەتـەوە، لەوانـە: (سـاپیر ١٩٢٥، هـاریس ١٩٤٤، بلـوم فیلـد ١٩٣٣، هۆکێـت ١٩٥٢) (Katamba, Stonham 2006: 5).

لـە دواییـدا لـە هەنـدێك لـە پێناسـەکاندا، بـۆ زیـاتر ڕوونکردنـەوەی چـەمکی مـۆرفێم، تایبەتییـەکانی تێدا خراوەتـەڕوو، ئەمـەش بـۆ ئـەوە دەگەڕێتـەوە، کـە هەندێ لە پێناسەکان زۆر گشتی بوون و سنوورێکی فراوانیان دەگرتەخۆ و لەگـەڵ کەرەستەی زمانیی تردا، تێکەڵ دەبوون. لەوانە، ستاگەبیرگ دەڵێت: (بچـووکترین دانـەی زمـانی کـە واتـای هـەبێت و دابـەش نـەبێت بـۆ دانـەی بچـووکتر، شـیانی دووبارەبوونەوەی هەبێت، پێیدەوترێت مـۆرفێم.) (Stageberg 1980: 83) بـەپێی ئەم تێڕوانینەش دەبێت هەر دانەیەکی زمانیی ئەو سیمایانەی تێدابێت، بۆئـەوەی بە مۆرفێم هەژماربکرێت. بـەم پێیـەش، چـەمکی مـۆرفێم لـە خۆیـدا زۆر فراوانـە و هەندێ جاریش، وشە لەخۆی دەگرێت. بەتایبەتی چەشنێك لە وشە دەبنە مۆرفێم، کە لە ڕووی پێکهاتنەوە خاوەنی یـەك دروسـتەی واتـایی و ئـەرکی بێـت — وشـەی سادە/ یەك مۆرفێمی–. (بەو مۆرفێمانـەی کـە دەتـوانن، بەتـەنیا بەشـێوەی وشـە سەربەخۆکان بەکاربهێنرێن، مۆرفێمی فەرهەنگییان پێیدەوترێت.) (مهدی مشکوه الـدینی ١٣٨٩: ٢٧)، بـەڵام دەبێـت، ئـەوەش بـزانین، کـە ئەمانـەش بەشـێکیان، واتایـەکی فەرهـەنگییان نییـە، بـەڵکو ئـەرکێکی سینتاکسـی ڕادەپـەڕێنن، بۆیـە پێیاندەوترێت، مۆرفێمی سەربەخۆی ئەرکی. کەواتە هەموو وشـەیەکی سـادە، کـە

فەرهەنگی بێت، یان ئەرکی، بە مۆرفێمێك هەژمار دەکرێت، چونکە ئەو تایبەتمەندییانەی تێدایە، کە لە پێناسەکەی ستاگەبیرگدا، لە هەریەك لە واتا و دابەش نەبوون و دووبارەبوونەوە، ئاماژەیان پێدراوە.

لە زۆربەی پێناسەکاندا، ئەوەی جەختی لەسەر دەکرێتەوە، ئەوەیە، کە مۆرفێم پێویستە واتا، یان ئەرکی ڕێزمانی هەبێت و هەر لەم گۆشەنیگایەشەوە، پۆلێنێکیان بۆ کردووە، بەڵام ئێمە لێرەدا، هەردووکیان لەچوارچێوەی چەمکدا کۆدەکەینەوە و دەڵێین، پێویستە مۆرفێم چەمکی هەبێت، چونکە (واتا بەشێکە لە چەمك و لە هەر وشەیەکدا بەشێك لە چەمك وەك واتا دەردەکەوێت.) (فاررووق عومەر سدیق ٢٠١١: ٣١) بۆیە دەشێت ئەو مۆرفێمانەی کە وەك لایەنی ئەرکی، یان ڕێزمانی جیادەکرێنەوە، بێنە ژێر تیشکی ئەم بۆچوونە، لەبەرئەوەی هەموو مۆرفێمێکی ڕێزمانی، چ بەندبێت، چ سەربەخۆ بێت، چەمکیان هەیە، بۆ نموونە لە زمانی کوردی و زۆربەی زمانەکاندا، ناساندن و نەناساندن و کۆکردنەوە...هتد، کە لە ڕێگەی مۆرفێمی بەندەوە دەردەبڕدرێن، چەمکێکی یەکجار فراوانیان هەیە و ناشێت تەنیا لەڕوانگەی ئەرکی ڕێزمانییەوە کورت بکرێنەوە. هەروەها مۆرفێمە فەرهەنگییەکانیش، چەمکێکی فراوانیان هەیە، ئەوەی کە لە بەکارهێنانیان دەردەکەوێت، بەشێکە، هەموو چەمکەکە نییە.

بەشێوەیەکی گشتی دەتوانین، بڵێین، مۆرفێم خاوەنی چەمکە، هەندێکیان چەمکی ڕێزمانی، دەگەیەنن و هەندێکی تریشیان چەمکێکی فەرهەنگییان هەیە، کە دەشێ ئەم چەمکەیان بکرێتە پێوەر بۆئەوەی لە کێڵگەیەکی واتاییدا، کۆببنەوە. هەردوو چەمکەکەش بەشێوەیەکی وەك یەك لە مێشکدا بە ئەبستراکتی هەڵگیراون و لەڕێگەی مۆرفەکانیانەوە بەرجەستە دەکرێن. هەر لەڕێگەی چەمکەکانیانەوە، دەشێت مۆرفێمەکان پۆلێن بکرێن و گرووپی جیاجیایان لێ دروست بکرێت. کاتێك هەریەکێکیش لەم گرووپانە بواری واتایی خۆی دروست دەکات. بۆ نموونە ئەو مۆرفێمانەی چەمکی شوێنیان تێدایە، یان ئەوانەی چەمکی بچووککردنەوە، یان پیشە و...هتد، کۆیان دەکاتەوە، لە بوارەکەی خۆیان دادەنرێن. لەمەوە بۆمان دەردەکەوێت، کە چەمکی هاوبەش و یەکسانیان هەیە، نەك واتای یەکسان. ئەمەش بە بەڵگەی ئەوەی کە زۆر بەکەمی نەبێت ناتوانرێت

لەبری یەکتر بەکاربهێنرێن، بەڵام لە یەك بواریشدا، ئەندامن. خۆ ئەگەر چەمك و واتایان یەکسان بوایە، دەگونجا بەئاسانی لەبری یەکتر بەکاربهێنرابان.

بەم پێیەش سنوورێك لەنێوان چەمك و واتای مۆرفێم دادەنرێت و چەمکەکەی زۆر لە واتاکەی فراوانترە، بەجۆرێك دەتوانێت، هەموو چەشنە جۆراوجۆرەکانی مۆرفێم لەخۆی بگرێت. دەبێت ئەوەش بزانین، بۆئەوەی هەر یەکەیەکی زمانی بە مۆرفێم هەژماربکرێت، پێویستە دوو تایبەتمەندی تێدابێت، کە ئەوانیش ئەوەن (لە یەك، یان چەند فۆنیمێك پێك بێت، خاوەنی واتا، یان ئەرکی سینتاکسی بێت.) (سیما وزیرنیا ١٣٧٩: ٧١) لە هەر زمانێکیش لە مۆرفێم بڕوانین، زۆر کەم ناوێزە دەکەوێتە ئەم دوو تایبەتمەندییە، مەگەر مۆرفێمی سفر، ئەویش وەك دانەی ئەبستراکت لەمێشکدا، بەسفری هەڵنەگیراوە، بەڵکو مۆرفەکەی دەبێتە سفر.

سەبارەت بەمۆرفێم لە زمانی کوردیشدا چەندین پێناسەی جیاجیایان بۆکردووە، ئێمەش لێرەدا چەند پێناسەیەك دەخەینەڕوو:

– ((مۆرفێم بچووکترین دانەی واتاداری زمانە)). (د. ئەورەحمانی حاجی مارف ١٩٨٧ : ٢٣).

– ((مۆرفێم بچووکترین دانەی واتاداری زمانە، لە فۆنیمێ یان زیاتر پێکدێت و دەورێکی لەڕێزماندا هەیە، بەگۆڕین و لابردنی هەر فۆنیمێکی یان لەتلەتکردنی مانا و دەورە ئەسڵییەکەی تیا ئەچێ)). (وریا عومەر ئەمین ٢٠٠٩ : ١١٤). کەواتە بەم پێیە دەتوانین بڵێین، کە مۆرفێم بچووکترین دانەی زمانە، کە یان واتای هەیە یان ئەرك. پۆلێنی جیاجیا بۆ مۆرفێمەکان کراوە، کە هەندێکیان لەسەر بنەمای ئەرك و هەندێکیان لەسەر بنەمای واتای فەرهەنگی یان لەسەر بنەمای شێوەی دەرکەوتنیان، کە هەندێکیان بەسەربەخۆیی دێن و هەندێکیان بەشێوەی بەند، هەروەها بەگوێرەی شوێنی هاتنیان پۆلێن دەکرێن، کە لە سەرەتا، یان لە ناوەڕاست یان لە کۆتایی دێن و ناوی جیاجیایان لێنراوە، چەندین پۆلینی جیاجیا بۆ دابەشکردنی مۆرفێم کراوە، بەڵام ئێمە ئەو پۆلینەی خوارەوە وەردەگرین کە لە هەموو پۆلینەکانی تر وردترو گونجاوترە.




**(محەمەد مەعرووف، سەباح ڕەشید ٢٠٠٦:٢٩ )**

## ٢/١) جۆرەكانی مۆرفێم

لەسەر چەند بنەمایەك جۆرەكانی مۆرفێم جیاكراوەتەوە، ئێمەش پەیوەست بە كارەكەمانەوە ئەم پۆلینەمان هەڵبژاردووە:

### ٢/١-١) مۆرفێمی سەربەخۆ

بەو مۆرفێمانە دەوترێت، كە (دەتوانرێت بە تەنهاو بەشێوەیەكی سەربەخۆ بەكاربهێنرێن، هەر بۆیەش بە وشەیەكی سەربەخۆ دادەنرێن.) (ایران كلباسی ١٣٨٠: ٢٢) كەواتە دەتوانین بڵێین هەموو مۆرفێمێكی سەربەخۆ وشەیە، بەڵام هەموو وشەیەك مەرج نییە، تەنیا مۆرفێمێكی سەربەخۆ بێت، چونكە هەندێ وشە هەن، لە مۆرفێمێك زیاتر پێك دێن ،ئەو مۆرفیمەیەكە بەتەنیا واتایەكی تەواوو سەربەخۆی هەیە، هەروەها ((بچووكترین بنكەی وشەیە، كە مانای سەرەكی وشە هەڵدەگرێت)).(ئەوڕەحمانی حاجی مارف ١٩٨٧: ٣) واتە دانەیەكی سەربەخۆ و واتادارە و دەتوانێ بەتەنیا و بەبێ هیچ پێشگر و پاشگرێك، لە هەموو ژینگەیەكدا دەركەوێت و واتای تەواو بدات بەدەستەوە.

(مۆرفێمی سەربەخۆ ئەو مۆرفێمەیە دەتوانێت بەتەنیابێت و واتایەكی هۆشەكی هەیە). (كەوسەر عەزیز ئەحمەد ١٩٩٩ : ٢٧). بۆنموونە وشەكانی وەكو (كوڕ ، كچ ، ژن ، دار ، سێو ، گوڵ ، ...هتد) هەموویان مۆرفێمی سەربەخۆن لە

فەرهەنگدا هەن و بەتەنیا دەردەکەون و واتای تەواویان هەیە. ئەم مۆرفێمە دەتوانێت لەگەڵ مۆرفێمی دیکەشدا بۆ دروستکردنی وشەی گەورەتر بەکاربێت. (کەمال میراودەلی ٢٠٠٧: ٧١). واتە وشە هەیە، دوو مۆرفێمە یان زیاتر.

**١/٢-٢) مۆرفێمی بەند**

وەك لە ناوەکەیەوە دیارە ((ئەو مۆرفێمەیە، کە هەرگیز وەك دانەیەکی سەربەخۆ دەرناکەوێت)). (کەوسەر عەزیز ئەحمەد ١٩٩٩ : ٢٨) ، چونکە (ئەم مۆرفێمە بەتەنیا واتای نییە، بەڵام دەخرێتە پاڵ مۆرفێمی سەربەخۆ و واتا دەبەخشێت). (سەلام ناوخۆش ٢٠٠٨ : ٥١) ئەوانیش وەك مۆرفێمە بەندە ڕێزمانییەکان وەکو (ەکە ، ێك ، ان ، ....هتد) مۆرفێمە بەندە فەرهەنگییەکان ، وەکو (هەڵ ، ەوە ، ڕا ، دا ، ...هتد). بەتەنیا هیچ واتایەکیان نییە، بەڵام کە دەخرێنە پاڵ مۆرفێمی سەربەخۆ واتا دەبەخشن، وەکو:

کوڕ + ەکە — کوڕەکە

کچ + ەکە — کچەکە — ناساندوویەتی، ژمارەی نیشانداوە

گوڵ + ێك — گوڵێك

هەڵ + چوو — هەڵچوو

ڕا + خست — ڕاخست

کردن + ەوە — کردنەوە

مۆرفێمی بەندیش، بەپێی واتا و ئەرکیان دەبن بەدوو جۆرەوە ئەویش مۆرفێمی بەندی ڕێزمانی و مۆرفێمی بەندی وشەداڕێژ، لە هەردوو جۆری مۆرفێمی بەندیشدا خاڵێکی هاوبەش لە نێوانیاندا هەیە، ئەویش ئەوەیە لە بەکارهێناندا سەربەخۆنین و پێویستییان بەیارمەتی وشەی دیکە هەیە، بۆئەوەی ئەرك و واتایان بەتەواوی دەربکەوێت. (شیروان حسێن حەمەد ٢٠١٠ : ٦٤).

هەندێ لە زمانەوانان جۆرێکی تری مۆرفێمی بەند جیادەکەنەوە، کە پێیدەڵێن مۆرفێمی بەندی وشە لێکدەر، کە ئەویش جۆرێکە لە مۆرفێمی ڕێزمانی، ئەرکی مۆرفۆلۆژی یان سینتاکسی دەبینێت.وەك بەناوەکەیدا دیارە، مۆرفێمی بەند بەو چەشنەی مۆرفێم دەوترێت، کە (ناتوانێت بەتەنهایی و بەشێوەی سەربەخۆ بەکاربهێنرێت، هەمیشە بەمۆرفێمی ترەوە دەلکێت.) (علاءالدین

طباطبائی ١٣٧٦: ١٠)، کەواتە ئەم پۆلەی مۆرفێم بوونێکی سەربەخۆیان نییە، چەمکەکەیان بە تەنیا ڕوون نییە، تاوەکو نەچێتە سەر ڕەگ و بنکەی ترەوە. بەشێوەیەکی گشتی دوو تایبەتمەندی لە مۆرفێمی بەندا هەن، (یەکێکیان ئەوەیە، کە هەرگیز بەتەنیا دەرناکەون و بەکارناهێنرێن، ئەویتریان ئەوەیە، دەبێت بەمۆرفێمی ڕەگ، یان وشەیەك (بنکەیەك)ەوە، بنووسێن.) (سیما وزیرنیا ١٣٧٩: ٧٢) ئەمانەش لەنێو خۆیاندا بەپێی چەمك و شوێنی دەرکەوتنیان و ئەرکەکانیان، بۆ چەند بەشێك پۆلێن دەکرێنەوە. ئەم چەشنەی مۆرفێم، هەرکاتێك بەڕەگ و بنکەوە بەند بێت، زۆر بەکەمی جێگەی خۆی دەگۆڕێت، تەنیا چەند مۆرفێمێکی بەندی ئەرکی نەبێت، کە ناونراون نووسەك و توانای گۆڕینی شوێنیان هەیە، لە چوارچێوەی ڕستەدا، بەڵام لە ڕووی چەمکە و واتاوە، هەر بە بنکە سەرەکییەکەی خۆیانەوە پەیوەستن. ئەم مۆرفێمانە، تەنانەت لە فەرهەنگی وشەنامەشدا، هەر لەگەڵ بەندکەرەکانیان، هەڵدەگیرێن و بەواتایەکی دیکە، هیچ مۆرفێمێکی بەند لە فەرهەنگدا نابینین، دەروازەی فەرهەنگی خۆی هەبێت، هەرچەندە خاوەنی چەمك و واتان. هەروەها لە گواستنەوەیان لە زمانێکەوە، بۆ زمانێکی تریش لە ڕێگەی بنکە و ڕەگەکانیانەوە دەبێت و پاشان لەنێو زمانەکەدا توانای زۆر دەبێت و دەچێتە سەر وشەی ڕەسەنی زمانەکەیش. ئەم تایبەتمەندییە بۆ فۆنیمیش هەر دروستە. خاسیەتێکی تری ئەم چەشنە لە مۆرفێم ئەوەیە، کە لە ڕووی پێکهاتنەوە، دەشێ لە تاکە فۆنیمێك پێکهاتبێت، جا سەر بەهەر پۆلێك بێت. ئەم دیاردەیە لە مۆرفێمی سەربەخۆدا، کەمتر بەرچاو دەکەوێت. سەرەڕای ئەوەش لە ڕوانگەی دەرکەوتنەوە، مۆرفێمی بەند لە هەندێ باردا، شیانی ئەوەی تێدایە، کە خۆی بەشێوەی سفر بنوێنێت، کە مەبەست لێیان (ئەو مۆرفێمانەن کە بوونو شێوەی فیزیکییان نییە.) (محمد ضیاء حسینی ١٣٨٩: ١٣) وەکو جێناوی کەسی سێیەمی تاك، لەگەڵ کاری ڕابردووی تێنەپەڕ، لە زمانی کوردیدا. هەروەها بوونی مۆرفێمی سفری دارشتن، کە لە هەردوو زمانی کوردی و فارسیدا بەرچاو دەکەوێت، بەڵام لە زمانی کوردیدا بە بەراورد بە زمانی فارسی کەمتر باسی لێوەکراوە. هەر لەچوارچێوەی ئەم جۆرە مۆرفێمەدا، مۆرفێمی بەتاڵ هەیە، کە دەرکەوتەیەکی دەنگیی زیادەیە و کار لە واتا و ئەرکی ڕێزمانی ناکات. کە هەموو ئەمانەش بەگرفتی بیری مۆرفێم دادەنرێن.

### ٣-٢/١) مۆرفێمی بەندی ڕێزمانی:

بەو مۆرفێمانە دەوترێت، کە دەچنە سەر وشە بۆ دەربڕینی پەیوەندیی نێوان وشەکان لەناو چوارچێوەی ڕستەدا. ئەم جۆرە مۆرفێمانە پێویستییەکی ڕێزمانی دەیانهێنێتە ئاراوە، جۆرێکن لە گیرەك و ئەرکەکانیان ئاماژەکردنە بۆ پەیوەندییە ڕێزمانییەکان.

لە زمانی کوردیدا، هیچ ڕستەیەك نییە مۆرفێمی ڕێزمانی تێدانەبێت، ئەگەر بوونی فیزیکیش نەبێت، ئەوا بەشێوەی مۆرفێمی سفر دەردەکەوێت. (شێروان حسێن حەمەد ٢٠١٠ : ١٥) واتە لەزماندا سادەترین ڕستە بێنین، ئەوا مۆرفێمی ڕێزمانی تێدا بەدیاردەکەوێت. ئەم (مۆرفێمە ڕێزمانییانە دەچنە سەر وشە و حاڵەتی ڕێزمانیی جیاواز پێك دەهێنن). (ئەوڕەحمانی حاجی مارف ١٩٨٧ : ٣٣). بەدوو شێوە دەردەکەون:

**پێشگر :**

((زاراوەیەکی زمانییە و بەو بەشەی وشە دەوترێت، کە لە (برگە)یەك یان زیاتر پێکدێت و دەبێتە هۆی گۆڕینی ڕواڵەت و ناوەڕۆکی وشە)). (جەمال عەبدول ٢٠٠١ : ٨٩) پێشگر بە بەشی پێشەوەی وشەوە دەلکێت. ئەو مۆرفێمە ڕێزمانییانەی بە بەشی پێشەوەی وشەوە دەلکێن و بریتین لە مۆرفێمەکانی (نەرێ کردن (نا ، نە ، مە ، ...، کاتی ڕانەبردوو (ە) ، نیشانەی داخوازی (ب) ، ....).

بۆنموونە :

-مۆرفێمی نەرێکردنی (نا) لە بەشی پێشەوەی وشەدا دێت، وەك:

دەخۆم – ناخۆم

دەهێنم – ناهێنم

مۆرفێمی نەرێکردن، چۆتە جێگەی (دە)ی نیشانەی ڕانەبردوو.

مۆرفێمی (مە)ی نەرێکردن، بەهەمان شێوە:

بهێنە – مەهێنە

بکرە – مەکرە

لێرەشدا، مۆرفێمی نەرێکردن چۆتە جێگەی (ب)ی نیشانەی داخوازی، بەڵام ئەگەر وشەکە دارڕژاو بوو، ئەوا دەچێتە دوای پێشگرە وشە دارێژەکە، وەکو:

هەڵبخە — هەڵمەخە

مۆرفێمی (دە)ی ڕانەبردوو

دەخۆم

**پاشگر:**

پاشــگریش وەك پێشــگرە، بــەڵام دەکەوێتــە دواوەی وشــە، ئــەویش وەکــو نیشانەکانی (ناسیاوی و نەناسیاوی و کۆ ...).

کچ + ەکە = کچەکە

ژن + ەکە = ژنەکە

ئەگەر ناوێـك کۆتـایی بەنـەبزوێن هاتبێـت، بەئاسـانی و ڕاسـتەوخۆ نیشـانەی ناسیاوی (ەکە) وەردەگرێت، وەکو لەم نموونانەی سەرەوەدا نیشـانمان دا، بـەڵام ئەگـەر کۆتـایی بـەبزوێن هاتبێـت، ئـەوا یـان (یـ) نیمچـە بـزوێن لـەنێوان نـاو و نیشانەکەدا پەیدا دەبێت، یان (ە) بزوێنی (ەکە) تێدەچێت، بۆ نموونە:

هەڵۆ + ەکە = هەڵۆکە — تێچوون

هەڵۆیەکە — پەیدابوون

دێ + ەکە = دێیەکە

مامۆستا + ەکە= مامۆستایەکە

کوڕ + ێك = کوڕێك

منداڵ + ێك = منداڵێك

بەڵام ئەگەر ناوەکـە کۆتـایی بـەبزوێن هـاتبوو، ئـەوا بـەم شـێوەیە نەناسـراو دەکرێت بە(یەك ، ییێك...).

مامۆستا + ێك = مامۆستایەك

برا + ێك = برایەك

برایێك

پیاو + ان = پیاوان

ژن + ان = ژنان

ئەگەر ناوێك کۆتایی بە ((بزوێنی (ا ، ۆ ، ێ) هاتبێت ئەوا لەنێوان ناونیشانەکە، نیمچە بزوێنی (یـ) پەیدا دەبێت)). (ئەورەحمانی حاجی مارف ١٩٧٨ : ١٤٨).

مامۆستا + ان = مامۆستایان

برا + ان = برایان

ئەگەر کۆتایی بەبزوێنی (وو) هاتبێت ئەوا لەنێوان ناونیشانەکەدا نیمچە بزوێنی (و) دەردەکەوێت.

بەرو + ان = بەرووان

ئەگەر ناوەکە کۆتایی بە (ە) هاتبێت، ئەوا تێدەچێت، وەکو:

بەرە + ان = بەران

هەروەها جگە لە (ان) چەند نیشانەیەکی تر هەن، کە دەچنە سەر ناوێکی کەم و کۆیان دەکاتەوە، لەوانە:

ات: خەیاڵ + ات = خەیاڵات

باخ + ات = باخات

جات: میوە + جات = میوەجات

ەها: ساڵ + ەها = ساڵەها

گەل: کوڕ + گەل = کوڕگەل (سەرچاوەی پێشوو: ١٥١)

## ٣/١) مۆرفێمی بەندی وشەدارێژ

ئەم مۆرفێمانە پۆلێکی فراوانن بەشداری لە دارشتن و دروستکردنی واتای نوێدا دەکەن. (دەچێتە سەر مۆرفێمی تر بۆ دروستکردنی وشەی نوێ یان گۆڕینی بەشە ئاخاوتنی وشەیەك یان داتاشینی وشەیەکی تر، بە واتایەکی جیاواز). (کەوسەر عەزیز ئەحمەد ١٩٩٩: ٢٨).

ئەم جۆرە مۆرفێمانە ئەرکی ڕێزمانییان نییە، تەنیا لەدروستکردنی وشەی نوێ بەواتای نوێ و چەمکی تازەوە، واتە ئەمانە دەبنە بەشێك لە چەمکی ئەو وشانەی کە دەچنە سەریان. مۆرفێمە فەرهەنگییەکانیش بەپێی شوێنی دەرکەوتنیان دەکرێن بەدوو جۆر هەندێکیان بەشی پێشەوەی وشە دەگرن

پێیاندەوترێت پێشگر ئەوانەی تر دەچنە دواوەی وشەکان پێیاندەگوترێت پاشگر.

پێشگرەکان وەکو: (دار ، ڕا ، هەڵ...هتد)

هەڵ + خست = هەلخست

دا + کەوت = داکەوت

ڕا + هێنا = ڕاهێنا

پاشگرەکان، وەکو (ەوە ، انە ، گە ، ەوەر ... هتد)

کردن + ەوە = کردنەوە

زستان + انە = زستانە

پیشە + ەوەر = پیشەوەر

هەروەها ئەو مۆرفێمانـەی بـەپێی ئـەو چـەمکەش، کـە دەیگەیـەنێت دابـەش دەبن بۆ پۆلی جیاجیا، لەوانە چەمکی شوێن، کە ئەمانە دەگرێتەوە (سـتان، گـە ، گا ، ەڵان ... هتد).

کورد + ستان = کوردستان — ناوی وڵاتی دروست کردووە .

دار + ستان = دارستان

جەنگەڵ + ستان = جەنگەڵستان

خوێندن + گە = خوێندنگە ، فەرمانگە ، دایەنگە

ئەو مۆرفێمانەی کە چەمکی پیشە دەگەیەنن لەوانە (چـی ، ی ، گـەر ، ەوان ... هتد).

تەنەکە + چی = تەنەکەچی

ئاسن + گەر = ئاسنگەر

ئـەو مۆرفێمانـەی کـە چـەمکی ئەبسـتراکت دەگەیـەنن وەکـو (ی ، ا ، ە ... هتد).

### ٤/١) یەکە واتاییەکان

دەستنیشانکردنی یەکەکانی هەر ئاستێکی زمـان، لـە دیـاریکردنی یەکـەکانی ئاستی واتاسازی ئاسانترە، چونکە واتا هەموو ئاستەکانی زمان دەگرێتـەوە، هـەر لە ئاستی دەنگسازییەوە، کە فۆنیمەکانن، لەسەر بنەمای دروسـتکردنی جیـاوازیی

واتـایی دادەنـرێن و لـە ئاسـتی مۆرفۆلۆژیشـدا، مـۆرفێم و وشـەن و لـە ئاسـتی ڕستەسازیشـدا ڕسـتە و فرێـز هـەن. لـەپاڵ ئەوەشـدا پەیوەنـدیی واتـایی لـەنێوان یەکەی گەورەتریشدا دەبینرێت، کە دەق و ئاخاوتنن، بەڵام لە زمانەوانیدا بایەخی سەرەکی بـەمۆرفێم دەدرێـت. واتـە مـۆرفێم دانەیـەکی گرنگـی واتاییـە، هـەروەك بلوومفیلد ئاماژەی بۆ دەکات لە لێکۆڵینـەوەی زمانەوانیـدا (مـۆرفێم بەبچـووکترین یەکـەی واتـاداری زمـان وەپـێش چـاو گـیراوە.) (Bloomfild:1954:161) بـەڵام ئەوەی تێبینی دەکرێت لە زمانی کوردیدا، لایەنی واتایی مۆرفێم وەك پێویست لای لێنەکراوەتەوە، بەتایبەتی مۆرفێمی بەند. ئـەم لالێنەکردنـەوەش بەهـەمان شـێوە فۆنیمیشـی گرتووەتـەوە، بگـرە زۆرجـار وەك دانەیـەکی واتـاییش سـەیر ناکرێـت. کاتێك باس لە واتاسازی دەکرێت، وشە یەکەی سـەرەکییە، بۆیـە هـەموو دیاردەو پێوەندییـە واتاییـەکان، بـەزۆری لـە ڕێـی وشـەوە دەستنیشـان دەکـرێن، بـەم شێوەیەی کە (واتاسازی پێویستی بەیەکـەی گـەورەتر لـە مـۆرفیم هەیـە، ئـەویش وشـەیە.) (کـورش صـفوی ١٣٨٧: ٣٢) هـەر لەبەرئـەوە لەلێکۆڵینـەوەی واتاییـدا، بەلای کەمەوە پێویستمان بەمۆرفیم و وشە دەبێت. زۆر جار بۆ لێکدانەوەی واتای ڕستەیەك بەتەنها بەم دوو یەکە واتاییە ناگەینە ئەنجام، بۆیە دەبێت ڕستە خـۆی وەك یەکەیەکی واتایی سەربەخۆ وەربگرین. ڕستە سەرباری ئـەوەی، کـە خـاوەنی ڕۆنانێکی ڕێزمانییە، ڕۆنانێکی واتایی بەهێزیشـی هەیـە، بـەجۆرێك (هـەموو کاتێـك واتای ڕستە لە کۆی واتای وشەکان پێك نایەت، بەڵکو زۆر جار ڕسـتە واتـای وشـە دیاریدەکات.) (سیما و زیرنیا ١٣٧٩: ٧٩) بۆیە ڕستەش وەك هەر دانەیەکی دیکە، پێویسـتە لـە ئاسـتی سیمانتیکدا بـەگرنگ تەماشـا بکرێـت، چـونکە هەنـدێك جـار وشەکان واتایان لـێڵ و تەمومژاوییـە تـا ئەوکاتـەی دەچـنە نـاو ڕسـتە. بۆیـە (بـۆ لیکۆڵینــەوە لــە واتــا، بێجگەلــە مــۆرفێم و وشــە پێویســتمان بەیەکــەی ڕســتەش دەبێــت.) (کــورش صــفوی ١٣٨٥: ٢١) بــۆ ســەلماندنی ئــەم ڕاســتییانەی، کــە ئاماژەمــان پێــدان بەپێویســتی دەزانــین، ئــەو پۆلینــەی کــە (نیــدا) بــۆ یەکــە واتاییەکانی کردووە، بخەینە بەرچاو:

١- وشەی سەربەخۆ

٢- گەورەتر لە وشە (لێکدان)

٣-بچووکتر لە وشە (مۆرفێمی بەند)

٤- بچووکتر لە مۆرفێم (فۆنیم)

بەشێوەی ئەم هێڵکارییە دەخرێتەڕوو:




**(أحمد مختار عمر ١٩٨٢: ٣٢)**

بەپێی ئەم پۆلێنکردنەی (نیدا)، واتا هەموو ئاستەکانی زمان دەگرێتەوە، واتە هەر لە فۆنیمەوە تاوەکو ڕستە. هەر لە ڕوانگەی ئەم پۆلینەوە ئاماژە بەوە کراوە، کە (وشەی سەربەخۆ بەگرنگترین یەکەی واتایی دادەنرێت.) (سەرچاوەی پێشوو: ٣٣) هەر بۆیەش دەتوانین بڵێین، لەبەرئەو جێگا تایبەتەی، کە وشە لە لێکۆڵینەوەی واتاییدا هەیەتی، لە زمانەوانیدا هەمیشە بەکەرەسەی بنجی دەژمێردرێت. لەپاڵ وشەدا، لەڕووی واتاییەوە، لە زانستی زماندا هێز و ئاوازەش شوێن و کاریگەریی خۆیان هەیە. بەجۆرێك کە توانای گۆڕینی واتای وشە و ڕستەیان هەیە، بۆیە دەکرێت وەك یەکەیەکی واتایی هەژمار بکرێن، بەتایبەتی لە ئاستی وشە و ڕستەدا سەروکاریان لەگەڵ واتادا دەبێت.( کورش صفوی ١٣٨٧: ٣٢)

## بەشی دووەم

### ٢/ ١) واتا

گرینگیی واتا لەوەدایە، كە پەیوەندییەكی ڕاستەوخۆی لەگەڵ لەیەكترگەیشتندا هەیە، تا ڕۆڵی لەیەكترگەیشتن لە ڕێكخستنی كۆمەڵدا زیاتر بێت، پێویستمان زیاتر بەواتا دەبێت. لێكۆڵینەوەی واتا هۆیەكە، بۆ تێگەیشتن لە مێشكی مرۆڤ و بیر و بۆچوونییەتی و، هۆش لەگەڵ تێڕوانین و دابڕینی لێهاتوویی (خیبرە)مان بەهۆی زمانەوە وا تێك ئالاون، كە نازانین كامیان زاڵە بەسەر ئەویتردا و كامیان لە چوارچێوەی ئەویتریاندا دروست دەبێت. (محەمەد مەعرووف ٢٠١١: ١٦)

واتای وشە و ڕستە ئەوەیە، كە دەخرێتە بەر لێكدانەوە و شیكردنەوەی وردەوە لەبەرئەوە گەڕان بەدوای واتادا ئەوە نییە بەدوای بوونێكی سەربەخۆ، یان ئەو بوونانەی وشەكان هەیانە بگەڕێین، بەڵكو بریتییە لە تێگەیشتنی ماهییەتی وشەكان و ڕستەكان، واتە وشەكان و ڕستەكان چۆن واتا وەردەگرن. (تالیب حسێن ٢٠١١: ٤١)، واتا ڕۆڵێكی گرنگ و گەورە دەگێڕێت لە هەموو ئاستەكانی شیكردنەوەی زماندا، هەر لە ئاستی شیكردنەوەی فۆنیمەكانەوە تا دەگاتە شیكردنەوەی دەق، بۆیە بەتەنها لە ڕێگەی تێگەیشتنی واتاوە، دەكرێت لەڕاستی و سروشتی زمان بگەین. واتای فەرهەنگی وشە، سیمای جیاكەرەوەكانی وشەیەك بەرانبەر بەوشەیەكی تر واتای فەرهەنگی فەراهەم دەكات. دروستییەكی ئاڵۆز لە مێشكی بەكارهێنەرانی زماندا هەیە، و واتاكەی پەیوەستە بەو بەواتایەی لە فەرهەنگی زماندا تۆماركراوە. گوزارشتێكی سادە یان ئاڵۆز كە پێویستە بناسرێتەوە، ئەگەر توانای داڕشتەی ئیدیەمی نەبێت، ئەوا هەڵگری واتای فەرهەنگییە، كە هەموو ئەو وشە و واتا زمانییانەی لە ئاوەزی مرۆڤدا هەڵگیراوە، دەگرێتەوە. (تریفە عومەر ٢٠٠٨: ٣٨)، (گرنگترین بواری لێكۆڵینەوە پەیوەست بە فەرهەنگی ئاوەزییەوە لەمانەدا كۆكراوەتەوە: ١- ناسینەوەی وشە ٢- ڕێكخراوەیی ناوەوەی سیمانتیكییانە و مۆرفۆلۆژییانەی فەرهەنگی ئاوەزی. ٣- هێنان و گونجاندنی زانیارییەكان لە ناوەڕۆكی گفتوگۆدا یا لە ناوەڕۆكی دەقدا) (محەمەدی مەحوی ٢٠٠٦: ١٢)، بیرەكانی مرۆڤ بەهۆی فۆڕمی دەنگییەوە

بەپێی یاسا و ڕێسای زمانەكەی لە دەربڕاوێكدا دەنوێنرێت، لە ڕێگەی واتا بەكۆدكراوەكانیانەوە بۆ تێگەیشتن ئامادەدەكرێن. ئەمە پەیوەندیكردنی زمانییە لە نێوان قسەپێكەرانی زمانێكدا. بەم پێیە ئەو پەیامە ئاڕاستەی وەرگر دەكرێت، وەرگر لە پرۆسەی جفرەلێكدانەوە پەیامەكە شیدەكاتەوە و واتاكان هەڵدەسەنگێنێت.

واتای پراگماتیكی، ئەم چەشنە واتایەیە بەهۆی دەوروبەرەوە واتاكەی وەردەگیرێت و لێكدەدرێتەوە.

## ٢/٢) جیاوازی واتای سیمانتیك و پراگماتیكی

(١- واتای سیمانتیكی بریتییە لەو واتایەی، كە لەئەنجامی بەكارهێنانی وشە فەرهەنگییەكانەوە دێتەكایەوە، واتای پراگماتیكی ئەو واتایەیە، كە دەوروبەری وتن دیاری دەكات.

٢- واتاسازی پابەندی یاسایە، بەڵام پراگماتیك پابەندی بنەماو ستراتیژە.)، (محەمەد مەعرووف ٢٠١١: ١٩٢)

٣- واتای سیمانتیكی واتای سەرزاری و ڕوون و ئاشكرا دەگرێتەوە، واتای پراگماتیكی واتای شاراوەو قووڵ دەگرێتەوە.

٤- واتای سیمانتیكی، واتایەكی بڵاوە و كۆمەڵ لەسەری ڕێككەوتوون، واتای پراگماتیكی مەرج نییە ڕێككەوتنی كۆمەڵی لەسەربێت. (عبدالواحد مشیر ٢٠١١: ٤٩)

٥- واتای سیمانتیكی پابەندە بەواتای پیتی وشەكانەوە و هێمای زمانی لێكدەداتەوە، واتای پراگماتیكی لە واتای خوازراو دەكۆڵێتەوە و هێمای زمانی و نازمانی لێكدەداتەوە و مێشك دەخوێنێتەوە.

٦- واتای سیمانتیكی پابەندی توانستی ئاخێوەرە، بەڵام واتای پراگماتیكی بەندە بە چالاكییەوە.

## ٣/٢) توانست و توانا

(توانست، توانا گشتییە زمانییەكەیە، ئەو زانینە ئاوەزییە شاراوەیەی قسەكەری زمانی دایكە، كە لەپرۆسەی زمان وەرگرتنەكەیدا (زمانپژانو زمان

فێربوون) بەبێئاگایی خۆی وەریگرتوون. توانا ئەو دەربڕاوانەن، کە قسەکەرانی زمانێك لەسەر بناغەی توانست بەرهەمیان دەهێنێت. (محەمەدی مەحوی ٢٠٠٦: ١٣)، توانستی پڕاگماتیکی، چۆنیەتی بەکارهێنانی زانیارییەکانی زمانە لە دەوروبەردا، بە پێچەوانەی توانستی ڕێزمانییەوە زگماك نییە، بەڵکو لە دەوروبەر و بارودۆخە کۆمەڵایەتی و سیاسی و کەلتووری ڕۆشنبیرییەکانەوە وەردەگیرێت و بەهۆی واتای ئەزموون بەندانەوە لە مێشکدا دەچەسپێت.

### ٤/٢) بەرهەمهێنان

مەبەستی دیاردەکە لە زمانەوانیدا، بریتییە لە هەوڵدانی قسەکەر یان بەکارهێنەری زمان بۆ خستنە تەکیەك و لێکدانی کەرەسە زمانییەکان، لە ڕێی جێبەجێکردنی یاساکانی فۆنۆلۆجی و مۆرفۆلۆجی و سینتاکسەوە بەسەر دانە دەنگی و فەرهەنگی و سینتاکسییەکانی زمانێکی دیاریکراودا بەئامانجی دروستکردن و بەرهەمهێنانی فۆرمی واتادار و دروستەی ڕێزمانی نوێ. (سازان زاهیر ٢٠٠٩: ٤)

بەبەرهەمی لە فۆرمدا، فۆرم دروستییە، بەبەرهەمی لە فۆرمدا لەو لاگرانە دەردەکەوێت کە بەشێوەیەکی فراوان لە دارشتنی وشەی نوێدا بەکاردەهێنرێن، بەبەرهەمی لە واتادا، واتا دروستییە، هەندێك جار بەبەرهەمی لە فۆرمدا لەگەڵ بەبەرهەمی لە واتادا هاوتەریب دەبێت. بەبەرهەمی واتا وادەکات فۆرمێك بەرهەم بێت. (نەرمین عومەر ٢٠١٠: ١٧)

لە بەرامبەر بەبەرهەمی کۆمەڵێك هۆکار هەن ڕێگرن لەبەردەم بەبەرهەمی لەوانەش:

١- ڕێگرە فۆنۆلۆژییەکان: یاساکانی وشەدارشتن، کاتێك دەکەونە ژێر کاریگەری فۆنۆلۆژییەوە کە نارێزمانی دەرکردەکانیان بەشێوەیەکی تایبەت پشت بە فۆرمی بناغەکە دەبەستێت. واتە شێوەی فۆنۆلۆژی بناغەکە بڕیاری ڕێزمانی دروستی یان نارێزمانی پێکهاتەی وشە دارشتن دەدات.

٢- ڕێگرە مۆرفۆلۆژییەکان: تایبەتمەندییە مۆرفۆلۆژییەکانی بناغە، دەکرێت لەبەردەم جێبەجێکردنی یاسا مۆرفۆلۆژییەکاندا ببنە ڕێگر، زۆرجار مۆرفێمە ڕەسەنەکان جیاواز لە مۆرفێمە بیانییەکان هەڵسوکەوت دەکەن. هەندێك گیرەك

لەوانەیە تەنها بە بناغە ڕەسەنەکانەوە بلکێن، یان بەو بناغانەوە بلکێن کە لە زمانێکی بێگانەوە هاتبن (katamba 1993 : 77)

٣- ڕێگرە سیمانتیکییەکان: لە زماندا سیمانتیك کاریگەری لەسەر وشە دارشتن هەیە، لایەنی واتا ڕۆڵ دەبینێت لە هەڵبژاردنی ئەو بناغانەی کە گیرەکە وشەدارێژەکان پێیانەوە دەلکێن.

٤- ڕێگرە سینتاکسییەکان: یاساکانی وشەدارشتن بە تایبەتمەندییە سینتاکسییەکانی بناغەوە پەیوەستن، بەگشت بناغە لە پۆلە ڕەگەزە سەرەکییە ڕێزمانییەکاندا ئەندامە، وەك ناو، کردار... بۆنموونە لە زمانی کوردیدا پاشگری (-ەر) تەنها بەرەگی کرداری تێپەڕەوە دەلکێت، وەك: نووسەر، دانەر... (نەرمین عومەر ٢٠١٠: ٢٢)

٥- ڕێگرە پراگماتیکییەکان: مەبەست لە ڕێگری پراگماتیکی ئەوەیە، وشە نوێیەکان لەگەڵ ئەوەی کە لە لایەنی فۆنۆلۆژی و سیمانتیکییەوە دروست دارێژراون، دەبێت بەسوودیش بن، واتە دەبێت لەدەرەوەی زماندا پێویستی بۆ ئەم فۆرمە زمانییە هەبێت.

٦- بلۆککردن: نەهاتنی فۆرمێکە بەهۆی بوونی فۆرمێکی ترەوە. زۆرجار بەبەرهەمی یاسایەکی وشەدارشتن دەرناکەوێت، چونکە لەلایەن وشەیەکی (هەبوو) لە زمانەکەدا، کە هەمان واتای ئەوی هەڵگرتووە بەتاڵ دەکرێتەوە، واتا وشە هەبووەکە هەمان ئەو واتایەی هەڵگرتووە، کە وشە نوێیە دارێژراوەکە هەیەتی، بۆ نموونە: بلۆککردنی وشەی (درۆکەر) کە فۆرم دروستە و واتا دروستە، بەهۆی هەبوونە وشەی (درۆزن)ەوە. (هەمان سەرچاوەی پێشوو:٢٣ )

**٥/٢) واتای سیمانتیکی و پراگماتیکی گیرەکە وشەدارێژەکان**

**أ- ئەو گیرەکانەی کە پیشە و ئیشی یەکێکیان پێدیاری دەکرێت:**

١- پاشگری (-گەر)

واتای سیمانتیکی ئەم پاشگرە ئەوەیە، بەزۆری دەچێتە سەر ناو و دەیکات بەناوی خاوەنی پیشە، وەك: ئاسن+گەر = ئاسنگەر

مس+گەر = مسگەر

سیما واتاییەکانی واتای سیمانتیکیی ئەم پاشگرە ئەمانەن: {+مادده + کانزا + پیشە + دروستکردن +مرۆڤ}

ئەم پاشگرە هەندێ جار دەچێتە سەر چەند بناغەیەك و واتای پڕاگماتیکی دەدات لەو کاتەدا سیما واتاییەکانیشی لەگەڵ سیما واتاییەکانی واتای سیمانتیکی جیاواز دەبێت، وەکو:

جادوو + گەر = جادووگەر

ڕۆژنامە + گەر = ڕۆژنامەگەر

کیما + گەر = کیماگەر

نوێ + گەر = نوێگەر

لەم نموونانەی پێشەوەدا دەبینین پاشگری (–گەر) چۆتە سەر ئەو وشانە و واتای پڕاگماتیکی دروستکردووە، جیا لە واتای سیمانتیکی، لە نموونەی یەکەمدا چۆتە سەر وشەی (جادوو) کردوویەتی بە (جادووگەر)، کە پیشەو ئیش نییە، بەڵکو بەو کەسە دەوترێت کە شارەزایی هەیە لە سیحر و جادوو، واتە لێرەدا زانست و زانیارییە لەبارەی شتێك. لە (ڕۆژنامەگەر)یشدا بە هەمان شێوە واتای زانست و زانیاری دەربارەی ڕۆژنامە و گۆڤار دەگەیەنێت. لە (کیمیاگەر)یشدا بەواتای ئەوەی کە زانستی دەربارەی زانستی کیما هەیەو لە تاقیگەی کیمیادا خەریکی دۆزینەوەی زانستییە، لە (نوێگەر)دا بەواتای ئەو کەسانە دێت کە نوێخوازن. بەم پێیە سیمای واتای پاشگری (–گەر) لە گەیاندنی واتای پڕاگماتیکیدا دەبێت بە {+مرۆڤ +زانستو زانیاری +پێشبینیکردن +داهێنان}

٢– پاشگری (–چی):

ئەم پاشگرە دەچێتە سەر ناو و ناوی پیشە دروست دەکات، وەکو:

پینە + چی = پینەچی

چا + چی = چاچی

تەنەکە + چی = تەنەکەچی

کوشن + چی = کوشنچی

تۆڕنە + چی = تۆڕنەچی

سیما واتاییيەکانی واتای سیمانتیکی ئەم پاشگرە ئەمانەن: {+مادده +خاوەن پیشە +وەستایی +− کانزا}

ئەم پاشگرە دەچێتە سەر چەند بنکەیەك و واتای پراگماتیکی دەگەیەنێت:

ماستاو + چی = ماستاوچی

فالْ + چی = فالْچی

ساختە + چی = ساختەچی

قومار + چی = قومارچی

لەو نموونانەی پێشەوەدا پاشگری (−چی) چووەتە سەر ئەو وشانە و جیا لە واتا سیمانتیکییەکەی، واتای پراگماتیکی دروست کردووە. لە وشەی (ماستاوچی)دا مەبەست لەو کەسە نییە کە خواردنەوەی ماستاو دروست دەکات، بەڵکو واتای پراگماتیکییەکەی مەبەستە، واتە ئەو کەسە نەفسی نزمە، گەورەکەی هەرچی پێی بڵێت دەڵێت بەڵێ، خزمەتی دەکات، ناراستی بۆ دەکات بەراست، خاوەنی کەسایەتی خۆی نییە، لەناو کۆمەڵدا کەسێکی قێزەونە، کۆمەڵێك سیفاتی زۆر خراپی هەیە. لە وشەی (فالْچی) بەواتای کەسێکی درۆزن و فێڵباز و دووڕووە، کە لە خۆیەوە قسەی درۆ هەڵدەبەستێ، بۆ پەیداکردنی کەمێك پارە. (ساختەچی)یش وەکو (فالْچی) سیفەتی خراپی هەیەو فێڵ لە خەڵکی دەکات. سیما واتاییيەکانی پاشگری (−چی) لە گەیاندنی واتای پراگماتیکیدا: {− مادە − کانزا +− پیشە − دروستکردن +خوو +فێڵکردنو هەڵخەڵەتاندن +مرۆڤ +کەسایەتی نزم +لێزانین}

٣− پاشگری (−ەوان):

ئەم پاشگرە دەچێتە سەر ناو، ناوی خاوەنی پیشە دادەرێژێت، وەك:

ئاش +ەوان = ئاشەوان

باخ + ەوان = باخەوان

دەرگا + ەوان = دەرگاوان

رەز + ەوان = رەزەوان

سیما واتاییيەکانی واتای سیمانتیکی پاشگری (−ەوان) ئەمانەن:

{+مـاددە –+کەرەسـە +پیشـە – دروسـتکردن +چـاودێری + لێـزانین + پاراستن +خاوەن پیشە}

ئەم پاشگرە دەچێتە سەر چەند بناغەیەك و واتای پڕاگماتیکی دەبەخشێت:

زمان + ەوان = زمانەوان

فڕۆکە + ەوان = فڕۆکەوان

دەریا + ەوان = دەریاوان

کەشتی + ەوان = کەشتیوان

لەم نموونانەی پیشەدا دەبینین پاشگری (–ەوان) لەگەڵ ئەو بناغانەدا واتای پڕاگمـاتیکی دروسـتکردووە، چـووەتە سـەر وشـەی (زمـان)و کردوویـەتی بـە (زمانـەوان) کـە بـە واتـای ئـەو کەسـە دێـت کـە خـەریکی لێکۆڵینـەوەی زمانـەو شارەزایی لەو بوارەدا هەیە. هەروەها لە وشەی (فڕۆکەوان)دا واتـای ئـەو کەسـەیە کە شارەزایی لە لێخوڕینی فڕۆکەدا هەیەو دەتوانێ فڕۆکـە لێبخوڕێـت. (دەریـاوان) ئەو کەسەیە کە سـەرکردایەتی لێخـوڕینی پـاپۆڕە گـەورەکان دەکـات، کـە ئەمانـە بـەزۆری دەسـتەیەکن. سـیما واتاییـەکانی ئـەم پاشـگرە لـە گەیانـدنی واتـای پڕاگماتیکیدا بریتییـە لـە {+مـاددە + کەسـی شـارەزا – دروسـتکردن +پیشـە – چاودێری +پسپۆڕ + کارامە}

٤– پاشگری (– باز ):

ئەم پاشگرە دەچێتە سەر ناو، ناوی خاوەن پیشە دادەڕێژێت، وەکو:

سەر + باز = سەرباز

تەقڵە + باز = تەقڵەباز

ڕێ + باز = ڕێباز

سـیما واتاییـەکانی واتـای سـیمانتیکی ئـەم پاشـگرە ئەمانـەن: {+مـرۆڤ + پیشە + خاوەنیەتی}

ئەم پاشـگرە دەچـێتە سـەر هەنـدێك نـاو، واتـای پڕاگمـاتیکی دەبەخشـێت، وەکو:

فێڵ + باز = فێڵباز

مێ + باز = مێباز

جام + باز = جامباز

قومار + باز = قومارباز

لەم نموونانەی پێشەوەدا دەبینین پاشگری (–باز) چووەتە سەر ئەو وشانەو واتای پراگماتیکی دروستکردووە، لە نموونەی یەکەمدا چوویتە سەر وشەی (فێڵ)و (فێڵباز)ی دروستکردووە کە واتای کەسێك دەدات، درۆ و فێڵ لە خەڵکی بکات و فریوبدات بۆ مەرامی تایبەتی و سوودی خۆی، لە وشەی (مێبان)دا واتای داوێن پیسی و چاو لە ناموسی خەڵکانی تر و ئابڕووبردنی خەڵکی و کارێکی قێزەونە لە ناو کۆمەڵگاو خەڵکی بەچاوێکی سووك تەماشای دەکەن‌و کەسایەتییان زۆر نزمە لەناو کۆمەڵگا. هەروەها وشەی (جامبان) بۆ زۆرزانی لەکارەکەی خۆیی و بەلەبەرچاوگرتنی بەرژەوەندیی خۆی لەپێش هەموو شتێکەوە، هەموو هەوڵی بۆ بەدەستهێنانی مەرامەکانی خۆیەتی.

سیما واتاییەکانی پاشگری (–باز) لە گەیاندنی واتای پراگماتیکیدا بریتین: {+مرۆڤ +خەڵەتاندن+پیشەی خراپ + کەسایەتی نزم +خوو +بەرژەوەندی پەرست}

٥– پاشگری (– بەند ):

ئەم پاشگرە دەچێتە سەر ناو، ناوی خاوەن پیشە دروست دەکات، وەکو:

ناڵ + بەند = ناڵبەند

سیما واتاییەکانی واتای سیمانتیکی ئەم پاشگرە ئەمانەن: {+مادده + پیشە + خاوەنپیشە +لێزان}

ئەم پاشگرە دەچێتە سەر هەندێك ناو، واتای پراگماتیکی دەبەخشێت، وەکو:

ڕوو + بەند = ڕووبەند

کەمەر + بەند = کەمەربەند

گۆ + بەند = گۆبەند

لەم نموونانەی سەرەوەدا دەبینین پاشگری (–بەند) واتای پراگماتیکی دروستکردووە، نەك واتای ئیش و خاوەن پیشە، لە وشەی (ڕووبەند) بەواتای ئەو شتە دێت کە ڕوو دادەپۆشێ، هەروەها لە وشەی (کەمەربەند) بەواتای ئەو شتە

دێت کە لە کەمەر دەبەسترێت. لە وشەی (گۆبەند) بەواتای نانەوەی شەڕ و ئاژاوەو ناخۆشی دێت. سیما واتاییەکانی ئەم پاشگرە لە گەیاندنی واتای پراگماتیکیدا ئەمانەن: {+داپۆشین + بەستن و توندکردن +ئامێر +شەڕ و ناخۆشی و ئاشووب}

**ب- ئەو گیرەکانەی واتای بچووککردنەوە و ناسکی و نازداری و خۆشەویستی دەگەیەنن.**

ئەو پاشگرانە کاتێك دەچنە سەر وشەیەك، واتای بچووککردنەوەو ناسکی و نازداری و خۆشەویستی دەگەیەنن، کاتێك کە بە واتای سیمانتیکیی خۆیان بەکاردەهێنرێن، بەڵام زۆرجار ئەم پاشگرانە واتای پراگماتیکی دەبەخشن، واتە بە واتای خوازراو دێن. لێکدانەوەی ئەم واتا خوازراوانەش، بەپشتبەستن بە هەستی قسەکەر لە دەوروبەر و بەکارهێنانە جیاوازەکاندا، لە رێگەی چوارچێوەی کۆمەڵایەتی و دەوروبەری قسەو نیاز و مەبەستی قسەکەر بەرجەستە دەبێت، کە مانایەکی باش یان خراپی لەپشتەوەیە.

بۆ بڕیاردان و تێگەیشتن لە واتای وشەی بچووککراوە پێویستە بۆنەی وتن و کات و شوێنی قسەکردن و تەمەن و جۆری پلەی پەیوەندیی نێوان قسەکەر و گوێگر و هەستی قسەکەر و ئاوازی دەنگ بەهەند وەربگیرێت، چونکە بێئاگایی گوێگر لەم هۆکارانە تەمومژ و لێڵی واتایی دروستدەکات. (سازان زاهیر ٢٠٠٩: ٥٣) هەندێك لەو پاشگرانە وەردەگرین:

١- پاشگری (- ۆڵە)

ئەم پاشگرە کاتێك دەچێتە سەر وشەیەك بۆ مەبەستی بچووککردنەوە و ناسك و نازداری و خۆشەویستی بەکاردێت، وەکو:

کچ + ۆڵە = کچۆڵە

بەرخ + ۆڵە = بەرخۆڵە

ناسك + ۆڵە = ناسکۆڵە

سیمای واتایی واتای سیمانتیکیی ئەم پاشگرە ئەمانەن: {+بچووکی لە تەمەن + ناسك و نازداری +خۆشەویستی}.

بەڵام کاتێك بە ژنێك دەوترێت (کچۆڵە) لێرەدا بە واتای پراگماتیکی بەکارهاتووە، دوورە لە واتا سیمانتیکییەکەی، واتایەکی نێگەتیڤ دەدات، بۆ تانە و تەشەر بەکارهاتووە، ئەمەش بەهۆی دەوروبەرو چوارچێوە کۆمەڵایەتییەکەوە واتاکەمان دەست کەوت. هەروەها لە وشەی (کزۆڵە)دا کە بەواتای ڕەزیل و دەست نووقاو و سەرسواڵکەر دێت، لێرەدا کۆمەڵێك واتای خراپ بۆ کەسەکە دێت، هەروەها لە وشەی (شرۆڵە)یشدا بەهەمان شێوە کۆمەڵێك واتای خراپی لە خۆی کۆکردۆتەوە بەنموونە دەوترێت: (سەرکار کەسێکی سەرکزەڵۆك و شرۆڵەیە.) بەم پێیە سیما واتاییەکانی واتای پراگماتیکی ئەم مۆرفێمە ئەمانەن: {+گەورەیی لە تەمەن + تانە و تەشەر – خۆشەویستی + قێزەون +کەسایەتی نزم}

٢– پاشگری (–کە، –یلکە)

ئەم پاشگرانە دەچنە سەر هەندێك وشە و بچووکی دەکەنەوە، بەواتای بچووککردنەوە دێن، وەکو:

تەشپی + یلکە = تەشپیلکە

جام + یلکە = جامیلکە

هەندێ جاریش ناوی ئامێر دروست دەکەن، بەمەش لە واتای سیمانتیکی لادەدات و دەبێتە واتای پراگماتیکی وەکو:

چاو + یلکە = چاویلکە

هەندێ جار ناوی خواردن دروست دەکەن:

لەت + کە = لەتکە

لووت + کە = لووتکە

ڕەش + کە = ڕەشکە

سیمای واتایی واتای سیمانتیکی بریتییە لە: {+مادە + بچووککردنەوە}

پاشگری (–کە) هەندێ جار دەچێتە سەر وشە و واتای پراگماتیکی دەبەخشێت، وەك:

پیس + کە = پیسکە

لووس + کە = لووسکە

لە وشەی (پیسکە)دا ئەم پاشگرە واتای پڕاگماتیکی بە وشەکە بەخشیوە کە دوورە لە واتای بچووککردنەوەو خۆشەویستی، بەڵکو بەپێچەوانەوە واتایەکی خراپی هەیە، بەواتای ڕەزیل و چاوچنۆك و نەزان و کەسایەتی نزم و...هتد دێت، هەروەها لە وشەی (لووسکە)ش بەهەمان شێوە بەکەسێك دەوترێت کە لە تەمەنێکی هەرزەکاریدا بێت و سمێڵ و ڕیشی تاشیبێت و زانست و زانیاری کەم بێت و خۆی بە زانا و گەورە دابنێت و قسەی گەورە بکات. سیما واتاییەکانی ئەم پاشگرە لە گەیاندنی واتای پڕاگماتیکیدا ئەمانەن: {+ڕەزیل و چاوچنۆك + کەسایەتی نزم +نەزان +خۆبەزلزان}

٣- پاشگری (- ۆکە)

ئەم پاشگرە دەچێتە سەر ناو و قەبارەکەی بچووك دەکاتەوە، وەکو:

دەسر + ۆکە = دەسرۆکە

بزن + ۆکە = بزنۆکە

خانو + ۆکە = خانۆکە

سیما واتاییەکانی واتای سیمانتیکی ئەم پاشگرە ئەمانەن : {+مادده + بچووککردنەوەی}

ئەم پاشگرە دەچێتە سەر هەندێك وشەی تر و واتای پڕاگماتیکی دەگەیەنێت، وەکو:

شێت + ۆکە = شێتۆکە

گێل + گێلۆکە = گێلۆکە

فەقیر + ۆکە = فەقیرۆکە

کەر + ۆکە = کەرۆکە

لە وشەکانی (شێتۆکە، گێلۆکە، کەرۆکە)دا، واتای خراپی بە پلەیەکی بەرزتر لە بنەڕەتییەکە دەربڕیوە. واتە بەهۆی ئەم پاشگرەوە پلەی نزم و خراپی لە سەرووی ئاستی بنەڕەتی خۆیانەوە نیشاندراون. بۆ نموونە دیارترین سیمایی واتایی (شێت)، {+کەمیی ئەقڵ}، بەڵام ئەو سیفەتە لە (شێتۆکە، گێلۆکە، کەرۆکە)دا {+- کەمیی ئەقڵە}واتە، دەشێت (کەر، شێت، گێل)ی تەواوبێت، بەڵکو لە هەندێ کردەوەو ڕەفتاری نابەجێ و ئاخاوتنی نەشیاودا لەگەڵ کەسی

(شێت و گێل و کەر)دا یەکدەگرنەوە. بەڵام لە (فەقیرۆکە)دا بەمەبەستی گەیاندنی واتای باش هاتووە بۆنموونە دەڵێین: (کەسێکی فەقیرۆکە و بێدەنگە.) واتە، کەسێکە خۆی لە ئیش و کاری کەسانی تر هەڵناقورتێنێ و نابێتە هۆی تێکدانی ئیشی کەسانی تر و زۆربلێیی ناکات و نابێتە مایەی سەرئێشە بۆ بەرانبەرەکانی و بەشێوەیەکی گشتی کەسێکی سەلامەت و بێگرفتە. سیما واتاییەکانی ئەم پاشگرە، لەگەیاندنی واتای پراگماتیکیدا ئەمانەن: {+− باش +مرۆڤ +گیانلەبەر}

٤− پاشگری (− لە)

ئەم پاشگرە لە سازکردنی وشەی نوێ و لەگەڵ ژمارەیەکی زۆری بناغەی جۆراوجۆر کەڵکی لێوەردەگیرێت، وەکو:

مێروو + لە = مێroولە

بەڕوو + لە = بەڕوولە

لەم نموونانەی سەرەوە ئەم پاشگرە لەگەڵ ئەو بناغانەی کە لەگەڵیاندا هاتووە وشەی نوێی بەواتای سازکردووە. بەڵام ئەم پاشگرە دەچێتە سەر هەندێك بناغەی تر و، واتای پراگماتیکی دەگەیەنێت، وەك:

برا + لە = برالە

کەنی + لە = کەنیلە

لە وشەکانی (برالە و کەنیلە)دا، بەهۆی دەوروبەری ئاخاوتنەوە واتاکەی ڕووندەبێتەوە، کە بۆ دەربڕینی هەست و سۆزو خۆشەویستی و ناسك و نازداری بەکارهاتووە، یان هەندێك جار بۆ مەبەستی نزمکردنەوەی کەسی بەرامبەر دێت.

٥− پاشگری (−ەڵ)

ئەم پاشگرە دەچێتە سەر ناو، ناوێکی تازە دروست دەکات، لە هەمان کاتدا واتای بچووکیش دەگەیەنێت، وەکو:

تۆپ + ەڵ = تۆپەڵ

کیس + ەڵ = کیسەڵ

دۆم + ەڵ = دۆمەڵ

سیما واتاییەکانی واتای سیمانتیکی ئەم پاشگرە ئەمانەن: {+− مادده + بچووککردنەوە + ناسکی}

هەندێك جار ئەم پاشگرە دەچێتە سەر وشەی تر و واتای پڕاگماتیکی دەدات، وەکو:

زەرد + ەڵ = زەردەڵ

پووچ + ەڵ = پووچەڵ

فش + ەڵ = فشەڵ

ئەم پاشگرە لەم نموونانەی سەرەوەدا واتایەکی خراپی گەیاندووە، واتای بچووککردنەوەو خۆشەویستی نەگەیاندووە، بەڵکو بەواتای سووککردن یان نیشاندانی سیفەتی خراپ لە کەسێکدا، یان بۆ پیشاندانی جۆرێك نەخۆشییە. (زەردەڵ) بەواتای نەخۆشی و بێتاقەتی و لەڕولاوازی کەسێك دێت، هەروەها (پووچەڵ)یش بەهەمان شێوە سیفەتێکی خراپی شتێك پیشاندەدات، وەك:

- گوێزەکان زۆربەیان پووچەڵ بوون
- پلانەکەی دوژمنیان پووچەڵ کردەوە

(فشەڵ)یش بەهەمان شێوە سیفەتێکی خراپ نیشاندەدات، وەك:

- خاکەکەی فشەڵە بۆیە ئەم خانووانە درزیان داوە.

سیما واتاییەکانی واتای پڕاگماتیکی ئەم پاشگرە ئەمانەن: {+ نەخۆشی + سیفەتی خراپ + کەمکردنەوەی بەهای شت}

٦- پاشگری (– ەڵە)

ئەم پاشگرە دەچێتە سەر ناو و چەمکی بچووکی دەگەیەنێت، وەکو:

گۆزە + ەڵە = گۆزەڵە

سیما واتاییەکانی واتای سیمانتیکی ئەم پاشگرە ئەمانەن: {+مادده + بچووککردنەوە + ناسکی}

ئەم پاشگرە دەچێتە سەر هەندێك وشە و واتای پڕاگماتیکی دەگەیەنێت، وەکو:

زیت + ەڵە = زیتەڵە

قیت + ەڵە = قیتەڵە

لەم نموونانەی سەرەوەدا واتایەکی باشی گەیاندووە. بەڵام لە هەریەك لەم نموونانەدا:

سووك + ەڵە = سووكەڵە

باریك + ەڵە = باریكەڵە

لێرەدا ئاوەڵكارەكان بەتەنها واتایەكی خراپ دەبەخشن، بەڵام پاش ئەوەی پاشگری (–ەڵە)یان دەچێتە سەر واتاكانیان لە خراپەوە دەگۆڕێت بۆ باشو پلەیان بەرزدەبێتەوە. هەروەها هەندێ جار ئەم پاشگرە دەچێتە سەر هەندێ وشەو واتای خراپی پێدەبەخشێت، وەكو:

ڕەق + ەڵە = ڕەقەڵە

ڕووت + ەڵە = ڕووتەڵە

لەم نموونانەی سەرەوەدا ئەم پاشگرە واتای وشەكانی نزم كردۆتەوە، واتایەكی خراپتری پێبەخشیون.

**ت– ئەو پاشگرانەی ناوی واتایی (ئەبستراكت) دروست دەكەن.**

**١– پاشگری (– انە)**

ئەم پاشگرە دەچێتە سەر هەندێك ناو ناوی واتایی دروست دەكات، وەك:

پیاو + انە = پیاوانە

ژن + انە = ژنانە

كورد + انە = كوردانە

خوێڕی + انە = خوێڕیانە

سیما واتاییەكانی واتای سیمانتیكی ئەم پاشگرە ئەمانەن: {+– سیفەتی باش + ناوی واتایی}

هەندێك جار ئەم پاشگرە دەچێتە سەر وشەی ترو واتای پڕاگماتیكی دەدات، وەكو:

سەر + انە = سەرانە

ڕۆژ + انە = ڕۆژانە

پووش + انە = پووشانە

شاگرد + انە = شاگردانە

لـەم نموونانــەی ســەرەوەدا چــەمكی پاشــگری (–انــە) (پــارە وەرگــرتن) دەگەیەنێت، بـەڵام بـە واتـای جیـاواز لـە (سـەرانە) باجێكـە مـرۆڤ وەری دەگرێـت لەجیاتی سەری خۆی. (ڕۆژانە) پارەیەكە لـەبری كـاركردنی ڕۆژانـە وەردەگیرێـت. (پووشانە) خاوەنی پووش و پاوان لـە خـاوەن ئـاژەڵانی وەردەگـرن. (شـاگردانە) شاگرد لە وەستای وەردەگرێ.

هەروەها ئەم پاشگرە دەچێتە سـەر هەنـدێك وشـەی تـرو واتـای بـەردەوامی دەگەیەنن، وەكو:

شەو + انە = شەوانە

ڕۆژ + انە = ڕۆژانە

ساڵ + انە = ساڵانە

مانگ + انە = مانگانە

٢– پاشگری (– ی )

ئەم پاشگرە دەچێتە سەر وشـە و چـەند جۆرێـك نـاوی ئەبسـتراكت دروسـت دەكات، لەوانە ناوی ئەبستراكت بەواتای بار و حاڵەت:

خۆش + ی = خۆشی

بەهێز + ی = بەهێزی

نەمر + ی = نەمری

جوان + ی = جوانی

ناوی ئەبستراكت بەواتای قۆناغی تەمەن:

منداڵ + ی = منداڵی

گەنج + ی = گەنجی

ساوا + ی = ساوایی

پیر + ی = پیری

سیما واتاییەكانی واتای سیمانتیكی ئەم پاشگرە ئەمانەن: {+نـاوی واتـایی + باروحاڵەت +قۆناغەكانی تەمەن}

هەندێك جار ئەم پاشگرە دەچێتە سەر وشەی ترو واتای پڕاگماتیكی دەدات، وەكو:

مامۆستا + ی = مامۆستایی

بازاڕ + ی = بازاڕی

ئـەم پاشـگرە کاتێـك دەچـێتە سـەر وشـەیەکی وەك (مامۆسـتا) واتایـەکی پراگماتیکی دەدات، وەکو:

– نەسرین مامۆستایی بۆ نەورۆز دەکات.

لێرەدا (مامۆستایی) بەواتای پراگماتیکی بـەکارهاتووە، واتـە رێوشـوێنی بـۆ دادەنێـت و ئامۆژگـاری دەکـات و پلانـی بـۆ دادەرێـژێت و فێـری دەکـات چـۆن هەڵسوکەوت بکات و ئەگەر تووشی گرفت بوو چۆن خۆی لێ دەرباز بکـات، ئەگـەر بۆ هەڵخەڵەتاندن بێت چۆن قسەی لووسی بۆ بکات...

لـە وشـەی (بـازاڕی) واتـای کـەم بـەهایی و کـەم نرخـی قسـەکەو شـتەکە دەگەیەنێت، وەك:

- قسەکانی بازاڕین.

واتـە لـە قسـەکانی وردنەبۆتـەوەو شـێوازی جـوانی بەکارنـەهێناوەو وشـەی گونجاوی لە شوێنی گونجاو بەکارنەهێناوە.

سیما واتاییەکانی واتای پراگمـاتیکی ئـەم پاشـگرە ئەمانـەن: {+لێـزانین + فێرکـــردن + کارامـــەیی +هەڵخەڵەتانـــدن و لەخشـــتەبردنی کەســـانی تـــر + کەمکردنەوەی بەها + تانە و تەشەر}

## ئە نجام

١– لەنێوان مۆرفێمە بەندەکاندا، گیرەکەکان بەهۆی ئـەو ڕۆڵـە گـەورەی کـە لەزماندا هەیانە لە هەموو مۆرفێمەکانی تر گرینگترو بەبەرهەمترن.

٢– گیرەکە وشە دارێژەکان لەپاڵ واتا سـیمانتیکییەکەیان، زۆربـەیان واتـای پراگماتیکیشیان هەیە، کە بەدەوروبەر و بەکارهێنانەوە بەندن، بەمەش پراگماتیك دەچـێتە نـاواخنی گیرەکەکانـەوە لەگەڵیانـدا بەشـدار و هاوبەشـدەبێت، بـەهۆی زانیاریی پێشینە و دەوروبەرەوە واتای پراگماتیکی بە وشەکان دەبەخشێت.

٣– ئەو گیرەکە وشـە دارێژانـەی، کـە واتـای پراگمـاتیکی دەگەیـەنن، سـیما واتاییـــەکانیان دەگۆڕێـــت و جیـــاواز دەبێـــت لـــە ســـیما ســـەرەکییەکانیان (سیمانتیکییەکانیان)، واتە سیمای تریان بۆ زیاد دەبێت.

**سەرچاوەکان:**

**کوردی:**

– ئەورەحمانی حاجی مارف (١٩٨٧)، وشەرۆنان لە زمانی کوردیدا، چاپی دووەم، لەبڵاوکراوەکانی کۆڕی زانیاری کورد، چاپخانەی زانکۆی سەلاحەدین، هەولێر.
– تالیب حوسێن عەلی (٢٠١١)، واتاسازی چەند بابەتێکی لێکدانەوەی واتای وشە، چاپخانەی ڕۆژهەڵات، چاپی یەکەم، هەولێر
– تریفە عومەر ئەحمەد (٢٠٠٨)، مەبەستی پراگماتیکی لە وتاردا، نامەی ماجستێر، کۆلێژی زمان، زانکۆی سلێمانی.
– سەلام ناوخۆش (٢٠٠٨)، پوختەیەك دەربارەی زمانناسی مێژوویی– بونیادگەری– چۆمسکی، چاپخانەی کاروان، چاپی دووەم، هەولێر.
– جەمال عەبدول (٢٠٠٨)، بەرکولێکی زاراوەسازیی کوردی، دووەم چاپ، لە بڵاوکراوەکانی ئەکادیمیای کوردی، چاپخانەی خانی، دهۆك.
– سازان زاهیر سەعید (٢٠٠٩) پێزی مۆرفێمە دارێژەکانی بچووککردنەوەو ناسکی لە سازکردنی وشەی نوێدا، نامەی ماستەر، کۆلێژی زمان، زانکۆی سلێمانی
– شێروان حسێن حەمەد (٢٠١٠)، تێڕوانینێکی نوێ بۆ سینۆنیم لەزمانی کوردیدا، نامەی ماجستێر، کۆلێژی زمان، زانکۆی سلێمانی.
– فارووق عومەر سدیق (٢٠١١)، لەدایکبوونی وشە، چاپی یەکەم، چاپخانەی شڤان، سلێمانی.
– محەمەد مەعرووف فەتاح (٢٠١١)، زمانەوانی، چاپی سێیەم، چاپخانەی حاجی هاشم، هەولێر.
– محەمەد مەعرووف فەتاح ،سەباح ڕەشید قادر (٢٠٠٦)، چەند لایەنێکی مۆرفۆلۆجی کوردی، چاپخانەی ڕوون، سلێمانی.
– محەمەدی مەحوی (٢٠٠٦)، ئاوەزداری و ڕێزمانی ناوەڕۆك– وابەستە، وەزارەتی خوێندنی باڵا و توێژینەوەی زانستی، زانکۆی سلێمانی، سلێمانی.
– کەمال میراودەلی (٢٠٠٧)، فەرهەنگی ڕێزمانی کوردی، بڵاوکراوەکانی مەڵبەندی کوردۆلۆجی، چاپی یەکەم، سلێمانی.
– کەوسەر عەزیز ئەحمەد (١٩٩٠) بیردۆزی مۆرفێم و هەندێ لایەنی وشەسازی کوردی، نامەی ماجستێر، کۆلێژی ئاداب، زانکۆی سەلاحەددین– هەولێر.

- نەرمین عومەر ئەحمەد (٢٠١٠)، بەبەرهەمی لە مۆرفۆلۆجی کوردیدا، نامەی ماستەر، کۆلێژی زمان، زانکۆی سلێمانی
- وریا عومەر ئەمین (٢٠٠٤)، چەند ئاسۆیەکی تری زمانەوانی، بەرگی یەکەم، بڵاوکراوەکانی دەزگای ئاراس ژمارە (٢٣٩)، چاپی یەکەم، هەولێر.

**فارسی:**

- ایران کلباسی (١٣٨٠)، ساخت اشتقاقی واژه در فارسی امروز، چاپ دوم پژوهشگاه علوم انسانی و مطالعات فرهنگی، تهران.
- پیتر ا. ام. سورن، (١٣٨٨)، مکاتب زبانشناسی نوین در غرب (بخشی از کتاب زبان شناسی در غرب)، ترجمه: علی محمد حق شناس، چاپ دوم، سمت، تهران.
- سیما وزیرنیا (١٣٧٩)، زبان شناخت، چاپ اول، نشر قطره، تهران.
- علاءالدین طباطبائی (١٣٧٦)، فعل بسیگ فارسیو واژەسازی، ویراسته: امید طبیب زاد، چاپ اول، مرکز نشر دانشگاهی، تهران.
- کورش صفوی (١٣٨٥)، اشنایی با معنی شناسی، چاپ اول، نشر بژواك کیوان، تهران.
- کورش صفوی (١٣٨٧)، در امدی بر معنی شناسی، چاپ سوم، انتشارات سورەمهر، تهران.
- محمد ضیاء حسینی (١٣٨٩)، مبانی زبان شناسی، چاپ دوم، انتشارات رهنما، تهران.
- مهدی مشکوه الدینی (١٣٨٩)، دستور زبان فارسی برپایەی نظریة ی گشتاری، ویرایش دوم، چاپ یازدهم، انتشارات دانشگاه فردوسی مشهد.
- ویکتوریا فرامکین، رابرت رادمن، نینا هیامز (١٣٨٧)، در امدی بر زبان (زبانشناسی همگانی)، ترجمه: علی بهرامی، سهیلا ضیاءالدین، چاپ اول، رهنما، تهران.

**ئینگلیزی:**

- Bloomfield, L. (1954), Language, New York: Henry Holt and Company.
- Katamba. F., Stonham. J. (2006), Morphology, Second published, Palgrave Macmillan, London.
- Stageberg, N. C. (1981) An Introductory English Grammar, 4th published, Holt Rinehart and Winston.

## ملخص البحث

تعد المورفيمات التي هي من انواع اقسام الكلام ومحركات اللغة، ولها تأثير واضح لأثراء اللغة. ومن دون هذه المورفيمات تصبح اللغة ناقصة ، مايعني ليس للألفاظ ولا للجمل معان من دون هذه المورفيمات. وليس لهذه المورفيمات معانٍ مستقلة بذاتها ولايلحظ أي حضور لها في المعاجم أيضاً. وتتوزع المورفيمات الى نوعين:

الأول: المورفيم المقيد المنحوت.

الثاني: المورفيم المقيد القواعدي.

وينصب الاهتمام في هذا البحث على النوع الاول (المورفيم المنحوت)، اذ ان معانيه متداولة وتحمل معانٍ سيمانتيكية وبراغماتيكية. وفي حال الصاق هذه المورفيمات بغيرها تتضح المعاني السيمانتيكية بوضوح من ثم يمكن التعرف عليها. وللحصول على معانٍ براغماتيكية نحتاج الى السليقة اللغوية ومقتضى الحال، وفي حال اعطاء المعنى البراغماتيكي تطرأ تغيير سمات الدلالة السيمانتيكية.

## Abstract

Bound morpheme is regarded as one of the essential elements of language .It plays role in the process of enriching language. Language would be deficient with the absence of such kind of morpheme ,i.e. the main elements of language (such as, words, phrases ,sentences ) would be meaningless. Without the functional role of morphemes, out of context (words or sentences), are meaningless; therefore, they are not considered in dictionaries.

Bound morphemes are classified into derivational and inflectional. This study tackles derivational morphemes which can have meaning only when they are used. The majority of such kind of morpheme can have semantic and pragmatic meaning in their uses. In a way that they cannot have their semantic meaning, unless they are attached to other morphemes whereas they are in need of a context to gain their pragmatic meaning which is not fixed, i.e. their meaning may vary from a context to another.

# ڕۆژی زمانی زگماك
# زمانی كوردی لەبەردەم هەڕەشە مێژوویی و سەردەمییەكاندا

د. هۆگر مەحموود فەرەج

بەشی كوردی- كۆلێژی زمان - زانكۆی سلێمانی

**پێشەكی:**

ئاشكرایە، كە زمان كۆڵەكەی یەكەمی هەر نەتەوەیەكە، كە لەڕێیەوە وەک تایبەتمەندییەک نەتەوەی پێدەناسرێتەوە. هاوكات هەر ئەم تایبەتمەندێتییەش دەبێتە خاڵی جوداوازیی نێوان نەتەوەكان، بەشێوەیەک، كە ئەگەر ژیرانە مامەڵەی لەگەڵدا نەكرێت، ئەوا دابڕان و دڕدۆنگی و بگرە دژایەتی و ...تاد، لێدەكەوێتەوە. خۆ ئەگەر ژیرانە مامەڵەی لەگەڵدا بكرێت، ئەوا دەشێت ببێتە خاڵی لێكتر نزیكخستنەوە و هاوكاری و سوودبەخشین. هەروەک چۆن لەڕێگەی وەرگێڕانەوە لە زمانێكەوە بۆ زمانێكی دراوسێ یاخود دوور، نەتەوەكان لە كەلتووری یەكتر و لە خواست و پێشكەوتنەكانی یەكتر ئاگادار دەبن و ئەمەش دەبێتە مایەی پێشكەوتنی ئەوانیش و لەڕێگەی گۆڕینەوەی كارامەییەكانەوە یاخود بەرهەمهێنراوە هزری و ماتریاڵییەكانەوە، كەڵک دەبینن. هەر ئەمەش هەلی ئاڵوگۆڕی بازرگانی و دەستكەوتی ئابووری فەراهەم دەكات. گومانیش لەوەدا نییە، كە هەر زمانە و خۆی بۆخۆی وەک دەفرێک وایە، كە ئاوەزمەندیی نەتەوەی تێدا هەڵگیراوە. بۆیە لێک نزیككەوتنەوەی نەتەوەكان لەڕێگەی زمانەوە، واتای ئەوەیە كە هەلی ئاگاداربوون لە لایەنی ئاوەزمەندیی نەتەوەكان، دەڕەخسێت. جا زمان، كە وەک وترا تایبەتمەندیی نەتەوەیە، ئەو تایبەتمەندێتییە پاراستن و كارپێكردن و ڕەچاوكردن و بگرە بەپیرۆزگرتنیشی لەلایەن نەتەوەكەوە پێدەوێت، چونكە هەروەک جینەكان چۆن هەڵگری تایبەتمەندییەكانی مرۆڤ و ڕووەک و گیاندارانن، زمانیش تاڕادەیەک بەو چەشنە

هەڵگری ئاوەزمەندی و مێژوو و ئەزموون و کارامەییەکانی مرۆڤە. هەر ئەمەشە وادەکات، کە داگیرکەران دژایەتیی زمانی نەتەوەی داگیرکراو بکەن.

دیارە بە لەدەستدانی زمانیش، نەتەوە ناسنامەی خۆی لەدەستدەدات، هاوکات مرۆڤایەتیش گەنجینەیەک لەدەستدەدات، کە هەرگیز وێنەیەکی دەقاودەقی ئەو لە سەرجەم لایەنەکانەوە، لەئارادا نابێت. جا نەتەوەی کوردیش، کە یەکێکە لە نەتەوە دێرینەکان، لە هێندێک لایەنەوە، بەتایبەت ئاسەوارناسان ئەرێی دێرینیی بۆ دەدەن. زمانەکەشی مێژوویەکی کۆنی هەیە و هەڵگری بەشێک لە ئەزموونی مرۆڤایەتییە. نەتەوەی کورد و زمانەکەی بەتایبەتی، ڕووبەڕووی چەندان هەڕەشەی لەمێژینە و سەردەمییانە، بوونەتەوە. بەوهۆیەوە بەچاکمانزانی، کە ئەم لێکۆڵینە بە پێشەکییەک و لە سنووری دوو بەشدا پێشکێش بکرێت، کە هەر بەشێکیان چەند تەوەرێک لەخۆدەگرێت، هاوکات لەگەڵ ئەنجام و پێشنیازەکان و دواتر لیستی سەرچاوە و کورتەی لێکۆڵینەکە بە زمانەکانی عەرەبی و ئینگلیزی، دەخرێنە ڕوو.

## بەشی یەکەم
## ڕۆژی جیهانیی زمانی زگماک:

بێگومان هەر نەتەوەیەک زمانی تایبەت بە خۆی هەیە، جیهانیش پتر لە (٦٠٠٠) زمانی تێدایە. دیارە ئەو زمانانەش تێیاندایە کە زمانی نەتەوەی بە ژمارە گەورەن، هەروەک تێشیاندایە کە ژمارەیان کەمن، بەڵام نەتەوەن و لەلایەنی زانستەوە بە سەرجەم لقەکانییەوە، بە نەتەوە دادەنرێن. لەلایەکی تریشەوە ئەم نەتەوانە تێیاندایە خاوەن هێزی ئابووری و سەربازین، کە لە زۆر باردا ئەم توانایانە وادەکات، خدەی خۆسەپاندن، کە لە مرۆڤدا هەیە، زمانەکە بەسەر نەتەوە یاخود نەتەوەکانی ژێردەستیاندا بسەپێنن و بەمەش مافێکی ئاسمانی و زەمینیی نەتەوەی ژێردەست، پێشێل دەکرێت. جا ئەگەر نەتەوەکە توانای بەرگری هەبێت، ئەوا بەرخۆدان و شۆڕش لەپێناوی بەدەستهێنانەوەی ئەو مافەیدا دەکات، خۆ ئەگەر ئەمەی لە توانادا نەبوو، ئەوا ملکەچی خواستەکانی نەتەوەی سەردەست دەبێت و زمانەکەی خۆی دەداتە پاشەکشە و بگرە پووکانەوە و نەمانیش. دیارە هەروەک دواتر لەم لایەنە دەدوێین، نموونەی ئەم بارە زۆرن. هێندێک لە سەرچاوەکان دەڵێن لە سنووری ئەم چەند دەیەیەی دواییدا، نزیکەی (٢٠٠) زمان لەناوچوون[1].

بێگومان ئەگەر هێز و خۆسەپاندن لەئارادا بێت و ڕێگری لێ نەکرێت، ئەم بارودۆخە هەمیشە بەردەوام دەبێت. هەر ئەوەش وایکرد، کە لە ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکاندا بیر لە دۆزی زمان بکرێتەوە و هەوڵبدرێت، کە ڕۆشنبیریی پاراستنی زمانەکان گەشەی پێبدرێت و زانایان هانبدرێن، کە سەبارەت بە زمانەکان لێکۆڵین بکەن و دەوڵەتانیش وەک مافێکی بنچینەیی لە زمانی نەتەوەکان بڕوانن و کار بۆ لەناوبردنی زمانانی تر نەکەن، چونکە ئەم کارە زیان لە کەلەپووری مرۆڤایەتی دەدات. ئەم بیرکردنەوە نوێیە لەلایەن نەتەوە یەکگرتووەکانەوە، بەدوای ئەو پێشنیازەدا هاتە ئاراوە، کە لە (١٧/ نۆڤەمبەر/١٩٩٩)دا لەلایەن وڵاتی بەنگلادیشەوە درایە نەتەوە یەکگرتووەکان و لە کۆبوونەوەی گشتییاندا (٢٨) دەوڵەت پشتگیریی پێشنیازەکەیان کرد و ڕەزامەندییان دەربڕی، کە بەو بۆنەیەوە ئاهەنگ بگێڕرێت.

دواتر یۆنسکۆ لە ساڵی (٢٠٠٠)ەوە، لە (٢/٢١)دا وەک ڕۆژی جیهانیی زمانی زگماک، ئاهەنگ دەگێڕێت و ئەندامانی نەتەوە یەکگرتووەکان بەشداری تێدا دەکەن و دواتر ساڵی (٢٠٠٨)یان بە ساڵی نێودەوڵەتیی زمانان، ڕاگەیاند.

دیارە هەڵبژاردنی ڕۆژی (٢/٢١)، کە لە پێشنیازەکەی بەنگلادیشدا هاتبوو، ئەمە هەڵبژاردنێکی لەخۆوە نەبوو، بەڵکو پێوەندیی بەو قوربانیدانەوە لەپێناو زمانی زگماکدا، هەبوو، کە بەنگالییەکان لە (١٩٥٢/٢/٢١)دا، دایان، بەتایبەت خوێندکارانی زانکۆ، چونکە حکومەتی پاکستان، کە خۆیان لە (١٤/ئۆکتۆبەری ١٩٤٧)دا سەربەخۆیی خۆیانیان بەدەستهێنابوو، کەچی لە (١٩٤٨/٣/٢١)دا، (محەممەد عەلی جەناح)ی سەرکردەیان، ڕایگەیاند کە زمانی ئۆردی زمانی فەرمیی سەرجەم پاکستانە و دەبێت لە سەرجەم وڵاتەکەدا وەک زمانی نیشتمانی، لە وڵاتدا بسەپێت. هاوکات حوکمڕانی بەنگالی ڕۆژئاواش، کە خواجە نیزامەدین بوو، ئەرێی بەو بڕیارە دا. لە بەرامبەردا خوێندکاران کەوتنە خۆپیشاندان و ناڕەزایی. کار گەیشتە ئەوەی، کە پشێوی و ناڕەزایی سەرجەم ناوچەکان بگرێتەوە. ساڵانی ١٩٥٠ — ١٩٥٢ ڕاپەڕینی بەرفراوان دەستی پێکرد، کە دواتر بە بزووتنەوەی زمانی بەنگالی، ناوی دەرکرد. لەو خۆپیشاندانانەدا پۆلیس کەوتنە دەستڕێژ لە خوێندکاران و لە بەنگالی ڕۆژهەڵاتدا پێنج خوێندکار کوژران و ژمارەیەکیش بریندار بوون. ئەم ڕەشەکوژییە لە نزیک کۆلێژی پزیشکی، لە دەکای پایتەختی ئێستای بەنگلادیش ڕوویدا. دواتر کڵپەی ناڕەزایی هەموو وڵاتی گرتەوە، بە چەشنێک دەسەڵات ملکەچی داننان بە زمانی بەنگالیدا، بوو. واتە لە ساڵی (١٩٥٦)دا زمانی بەنگالی وەک ئۆردی و شانبەشانی ئەو بەکاردەهات. ئەم هەلومەرجە واکەوتەوە، تاوەکو لە (١٩٧١)دا بە فەرمی بەنگلادیش سەربەخۆیی خۆی بەدەستهێنا و لە پاکستان جودا بووەوە. ئەوەی جێگەی سەرنجە ئەوەیە، کە دۆزی زمان بووە هۆی هەژاندنی نەتەوەکە و بزووتنەوە زمانییەکەیان بووە هۆکاری ڕاپەڕین و کۆڵنەدان و بەردەوامیشی ملکەچکردنی دەسەڵاتی لێکەوتەوە و ئاکام بە سەربەخۆیی شاد بوون. ئێستا لە شاری دەکای پایتەختی بەنگلادیشدا، لەبەردەم کۆلێژی پزیشکیدا مۆنۆمێنتێکیان بۆ بەرزڕاگرتنی ئەو شەهیدانە داناوە، کە بە مۆنۆمێنتی شەهید مەنار دەناسرێت.

دیارە لە مانگی تشرینی دووەمی ساڵی (١٩٩٩)وە، بەپێی پرۆژە بڕیاری (C/D R.35 30)ی کۆنگرەی گشتیی ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان بۆ پەروەردە و ڕۆشنبیری (یۆنسکۆ)، ڕاگەیەنراوە، کە ئاهەنگ بەو بۆنەیەوە بگێڕرێت و هانی چالاکانی کۆمەڵی شارستانی و لێکۆڵان و زمانەوانان بدرێت، کە بە ئاڕاستەی پاراستنی زمان و فرەزمانی و فرە ڕۆشنبیریدا، کاربکەن. هەر بۆ ئەو مەبەستەش لەساڵی (٢٠٠٢)وەوە خەڵات بەسەر ئەوانەدا دابەشدەکرێت، کە تائێستا (١٣) کەسێتی و دامەزراوەی فێرکاریی (١١) وڵات، وەریانگرتووە. هەر لە (١٦/ئایاری ٢٠٠٧)یشەوە، بەگوێرەی بڕیاری (RES/A/٦١/٢٦٦)، داوای هاندان لە دەوڵەتانی ئەندامی ئەو ڕێکخراوە کراوە، سەرجەم ئەو زمانانە بپارێزن، کە نەتەوەکان بەکاریاندەهێنن. وەک پێشتر لێیدواین، هەر بەو بڕیارە و لەپێناو یەکگرتوویی و لەچوارچێوەی فرەڕەنگیی لێکتێگەیشتنی نێودەوڵەتی لە فرەزمانی و فرە ڕۆشنبیریدا، ساڵی (٢٠٠٨) کرابوو بە ساڵی نێودەوڵەتیی زمانانی جیهان[٢].

دیارە ئەم بڕیار و بۆچوونانە چاکن و دەبێت ئێمەی کوردیش ئەو ڕۆژە وەک جەژنی زمانی زگماک سەیر بکەین و هەوڵبدەین، کە لەو ناوچە و پارچانەی کوردستاندا، کە ئەم مافەمان پێشێل دەکرێت و ئەو دەوڵەتە داگیرکەرانەی کوردستان بەردەوامن لەوکارە، ئێمە ئەو ڕۆژە و ئەو بڕیارەی نەتەوە یەکگرتووەکان بکەینە کارتی گوشار. هاوکات لەو ڕۆژەدا کاری گرنگ سەبارەت بە زمان لە کۆڕ و کۆبوونەوەکاندا، بکرێت. خاڵێکی زۆر گرنگیش هەیە، کە نابێت پێشوەخت ڕەچاوی نەکەین، ئەویش ئەوەیە، کە ئایا داگیرکەرانی کوردستان ئەم بڕیارە و ئەم زاراوەی زمانی زگماکە ناکەنە هۆکارێک بۆ پەرتکردنی نەتەوەکە، بەتایبەت، کە ئێمەی کورد کاریگەریی زۆری بارودۆخی داگیرکراوی و تەنانەت چەوساندنەوەی زمانیی زۆرمان لەسەر بووە و لەسەرە. بەواتایەکی تر، ئایا هەر زار و ناوچەیەک وەک زمانی زگماک بۆ زارەکەی خۆی ناڕوانێت؟. ئایا هەلومەرجی بەو شێوەیە، تێکەڵکردنێک لە بۆچوونەکاندا سەبارەت بە زمانی زگماک وەک زمانی نەتەوە و زار و گۆڤەر و زمانی نیشتمانی و ...تاد، ناهێنێتە ئاراوە؟. ئەمانە پرسگەلێکن، کە تێڕامانی

ورد و بیرکردنەوەی دروستیان بەپێی بەرژەوەندیی نەتەوەیی، پێویستە. بۆیە دواتر کەم تا زۆر هەوڵدەدەین، بەپێی ئەو ئاڕاستەیە، بۆچوونەکان بخەینەڕوو.

دیارە گومانیش لەوەدا نییە، کە ئەمڕۆ جیهان بە قۆناغێکی زۆر خێرا لە پێشکەوتندا تێدەپەڕێت، بەشێوەیەک سنوورەکان لەبەردەم تەکنۆلۆژیادا نەماون و جیهان وەک دەڵێن: بووەتە گوندێکی بچووک و هەرچی تێیدا ڕووبدات ناشارڕێتەوە. هەربۆیە خواستی تیوارەتی (الشفافية) بمانەوێت یان نا، تەنگی بە لایەنە شارراوەکان هەڵچنیوە. لەم هەلومەرجەشدا، هەر نەتەوەیەک، ئەگەر بخوازێت، لە کاروانی پێشکەوتن دوانەکەوێت، ئەوا نابێت گۆشەگیر بێت و دەبێت بە جۆرێک لە جۆرەکان تێکەڵ بەو ڕەوتی پێشکەوتنە ژیاری و تەکنۆلۆژیایەی ئەمڕۆ ببێت. لێرەدا نابێت ئەوە لەیاد بکەین، کە هەروەک گۆشەگیری کارێکی نەخوازراوە، هەر بەو چەشنەش تێکەڵبوونی بێ پلان و بەرنامەش نەخوازراوە و دەشێت ئاکامەکەی ونبوون و سەرلێشێوان و تێداچوونی نەتەوەی لێبکەوێتەوە.

**بۆچوونە جوداکان سەبارەت بە زمانی زگماک:**

چەند بۆچوونێکی جودا بۆ زمانی زگماک لە ئارادان، کە هەریەکەیان لەلایەن زانایەک یاخود گرووپێکەوە، سەرچاوەی گرتووە. کەواتە مەرج نییە ئەو بۆچوونانە لەگەڵ ئەو واتایەی وشەی زگماک لە کوردیدا یەکبگرنەوە. یەکێک لەو بۆچوونانە بۆچوونی (لویس جان کالڤی)یە، کە دەڵێت: زمانی زگماک زمانێکە، کە منداڵ بۆی دەمێنێتەوە. بیرۆکەی بۆماوەیی، واتە بیرۆکەی ڕەچەڵەک، کە بەشێوەیەکی بەربڵاو لە زمانی ڕووسیدا دەردەکەوێت، چونکە دەستەواژەی زمانی زگماک لە ڕووسیدا بۆ زمانی (لەدایکبوون) لەلایەک و بۆ (کەسوکار) و (بنەچە) لەلایەکی دیکەوە، دەگۆڕڕێت. هیچ لەوەش کەمتر نییە، بەتایبەت لە زمانە ئەمەریکاییەکاندا، کە ئەو خوازە و دەستەواژانەی زمانی یەکەم، دەبنە: زمانی شیری، زمانی مەمکی، بەڵام بەپێچەوانەوە لە هەندێک زماندا بیرۆکەی پێوەندیی ئەو زمانە یەکەمە، بە زەوییەوە دەبەستێتەوە. ئەمە لە زمانی چینیدا هەیە، کە بە (زمانی زگماک)ی دەڵێن[٣] .

کەواتە لەبری زمانی زگماک چەندان گوزارشتی تر هەن، کە تەنانەت لەناو خودی یەک زمانیشدا، ئەمە بەرچاو دەکەوێت. بۆ نموونە لە فەرەنسەییدا ئەمە هەیە، کە لە فەرهەنگە بەربڵاو و باوەکاندا، بە زمانی زگماک (زمانی ئەو وڵاتەی تێیدا لەدایکبووین) دەوترێت، دیارە ئەو پێناسەیەش گشت لایەنە گشتییەکانی زمانی زگماک بەرجەستە ناکات. بێگومان زمانی فەرەنسەیی زمانی زگماکی ئەو فەرەنسەییەیە کە لە ژاپۆن لەدایک بووبێت، بەڵام لە ژینگەیەک گەورە بووبێت، کە بە فەرەنسەیی قسەیانکردبێت. بەپێچەوانەی ئەوەشەوە، فەرەنسەییەک، کە لە دایک و باوکێک بێت، بە ڕەچەڵەک بیانیبن و جگە لە فەرەنسەیی بە زمانی تر قسە نەکەن، دەتوانێت ئەو زمانەی کە نایزانێت، بە زمانی باپیرانی دووری دابنێت و ئەگەر لەڕووی سۆزەوە خۆی بە فەرەنسەیی دانەنێت، ئەوا بەو زمانەی باپیرانی بڵێت زمانی زگماک. بەوشێوەیە جاری وا هەیە کە بە زمانی زگماک دادەنرێت و هەندێک جاریش بە (زمانی دایک — نیشتمان). لێرەدا ئەو ڕوونکردنەوەیە تێکەڵییەک لە ڕا و بۆچوون و سەرنجدان دروستدەکات، لەوەدا، کە زمانی زگماک بە زمانی خێزان لەقەڵەم دەدات، کە هەندێک هێما و بۆچوون بەرجەستەی دەکات، کە بریتین لە (مەمکی دایک، سۆزی دایک، خوێنی دایک)، لەلایەکی دیکەشەوە گوزارشت لە زمانی هەرێم و وڵات و نیشتمان دەکات. لە باری دووەمیشدا لە ڕێگای (باوک)ەوەیە، چونکە ڕەگی وشەی (باوک) لە فەرەنسەییدا (Pere) لە وشەی نیشتماندا هەیە (Patric)، هەروەها لە وشەی ئیتاڵیایی یان ئیسپانیایی بەرامبەر (Patria)یە، کە واتای (خاکی باوک) دەگەیەنێت، هەروەک لە ئەڵەمانیدا (Vaterland) لە وشەی (Fatherland)ی ئینگلیزییەوەیە، کەچی لە ئینگلیزیدا ((Motherland)ە، بەڵام بیرۆکەی نیشتمان لە زمانی چینیدا نە پێوەندیی بە باوک و نە بەدایکیشەوە نییە، بەڵکو بە (زوکیو) واتە بە باپیرانەوەیە، کە واتای (خاکی باپیران) دەگەیەنێت. لەو سۆنگە گشتییەوە کە زمان لەخۆ دەگرێت، پێدەچێت کەسوکار لە پێوەندییە خزمایەتییەکەدا نەوەکان دابەش بکەن، باوک خاک ببەخشێت (لێرەدا ئەو زەوییەیە کە بە چەک داکۆکی لێدەکات زیاتر لەو زەوییەی کە دەیچێنێت) دایکیش ئەو زمانە دەبەخشێت،...

ئەوەی لێرەدا سەرنج ڕادەکێشێت، ئەوەیە کە ئەم دابەشکردنە، فرەزمانی پشتگوێ دەخات. لەنێوان شانەی خێزان و قەوارەی نیشتماندا، دابڕان دروست نابێت. زمان دایک و خاک باوک، بە هەردووکیان یەکێتیی داستانێک پێکدەهێنن، کە زمانی مێگەل واتە زمانی تایبەت دەکات بە جیهانێکی بچووککراوەی زمانی بلاو، هەروەها خێزانیش دەکات بە جیهانێکی بچووککراوەی نیشتمان، چونکە زمانی دایک و زمانی نیشتمان یەک شتن. ئەو جیهانەی نیشتمان، کە بەر لە هەموو شتێک فرەزمانی دەستنیشانی دەکات، جیهانێکە لە چەند یەکەیەکی تاکزمانی پێکهاتووە، بنەما ڕاستەقینەکەشی بریتییە لەو زمانەی کە دایک بۆ منداڵەکانی جێیدەهێڵێت، هەروەها خاکێک کە باوک بۆ منداڵەکانی جێیدەهێڵێت. واتە هاوکات لە زمانی دایکەوە بۆ زمانی نیشتمان دەگوازرێتەوە، بەبێ هیچ جیاوازییەک لەنێوانیاندا[٤] . جا ئەمڕۆ، کە لە ڕێکخراوە نێودەوڵەتییەکانی وەک نەتەوە یەکگرتووەکان و ڕێکخراوەکانی کۆمەڵی شارستانییەوە، باس لە زمانی بێگانە و زمانی زگماک دەکرێت، ئەوا دەبێت ئەوە بزانین کە لە زۆر وڵات و لای زۆر نەتەوەش دیدی دووفاق هاتوونەتە ئاراوە، کە هەریەکەشیان قسەی خۆی و بەرگریی خۆیشی بۆ بۆچوونەکانی هەیە.

### سروشتی هێندێک لەو هەڕەشانەی، کە ڕووبەڕووی زمانی زگماک بوونەتەوە:

پێشتر لەوە دواین، کە لە وڵاتاندا و بگرە لە هێندێک لە ڕێکخراوەکانی کۆمەڵی شارستانیشدا، سەبارەت بە زمان و زمانی زگماک، بیر و بۆچوونی جودا یاخود تێڕوانین و دیدی جودا هاتوونەتە ئاراوە، کە ئەگەر بە بەئاگایی و بەپێی بەرژەوەندیی نەتەوەیی مامەڵەیان لەگەڵدا نەکرێت، ئەوا بە زیانی نەتەوەکەمان بگەڕێت و ئاکامی نەخوازراوی لێبکەوێتەوە. لەو دیدانەش،

دیدی یەکەم: پێیوایە کە ئەمڕۆ دەبێت سەبارەت بە زمانی بێگانە بەتایبەت ئینگلیزی، مرۆڤ ئەگەر بۆخۆی هەلی فێربوونی نەڕەخسابێت، ئەوا بۆ منداڵەکانی پێویستە ئەو هەلە بڕەخسێنێت، چونکە لەم ڕێگەیەوە منداڵەکەی

هەلومەرجی تێکەڵبوونی بە جیهانی زانست و تەکنۆلۆژیا و تەنانەت هەلی کار و بگرە ڕێزی خەڵکیش بەدەستدەهێنێت و دەشتوانێت بۆ هەر کام لە وڵاتانی جیهان بچێت، بەهۆی زمانەکەوە توانای پێوەندیکردن و بگرە کارئاسانیشی بۆ دەستەبەر ببێت.

ئەم بۆچوونە تاڕادەیەک بەشێوەیەک لە شێوەکان لە ڕاستی بەدەر نییە و ڕەواجپێدەرانیشی کەم نین. جا ئەمە بۆ ئێمەی کورد بەتایبەت لەم پارچە بە زۆر بە عێراقەوە لکێنراوەماندا، ڕێک وەک ئەوە وایە، کە لە هەشتاکانی سەدەی بیستەمدا، داروودەستەکانی ڕژێمی بەعس، بە بیانووی ئەوەی کە خوێندن بە عەرەبی بۆ داهاتووی منداڵانی کورد چاکترە لە خوێندن بە زمانی زگماکیی خۆی، گوایە لە چوونە زانکۆیاندا گەر بە عەرەبی نەیانخوێندبێت، سەرکەوتوو نابن. دیارە ئەم قسەیەش ڕێک لەگەڵ ئەو وتراوەی عەرەبدا دێتەوە، کە دەڵێت: "كلمة حق يراد بها الباطل" واتە وتەیەکی ڕەوایە و ڕاستە، بەڵام بۆ مەبەستێکی ناڕەوا. جا ناڕەواییەتی ئەو وتەیە لەوێدا بوو، کە ئایا بۆ دەبێت کورد وەک ئەوانی تر، خوێندنی زانکۆیی بە زمانەکەی خۆی نەبێت؟. ئەو دەمە ئەم قسانە دنە و پڕوپاگەندەی بەعس و عەرەب بوون، بۆ بەرژەوەندیی داگیرکەرانە و ڕماندنی پایەی یەکەمی نەتەوەیی ئێمە. دیارە مەبەستیشیان کردنەوەی ڕیسی کورد بوو بە خوری، چونکە هەوڵی چەندان سەدەی کورد، کە لەپێناوی زمانەکەیدا خوێنی ڕژتبوو، بە هەدەر دەچوو. بێگومان ئەمە لەگەڵ ئەو خواستەشدا دەهاتەوە، کە برایانی موسڵمان (اخوان المسلمين) لە سەرەتاکانی سەدەی بیستەمەوە لە ڕێکخراوێکدا یان پارتێکدا لەپێناو گرتنەدەستی دەسەڵاتدا خۆیان ڕێک خست و لە خەمیدا بوون، کە ئەویش بڵاوکردنەوەی زمانی عەرەبی بوو. دیارە لەمەدا لەگەڵ ڕەگەزپەرستانیشدا یەکدەنگ بوون، چونکە ئەوانیش پێیانوابوو، کە ئەگەر بەو چەشنە نەبێت، ئەوا خوارووی سوودان و باکووری عێراق (بە وتەی ئەوان) و ناوچەکانی ئەمازیغ لە ئەفریکادا، لە عەرەب دادەبڕێن، چونکە پێیانوابوو ئەگەر ئەمە نەکرێت، ئەوا ڕۆژێک لە ڕۆژان ئەو ناوچانە لە نیشتمانی عەرەب جودا دەبنەوە[٥]. هەربۆیە پێیانوابوو، کە لەسەر هەموو موسڵمانێک پێویستە کار بۆ بڵاوکردنەوەی زمانی

عەرەبی و پەرەپێدانی بکات[٦]، تاوەکو ئەوە ڕوونەدات. جا هەروەک (دکتر صدیقە عدالتی) دەڵێت: بۆ لەناوبردنی مرۆڤەکان سێ ڕێگەی سەرەکی هەن، کە ئەوانیش: یەکەم/ لەناوبردنی فیزیکیی نەوەکانی نەتەوەی تر، لەڕێگەی چەکی ئەتۆمییەوە... دووەم/ ناودێرکردن بە خوێنی پاک و جینی ڕەسەن!. سێهەم/ لەڕێگەی لەناوبردنی جینە شارستانی و ڕۆشنبیرییەکانەوە[٧] .

جا ئەوەی ڕاستی بێت ئێمەی کورد، تەنیا چەکی ئەتۆمی ماوە کە پێی قڕمان بکەن، دەنا داگیرکەرانمان هەر چەکێکیان هەبووبێت تاقییان کردووەتەوە، بەڵام لە کیمیایی پتریان نەبوو، دەنا لە ئەتۆمییش دەستیان نەدەپارازت. سەبارەت بە خوێنپاکی و ڕەسەنی، ئەوا هەر لە زووەوە و لە پەنا ئاییندا بەجۆرێک لە جۆرەکان ئەوەمان لەگەڵدا کراوە، خۆ ئەگەر وا نییە و خراپتریش، ئەی دەبێت چی وایکردبێت، کە بەپێی ئایینزای شافعی تا عەرەب وەستابێت، کورد بۆی نەبێت ببێتە دادوەر. نەک هەر ئەوەش، بەڵکو مێژوو شێوێنانیشیان چەندان درۆی نابەجێیان بەرامبەر بنەچە و ڕەسەنمان کردووە، بەشێوەیەک کە یان عەرەبباندوویانین یاخود کردوویانینە تورکە کێویلە و کۆچەری فارس و... تەنانەت گێلکەزابێکی وەکو مەسعوودی ڕەچەڵەکی بردووینەتەوە سەر جنۆکە!!. ئەم بۆچوونە گێلانەیە تائێستاش لەناو داگیرکەرانماندا گوێگر و دەهۆڵکوتی هەن. دیارە (جلال الدین الصغیر)، کە پەرلەمانتارێکی ئاخوندی شیعەی ئێراقی ئەمڕۆیە، یەکێکە لەوانە، کە ئەم هەموو پێشکەوتنە تەکنۆلۆژیایەی جیهانی ئەمڕۆ هێندە کاری تێ نەکردووە، کە ئاوەزی بجووڵێت و لەم ڕۆژگاری کارکردن لە ئەندازەی جینەکاندا، ڕێگری لێ بکات گەوجێتیی وا نەنوێنێت. هەرچی خاڵی سێهەمی (صدیقە عدالتی)یە، کە باس لە لەناوبردنی جینەکانی شارستانی و ڕۆشنبیری دەکات، ئەوا لەگەڵ کورددا بە هەموو شێوەیەک کردوویانە و دواتر بەوردی لەو لایەنە دەدوێین.

دیارە و گومانیشی تێدا نییە، کە ئەمەش مەبەستە شارراوەکەی، وەلانانی زمانی کوردی و ئەوانیتر بوو، چونکە بە نەمانی زمان، پێناسی نەتەوەییش ئەگەر بە تەواوی لەناویش نەچێت، وەک ئەوەی هێندێک خۆشئەندێش بانگەشەی بۆدەکەن، ئەوا بە دڵنیاییەوە پێزی پێوە نامێنێت و سەرەنجام لە

بــۆتەی ئەوانـــدا دەتـــوێتەوە، هەروەک چـــۆن قیبتـــی[٨] و فینیقـــی و ئارامییەکان...تاد[٩] ، بە نەمـانی زمانەکانیـان، خۆشیان وەک نەتەوە بوونیـان نەما و لە بۆتەی عەرەبدا توانەوە. جا ئەو بۆچوونانە لەلایەن عەرەب و تورک و فارسـەوە، یـان لەلایەن بەعەرەببـووانی وەک میسـرییەکان و سـووریاییەکانەوە بێت، هـیچ گرفتێـک نییە، چـونکە ئەوان تواندنەوەی ئـێمە لە نـاو خۆیانـدا بە بەرژەوەنـدیی خۆیـان و خـاک و داهاتوویـان دادەنـێن. دیـارە ئەمەش دیـدی داگیـــرکەران و مامەڵەیـــان لەگەڵ داگیرکراوانـــدا دەردەخـــات، هەروەک چـــۆن ئیسپانییەکان لە سەدەی (١٦)دا، لەگەڵ دۆزینەوە و داگیرکردنی ئیمپراتۆریەتی (ئینکا) لە ئەمەریکای لاتین، کە دانیشتووانەکەی لە هندییەکان بوون، بە چەند زمانێک قسەیان کردووە، کە زمانی ناوخۆیی بوون و زمانی گشـتییش (کیشـوا) بـــووە، کە ســـەر بە هەرێمـــی (کۆزکـــۆ) بـــووە، قســـەی پێکـــراوە، بەڵام بە داگیرکردنیـان و بە لەنـاوچوونی ئیمپراتـۆریەتی ئینکـا، زمـانەکەش لە ئەرکـی سەرەکیی خۆی دابڕا و ئەمەش بواری بۆ دووفاقێتیی زمانی ئیسپانی لەلایەک و زمـانە تایبەتییەکـان، لەلایەکـی تـرەوە ڕەخسـاند. دواتـر کە نەیـانتوانی زمـانی ئیسـپانی بەسـەر دانیشـتووانە ڕەسـەنەکاندا بسـەپێنن، ئیتـر پەنایـان بـردە بەر (کیشوا) کە زمانێکی بڵاو بوو، لەپێناو هێورکردنەوەی ئیمپراتـۆریەتی ئینکـادا. ئەمەش دەستپێکردنەوەی پیـادەکردن و بەکارهێنـانی زمـانە گشـتییەکە بـوو لە قۆناغی یەکەمدا، بەڵام دواتر دەسەڵاتە داگیرکەرەکە، کە مەبەستی ڕاستەقینەی بڵاوکردنەوەی زمانی ئیسـپانی بـوو، بـۆیە بڕیـاری دا شـوێنەواری پێشـینییەکان بسڕێتەوە. بۆ ئەمەش هەر لە مەڵبەندی کـارگێڕی و پەرسـتگە و تەنـانەت چـی گـــۆڕی هنـــدییەکان هەبـــوو، خاپووریـــان کـــردن، هەر بەو شـــێوەش مۆمیـــا و ئامێرەکـانی ئامـار و ژماردنیـان سـووتاندن و سـەمای ئاسایيشـیان لـێ قەدەغە کردن، کەچی لە بەرامبەر ئەمانەدا کتێبی ئایینی مەسیحییان بە زمانی کیشوا و زمانی ئەیمارا، چاپدەکرد[١٠].

بێگومان ئەمەش لەپێناوی ئاییندا نەبووە، بەڵکـو لەپێنـاوی ئەوەدا بـووە، کە لەڕێـگەی ئایینیشـەوە کارئاسـانی بـۆ داگیرکردنـی زمـانی بـکەن. هەروەک زمانەوانی بۆلیڤی (کزافێە ئەلبۆ) لە توێژینەوەیەکیدا، بەو ئەنجـامە گەیشـتووە،

کە لە داهاتوودا زمانی کیشوا بەرەو پاشەکشە دەچێت و لە بەرامبەردا زمانی ئیسپانی دەبێتە زمانی بڵاو[11] . دیارە ئەمەش بۆچوونێکی ڕاستە و هەرواش دەکەوێتەوە. جا لەناوچوونی زمانی قیبتی و ئارامی لە سایەی دەسەڵاتی دەوڵەتی خەلافەت و ئیسلامدا، نموونەی هەلومەرجی لەو چەشنەن.

## چەردەیەک لە هەڕەشەکانی بەردەم زمانی زگماکی کوردی:

نەتەوەی کورد وەک نەتەوەیەکی نیشتمان داگیرکراو لەلایەن عەرەب و فارس و تورکەوە، مێژوویەکی دوورودرێژی لەلایەنی چەوسانەوەی زمانییەوە هەیە، کە بە چەندان ئاڕاستە و شێواز کاری تێکراوە. لەوانەش زمانی ئایین و زمانی دەسەڵات، کە عەرەب بە هەردوو شێوە لەگەڵ نەتەوە موسڵمانەکانی ناعەرەبدا کاری کردووە. فارس و تورکیش لەڕێگەی زمانی دەسەڵاتیانەوە ئەو کارەیان کردووە. بێگومان داگیرکەران بە هەموو چەشنێک هەوڵی سەپاندنی خۆیان دەدەن، جا ئەمە لەڕێگەی پەرتکردنی نەتەوە داگیرکراوەکانەوە بێت، لەلایەنی ئایین و ئایینزاوە، یاخود لەلایەنی زارە جوداجوداکانی زمانی داگیرکراوەوە بێت، ئاکام هەر سستکردنی داگیرکراو و زاڵکردنی زمان و کەلتوور و دەسەڵاتی داگیرکەری لێدەکەوێتەوە. هەر بۆ نموونە، دەوڵەتی تورکیا هەوڵدەدات، جگە لە سەپاندنی زمانی تورکی، بە ئاڕاستەی ئایین و ئایینزا و زارە جوداکانی کوردیش، بۆ مەرامی خۆی بەکاربهێنێت. بۆ نموونە عەلەویبوونی بەشێک لە کوردی تورکیا، بە شوناسێکی جیاواز لە شوناسی کوردبوونیان پیشاندەدات، کە ئەوەش درۆیەکی گەورەیە، چونکە هەروەک ڕۆشنبیرانی خۆیان دەڵێن: "... من یەکەم جار کوردم ئینجا دوای ئەوە عەلەویم"[12] . بێگومان ئەم بۆچوونە ڕوونە، بەڵام ئایا ئێمە پێش ئەوەی قسە لە زار و گۆڤەرەکانمان بکەین، زمانەکەمان کوردی نییە؟!. جا ئەگەر دابڕینمان بەهۆی عەلەویبوون و ئێزدیبوون و شەبەکبوون و ...تاد، لەلایەنی ئایینەوە بە زیانی ئێمە و بەرژەوەندیی داگیرکەران بکەوێتەوە، ئەوا بەبێ هیچ گومانێک پەرتبوونمان بەهۆی زار و گۆڤەر و ناوچە جوداجوداکانمانەوە، هەر بە زیانمان تەواو دەبێت، ئەگەر بیر لە بەرژەوەندیی باڵای نەتەوەکەمان نەکەینەوە. دیارە داگیرکەران

هیچکات بەسەر ئەم لایەنەوە ناچن، ئەگەر لەپێناو خۆیاندا نەیوروژێنن، هەروەک بۆ زمانی کوردی هەبوونی زار کراوەتە دەلاقەیەک، تاوەکو لەڕێگەیەوە زمان و نەتەوەکە پەرت بکرێت، کە ئەمە لای گەلانی پێشکەوتوو نەکراوەتە هۆکار بۆ لێکترازانی نەتەوە. هەر بۆ نموونە شێوە زمانی ئێلڤدالی، کە لە ناوچەی (دالارنا)ی سوید قسەی پێدەکرێت، بۆ ئەو سویدییانەی کە شێوە ستانداردەکە دەزانن، زۆر ئاسانترە کە لە زمانی نۆروێژی یاخود دانیمارکی بگەن، تاوەکو ئەو شێوەیەی زمانەکەی خۆیان، کە بە فەرمی بە دیالێکتێکی سویدیش دانراوە[١٣]، کەچی هیچکام لە خەڵکانی سەر بەو شێوەیە نەهاتوون ئەمە بکەنە بیانوو بۆ خۆدابڕین یاخود سەپاندن، بەڵکو زمانی خوێندن و فەرمییان هەر ئەوەیە، کە سەرجەم سویدییەکان لە بەرامبەر زمانانی تردا، بە زمانی خۆیانی دادەنێن.

جا گرفتی گەورەی ئێمەی کورد، ئەوەیە کە ئێستا خۆمان لەم هەلومەرجەدا، کە تاڕادەیەک لە هەرێمی کوردستاندا سەربەخۆین و لە دەستی ڕاستەوخۆی عەرەب دوورین، کەچی نەمانتوانیوە بەپێی بەرژەوەندیی باڵای نەتەوە، کار بۆ زمانەکەمان بکەین، نەک هەر ئەوە، بەڵکو تائێستاش بە ڕێژەیەکی دیار خەڵکمان هەن، کە منداڵانیان دەنێنە بەر خوێندنی عەرەبی، ئەوانەش کە ئەم کارە ناکەن، ئەوا جۆرە پەتایەکی تر گرتوونی، کە پەتای جیهانگیرییە و لەپاڵ خۆ و زمانی خۆ بەسووکزانیندا، بۆ خوێندن بە منداڵانیان، ڕوو لە خوێندن بە زمانانی بێگانەی تر دەکەن. لەمەشدا هەر لە تورکییەوە بیگرە، تا بە فەرەنسی و ئینگلیزی و...تاد، گرنگ ئەوەیە کوردی نەبێت. خاڵی نابەجێش لەمەدا، بە پلەی یەکەم ئەوەیە، کە ڕێژەیەکی زۆری ئەو باوک و دایکانە، بەرپرسانی دەسەڵاتن لە کوردستاندا و بەدوایاندا دەوڵەمەندان دێن. ئەم دایک و باوکانە تێیاندا هەن، کە هەر لە باخچەی ساوایانەوە منداڵانیان بەم چەشنە گۆشدەکەن. ئەم بەڕێزانە، کار بەوەی باشە، کە نە خۆیان و نە خانمانیان لە زۆر باردا زۆرینەیان، جگە لە زمانی زگماکیان کە کوردییە، زمانی تر نازانن، دەنا لە ماڵەکانیشیاندا نەیاندەهێشت زمانی کوردی بەکاربێت، تاوەکو منداڵانیان بە چاکی زمانە بێگانەکە فێرببن. جا بەدبەختیی کورد

لەوەدایە، کە هۆکارەکـــانی ڕاگەیانـــدنیش لەبـــاتی لە خەمـــی زمانـــدا بـــن، بەپێچەوانەوە بەهۆی بێبەرنامەیییەوە، ئەوانیش بە کار و بەرنامەکانیان هێندەی تـــر زیـــان بە زمـــانی کـــوردی دەگەیەنـــن. هەر بـــۆ نمـــوونە لەو بەرنامـــانەی تەلەفزیۆندا، کە دەکرێت ڕاژە بە زمانی کوردی و نەتەوەکە بکەن، میوانەکانیـان دێـن و تەلەفزیـۆنەکە دەکەنە هۆکـاری بانگەشـە بـۆ هانـدانی خوێنـدن هەر لە بـاخچەی سـاوایانەوە بە زمـانی ئینگلیـزی[١٤]، کە ڕەنـگە ئەو بەرێـزانە خۆیـان لەوکەسانەشبن، کە خاوەنی قوتابخانەی تایبەتبن.

ئێمەی کورد، ئێستا لەم چەشنەمان نەک هەر لە کوردانی تاراوگە زۆرن، بەڵکـو لە کوردانی بەغدا و شـارەکانی تـری ئیراقیشـدا زۆرمـان هەن، کە لە داهـاتوودا ڕێچکەی تواندنەوە لە بـۆتەی عەرەب و نەتەوەکـانی تـردا دەگرنەبەر. دووریـش نییە لە داهاتوودا ئەمانە نەبنە دوژمنـی سەرسـەختی نەتەوەی خۆیـان، چـونکە لەم نموونانەمان لەناو کوردانی بە عەرەببوو و بە فارس و تورکبـوودا هەن. جـا ئەوەی جێگەی سەرنجە ئەوەیە، کە لەناو هەرێمەکەماندا و لەلایەن بەرپرسانەوە بەم چەشـنە مـامەڵە لەگەڵ زمـانی زگمـاک بـۆ ڕۆڵەکانیـان بکرێـت. ئەم کـارە دروست پێچەوانەی ئەو کار و قـانوونە مرۆڤدۆسـتانانەی وڵاتـانی ئەوروپـایە، کە خوێندن بە زمانی زگماک لە بەرنامەکانی خوێندنی بەراییدا، بۆ ڕەوەنـدی کـورد و نەتەوەکانی تر، فەراهەم دەکات.

دیدی دووەم: پێیوایە کە نەک خوێندن بە زمانی بێگانە، بەڵکـو خوێنـدنی زمانی بێگانەش لە پەروەردەی گشتیدا، بەتـایبەت لە قۆنـاغی بەراییـدا، دەبێـتە هۆی پەرتبوونی ڕۆشنبیری و ناسنامەی نەتەوەیی، کە خۆی لە زمـانی زگماکـدا دەبینێـتەوە. هەر لەبەر ئەم گـرنگییەی زمـانی زگمـاکە، کە (نیلسـۆن مانـدێلا) وتـــوویەتی: قســـەکردن لەگەڵ کەســـێکدا بەو زمـــانەی کە تێیـــدەگات، کـارێکە دەکەوێتە بەر ئاوەزی، بەڵام قسە لەگەڵکردنی بە زمانی زگماکی خـۆی، کـارێکە دڵـی دەیگرێـت[١٥]. هەر ئەمەشـە وادەکـات کە شـوێنکەوتووانی دیـدی دووەم، پێیانوابێت، کە زمانی بێگانە لە بۆشاییەوە ناهێت و بخوێندرێت، جـگە لەوەش خوێندنی زمان بەتەنیا وشە و ڕۆنانە ڕستەییەکان نین، بەڵکو هەر زمانە خـۆی لە خۆیدا ئەو دەفرەیە کە ڕۆشنبیری و فەرهەنگی نەتەوەی خاوەنزمان و خوو و

بەهاکانی قسەپێکەرانی ئەو زمانانەشی تێدا هەن. ئەمانەش کاریگەریی زۆریان لە دەروون و ناخی کەسانی فێرکراودا دەبێت. جا ئەمە کاتێک کە شوێنکەوتووانی دیدی یەکەم، بانگەشەی پەرەدان بە فێرکردنی زمانی بێگانە، هەر لە قۆناغی باخچەی ساوایانەوە دەکەن، لە بەرامبەریاندا شوێنکەوتووانی دیدی دووەم، دەخوازن کە خوێندنی زمانی بێگانە وەلابنرێت، یاخود بۆ ساڵەکانی کۆتایی قۆناغی بنەڕەتی دوابخرێت.

هەرچەند ئەم دوو دیدە دژیەکن، ڕەچاوکردنی هەریەکێکیشیان بەبێ گوێدان بە ئەوی تر، کارێکی ئاسان نییە، کەچی ئەوەی تێبینی دەکرێت ئەوەیە، کە فێرکردنی زمانی بێگانە لە قۆناغی بنەڕەتیدا بووەتە کارێکی بڵاو. جا ئەمە چ لە قوتابخانەکانی میریدا بێت یان لە تایبەتەکاندا. لەم چەند دەیەیەی دواییدا گرنگیپێدانی جیهان سەبارەت بە زمانی بێگانە و فێرکردنی منداڵان بێجگە لە زمانی زگماک، لە زۆربووندایە. ئەمەش لە وڵاتانی فرەچەشنە ڕۆشنبیری و فرەزمانیی وەک وڵاتە یەکگرتووەکان و کەنەدا و ئوسترالیادا بە ڕوونی دیارە. دیارە دەوترێت ئەمەش لەپێناوی یەکخستنی زمانی و ڕۆشنبیری و چەسپاندنی سەرەتاکانی دیموکراسی و هاوشانیی هەلی فێربووندایە. ئەم کارانە هەوڵی نەهێشتنی هێندێک لەو گرفتانەشی بەدوای خۆیدا هێنا، کە لە فێرکردنی ڕۆڵەکانی کەمە نەتەوەکاندا دەهاتنە ئاراوە، بەوەی ئەو وڵاتانە ڕەچاوی پرۆگرامی پەروەردەیی تایبەت یان فرەچەشنیی پرۆگرامی خوێندنیان دەکرد، بە ئامانجی مامەڵەکردن لەگەڵ ڕۆڵەکانی گرووپە نەتەوەیییەکاندا. ئەم پرۆگرامانەش دەکرێت، بەم چەشنەی خوارەوە کورت بکرێنەوە:

یەکەم/ پرۆگرامی جووت زمان فێرکردن (Bilingual Education):

بەپێی ئەم پرۆگرامە قوتابی لەیەک کاتدا دوو زمان فێر دەکرێت، بەومەرجەی کە ئەوەی لە ئینگلیزیدا پێیدەدرێت، پلە پلە لەسەر حسابی زمانە زگماکەکەی زیاد بکرێت. دیارە ئەمەش بە ئامانجی بەتواناکردنییەتی لە زمانە ئینگلیزییەکەدا، تاوەکو پلە پلە جێگەی زمانی یەکەمی بگرێتەوە.

دووەم/ پرۆگرامی نغرۆکردن (Immersion Programme):

ئەمەش ئەوەیە، کە هەر لەسەرەتاوە منداڵ بە زمانی ئینگلیزی فێربکرێت و زمانی زگماکی خۆی وەلابنرێت. ئەم نموونەیە لە هێندێک ناوچەی کەنەدادا بڵاوە.

سێهەم/ پرۆگرامی دووەم زمان فێرکردن (Second Language):

لێرەدا منداڵ زمانەکەی خۆی فێردەکرێت، بەڵام لە بەشێک لە ڕۆژی خوێندنەکەیدا زمانی ئینگلیزییش دەخوێنێت. ئەم پرۆگرامە بەڕێگەیەکی ناڕاستەوخۆ زمانی ئینگلیزی لەڕێگەی قوتابخانە و هۆکارەکانی ڕاگەیاندنەوە بڵاودەکاتەوە. ئەمە لەلایەن وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکاوە هاندەدرێت. جا ئەم زمانی دووەمە لە کۆمەڵە فرەزمانەکاندا دەبێتە زمانێک، کە کاتێک گرانیی پێوەندیکردن بە خەڵکان و هەرێمەکانی ترەوە لەئارادا بێت، ئەوا پەنای دەبرێتە بەر، وەک ئەوەی لە هندستان و نێجیریادا هەیە. جا هەر ئەو زمانە دووەمەش لە فەرمانگەکانی میریدا وەک زمانی فەرمی و لە پەروەردە و بازرگانی و بۆنە فەرمییەکاندا، کە سەرجەم هەرێمەکان لەخۆبگرێت، بەکاردێت. دەشبێتە پێویستییەکی ژیان و لێکتێگەیشتنی کۆمەڵایەتی. لەم لایەنەوە زمانی ئینگلیزی بووەتە پێشەنگ و ئەمەش بەهۆی پێشینە داگیرکارییەکانییەوە هاتووەتە ئاراوە[١٦].

کەواتە خوێندن بە زمانانی بێگانە لە قوتابخانە بەراییەکاندا، بەیەک شێوە و ڕێباز نییە، هەربۆیە بۆچوون و لێکۆڵین زۆرن، کە دژی ئەوەن خوێندنی زمانی بێگانە بخرێتە بەرنامەی خوێندنی بەراییەوە. ئەوانە جەختی ئەوە دەکەن، کە ئەم کارە کاریگەریی نەرێنی لە ئاستی فێربوونی زمانی زگماک و پێگەکەی لە قۆناغی منداڵیدا دەبێت، چونکە جووت زمان خوێندن لەو قۆناغەدا بەزۆری لەسەر حسابی زمانی زگماک دەبێت. ئەو نەیارانەی بابەتەکە، لەم بۆچوونەیاندا پشت بە کۆمەڵێک بەڵگە و نیشانە دەبەستن، کە لە زانستی دەروونیی پەروەردەیی و کارکردنی کارەکێتی و هەلومەرجی دارایی و کارگێڕییەوە بۆ فێربوون، سەرچاوە دەگرن.

یەکەم نەیاری فێرکردنی زمانی بێگانە لە قۆناغی بەرایی و تەمەنی منداڵیدا، زانای زمان (مایکل ویست M. West)ە و چەندانی تریش هەن، کە

ئەمـانە پێیـانوایە ئەم کـارە لە قۆنـاغی سـەرەتاییدا، زیـان بە بەرژەوەنـدیی منداڵەکە دەگەیەنێت و لەمـپەر بـۆ گەشـەی بیـری دروسـتدەکات و ڕایـدەگرێت. ئەمانە بەهانەی زۆر بۆ بۆچوونەکانیان دەهێننەوە، لەوانەش:

١- گەوران لە فێربـوونی زمـانی بێگـانەدا لە منـداڵان بەتوانـاترن، چـونکە گەشەکردنی زیرەکی لە تەمەنی (١٥) ساڵیدا دەگاتە چڵەپۆپە و جێگیر دەبێـت تا تەمەنی (٤٠) ساڵی و لەوێوە ئیتر بەرەو خوار دەبێتەوە.

٢- فێربوونی زمانێکی تر، کارێکی زۆر ئاڵۆزە و سەرجەم هێزەکـانی تـاک چ ئاوەزی و چ دەروونی و چ لایەنی سۆز تێیدا هاوبەش دەبن. بێگومان ئەمەش بـۆ منـداڵان کـارێکی پـڕووکێنەیە. لێـرەدا عەرەبەکـان بۆچوونێکیـان هەیە، کە دەڵێت: منـداڵانی عەرەب خۆیـان بەشـێوەیەکی کـارەکی زمـانێکی تـر، جـگە لە زمـانی یەکەم فێردەکـرێن، کە ئەویـش عەرەبیـی سـتاندار (فصـحی)یە، کە بەشێوەیەک لە شێوەکان لە زمـانی منـداڵانیان جیـاوازە. بـۆیە دەڵێـت: واچـاکە زمانی سێهەمیشیان بۆ نەکەینە سەربار.

٣- کاتێکیش کە دەوترێت قۆناغی دایەنگا و باخچەی ساوایان لە (٣-٦) سـاڵییەوەیە، لێـرەدا عەرەبەکـان دەڵـێن: لەم قۆنـاغەدا منـداڵانی ئـێمە زۆر پێویستییان بەوەیە زمانە عەرەبییە ڕەسەنەکەیان بە دروستی فێربن، هەروەهـا ئەو لایەنانەش کە پێوەندییان بە ڕاهێنانەوە هەیە لەلایەنی ماسوولکەکانی زمـان و ژێ دەنگەکانەوە، کە لەسەرەتای گەشەکردنیاندان. جا ئەگەر زمانی بێگانەش فێربکـرێن، ئەوا ئەمە گەشـەی زمـانە عەرەبییەکەیـان دوا دەخـات، چـونکە هەر زمـانە و ڕاهـاتنی دەنگیـی خـۆی هەیە. خـۆ ئەگەر سـەپێنرا، ئەوا منـداڵەکە هیچیانی بەباشی بۆ ناچێتە سەر.

کەواتە کەی منـداڵەکە زمـانە زگمـاکەکەی بەتەواوی و دروسـتی وەرگـرت، ئەوسا ترسی زمانی تری لەسەر نابێت. ئەمـانە بەڵـگەش دەهێنـنەوە بەوەی لە وڵاتانی پێشکەوتووشـدا لە قۆنـاغی بەراییـدا زمـانی نەتەوەیـی بەبـێ زمـانی تـر دەخوێنرێت.

٤- عەرەبەکان دەڵێن: تەنـانەت فێرکردنـی ئینگلیـزی و نووسـینەکەی بـۆ ئەو قۆناغە ڕەنگە کاریگەریی نەرێنی بۆ جووڵەی چاوی منـداڵ هەبێـت، چـونکە

لە نووسینی هەریەک لە عەرەبی و ئینگلیزیدا پێچەوانەی یەکن. واتە ڕاست و چەپ، بۆ دەستکردن بە نووسین جیاوازن.

٥- زمانانی بێگانە وەک یەک کار بەو یەکە دەنگییانە ناکەن، کە لە زمانە عەرەبییەکەدا هەن، هەروەها لە ڕستە و واتاشدا. بێگومان ئەمەش ڕۆڵی نەرێنی سەبارەت بە زمانی زگماک، دەبێت.

٦- کاتی خوازراو بۆ فێرکردنی زمانە بێگانەکە، کار لەکاتی زمانە زگماکەکە دەکات.

٧- دانانی زمانی بێگانە لەو قۆناغەدا و گرنگیپێدانی لەلایەن دایکان و باوکانیشەوە، لەوەدا کە گوایە بەندە بە پاشەڕۆژی باشەوە بۆ مندالآن، وادەکات کە هێندێک باوک و دایک هەر لە باخچەی ساوایانەوە مندالآن بخەنە بەر خوێندنی زمانی بێگانە و ئەمەش مندالآن دەخاتە بەر کاریگەرییە نەرێنییەکانی ڕۆشنبیری و زمانی و سۆزداریی بێگانە.

٨- هێندێک لێکۆڵینی تایبەتمەندیش، دەخوازن لە فێرکردنی زمانی بێگانەدا، کە لەڕێگەی ڕۆشنبیریی ئەو زمانەوە، کە مەبەستە و هەروەها لەڕێگەی ڕۆشنبیریی قسەپێکەرانییەوە بێت. جا ئەمە ئەگەر وابێت ئەوا بۆ مندالٚ بەو ناوەرۆکە ڕۆشنبیرییەی ئەوان، مەترسیی خۆی دەبێت و بەمەش مندالەکە بڕوای بە ڕۆشنبیرییەکەی خۆیان نابێت و لەوانەشە کاریگەری لە ئایین و زمان و ڕۆشنبیرییەکەی خۆی بکات[17] .

بەپێی لێکۆڵینان ئەوە سەلمێنراوە، کە ئەو مندالآنەی پێشوەخت هەلی ڕاهێنانیان لە قوتابخانە بەراییەکان (باخچەی ساوایان)دا بە زمانی زگماک بۆ ڕەخسابێت، ئەوا بەشێوەیەکی چاکتر لە خوێندندا سەرکەوتوو دەبن. ئەمەش خۆی لە خۆیدا دەبێتە پردێک لەنێوان زمانەکە لە قوتابخانە بەراییەکەدا لەگەڵ زمانەکەی مالەوەیدا. هەر ئەمەش وایکردووە، کە بوترێت دەبێت وەزارەتەکانی پەروەردە و خوێندنی بالآ، لە پێوەندیی تەواودا بن و هەولەکانیان لەپێناوی تین و گوڕدانێکی تەواو و لەبار بە بواری فێرکردنی گشتیدا لەڕێگەی پێداگری لەسەر قۆناغی بەرایی، یەکبخەن. ئەمەش لەبەرئەوەیە، کە ئەو قۆناغە گرنگترین قۆناغی ژیانی مندالە. هەربۆیە ولآتانی پێشکەوتوو، بەشێوەیەکی

گونجاو پێداگری لە هەڵبژاردنی مامۆستای ئەو قوتابخانانەدا دەکەن، چونکە هەر لەو قۆناغەدا کەسێتیی منداڵ بنیات دەنرێت. دیارە ئەوەش تەنیا بە مامۆستاکان ناکرێت، بەڵکو دایک و باوکیش دەبێت هاوبەشبن. بێگومان ئەمە پێویستی بە ڕێوشوێن و کەلوپەلی فێرکاری و مامۆستای لەبار و ئاستی ئامادەکراویی دروست و توانای ئاوەزی و دەروونی هەیە، بۆئەوەی بتوانن لەگەڵ منداڵاندا لە کەشێکی خۆشی و خۆشەویستی و سووربوون بۆ بارهێنانی منداڵەکە و فێرکردنی بەپێی چەمکە پەروەردەیییەکان بێت، کە نە توندوتیژی تێدایە و نە کەمتەرخەمییش[١٨] .

گرنگیی زمانی زگماک لەو قۆناغەی تەمەنی منداڵدا وایکردووە، کە لە وڵاتانی وەکو سویددا مامۆستای زمانی زگماک، لەو وڵاتە و لەو ڕۆشنبیرییەوە، کە هی منداڵەکانە، دەستەبەر دەکرێت و هەفتانە بەلای کەمەوە جارێک دەبێت منداڵەکان ببینێت و جگە لە زمانەکە، یارییان لەگەڵدا بکات و گۆرانییان لەگەڵدا بڵێت و چیرۆکیان بە زمانە زگماکەکەیان بۆ بخوێنێتەوە و بگێڕێتەوە ...تاد، هاوکات هەوڵی بەهێزکردنی ناسنامە و پابەندبوونی منداڵەکان پێوەی، بەهێز بکات.

ئەم کارە لە وڵاتێکی وەکو سویددا، شارەوانییەکان دەستەبەری دەکەن و چاودێری دەکەن. بێگومان ئەم کارە تەنیا وەک یارمەتیدانی زمانی زگماکە و بۆ بەخێوکەری منداڵان هیچی تێ ناچێت. لەکوێش پێنج قوتابی هەبن، ئەوا مامۆستای لەباریان بۆ پەیدا دەکرێت، یاخود لەنێوان چەند قوتابخانەیەکدا هاوکاری دەکرێت، تاوەکو ژمارەیەک قوتابی بۆ خوێندنی زمانی زگماک یەکبخرێن و هەلومەرجیان بۆ بڕەخسێنرێت.

وەک وترا، بەپێی قانوونی قوتابخانەکان، شارەوانییەکان بە پێشکەشکردنی هەلی خوێندنی زمانی زگماک، پابەندن. هێندێک جار ئەو وانانەی کە بۆ زمانی زگماک دادەنرێن، وەک وانەی سەربار دەبن و لە سنووری دوو وانەدا، بەدەر لە وانە ئاساییەکان، دەستەبەر دەکرێن. تەنانەت لە قۆناغی ئامادەییشدا قوتابی مافی ئەوەی هەیە، ئەگەر حەزبکات دەتوانێت وەک خولی سەرباری وانە ئاساییەکان، لە خوێندنی زمانە زگماکەکەیدا بەردەوام بێت.

جا هەلومەرجی منداڵیش بەندە بەو هەڵوێستە ئەرێنییەوە، کە دایک و باوک و مامۆستایان بەرامبەر بە زمانی زگماک دەیانبێت. خۆ ئەگەر هێندێک زرە کورد بە نموونە بهێنینەوە، لەوانەی کە لەو تاراوگەیەش دەستی تاوانیان بەرامبەر بە زمانی کوردی هەڵناگرن و هانی دایک و باوکانی کورد دەدەن، کە منداڵانیان بۆ زمانی زگماک بنێرنە بەر عەرەبی و تورکی و فارسی، ئەوا بە دڵنیاییەوە ڕەچاوکردنی ئەو پێشنیازە ناحەزانەیە لەلایەن دایکان و باوکانی کوردەوە، وادەکات کە منداڵانیان نەک هەر لە نەتەوەکەیان داببڕێن، بەڵکو بە کەم و ناشایستەشی بزانن. هاوکات ئەگەر هەوڵبدرێت کەشێکی هاوکاری لەنێوان ماڵ و قوتابخانە و باخچەی ساوایان و دایەنگادا لەپێناوی زمانی زگماکدا بڕەخسێنرێت، ئەوا ئەمە کارێکی زۆر گرنگ و ئاکامێکی باشیشی دەبێت. سەرباری ئەوەش قوتابخانە و مەڵبەندی چاودێریی منداڵان، دەبێت گفتوگۆ لەپێناوی پەرەپێداندا ڕێکبخەن، کە ئەمەش بە زمانی سویدی دەبێت و بەلای کەمیشەوە لە هەر کۆرسێکدا یەکجار دەبێت، کە تێیدا مامۆستا و بەخێوکەر و منداڵەکەش بەشداردەبن، جا ئەوەی کە ئەو زمانی زگماکە دەخوێنێت، ئەوا ڕاهێنەرەکەشی ئامادە دەبێت، بەڵام ئەمە بەواتای ئەوە نییە، کە ڕاهێنەرەکە ڕۆڵی وەرگێڕ ببینێت(١٩) .

گومان لەوەدا نییە، کە بەرنامە و شێوازەکانی پەروەردەی زمانی، یەک چەشن نین، هەر بۆ نموونە ئەو پەروەردە زمانییەی کە زۆربەی وانەکان و چالاکییە قوتابخانەیییەکانی لە فێرکردنی منداڵاندا بە زمانی دووەم دەبێت، بە نغرۆکاری ناودەبرێت. ئامانجی هەر بەرنامەیەکی نغرۆکارییش ئەوەیە، کە منداڵەکان بە ئاستێکی باڵا لە توانا و کارامەیی زارەکی و بیستاری و خوێندنەوە و نووسین، بگەیەنێت. دیارە ئەمەش خۆی لە خۆیدا دوو چەشنی هەن، کە بریتین لە:

١- نغرۆکاریی تەواو:

واتە خوێندنی هەموو بابەتەکانی خوێندن، تەنانەت وەرزش و چالاکییەکانی تریش، هەر بە زمانی دووەم دەبێت. نغرۆکاریی قۆناغی بنەڕەت لە قوتابخانەدا، بەبێ کەڵکوەرگرتن لە زمانی زگماک لە پۆلدا، تا پۆلی دووەم

یان سێهەمی سەرەتایی بەردەوام دەبێت. هاوکات دەتوانێت ڕۆژانە یەک کاتژمێر وەک هەر وانەیەک لە وانەکانی تر، هونەرەکانی زمانی زگماکیش بخوێنرێت. لەگەڵ بەرەوپێشچوونی قوتابییەکەشدا ئاستی کەڵکوەرگرتنی لە زمانە زگماکەکە پتر دەبێت.

بە درێژایی ئەم بەرنامەی نغرۆکارییە، توانا زمانییەکان چ بۆ زمانی دووەم و چ بۆ زمانی زگماک، هەردووکیان بەوردی چاودێری دەکرێن. ڕەنگە قوتابییان لە زمانی زگماکدا کێشەیان هەبێت، بەتایبەت لە لایەنی ڕێنووس و خوێندنەوەیدا (کە لەمانەدا ڕاهێنانیان کەمترە)، بەڵام سەرئەنجام لە تەواوی ئەو وانانەدا، کە لەچاو قسەپێکەرانی یەک زماندا، دواکەوتوون، چارەسەر دەکرێن.

٢- نغرۆکاریی ناتەواو:

ئەمەش ئەوە دەگرێتەوە، کە قوتابی نیوەی ڕۆژێکی خوێندنی قوتابخانەی بە زمانی دووەم و نیوەکەی تر بە زمانی زگماک دەبێت. ئەم چەشنە لەکاتێکی زووی قوتابخانەی سەرەتاییەوە دەستپێدەکات. ئەم بەرنامەیە لە هەر ساڵێکدا لە بەیانییەوە یان لە پاش نیوەڕۆدا دەبێت و ساڵ بە ساڵیش گۆڕانی تێدا دەکرێت.

ئەم جۆرەیان زمانە زگماکەکە، ئاسایی لاوازتر دەبێت لەوجۆرەی، کە هەموو ساڵەکان یەکزمانییە. کاتێکیش کە کارامەیی زمانی دووەمی قوتابییانی ئەم بەرنامەیە بە قوتابییانی هاوتایان لە بەرنامەی نغرۆکاریی تەواو بەراورد دەکرێن، دیسان کۆمەڵی یەکەم ئاستی کەمتریان دەبێت[٢٠]. دیارە ئەوەش هۆی ئەوەیە کە لە بەرنامەی نغرۆکاریدا قوتابییەکان، پتر لە جۆرەکانی تر بەرنامەی خوێندنی زمانییان بە زمانی دووەم دەبێت. هاتنە ئارای ئاکامی باشتر لەم بەرنامانەدا سەرسووڕهێنەر نییە. هەر بەو شێوەیەش ئاستێکی چاکتر لە بەرنامەکانی نغرۆکاریی تەواو، کە هەر لە سەرەتاوە دەستبەکارن، ئەوا بە بەراورد بە قوتابییانی تر، کە بەرنامەیان لە زمانی زگماک و زمانی دووەمدا بەرامبەرە، ئەوا قوتابییانی نغرۆکاریی تەواو، لە زمانی دووەمدا تواناکەیان لە توانای خەڵکانی سەر بە زمانەکە نزیکتر دەبێتەوە [٢١].

## بەشی دووەم
## زمانی زگماک لە ڕوانگەی بەرژەوەندیی نەتەوەیییەوە:

لەم ساڵانەی دواییدا، ڕامیاریی زمانپارێزی ( Language Maintenance) هاتووەتە ناوانەوە و لە هێندێک لە وڵاتاندا کاری بۆ دەکرێت و شتێکی چاکیشە، چونکە هەلومەرجی ئێستای جیهان بە چەشنێکە، کە ئەگەر بیرکردنەوەیەکی وانەبێت، ئەوا ڕەنگە زۆر لە زمانان وەک ئەوانەی پێشوو، کە لەناوچوون، لەناوبچن. جا لە وڵاتێکی وەک ئەمەریکادا زمانی هیندییە سوورەکان و ئیسپانیۆلی و زۆری تریش، لەوەیە لەناوبچن. ئێمەی کوردیش لە زۆر ناوچەدا لەو هەڕەشەیە بە دوور نین. کەواتە ڕامیارییەکی لەو بابەتە لە بەرژەوەندیی نەتەوەی کوردیشدایە. جگە لەمەش یادکردنەوەی ڕۆژی زمانی زگماک (زمانی دایک) دەبێت گرنگیی زۆری پێبدرێت.

دیارە دەبێت بەرچاویشمان ڕوون بێت، لەوەدا کە بەرژەوەندییە نەتەوەیییەکانمان لەکوێدان، بەو ئاراستەیەدا کاربکەین. کارێکی چاکە ئەگەر ئێمە لە ئەزموونی نەتەوە پێشکەوتووەکان و تەنانەت لە ترسیان سەبارەت بە داهاتووی زمانیان، بەئاگابین. هەر بۆنموونە دەکرێت ئاماژە بە فەرەنسەیی زمانەکانی هەرێمی کیبیک لە کەنەدا، بکەین، کە لەلایەنی زمانەوە ترسی زۆریان لە ئایندە هەیە، ئەگەرچی زمانەکەشیان لەگەڵ زمانی ئینگلیزیی بەشەکەی تری کەنەدادا، فەرمین، کەچی لەو (فرە کەلتووری)یەی، کە لە وڵاتەکەدا فەرمییە، دەترسن. دیارە ئەو ترسەیان لەوەوەیە، کە بە پیلانێکی دەزانن، کە ئامانجی لەباربردن و هاڕینی داواکارییە تایبەتییەکانی فرانکۆفۆنییەکان بێت... تەنانەت بیر لەوەش دەکەنەوە، کە ڕێژەی لەدایکبوون لە هەرێمەکەیاندا لە پاشەکشەدایە...[٢٢] لێرەشەوەیە، کە کیبیکییەکان بەردەوام مەیلی جیابوونەوە و سەربەخۆیییان هەیە. کەواتە ئێمەی کورد دەبێت سەبارەت بە زمانی زگماک لەبەر ڕۆشنایی ڕامیارییەکی زمانیی تۆکمەدا و بەپێی پلانێکی دروست قسە لەم بابەتانە بکەین و وا نەکەوێتەوە، کە خۆمان لەناو وشە و زاراوە و گوزارشت و ڕاڤە و گۆشەنیگا جوداوازەکانی لێکدانەوەیاندا، ون بکەین. یاخود لەباتی کەڵکوەرگرتن، بۆمان بە زیان بگەڕێتەوە.

دیارە ئەمەش کاری تاکەکەس نییە، بەڵکو ئەمە بە میری دەکرێت. جا ئێمە لەم پارچەیەی نیشتمانەکەماندا، کە حوکومەتی هەرێممان هەیە، ئەوا دەبێت و پێویستیشە، کە بە بەرنامەیەکی نیشتمانیی کورت مەودا بۆ ئێستا و دوورمەودا بۆ داهاتووی نزیک و دوور، لە پرسی زمان ورد ببێتەوە. خۆ ئەگەر وانەکەین، ئەوا دوور نییە ڕۆژگار لەلایەنی زمانەوە بە زیانمان بسووڕێت و گرێی دەستمان بخرێتە دان و تەنانەت ئەوەش دادمان نەدات و بەرەو پەرتبوون بچین. جا هەروەک چۆمسکیش وتوویەتی: مرۆڤ هەر بۆ ئەوە لەدایک نەبووە، کە ئەندێشە بکات، بەڵکو دەبێت دەستبەکارکردنیش بکات[٢٣].

کەواتە بۆ ئێمەی کورد جێگەی خۆیەتی گەر بپرسین سروشتی ئەو کارکردنانە دەبێت چۆنبن؟ یاخود کارکردنی نزیک مەودا کامەیە و دوورمەودا کامەیە؟. جا ئەوەی ئاشکرایە، ئێمەی کورد، زمانەکەمان وەک هەر زمانێک لە چەندان زار و گۆڤەر پێکهاتووە و نەتەوەکەشمان لەم پارچەیەدا نەبێت، ئەوا ڕەوشی زمانی زگماک، بۆمان لەلایەنی ئەو مافەوە، کە قانوونە ئاسمانی و مرۆییەکانیش سەلماندوویانە، ڕەچاوکردنی نییە. لەو پارچەیەشدا، کە خۆمان خۆمان بەڕێوەدەبەین، ئەگەر هۆشیارانە مامەڵە نەکەین، ئەوا ڕەنگە کار بە ئاڕاستەی تردا بکەوێتەوە. هەر بۆنموونە ئەگەر لە زاراوەکانی زمانی زگماک (Mothertonge) و زمانی نەتەوەیی (Native Language) و زمانی نیشتمانی (National Language) و...تاد و لێکدانەوە جیاوازەکانیان بڕوانین، ئەوا کێشە و بەرەی زۆریان لێدەکەوێتەوە.

خۆ ئەگەر لەپێناوی بەرچاوڕوونیدا لەم لایەنەوە لە زمانی عەرەبی بڕوانین، کە عەرەب زۆر زیاتر لە ژمارەی دەوڵەتەکانیان، زار و گۆڤەریان هەن، کە تێیاندایە، ئەگەر بەیەک بگەن پێناچێت لێکتێگەیشتنیان ئاسان بێت، هەموو تاکێکی عەرەبی خوێندەواریش ئەو ڕاستییە دەزانن، هەر ئەمەشە وایکردووە، کە دراما و نواندنەکانی مەڕاکیش و جەزائیر، کە بە زاری خۆیانن، وەک وەرگێڕراو، دەبێت ژێرنووسیان لەگەڵدا بنووسرێت، کە ئەمەش بێگومان بە ستانداردە عەرەبییەکە دەبێت، تاوەکو لە وڵاتانی تری عەرەب، لێی تێبگەن.

لێرەدا پرسەکە ئەوەیە ئایا ئەمانە زمانی زگماک لەلایان چییە؟ ئایا ئەوەی کە عەرەب (فصحى)ی پێدەڵێن، ئەوە زمانی زگماک دەبێت یان زمانی نەتەوەیی، یاخود زمانی دووەم. دیارە ئێمە لێرەدا کارمان بەوەوە نییە، کە زۆرێک لەو وڵاتانەی کە ئێستا خەڵکەکەی بە عەرەب ناودەبرێن، عەرەب نین، بەڵکو تەنیا مەبەستمان بەرچاوڕوونییە بۆ زمانەکەی خۆمان. کەواتە ڕەوایە ئەگەر بڵێین: ئەرێ دەبێت کەسێکی سلێمانی و هەورامانی و دهۆکی و کرماشانی، چۆن لە زمانی زگماک بدوێن؟ ئایا ئەوەیە کە هەریەکەمان لە دایکمانەوە فێری بووین؟ یان ئەوەیە کە کۆی ئێمە بە زمانی نەتەوەکەمانی ناودەبەین؟ و هەر ئەو زمانەشە کە تاڕادەیەکی زۆر کەلتووری نەتەوەکەمانی تێدا پارێزراوە. وەک ئەوەی ئەدوارد ساپیر، وتوویەتی: "گشت وشەکانی زمانێک ڕەشنووسێکی ئاڵۆزن لە هزر و بیرۆکە و ئەو حەز و پیشانەی کە سەرنجی ئەو گەلەیان بەرەو لای خۆیان ڕاکێشاوە..."[٢٤] کە ئەمەش ڕاستییەکی زۆری تێدایە و زمانی کوردی، بە هەر زارێک بێت، ئەوا هزر و بیر و حەز و پیشە و...تاد، کوردیی تێدا تۆمار کراوە و سنووری جیاوازییەکانمان لە سنووری زار تێناپەڕن، هەرچەندە هێندێک قەبەی دەکەن، وەک ئەوەی کە ( Mac Giolla Chriost) دەڵێت: جیاوازیی نێوان زارە کوردییەکان هێندە زۆرن، کە لە جیاوازیی نێوان چەندان زمانی سەربەخۆ دەچن[٢٥] . بێگومان هەرگیز ئەم بۆچوونانە ناتوانن کاریگەرییان بەرامبەر ئەو هەستی یەکبوونە نەتەوەییەی کورددا هەبێت. جا هەر ئەمەشە، کە لە کۆنەوە مرۆڤی کوردی وا لێکردووە، کە بە هەر زارێک دوابێت، گەر لێی پرسرابێت بە چ زمانێک قسە دەکات، لە وەڵامدا وتوویەتی کوردییە. خۆ ئەگەر وترابێت زمانی زگماکت چییە، دیسان هەر کوردیی وتووە.

ئێستا با بە گریمانە وا دابنێین، کە سەرجەم گەلی کورد ڕزگار دەبین و هەلی ئەوەمان بۆ هەڵدەکەوێت بە زمانی زگماک بخوێنین و چالاکیی فەرمی بنووێنین، ئایا لەم بارەدا هەر شار و شارۆچکەیەکمان یان هەر گوند و ناوچەیەکمان بەشێوەی خۆی ئەو کارە ناکات؟ ئایا ئەگەر وابێت ئەمە لە دوورمەودادا دەبێتە مایەی لێک نزیکخستنەوەمان یان بەپێچەوانەوە؟ یاخود ئایا

هیچ نەتەوەیەک هەیە، کە ئەزموونێکی وای هەبووبێت؟. خۆ ئەگەر بە پێودانگی کەڵک و زیان لەو کارە بڕوانین، ئەوا دەبێت بپرسین ئایا ئێمەی کورد لەوەها هەلومەرجێک سوودمەند دەبین یان بەپێچەوانەوە؟. سەرجەم ئەمانە و پرسگەلێکی زۆر و زەبەند لەم بارەیەوە خۆ قوت دەکەنەوە، کە ئەگەر ڕامیاریی زمانیمان نەبێت و هۆشیارانە و بەپێی ستراتیژێکی لەبار کارنەکەین، ئەوا دەشێت لە هەلومەرجێکی وادا نەتەوەکەمان، کە بە پلەی یەکەم زمانەکەی هێشتوویەتییەوە، ئەوا ئەم جارە زمانەکە ببێتە هۆی پەرتکردن و لێکدابڕانمان.

ئێمەی کورد، کە نیشتمانەکەمان پارچەپارچە کراوە و ماکی ئەم پارچەپارچەکردنەش لە زۆر لاوە خودی نەتەوەکە و زمان و ئابووری و هێندێک جار ئایین و ئایینزایشمانی لێکدابڕیوە و هەموو ئەمانەش بە زیانی نەتەوە و بە کەڵکی داگیرکەران، گەڕاون. جا ئەوەی کە بابەتی لێکۆڵینەکەمانە، زمانەکەیە، کە هەروەک پێشتریش لێی دواین، گرنگترین پایەی نەتەوەییمانە. هەربۆیە داگیرکەران پێداگری زۆریان لە سستکردن و لێکدابڕین و پەراوێزخستنیدا کردووە و بەردەوامیشن، بەڵام خۆشبەختانە لەم سەدەیەدا هۆکارەکانی پێوەندیکردن بەجۆرێکن، کە دوژمنان چیتر نەتوانن ئەم کارەیان وەک جاران بەئاسانی بۆ بچێتە سەر، بە مەرجێک خۆمان بتوانین ئەو هۆکارانە بۆ بەرژەوەندیی زمان و نەتەوەمان بەکاربببەین. دیارە و ئاشکرایشە هەر کاتێک قسەپێکەرانی زمانێک لێکدابـبڕێن، جا ئەو دابڕانە بە هەر هۆیەکەوە بێت، ئەوا بۆ مەودای دوور گۆڕانکاریی زمانی لێدەکەوێتەوە. خۆ ئەگەر دابڕانەکە زۆر بخایەنێت، ئەوا گەشەکردنی هەر بەشێکی دابڕاو، بە جودا لە بەشەکانی تر دەبێت و ئاکام وا دەکەوێتەوە، کە ئەو بەشە لێکدابڕاوانەی زمانەکە، وەک چەند گۆڤەرێکی زمانەکە ڕەچاو بکرێن. جا بە درێژخایاندنی دابڕانەکە، دەشێت ئەو گۆڤەرانە لە سنووری گۆڤەریش بترازێن و وەک چەند زارێکی جودای یەک زمان بنوێنن.

بۆیە کاتێک کە زانایەکی وەک (جولیا ئێس فالک)، دەڵێت: "زۆرێک لەو خالانەی کە جیاوازی لەنێوان زارێکی ستاندارد و زارێکی ناستانداردا دەخەنەوە، تاڕادەیەک ئەو گرنگییەیان نییە، بەڵام هەندێک لەو جیاوازییانە

دروست پێوەندییان بە نەبوونی پێوەندیی بەردەوام بەیەکەوە، هەبووە"[٢٦] .
کەواتە دابڕانی پێوەندیی قسەپێکەرانی زمانەکە لەگەڵ یەکدا، دابڕانی زمانەکەیانی لێدەکەوێتەوە و ئەمەش ڕووبەری خاڵە جیاوازەکانی نێوانیان زۆرتر دەکات. جا ئەگەر قوتابخانەش هەبێت، کە لە زۆر باردا بۆ نەتەوەی داگیرکراوی وەک ئێمەی کورد، ئەوا بە زمانی داگیرکەران دەبێت. ئەمەش هێندەی تر ڕووبەری جیاوازییەکانی نێوان خەڵکە دابڕێنراوەکە زۆرتر دەکات، چونکە لە بنەچەدا داگیرکەر نەک هەر دابڕینی نەتەوە داگیرکراوەکەی لە پارچەکانی تریان مەبەستە، بەڵکو لەکارخستنی زمانەکەشی مەبەستە، چونکە ئەمەش ڕێخۆشکەری بۆ تواندنەوەی نەتەوەکە دەکات.

بێگومان هاتنە ئارای زار و گۆڤەریش لە زماندا، بەهۆی دابڕانەوە دێنە ئاراوە، دەنا هەروەک سەلاح سەعدوڵڵا، دەڵێت: "زاری ڕەواندز کە دەکەوێتە نێوان زاری کرمانجیی ژوور و خوارووەوە، لە زارێکی هاوبەشی نێوانیان دەچێت.. جا هاتنە ئارای زارەکان بەهۆی دابڕانیانەوە دەبێت، بە پێکگەیشتنیشیان بەیەکتر کاریگەر دەبن و کاتێکیش کۆتی دابڕان بشکێنرێت، ئەودەم ئاسایی و پلەپلە زارەکان نامێنن و زارێک جێگەی پێشەنگ لە کۆمەڵدا دەگرێت و باڵ بەسەر زارەکانی تردا دەکێشێت و دەبێتە زمان. واتە لە زمانی ناوچەیەکی نەتەوەکەوە دەبێتە زمانی سەرجەم نەتەوەکە. واتە زمانی نەتەوەیی زمانی ئەدەبیی "یەکگرتوو" و زمانی فەرمی...تاد"[٢٧] . بێگومان ئەو قسانە گومان هەڵنەگرن و بۆ هەر زمانێکیش هەروا دەکەوێتەوە.

لە جێگەیەکی تردا، هەر سەلاح سەعدوڵڵا، دەڵێت: "... زارەکان پەرە ناسێنن و نابنە زمانی نەتەوەیی، تا ئەوکاتەی کە کۆلۆنییەکان و میرگەکان بەرەو قەوارەیەکی نەتەوەیی پەرە نەسێنن"[٢٨] . کەواتە ئەگەر هەر پارچەیەک و هەر ناوچەیەک خۆبەخۆی خۆی لەلایەنی زمانەوە کاربکات، ئەوا نە قەوارەی نەتەوەیی دروستدەبێت و نە زمانی ناوکۆییشمان دەبێت. جا ئەگەر لە هەلومەرجی ئێستای جیهان و تەکنۆلۆژیای نوێدا، بەپێی وتەکەی جان هاڵت (John Holt) کاربکەین، کە دەڵێت: "چی دیکە ناتوانین بەوە قایلبین، کە فێرکردن یەکسانە لەگەڵ قوتابخانەدا، دەبێت ئەم ڕوانگەیە بگۆڕین و بەرەو

هەمەلایەنەکردنی فێرکردن و پێکهێنانی پێوەندییەکی سازێنە لەنێوان قوتابخانە و دامەزراوە کۆمەڵایەتییەکانی دیکەدا، برۆین"[٢٩] . کەواتە بۆ ئێستای جیهان، دەکرێت فێرکردن لەڕێگەی پێوەندیی نێوان قوتابخانە و دامەزراوەکانی تریشەوە بێت، ئەگەر خواست بۆ ئەوە لەئارادا بێت، هەروەک چۆن کوردانی ڕۆژهەڵات لە هێندێک قۆناغدا، پارتەکانیان و تەنانەت هێندێک لە دڵسۆزانی سەربەخۆش، خولی فێرکردنی زمانی کوردی دەکەنەوە و هێندێکیش لەڕێگەی (سی دی) و ئێستاش لەڕێگەی ئینتەرنێتەوە لە پێوەندیدان. کەواتە کاتێک کە داگیرکەران نەیانەوێت یاخود بەربەست بۆ ئەو جۆرە پێوەندییانە دروستبکەن، ئەوا تەکنۆلۆژیای نوێ دەکرێت ئەو بەربەستە بشکێنێت و بەشێوەیەکی تۆکمە هەلی پێوەندیی برەخسێنێت.

کەواتە، بۆ ئێمەی کورد، کە ڕێژەیەکی زۆری نەتەوەکەمان لە هەر کام لەو پارچانەی کوردستاندا، جگە لە هەرێمی کوردستان، تێیاندا خوێندن بە زمانی کوردی لە ئارادا نییە، یاخود خۆیشیان ڕێژەیەکیان زمانی کوردییان لەدەستداوە و تەنیا تورکی یان عەرەبی یاخود فارسی دەزانن، ئەوا بۆ ئەمانە ئەگەر خواستیان هەبێت و هەستی نەتەوەییان لەدەست نەدابێت، دەتوانن لەڕێگەی بەرنامەی فێرکاریی تایبەتەوە فێربکرێنەوە، بەشێوەیەک کە لە بەرنامەی هەر پارچەیەک لە پارچەکانی کوردستاندا، ڕەچاوی تایبەتمەندێتیی خۆی بکرێت. واتە کارئاسانی بکرێت، چونکە ئامانج لەمەدا تەنیا ئەوەیە... کە بتوانن بە زمانی کوردی بدوێن و دواتر لە قۆناغی باڵاتردا خوێندنەوە و نووسینی کوردی فێربکرێن. بێگومان دەکرێت ئەم کارە لەڕێگەی کتێبی تایبەت و (سی دی) وە بێت، یاخود لەڕێگەی ئینتەرنێت و تەنانەت کەناڵە تەلەفزیۆنییە ئاسمانییەکانیشەوە، بکرێت. لە هەموو بارێکیشدا دەبێت ئەم بەرنامانە کەسانی پسپۆڕ و دەستگای تایبەتمەند دایبنێن و بە کەڵکوەرگرتن لە توانای پسپۆڕانی بواری فێرکردنی زمانیی وەک ئەوەی، کە بۆ زمانی ئینگلیزی لە جیهاندا لەئارادایە.

ئەوەی لێی دواین قسەکردنە لەو گەورانەی کە زمانی زگماکی خۆیان واتە زمانی کوردییان لەدەستداوە، بەڵام خواستی فێربوونیان هەیە، کە ئەمەش وەک

وتـرا پـاڵنەرەکەی دەبێـت بزوانـدنی هەسـتی نەتەوەیـی بێـت، دیـارە ئەمەش جـۆرێکی تـر لە کـارکردنی پێویسـتە. ئەمە دروسـت لەگەڵ بۆچـوونی ئەو کـچە کوردەی باکووری کوردستاندا، کە لە تاراوگە لە هۆڵەندادا گەورە بووە، دێتەوە، کە دەڵێـت: "کوردبـوون وشـیارییەکی سیاسـییە، کە دواتـر دەبێـتە شوناسـێکی کولتووری..."[(٣٠)] . کەواتە ئەگەر ئەو هۆشیارکردنەوەیە نەبێت، ئەوا مەرج نیـیە ئەو کـوردانەی کەوتـوونەتە ژێـر کـاریگەری و گوشـارە جۆراوجۆرەکـانی زمـان و کەلتووری گەلانی تـرەوە، لەدوای چەنـد نەوەیەک، بە زۆری لە کـورد دانەبـڕێن. جا هەروەک ئەو کچە دەڵێت: "... ئـێمە نـاتوانین بەر بە لەدەسـتدان و دۆڕانـی کەلتووری خۆمان لە هۆڵەندادا بگرین. نـاتوانین بە هـیچ شـێوەیەک چارەسـەری بکەیـن. مـن خـۆم کـوردی نـازانم، ئەوە مانـای ئەوەیە کە منداڵەکەشـم فێـری نابێت"[(٣١)] .

ئەمە بۆ ئێمەی کورد ڕاستە، بەڵام بۆ ئەو نەتەوانەی کە ئاستی شانازییان بە زمـان و کەلتـووری خۆیـانەوە باڵابێـت، جیـاوازە. بێگومـان ئەو ئاسـتەش لە بۆشـاییەوە نایێـت، بەڵکـو نەتەوە و ڕێکخـراو و دەسـەڵاتەکانیان لە وڵاتـانی خۆیانـدا فەرامۆشـیان نـاکەن و ئەمەش وادەکـات دانەبـڕێن. دیسـان لێرەشـدا هۆشیاری و ڕامیاری و پـلان، ڕۆڵیـان لەو لایەنەوە دەبێـت. هاوکـات لـێگەڕان و بیر لێنەکردنەوەشی دابڕان و تواندنەوە و ونبوون بەدوای خۆیدا دەهێنێت.

**هەڵوێستی حکوومەتی هەرێمی کوردستان سەبارەت بە زمانی زگماک:**

ئاشکرایە، کە ڕێبەرانی ئەم هەرێمە، بەرپرسێتیی مێژووییـان لەلایەنـی زمانەوە لەسەرشانە. ڕەچاونەکردنی ئەم بەرپرسێتییە، ساڵ دوای ساڵ گرفتەکە ئـاڵۆزتر و کاریگەرییەکـانی زیـانی گەورەتریـان لێـدەکەوێتەوە. کەواتە گرفتـی هەنـووکەیی ئـێمەی کـورد، لەم پـارچەیەی کوردسـتاندا، کە خۆمـان خـۆ بەڕێوەدەبەین، لەوەدایە کە لەلایەنی زمانەوە بەگشتی و لەلایەنی زمـانی زگمـاک و پەروەردە و فێرکـردنەوە بەتـایبەتی، بەجۆرێـک لە جۆرەکـان لەبـاتی ڕەچاوکردنی ڕامیاریی زمانی و پلانی ستراتیژی بۆ زمـان، کەچـی ئەم دۆزەمـان داوەتە دەست ڕێکەوت و بێبەرنـامەیی. ئەمەش جـگە لە پاشـاگەردانی، شـتێکی

تری لێ چاوەڕوان ناکرێت، چونکە ئەگەر چەند ساڵێک لەمەوبەر تەنیا ترسمان لە پاشاگەردانیی ڕاگەیاندن و بڵاوکراوەکانمان هەبووبێت، ئەوا ئەمڕۆ خوێندن و پەروەردەشی هاتە سەر، کە نەتوانێت بەرگری لە زمانی خوێندن لە قوتابخانەکانیدا بکات و ملکەچی بێبەرنامەیی و بێسەروبەری نەبێت و بتوانێت پێناسەی زمانی زگماک بەو چەشنە بکات و ڕەچاوی بکات، کە نەتەوە و وڵاتانی خاوەن قەوارەی ڕامیاریی چەسپاو، کردوویانە. جا هەروەک (باختین) وتوویەتی: سەرکەوتنی زارێک لەناو زارەکانی تردا، بەکۆیلەکردنی ئەوانی تر نییە، بەڵکو ئەمە یەکگرتوویی ڕاستەقینە پیشاندەدات و هاوکات پێداویستییەکی مێژووییشە [٣٢] . ئێمە ئەگەر لەم قسەیەی باختین وردببینەوە، ئەوا ڕاستیی ئەوەمان لە زمانی خوێندنی کوردیی دوای حەفتاکانی سەدەی پێشووی باشووری کوردستانماندا بۆ دەردەکەوێت، چونکە لەگەڵ کەموکورتییەکانیشیدا، بەڵام خوێندن و زمانی خوێندنمان یەکگرتوو بوو، کەچی لەباتی ئەوەی لە سەردەمی حکوومەتی هەرێمی کوردستاندا هەوڵی نەهێشتنی کەلێنەکانی بدرێت، بەپێچەوانەوە، گەڕاینەوە بالۆرە نەسازەکەی "ئۆخەی ئۆخەی هەرکەس بۆخۆی". بەشێوەیەک کار بەو ئاستە گەیشتووە، کە زار و گۆڤەرەکانی زمانەکە، بانگەشەکەری خوێندن بە زار و گۆڤەری خۆیانیان تێدا هەڵتۆقیون و بەپێی ئەو وتە کۆنەی، کە وتراوە: (ئەگەر لەکین گشت چوونیەکین) کاردەکەن و بێگومان هاندەری ناوخۆ و دەرەکییشی بۆ ئەم بابەتە هەن و ئاکامەکەشی وەک ڕۆژ ڕووناکە، کە لە پەرتبوون بەولاوە ئاکامێکی بۆ بەرژەوەندیی نەتەوەیی نییە و نابێت. جا ئەگەر کورد بەم بێبەرنامەییە بەردەوام بێت، ئەوا هەروەک (دکتۆر محمود السعران)، دەڵێت: لە ژیانی زماندا دوو ئاڕاستە هەن، یەکێکیان بەرەو دابەشبوونە بۆ زار و زمانی تر، دووەمیان بەرەو یەکگرتنی فراوانترە. هەردووکیشیان کاری ئەو ڕووداوانەن، کە کار لە کۆمەڵان دەکەن. هێندێک لە زمانەوانان وایدەبینن، کە ئاڕاستەی دابەشبوون لە یەکگرتنەکە بەهێزترە، جا ئەو ئاڕاستەیەی یەکەم، کاری پەرەسەندنی سروشتیی زمانە. لەو زمانەوانانەش کە ئەو بۆچوونەی هەیە، (ویڵد)ە، کە

دەڵێت: ئاراستەی زمـان بەرەو "جۆراوجـۆریی نەبـڕاوەیە" ئەو زمانەوانـانە، ئەوە بە بەڵگە دەهێننەوە، کە زمانێکی گشتی نەبووە، کە بەش نەبووبێت[٣٣].

ئەو بۆچوونانەی سەعران و ویڵدیش ڕاستن، بەڵام دەبێـت ئەوەش بـزانین، کە هەر کەسان و دامەزراو و دەسەڵاتەکانی ناو کۆمەڵیشن، کە ڕامیاریی زمان و پلانـی سـتراتیژیی زمـان دادەڕێـژن و وادەکەن، کە زمـان بەپێـی ئەو پلانـانە و بەگـوێرەی بەرژەوەنـدیی نەتەوەکە وەگەڕبـخەن. دیـارە زمـانیش بەنـدە بە بەکارهێنـانییەوە، تەنـانەت پەرەسـەندنی هەر زمـانێکیش خـۆی لە خۆیـدا بـۆ چۆنییەتی ڕەچاوکردن و بەکارهێنانی لەلایەن نەتەوەکەوە دەگەڕێـتەوە. ئەمەش ڕێک لەگەڵ بۆچوونێکی تـری سـەعراندا دێـتەوە، کە دەڵێـت: هەر زمانێـک وەک ئەوەی، کە پێڕەوێکـی هێمـایی خـورتییە و لەسـەری ڕێککەوتـووین، بـوونی نامێنێـت، ئەگەر کۆمەڵێـک لە کـۆمەڵان بەکـاری نەهێنێـت[٣٤]. کەواتە پەرەسـەندنی تەواوی زمـانی کـوردییش، ئەگەر لەلایەن تەواوی نەتەوەکەوە بەکاربێت جیاوازە لەوەی کە هەریەکە و زار و گۆڤەرێک بـۆ خوێنـدن و نووسـین بەکاربیات. هەر تاکێکیش سەر بە هەر زمان و زارێکیش بێت، ئەوا فێربوونی بۆ زمانەکەی شتێک نییە، کە بە سرووش پێیگەیشتبێت، یـاخود داهێنـانی خـۆی بێت، بەڵکو لەڕێگەی فێربوونی دووروودرێژ و گرانەوە لە ساڵانی یەکەمی منداڵیدا فێری دەبێت و بەردەوامیش ڕاستکردنەوە و هەمووارکردن دەکات، تـا ئەو ڕۆژەی لە ژیان دەردەچێت. سەعرانیش هەروا دەڵێت[٣٥] . کەواتە فێربوون بەتایبەت لە قوتابخـانەدا سروشـتی فێرکـردنەکە دەیگۆڕێـت، دەنـا مـرۆڤ لەگەڵ چـوونە قوتابخانەشدا مەرج نییە ئەو زار و گۆڤەرەی، کە لە خێزاندا قسەی پێدەکات بە دروستی بیزانێت، بەڵکو هەنگـاو هەنگـاو فێـری دەبێـت و بەخۆیـدا دێـت. بـۆیە ئەگەر خوێندنەکەی بە زمانی زگماک واتە بە زمانی سەرتاسـەریی نەتەوەکەشـی بێت، ئەوا هەر بە فێربوون پێیدەگات و لەمەشدا تۆکمەیی بەرنامە فێرکـارییەکە و هاوکاریی خێزان، مەرجی سەرکەوتنی کارەکەن.

ئاشـکرایە، کە زمـانپژانی مـرۆڤ لە دوای نزیکبـوونەوە لە کۆتـایی سـاڵی یەکەمی تەمەنی منداڵدا، دەستپێدەکات جا ئەمەش بە دەربڕینی چەند دەنگێکی کەم دەبێـت، کە لە ژیـنگەکەی خۆیـدا دەیانبیسـتێت. جـێگەی خـۆیەتی بڵێـین

بەپێی لێکۆڵینە زانستییەکان ئەوە دەرکەوتووە، کە منداڵ لە قۆناغی پسییشدا (جنین) بەدەنگەوەهاتنی لە قۆناغێکی دیاریکراودا، کە لە سکی دایکدایە، هەیە و تەنانەت دەوترێت، کە دەنگی دایکی دەناسێتەوە. هێندێک دەڵێن تەنانەت پسەکە ئەو ئاوازەی زمانەش، کە ئەو لە ژینگەکەیدایە، دەناسێتەوە. واتە منداڵی کورد یان هەر نەتەوەیەک، ئەگەر دایکەکە بچێتە ناو کەسانی سەر بە زمانێکی ترەوە، ئەوا بەو بەرکەوتنە دەنگییانەدا دەزانێت، کە گۆڕانێک ڕوویداوە.

جا منداڵ بەرەبەرە بەدوای زمانپژانەکەیدا هێدی هێدی کەرەستەی دەنگیی یەک برگەیی دەردەبڕێت و دواتر بەپێی هەڵکشانی تەمەنی، ئەم کەرەستە دەنگییانە وەک فرەواتایەک دەردەبڕێت، چونکە لە سەرەتادا تەنیا گڕوگاڵە و جۆرێکە لە یاریکردن بە ئەندامەکانی دەنگدەربڕین و گوێ لێگرتنەوەیان. واتە لە قۆناغێکدا ئەو جۆرە دەنگە دەربڕاوانە هیچ پێوەندییەکیان بە واتاوە نییە. دیارە ئەمە بەو واتایە نییە، کە هێندێک لە زاناکان دەڵێن تەنانەت منداڵ لەدوای لەدایکبوون، شێوازەکانی گریانی جودان و هەریەکەیان گوزارشتە لە خواستێکی منداڵەکە[٣٦] . بۆنموونە دەوترێت کە یەکێک لە گریانەکانی ئەوەیە کە ئازارێکی هەیە، یەکێکیان ئەوەیە، کە خۆی پیس کردووە و ئەمەش بێزاری دەکات، بۆیە دەخوازێت پاک بکرێتەوە. یەکێکی تریان ئەوەیە، کە دەخوازێت دایکی لێی دوورنەکەوێتەوە، یاخود بگەڕێتەوە لای...تاد. بێگومان ئەوانەی باسکران پێوەندیی ڕاستەوخۆیان بە بابەتەکەوە نییە، تەنیا هێندە نەبێت، کە جەختی پابەندبوون و ئاوێتەبوونی مرۆڤ و زمان دەکات، لە هەر ساتەوەختێکی ژیاندا بێت.

کەواتە وەک پێشتر لێی دواین زمانپژان وەک دیاردەیەکی مرۆیی گشتی، لە دەوروبەری ساڵی یەکەمی تەمەنەوە، بەجۆرێک لە جۆرەکان دەستپێدەکات، دواتر لەگەڵ هەڵکشانی تەمەندا پەرە دەسێنێت. جا کاتێک کە لە زمانی کوردیدا پێیدەوترێت زمانی زگماک، ئەوا ڕەنگە بە باشترین شێوە گوزارشتی لەو زمانە کردبێت، چونکە هەروەک پێشتر لێی دواین، منداڵ هەر لەپێش لەدایکبوونەوە، واتە هێشتا نەهاتووەتە جیهانەوە هێندێک ئاشنایی و کارامەیی

زمانەکەی وەک بۆماوە لەگەڵدایە. دیارە ئەمە بۆیە دەخەمەڕوو، چونکە زۆرێک لە نەتەوەکان (زمانی دایک)ی پێدەڵێن، بەڵام پێدەچێت وشەی زگماک چاکتر گوزارشت لەو زمانە بکات. جا منداڵ بەرە بەرە فەرهەنگەکەی فراوان دەبێت و توانای بەکارهێنانی وشە و زاراوەکانی گەشە دەکات. ساڵ بەساڵ ئەم توانایە لە بەرەودا دەبێت و خواستی فراوانکردنی فەرهەنگ و بەکارهێنانی زمانیش، خواستێکی سروشتی و خۆڕسکە و مرۆڤ ئاسایی لە هەوڵی بەدەستهێنانی زیاتر و زیاتردا دەبێت، بۆئەوەی لەگەڵ توانای قۆناغەکانی لەخۆی بالاَتردا یەکسان بێت. هەرئەوەشە، وای لێدەکات، کە پتر چوست و چالاک بێت لەو ژینگەیەدا کە تێیدا دەژیێت. هەرئەمەش تواناکانی لە بەدەستهێنانی زانیاری لەرێگەی وتوویژ و خوێندنەوە، پتر دەکات[٣٧] .

دواتریش لەگەڵ هەڵکشانی تەمەندا، کاری فێرکاریی فەرمی و نافەرمی، رۆڵیان لە پەرەسەندنی ئەو توانایانەدا، دەبێت. جا ئەگەر ئەم توانا فەرمی و نافەرمییانە، بەپێی بەرنامەیەکی تۆکمەی زانستی و لەپێناوی بەرژەوەندیی باڵای نەتەوەدابن، ئەوا دەکرێت زمان ملکەچی ئەو بیرکردنەوەیە بێت، کە لە خزمەتی نەتەوەکەدایە. دیارە ئەمەش کۆکە لەگەڵ وتەیەکی پیاژەدا، کە: "زانیاری بە لەپێش دەزانێت و زمان بە ملکەچی بیر دادەنێت..."[٣٨] خۆ ئەگەر زمان ملکەچی بیر بوو، ئەوا دەبێت بیرکردنەوەی لەبار سەبارەت بە زمان هەبێت، تاوەکو زمان بە ئاڕاستەی مەبەستی ویستراودا ببرێت، پێچەوانەکەشی هەر پێچەوانەی لێدەکەوێتەوە. بۆنموونە لە ئێستای هەرێمی کوردستاندا، کە رێگە بە خوێندن بە دوو زار دراوە، ئەمەش رووبەری جیاوازییەکان فراوان دەکات و ئاکام هەروەک (Fishman) بۆی چووە، ئەگەر جیاوازییەکان چارەسەرێکی ریشەییان بۆنەکرێت، ئەوا نەتەوەکە بەرەو دابڕان دەبەن[٣٩] . هەروایشە، چونکە ئەوە لەناو زار و گۆڤەرەکانی تریشدا، وەک پێشتر ئاماژەمان بۆکرد، ئەو خواستانە سەریانهەڵداوە، خۆ ئەگەر دەسەڵاتێک نەبێت بەری پێبگرێت، ئەوا مەیلی پەرتبوون بەسەر یەکبووندا زاڵدەبێت و ئەو زمانەی، کە سەدان ساڵە لەپێناویدا قوربانی دەدەین، لە سایەی بێبەرنامەییماندا بەرەو پەرتبوون دەچێت. زمانی خوێندن هەر ئەو زمانەیە، کە بە فەرمی دەناسێنرێت،

ئەم ناساندنەش هەروەک ئەنسرۆپۆلۆجستێکی فەڕەنسایی، دەڵێت: بە شێوە قانوونی و ڕامیارییەکەی، دەبێت دەوڵەت دەستنیشانی بکات(٤٠) . جا ئێمەی کورد، کە تەنیا حکوومەتی هەرێمی کوردستانمان هەیە و ئەویش خۆی لێ بێدەنگ کردووە، ئەوا بە دڵنیاییەوە ئاکام لە بەرژەوەندیی نەتەوەکە نابێت، چونکە خوێندن بەچەند زارێک وادەبێت، کە مەترسی بۆ زمانی ناوکۆیی دروستبکات. هەروەک (Newbolt) دەڵێت: گەورەترین مەترسییش، ئەوەیە کە ڕێگە بە خوێندن بە زارە دابڕاو و گۆشەگیرەکان بدرێت، لەوەش مەترسیدارتر ئەوەیە، کە زۆری و بۆریی خەڵکی نەخوێندەوار و بێئاگا لە ئەدەب و نووسین، پشکیان لە قورسایی داناندا هەبێت بەسەر دەسەلاتی جێبەجێکردندا بۆ لەمپەر دانان لەبەردەم زمانی ستانداردا(٤١) .

هەر بەو پێودانگەش زار و گۆڤەرەکانی تریش وەک لێی دواین بەپێی چاولێکەری لێرەولەوێ کەم تا زۆر ئەو خواستەیان هەیە و بە چوونە سەری ئەمانەش ئەودەم خەونی بوونە خاوەن دەوڵەت بۆ کورد، ئەو بایەخەی نامێنێت، چونکە بە هاتنەدیی ئەو خەونە، ئەوا دەبێت زمانێکی فەرمیی دانپێدانراومان هەبێت، جا ئەگەرچی بە خوێنی هەزاران شەهید لەم هەرێمە فیدراڵەماندا ئەو دانپێدانانەمان لە حکومەتی ئیراقیدا هەیە، بەڵام کە دەسەڵاتی خۆمان ئامادەی پەرژاندنی لە سەرجەم هەرێمەکەدا نەبێت، ئیتر چاوەڕوانی هەنگاوی تر چۆن بکرێت؟!. بەتایبەت کاتێک کە لە ئەزموونی نەتەوەکانی تر دەڕوانین، ئەوا بەڕوونی ئەوە دەبینین کە دەسەڵات زمانی فەرمی و ستانداردی بۆیان ناساندووە و سەپاندوویەتی و بەو زمانەش لە سەرجەم وڵاتەکەدا دەخوێنرێت. نەک هەر ئەوە، بەڵکو لە سەرجەم ئەو وڵاتانەشدا، کە بەشێک لەو نەتەوەیەیان تێدایە و مافی مرۆڤ و هەلی خوێندن بە زمانی زگماکیان بۆ دەستەبەر بووە، ئەوا هەر بەو زمانە دەخوێنرێت، گەرچی لەسایەی چەند دەسەڵاتێکیشدان. باشترین نموونەش زمانی ئینگلیزییە، هەروەک ( John Heney) چۆنییەتی بەستانداردبوونی ئەو زمانە و نەیارەکانی لەناو زارە نێوخۆییەکاندا باس دەکات و گرنگی و بایەخی ئەو بەستانداردبوونەش دەخاتەڕوو(٤٢) . دیارە زمانێکی وەک ئینگلیزی، کە لەناو بەریتانیاشدا چەندان

زار و گۆڤەری هەن، ئەوا ئەگەر زمانێک یان زارێک نەبووایە بە ناوکۆیی و بۆ خوێندن و سەرجەمیان پێیبخوێنن، ئەوا ئەستەم بوو قسە لە ستاندارد و فەرمی و ئەو بەخۆداهاتنەی ئەو زمانە هەیەتی، هەبووایە. بێگومان دەسەڵاتی بەهێز و دوورئەندێشیی سەرکردەکانیان، هەر لە هێنریی پێنجەمەوە بیگرە تا بەئێستا دەگات، وایانکردووە، کە نەک هەر زارەکانی خۆیان، بەڵکو زۆر زمانی تریش بۆ فەرهەنگی ئینگلیزی بەتایبەت ئۆکسفۆرد، ببنە سەرچاوە و بەهێزی بکەن، کەچی ئێمەی کورد تازە بە تازە، کە لەم هەرێمەدا ئازادین، ڕادیۆ و تەلەفزیۆن و بڵاوکراوەکانمان دێن و بەپێی ناوچە و زار لە زمانەکەدا ماڵجیایی دەکەن و بەدوای وشە و زاراوەی ناوچەییدا دەگەڕێن. بێدەنگیی دەستگاکانی ڕاگەیاندن و وەزارەتی ڕۆشنبیریش، وایکرد، کە ئەم بارە بەرەو وەزارەتەکانی پەروەردە و خوێندنی باڵاش بچێت. دیارە ئەم کارانەش وا دەکەونەوە، کە ئەو زارەی سەدەونیوێکە ڕێچکەی ستانداردبوونی گرتووە، بەری پێبگیرێت و لەمپەری بۆ دروستبکرێت، تاوەکو نەبێتە زمانی ناوکۆیی سەرجەم نەتەوەکە، چونکە لەم پارچەیەی هەرێمی کوردستاندا، کە ناوەندی سەرجەم زارەکانی کوردییە، ئەوا هەلی ئەو بەخۆداهاتنەی زمانەکە پتر لەبارە وەک لە پارچەکانی تر. بۆیە ئەگەر لێرە لەمپەری بۆ دروستبکرێت، ئەوا هەنگاوەکانی دواتر زۆر کارەکی نابن. بۆنموونە جەزائیرییەکان کە زۆرینەشیان ئەمازیغ و نەتەوەی ترن، کەچی هەر بە ڕزگاربوونیان لە ١٩٦٢دا، لە وڵاتانی عەرەبەوە مامۆستایان بۆ خوێندن و فێرکردنی زمانی عەرەبی بانگهێشتی وڵاتەکەیان دەکرد، تاوەکو بەو ستانداردە بخوێنن، گەرچی وەک پێشتر لێی دواین، زمانی زگماکیشیان نییە. هیریەت مونتگومری، سەبارەت بە نەبوونی ستاندارد بەشێوەی فەرمی لای کورد، دەڵێت: "هۆکەی قەدەغەکردنی فێرکردن و فێربوونی کوردییە لەو دەوڵەتانەدا، کە کوردستانیان بەسەردا درێژبووەتەوە، زۆربەی کوردەکان شارەزای زمانی دایکی خۆیان نین"[٤٣]. لێرەدا جێگەی خۆیەتی گەر بڵێین، ئەوە بۆ زۆر لە پارچەکانی کوردستان ڕاستە، بەڵام لەم پارچەیەدا بەلای کەمەوە نزیکەی سەدەیەکە، کە فێرکردن و فێربوونی کوردی بوونی هەیە و بێ دابڕان کاری پێکراوە، ئایا ئەم ماوە دوور و درێژە ڕۆڵی لە گەشەکردن و

بەخۆداهاتنی زمانەکەدا نەبووە، تاوەکو بە فەرمی ببێتە ستاندارد؟![٤٤] . یاخود ئەوە بەرپرسانن، کە گرنگیی ئەم لایەنە بۆ داهاتووی نەتەوەکە وەک پێویست نازانن. وۆرف (Whorf) وتەیەکی هەیە، دەڵێت: ئێمە دەرک بە پێشینەی زمانەکەمان ناکەین هەروەک چۆن دەرک بە بوونی با ناکەین، تاوەکو نەکەوینە باری خنکانەوە[٤٥] . جا زمانی کوردی کە ئەم پێشینەیەی هەبێت، ئیتر بۆ خۆمانی لێ نەبان بکەین، تاوەکو ئەوەی کە بنیاتنراوە دەڕووخێنرێت و نەتەوەکە لە گرنگترین دەستکەوتی مێژوویی دەبێت، ئەوجا پەلەقاژەی دەربازبوون لە ئاکامەکانی بکەین. ناحەزانی کورد هەمیشە ترسی ئەوەیان هەبووە، کە کورد بیر لە زمان و ناسنامەی خۆی بکاتەوە. لەم لایەوە دەوڵەتانی داگیرکەر ئەوەی بەرامبەر کورد کردوویانە، هەمیشە جیاواز بووە، تەنانەت بە بەراورد لەگەڵ نەتەوە ژێردەستەکانی تریشیاندا.

هەر بۆ نموونە لە هەرکام لەو داگیرکەرانەی کوردستان بڕوانین، ئەم بۆچوونە ڕاستدەبێت. لەوانەش ڕژێمی سووریا، ئەوەی بەرامبەر بە کورد دەیکات، چەندان ناکۆکی و دژیەکییەکی بەبەراورد لەگەڵ زمانە بیانییەکانی تری وەک ئەرمەنی و ئاشووری و جوولەکەی تێدایە، چونکە ڕژێم ڕێگەی بەوان داوە، کە زمانی خۆیان فێرببن و بە کەلتوور و دابونەریتەکانیان لە قوتابخانە تایبەتییەکانیان و لە یانە و کۆمەڵە کەلتوورییەکاندا ئاشنا بین، لەگەڵ ئەوەشدا ژمارەیەکی زۆر قوتابخانە و پەیمانگای تایبەتی فەرەنسەیی و بەریتانی و ڕووسی و چەندان زمانی تری ئەوروپایی هەن، کە خوێندن تێیاندا بەخۆڕاییە[٤٦] ، کەچی بۆ کوردی، نەک ئەمانە نین، هەروەها نەک خوێندن بە کوردی، بەڵکو ناوی شوێنەکان کە کوردین کراون بە عەرەبی و ئیسلامی و بەئاشکرا ڕێگە نادرێت لە ئاهەنگەکاندا گۆرانی کوردی هەبێت. تەنانەت ناوی منداڵ بەپێی حکوومەتی سووریا، پێویستی بە بەڵگەی بەشی ئاسایشی ناوخۆ هەبوو[٤٧] . ئەم بارە بۆ سەرجەم پارچەکانی تری کوردستان، جگە لەم بەشە ئازادە، هەر وا بووە. بۆیە ئەو پێشکەوتنانەی کە لەم ناوچەیەدا هەن، لە ناوچەکانی تردا هەلی بۆ نەڕەخساوە. کەواتە بۆ دەبێت ئەم ڕەوتی پێشکەوتنە بەگورتر نەکرێت و پەرەی پێنەدرێت. بۆ دەبێت کورد هەمیشە ئامادەی گەڕانەوە بێت بۆ چوارگۆشەی یەکەم؟!!.

کالفی، دەڵێت: ئیمپریالیزمی زمانی، زۆر ڕێچکە بۆ سوودوەرگرتن لە ڕامیاریی قوتابخانە و زانکۆ و پلاندانانی زمانی و هۆیەکانی ڕاگەیاندن، دەگرێتەبەر. پرسی نووسینیش، کە بە ڕواڵەت ساکارە، کەچی ڕۆڵی گرنگ لە کاری وەرگرتنی زمانی تر و وەلانانی زمانی نەتەوەییدا دەبینێت[٤٨] . جا ئێمە ئەگەر سەرنجێکی هەلومەرجی تورکیا و ئەو دابڕینەی کە گۆڕینی ئەلفوبێی عەرەبی لەسەر دەستی مستەفا کەمالدا کردی بەرامبەر بە کەلتووری عوسمانی و دواتر، ئەوا ئەو گۆڕینەش بە چاولێکەریی تورک، نەک ئێمەی لە کەلتووری پێشوومان، بەڵکو لە پارچەکانی تریشی کردین، چونکە پێشتر بە هەر زارێک کەم تا زۆر ئەگەر بنووسرایە، ئەوا هەر هەوڵی خوێندنەوەی دەدرا، بەڵام لەدوای ئەو مێژووەوە، ئیتر لەمپەر بۆ خوێندنەوەی نووسراوی کوردی زۆر زۆرتر بوو، ئەگەر نەڵێین بواری بۆ نەمایەوە. جگە لەوەش ئێستا تورکە فەتحوڵڵا گوڵەنییەکان لەم هەرێمە ئازادەشماندا لە هەوڵی ئەوەدان، کە لە باخچەی ساوایانەوە تا بە زانکۆ دەگات، خوێندنگایان لەناوماندا هەبێت. بێگومان ئەم کارە ناکرێت تەنیا لە ڕوانگەی بازرگانییەوە سەیر بکرێت و وا دابنرێت، کە ئەوانە بەڕاستی دەستگایەکی بازرگانی و خێرخوازیی ئیسلامیی پەتین، چونکە ئەمانە جگە لەوەی کە زمانی تورکی فێری منداڵان دەکەن، هاوکات کەلتووری تورکیشیان لا خۆشەویست دەکەن. ئەمەش بەجۆرێک لە جۆرەکان لەسەر حسابی کەلتووری کوردەواری دەبێت. جگە لەوەش ئەمانە کار لەسەر بە ئیسلامکردنی ڕامیاری دەکەن، بە چەشنێک کە دابڕان لەنێوان کوردبوون و موسڵمانبوونی منداڵی کورددا بکەن. جا ئەگەر کەسانێک لە خۆمان دەرک بەم ڕاستییە نەکەن، ئەوا با خوێندکارانی ئەو قوتابخانانە بدوێنن و بزانن بۆچوونیان سەبارەت بە پارتی کرێکارانی کوردستان چۆنە. بێگومان لای زۆرینەی زۆری خوێندکارەکان ڕەنگدانەوەی ئیسلامی تورک و گوڵەنییەکان سەبارەت بەو پارتە و ئەوانەش کە وەک ئەوان بیردەکەنەوە، دەبینرێت. لێرەدا ڕەنگە لەجێی خۆیدا بێت ئەگەر ئاماژە بە قسەیەکی پەرلەمانتاری کوردی باکوور (ئاڵتان تان) بکەین، کە خۆی کەسێکە، کە تەمەنێک لەناو پارتەکەی نەجمەدین ئەربەکان و دواتریشدا کاری کردووە و چالاک بووە، چۆن لەوە دەدوێت کە جارێکیان

نامەیەکی کراوە لەڕێگەی ڕۆژنامەوە بۆ ئەو پرۆفیسۆرە ئیسلامییەی بواری شەریعەتی ئیسلام، کە پێشتر مامۆستای تەییب ئەردۆگان بووە و تائێستاش ڕاوێژکاریەتی، دەنێرێت. لە نامەکەدا ئەوەی لێدەپرسێت، کە ئایا زمانی کوردی و بەکارهێنانی لەلایەن کوردەوە، بەپێی ئایینی ئیسلام حەڵاڵە یاخود حەرام؟!. دیارە پەرلەمانتارە کوردەکە، کە خۆی ئیسلامییە، دەزانێت کە تورکانی ئیسلامی چۆن بیر دەکەنەوە، بۆیە دەڵێت پرۆفیسۆرەکە بە چوار نامە وەڵامی پرسەکەی دامەوە، بەڵام بەدەمیدا نەهاتبوو، کە بڵێت بەڵێ حەڵاڵە، بەڵکو بەشێوەیەک لە شێوەکان کوردواتەنی ڕاوە ڕێویی لە وەڵامەکەدا کردبوو، لەوەدا کە نموونەیەکی نابەجێی هێنابووەوە، گوایە شەکر باشە بەڵام ئەگەر بڕەکەی زۆربێت، ئەوا مرۆڤ نەخۆش دەخات. واتە زمانی تورکی هەیە و پێویستیی خەڵکەکە پڕدەکاتەوە، کەواتە بەوپێیە بێت زمانی تر گرفت دروستدەکات. واتە نە بە حەڵاڵ و نە بە حەرام وەڵامێکی ڕاشکاوی بەدەستەوە نەداوە، چونکە ئەگەر بڵێت حەرامە، ئەوا پێچەوانەی ئایینی پیرۆزی ئیسلام دەوەستێتەوە و خۆیشی باش ئەمە دەزانێت. خۆ ئەگەر بیشڵێت حەڵاڵە، ئەوا پێ دەنێت بە ویژدانی ڕەگەزپەرستانەیدا، چونکە ئەو ئیسلام و هەموو شتەکانیش دەخاتە ڕاژەی بیرکردنەوە خۆسەپێنی و داگیرکارییەکانیانەوە. جا پەرلەمانتارەکە بەپێکەنینەوە وتی: "نموونەکەی لەبار نەبوو، چونکە ئێمە نەخۆشی شەکرەمان نییە، تاوەکو زمانەکەمان بۆمان خراپ بێت"[٤٩]. ئێمەش دەڵێین: بەڵێ ئەوە داگیرکەرانن، کە بە زمانی شیرینی کوردی تووشی شەکرە دەبن. جا ئەو هەڵوێستەی ئەو پرۆفیسۆرە موسڵمانە ئیسلامییە و مامەڵەی دەوڵەتەکەشی لەگەڵ زمانی زگماکی کوردیدا، لەگەڵ ئەو بۆچوونەدا یەکدەگرێتەوە، کە خانمی ئازەری (دکتر صدیقە عدالتی)، بە لەناوبردنی جینە شارستانی و ڕۆشنبیرییەکان ناودێری دەکات و دەڵێت: ئەم جینە شارستانی و ڕۆشنبیرییانە، کە وەک میرات لە نەوەکانی پێشووەوە بەئێمە گەیشتوون، ئەمە لەلایەن ڕامیارانی ئێرانەوە کراوەتە ئامانج و لەناوبردنی لە ڕێکاری خۆیاندا ڕەچاوکراوە. دیارە ئەمە لەگەڵ نەتەوە نافارسەکاندا دەکرێت و بەمەش مێژوو و

ناسنامەی ئەو نەتەوانە لەڕێگەی قەدەغەکردنی ناقانوونیی زمانەکەیانەوە دەکرێت و دەکرێنە مرۆڤی پلە دوو لە کۆمەڵدا...[٥٠]

بێگومان بۆ بەئاگایان، کارکردنی ئەمەریکاییەکان سەبارەت بە زمان و بەتایبەت کارەکانی پەیمانگەی هاوینەی زمانی[٥١] و ئامانجەکانی، شارراوە نین. هەربۆیە ناشکرێت وادابنێین، کە تورک لەسەر ئەو ڕێچکەیە، کار ناکەن. جگە لەوەش دەبێت چاک ئەوە بزانین، کە ڕامیاری و ڕامیاری زمان دوو شتی لێکدابڕاو نین، ناکرێت ئەو دەنگانەی لێرەولەوێ لەلایەن چەند کەسێکی بە بنەچە کوردەوە، کە خۆیان لە هەندەران دەژین و دەنگ و نووسینیان لە دژی زمانی کوردییە و بانگەشەی پەرتبوونی زمانەکە و دنەدانی زارەکان دەکەن، تاوەکو هەرکەس بۆخۆی کاربکات، ئەمانە بەکاری کەسی و بڕوا و بۆچوونی تایبەت دابنرێن، بەڵکو هیچ دوور نییە، کە بە بەرنامەی یەکێک لەو ناوەندە زمانییە نێودەوڵەتییانە کارنەکەن، کە ڕامیاری زمانیی تایبەتیان لەپێناوی بەرژەوەندیی دەوڵەتەکان و زمانەکانیاندا، هەن. کەواتە ئێمەی کورد ئەگەر بیرکردنەوەی لەبار و ڕامیاریی دروستمان بۆ زمان نەبێت، وەک ئەوەی کە لەم ساڵانەی دواییدا بەناوی ڕامیاریی زمانپارێزی (Language Mentenance) ناودەبرێت[٥٢]، ئەوا پێدەچێت لە زۆر لایەنەوە بەربەست و لەمپەرمان بێنە پێش. هاوکات ئەگەر بمانەوێت پیلان و پلانی ناحەزان بەرامبەر بە زمانەکەمان سەرنەگرێت، ئەوا دەبێت خۆنەویستانە کاری ڕژد بکرێت، هەروەک جەمال نەبەز، دەڵێت: مرۆڤی وت و وریا و تێگەیشتوو و ڕۆشنبیر و بە تەنگەوەهاتووش، ئەوەیە کە بزانێت چۆن کەڵک لە نەخشەی ماڵوێرانکەرانەی دوژمنەکانی وەردەگرێت بۆ خزمەت بە ئامانجەکانی گەلەکەی خۆی. بۆ وێنە: ئەگەر هاتوو دوژمن بەنیازی دووبەرەکی و سێبەرەکینانەوە، یان لەتوپەتکردنی زمانەکەت، پرۆگرامی بەچەند زاراوەیەکی ناوچەیی بەسەرتدا سەپاند، ئەوا تۆ دەبێت هەوڵبدەیت بوونی ئەو زاراوانە لە ڕادیۆدا بۆ بڵاوکردنەوە و خزمەتکردنی زمانە ئەدەبییەکەت بەکاربهێنیت، بەتایبەتی لەو ناوچانەدا، کە بەو زارانە قسە دەکەن[٥٣] . لێرەدا ڕەوایە گەر بپرسین ئایا ناحەزانی کورد ئەم کارەیان بەرامبەر بە کورد نەکردووە؟! یان ئایا ئێمە دەتوانین پلانی ناحەزان بە

ئاڕاستەیەکدا بگۆڕین، کە لە بەرژەوەندیی نەتەوەکەماندا بێت؟. لە وەڵامدا دەڵێین: ئەگەر خواستی ڕاستەقینە بۆ پاراستنی زمانەکەمان و یەکبوون و یەکگرتنەوەمان تێدا بێت، ئەوا گومان لەوەدا نییە، کە ئەمڕۆ هەروەک پێشتر لێی دواین، هەلومەرجی کارکردن بەو ئاڕاستەیەدا، گەلێک لە ساڵانی پێشوو لەبارترە. بێگومان دەبێت ئەوەش بزانین، کە ئەم کارە کاری دەستگا جۆراوجۆرەکانن، بەڵام بەپێی پلانی زانستانەی داڕێژراو لەلایەن پسپۆڕانەوە و بە پشتگیریی توانا ئابووری و تەکنۆلۆژییەکانی بەردەست حکوومەتی هەرێمی کوردستان، کە ئەمڕۆ لەم پارچەیەدا حوکمڕانە.

**ڕوانگەی زانست سەبارەت بە زار و گۆڤەرە جوداکانی زمان:**

بەپێی دید و ڕوانگەی زانست بەگشتی و زانستی زمان بەتایبەتی، بەهیچ جۆرێک هیچ زار و گۆڤەرێک لەویتر بە باشتر نازانرێت، چونکە ئەم لایەنە لە ڕوانگەی زانستەوە هەر لەگەڵ پێناسەی زماندا ڕوون دەبێتەوە و یەکلایی دەبێتەوە. پێناسەی زمانیش لە ساکارترین شێوەیدا، ئەوەیە، کە دەڵێت: زمان بریتییە لە هۆکارێک بۆ گوازتنەوەی بیر لە قسەکەرەوە بۆ گوێگر و بەپێچەوانەشەوە. جا بەپێی ئەم پێناسەیە هەموو زار و گۆڤەرەکانی زمانێک، خۆبەخۆی خۆیان لەناو قسەپێکەرانیاندا لەو ناوچە و ناوەندە جوگرافیاییەی تێیدا لەکاردان، هەر ئەو ئەرکە بەجێدەهێنن. واتە هۆکاری گوازتنەوەی بیرن، کەواتە پێڕەوبەندیشن. بەمەش بواری ئەوە نامێنێت، کە هیچ کامیان لەویتریان لە ڕوانگەی زانستی زمانەوە بە باشتر و لەبارتر بزانرێت. جا کاتێک کە زارێک یان گۆڤەرێک وەک ناوکۆیی لەلایەن قسەپێکەرانی زمانێکەوە بۆ پێوەندیکردن لەنێوان کۆی ناوچەکان و هەروەها بۆ بەکارهێنانی فەرمی و بۆ بواری پەروەردە و فێرکردن و...تاد، ڕەچاو دەکرێت، ئەوا ئەمە هەروەک زۆر لە زانایان لێی دواون، پێوەندیی بە لەباری و نالەبارییەوە نییە، بەڵکو شتگەلێک دەبنە هۆکار بۆ ئەمە، کە پێوەندیی ڕاستەوخۆیان بەولایەنەوە نییە، بەڵکو هێندە هەیە کە زارێک هەلی بۆ هەڵکەوتووە، لەوەدا کە بۆ نووسین و خوێندن و ڕاگەیاندن و...تاد، بەکاربراوە، یاخود مێژوویەکی درێژتری لەو بەکاربردنەدا هەیە و

ئەمەش وایکردووە، کە لە وشە و زاراوەی زارەکانی تریش سوودمەند بێت. جگە لەمانەش ناوچەی جوگرافیایی خودی ئەو زارە، لە هێندێک باردا هەلێکی تر بۆ ئەو سوودمەندبوونە لە زار و گۆڤەرەکانی تر دەڕەخسێنێت. واتە ئەگەر ئەو زارە لە ناوەندی زار و گۆڤەرەکانی زمانەکەدا بێت، ئەوا بەشێوەیەک لە شێوەکان نزیکی پتر دەبێت، بە بەراورد بەو زارانەی کە سەرپەڕن، لەمەدا دەکرێت بڵێین، کە کرمانجیی ناوەڕاست لەم لایەنەوە ناوەندی زارەکانە. نەک هەر ئەوەش، بەڵکو لە هەرێمی کوردستاندا کەم تازۆر زۆرینەی زارەکان بەشێوەیەکی ڕێژەیی بوونیان هەیە. دیارە ئەمەش خاڵێکی ئەرێنییە بۆ زارەکە و پێوەندیی بە زارەکانی ترەوە و هاوکات هەلی کارلەیەککردنیان زۆرتر دەبێت.

### چی بکەین و چۆن مامەڵە لەگەڵ زمانی زگماکدا بکەین:

ئێمەی کورد، کە تائێستا قەوارەیەکی ڕامیاریی سەرتاسەریمان نییە، کە سەرجەم پارچەکان لەخۆبگرێت، بۆیە چاک وایە لە ئێستادا قسە لە هەرێمی کوردستان، کە سەد ساڵێک لەمەوبەر بە ویلایەتی مووسڵ ناودەبرا، بکەین. دیارە ئەمە هەرگیز بەو واتایە نییە، کە کار بۆ پارچەکانی تر نەکرێت. جا لە هەرێمدا، هەروەک پێشتر لێی دواین، زۆربەی زارەکانی کوردی بوونیان هەیە. لەم بارەشدا ئەگەر زمانی زگماک وا لێکبدرێتەوە، کە ئەوە بێت، کە هەرچەند گوند یان شار و شارۆچکەیەک پێیدەدوێن، ئەوا دەبێت بڵێین، کە چەندان زمانی زگماکمان هەن. دیارە ئەمەش شتێکی لۆژیکی نییە و ڕەچاوکردنیشی کاری کردن نییە و ناشێت. بەدەر لەوەش بەجێیە، گەر بپرسین ئایا هیچ وڵاتێک یان نەتەوەیەک هەیە، کە زمانی دایک بەو چەشنە لێکبداتەوە؟. لە وەڵامدا دەڵێین: نەخێر، چونکە کام لەو دەوڵەتانەش بگرین، کە خۆیان بە پێشەنگی جیهان لەزۆر بواردا دادەنێن، ئەوا نموونەیەک لەو چەشنە لەئارادا نییە. کەواتە دەبێت ئێمەی کورد چی بکەین؟ ئایا گوێ لەو دەنگانە بگرین، کە جگە لە ناوچەگەری و زار و گۆڤەرگەری شتێکی تریان پێنییە؟ یاخود گوێ لەو بێگانانە بگرین، کە بەرژەوەندیی نەتەوەیی کورد، کێشەی ئەوان نییە؟ یان گوێ لەو بەناو کوردانە بگرین!، کە نە پەرتبوونی کورد و نە زمانەکەشی

جێگەی سەرنجیان نەبووە و نییە. هەربۆیە قسەنەکردنی ئەوانە پتر خزمەت بە کورد دەکات، وەک لە قسەکردنیان.

کەواتە ئەم بابەتە چۆن ڕەچاو بکرێت؟ دیارە کوردی ئەم پارچەیەی کوردستان ئەزموونێکی دەیان ساڵەی خوێندنی بە کرمانجیی ناوەڕاست بۆ قوتابییانی زارەکانی تریش، هەبووە، گەرچی ئەمە بەو واتایە نییە، کە بێ گرفت بووبێت، چونکە پێناچێت ئەو بەرنامانە بۆ ڕۆڵەکانی زارەکانی تر، بەتایبەت بۆ کرمانجیی ژووروو، بێ گرێ بووبێت. دیارە ئەمەش کۆمەڵێک هۆکاری هەن، گرنگترینیان پەروەردەنەکردنی لەبار بۆ ئەو مامۆستایانەی کە فێرکار بوون. بەواتایەکی تر دەستەبەرنەکردنی مامۆستا بەشێوەیەک، کە بتوانێت سەرکەوتووانە وانەکان بڵێتەوە، چونکە هەروەک جولیائێس فالک، دەڵێت: ئەو قوتابخانانەی کە ڕامیاریی زمانییان وایە، کە ستانداردی ئینگلیزی بخوێنن یان نا، ئەوا مامۆستایان دەبێت سەبارەت بە هەر زارێکی ناستانداردیش، کە لەلایەن قوتابییانەوە قسەی پێدەکرێت بەئاگابن، چ لەلایەنی ناوەرۆکی جۆراوجۆری کۆمەڵایەتی و چ کەرەستە زمانییە تایبەتەکانی زارە جوداکان، دەبێت مامۆستا تێبگات، تاوەکو بتوانێت بەشێوەیەکی کاریگەر وانە بڵێتەوە، هەروەها بەشێوەیەکی ئەرێنی لەگەڵ قوتابییەکاندا لە پێوەندیدا بێت[٥٤]. لێرەدا من دەپرسم: ئایا ئەو چەشنە مامۆستایانەمان بۆ خودی زارەکە دەستەبەر کردوون، چجای ئەوانەی کە سەر بە زارەکەش نین؟! بەدڵنیاییەوە دەڵێم وەک پێویست نەبوون. دیارە ئەمەش بۆ ڕۆڵەکانی زاری تر بارەکە زۆر گرانتر دەکات و دواجار کاریگەریی لەسەر کەمکردنی حەز و خواستی منداڵان بۆ خوێندن دەبێت. ئاکام ڕێژەی سەرکەوتن و دەرچوون کەم دەکات. بەمەش دایکان و باوکان بەرەو ئەو بڕوایە دەچن، کە هۆکەی نالەباری ئەو زارە بێت، کە پێیدەخوێنرێت. بۆیە دەنگی ناڕەزایی بەرز دەبێتەوە. لەولاشەوە پیلانەکانی ناحەزانی کورد لەکاردان و هەلومەرجی ڕامیاریی هەرێمەکەش بە چەشنێکە، کە دەستگاکانی پەروەردەمان لەباتی گەڕان بەدوای هۆکارەکانی ئەو بارەدا، دێن و گۆڤەرێکی تر بۆ خوێندن دەپەرژێنن. لەلایەکی تریشەوە ئایا ئەو بەرنامەی خوێندنە، ڕەچاوی ئەوەی تێدا کراوە، کە بگونجێت لەگەڵ سەرجەم زارەکانی

کوردیدا، یاخود تەنیا بەپێی ئەوەی کە لە ناوچەیەکی دیاریکراودا هەیە، کارکراوە و ڕەچاوی ئەو وشە و زاراوانە نەکراون، کە گشتین و سەرجەم کورد بەکاریاندەهێنن، یاخود لێکنزیکن. یان لە زۆر باردا لە خودی زارەکەشدا فۆنەتیکییانە مامەڵە لەگەڵ وشەکاندا کراوە، کە ئەمەش هێندەی تر زمانەکەی کردووەتە بارێکی گران، چجای ئەوەی کە بابەتی زانستەکانی تریشی پێبخوێنرێت.

ڤندریس، دەڵێت: زمان ئەگەر ڕەوان و سووک بێت و کەمترین وردەکاریی ڕستەیی تێدا بێت، ئەوا ڕێگە بە بیرەکە دەدات، کە بە ڕوونییەکی تەواو و جووڵەیەکی سەربەستانەوە دەربکەوێت[٥٥] . لێرەدا جێگەی خۆیەتی گەر بپرسین ئایا تا چەند دانەرانی پەرتووکەکانی خوێندن کاریان بەم بۆچوونانە کردووە؟!. بەدڵنیاییەوە لە کەمترین ئاستدا نەبێت، نەبووە، ئیتر چۆن گلەیی لە کەسانێک بکەین، کە سەر بە زارەکەش نەبن، لەکاتێکدا کە خوێندنەوەی ئەو کتێبانە بۆ کەسانی سەر بە زارەکەش، پڕ گرێوگۆڵ بێت، یاخود لە ساکارترین پەسنیدا ئەوەبێت کە وەک دەبینین بێ کێشە نەبێت. هەر بۆ نموونە ئێمە لە ئاستی زانکۆشدا تائێستا لەمەڕ زاراوەکانی جێناو، ئاوەڵکار و، کار... تاد، یەک دەنگ نین.

بێگومان فێربوون یان فێرکردنی هەر زمانێک یان زارێکی جودای زمانێک، پێویستی بە زۆر لایەن هەیە و تەنیا بە دەقە نووسراو یان وتراوە دابڕاوەکان، ئەم کارە لە هەموو بارێکدا بەڕێوە ناچێت، بەڵکو هەروەک (دکتور محمود السعران) دەڵێت: زمان لە کۆمەڵدا بەکاردێت و فێربوون و پەرەسەندن و کاریگەرییەکەشی لە کۆمەڵدایە. بۆیە هەر دەقێکی قسەیی وتراو بێت یان نووسراو — بەواتا دروستە تەواوەکەی، تەنیا بە لێکدانەوەی وەک یەکەیەکی سەربەخۆ لەلایەنی دەنگی و ڕستەیی و هەروەها لەلایەنی فەرهەنگی، تێناگەین، بەڵکو پێویستە لە دەستنیشانکردنی واتاکەیدا ڕەگەزی تریش جگە لە ڕەگەزی قسەیی، بێنە ناوەوە. ئەو ڕەگەزانەی کە لەگەڵ ڕەگەزە قسەییەکەدا پێکەوە یەکەیەکی تەواوکارانە پێکدەهێنن، لەوانەش: هەڵوێستی هاوبەشەکان لە قسەکەدا، خۆیان و کەسێتییان و پێوەندیی نێوانیان و ئەو شتانەش، کە لێی دەدوێن و ...تاد[٥٦] . کەواتە بەجێیە، گەر بپرسین ئایا

ئەوانەی پەرتووکەکانی قۆناغی بەراییان بۆ فێرکردنی خوێندن و نووسینی کوردی داناوە، ئەرێ لە چ ئاستێکدا ڕەچاوی ئەم لایەنانەیان کردووە؟ ئایا لەگەڵ خودی پەرتووکەکاندا کتێبی یاریدەدەریان هەبووە؟ ئەگەر هەبووە تا چەند ڕەچاوی ئەم لایەنانە کراون؟.

وەک پێشتر لێی دواین، لە زماندا و لەنێوان زارەکاندا جوداوازی لە چەندان کەرەستە و لایەنەوە هەن، هەروەک (جولیا ئێس فالک)یش دەڵێت: زۆرێک لەو کەرەستە جوداییکارانەی نێوان زارێکی ناستاندارد و زاری ستانداردا، لەوەیە ئەو گرنگییەیان نەبێت، بەڵام هێندێک لەو کەرەستانە دەشێت دواجار پێوەندییان بە ناجێگیرییەوە هەبێت. جا مامۆستا دەبێت وابێت کە بتوانێت ئەوەی قوتابییەکان دەیڵێن تێبیگات و قوتابییەکانیش وا لێبکات، کە لەوە بگەن، کە مامۆستا دەیڵێت[٥٧] . دیسان ئەو پرسە دێتەوە پێش، ئایا کۆلێژ و پەیمانگاکانی ئێمە بەواتای وشە لەو مامۆستایانەیان بۆ بەرهەمهێناوین، بەتایبەت بۆ خوێندنی بەرایی لە ناوچەی زارەکانی تردا؟ بەدڵنیاییەوە، دەڵێم: ئەگەر وا بووایە، ئەوا ئەو ناڕەزاییانەی هاتنە ئاراوە، نەدەبوون. واتە سەرجەم ئەم گرفتانە بێبەرنامەیی هێناونییەتە ئاراوە. هاوکات گرنگیی زمان لە ئاستێکدایە، کە هەرگیز ناکرێت بەبێ بەرنامەی تۆکمە کاری تێدا بکرێت. جگە لەوەش ئەو بەرپرسانەی کە لە بواری پەروەردە و فێرکردن و خوێندنی باڵا و ڕاگەیاندن و ڕۆشنبیریدا کاردەکەن و بەرپرسێتییان هەیە، ناکرێت لەم دۆزە بە وردی بەئاگا نەبن. دیارە هەر بڕیارێک یاخود کارێکی ئەمانە، دەشێت ئەگەر دروست و لەبار نەبێت، زیانی گەورە بە نەتەوەکە بگەیەنێت. بەتایبەت بۆ نەتەوەیەکی وەک ئێمە، کە هەستی نەتەوایەتیمان لەچاو نەتەوەکانی جیهاندا و بەتایبەت دەوروبەرماندا، لە کەمترین ئاستدایە. دیارە ئەم تێبینییەمان سەرپێیی نییە، تەنانەت ئەو بێگانانەی، کە لە مێژوو و کەلتووری ئێمە و مەرگەساتەکانمان بەئاگان، یاخود کاریان تێدا کردووە، زۆر بە ڕوونی هەستیان بەوە کردووە و بەڕاشکاویش دەریدەبڕن و نایشارنەوە[٥٨] . بێگومان ئەم بۆچوونە لە ڕاستی بەدەر نییە، خۆ ئەگەر وا نەبووایە، ئەوا بە گەورەترین نەتەوەی بێدەوڵەت ناونەدەبراین. هاوکات هەستی ناوچەگەری و خێڵگەری و زار و گۆڤەرگەریمان لەسەروو هەستی نەتەوەییەوە، نەدەبوو.

**ڕاسپاردەکان**

• کورد وەک نەتەوەیەکی چەوساوە و بێدەوڵەت و زمان قەدەغەکراو، دەبێت زۆرترین گرنگی بە ڕۆژی (٢١)ی شوبات بدات، هاوکات زۆرترین چالاکیی زانستیی ئاکادیمی و کۆڕ و مێزگردی ڕۆشنبیری بەو بۆنەیەوە ئەنجام بدات.

• ڕێکخراوەکانی کۆمەڵی شارستانی و چالاکانیان، هەوڵبدەن دەنگی خۆیان بە هەر شێوەیەک بۆیان دەستەبەر دەبێت، بگەیەننە ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان، پێشێلکارییەکانی دەوڵەتانی داگیرکەری کوردستان سەبارەت بە بڕیاری (RES/A/٦١/٢٦٦) لە بواری زمانی زگماکدا بخەنە ڕوو.

• حکوومەتی هەرێم دەبێت خاوەنی ڕامیاریی زمانی بێت و لەبەر ڕۆشنایی ئەو ڕامیارییە زمانییەدا پلانی کورتخایەن و درێژخایەن بەپێی ستراتیژێکی تۆکمەی نەتەوەیی، دابڕێژێت.

• وەزارەتەکانی پەروەردە و فێرکردن و خوێندنی بالا و ڕۆشنبیریی هەرێمی کوردستان، کاری ڕژد و بە بەرنامە بۆ زمان بکەن، شکۆ بۆ زمانەکە بگێڕنەوە و لەو پاشاگەردانییەی کە تێیدایە، ڕزگاری بکەن. هاوکات خۆشەویستی بۆ زمانەکە بگێڕنەوە، کە لە ئێستادا لە کەمترین ئاستدایە.

• ئاستی خوێندن لە قوتابخانە کوردییەکانی حکوومەتی هەرێمدا، پەرەپێبدەن، بەشێوەیەک، کە کەمتر نەبێت، لە قوتابخانە تایبەتەکان.

• وەزارەتی ڕۆشنبیری ڕێنمایی لەلایەنی زمانەوە بۆ سەرجەم دەستگاکانی ڕاگەیاندن هەبێت، هاوکات سزا و پاداشت بەرامبەر بە کارەکانیان لەئارادا بێت، تاوەکو گیانی ململانێی لەبار لەلایەنی زمان و ڕاژەی کەلتووری کوردەوارییەوە، بێتە ئاراوە.

• داوا لە تەلەفزیۆنەکان بکرێت، کە گرنگیی بە فیلمی کارتۆن بە کوردی بدەن، یاخود دۆبلاژ بکەن، بە زمانی کوردی و بە وشەگەلێک، کە لەنێوان زارەکاندا ناوکۆییبن، یاخود بەشێوەیەکبن، منداڵان لە واتایان بگەن.

• بەرنامەی فێرکاری بۆ زمانی کوردی، لە تەلەفزیۆنە ئاسمانییەکاندا، بکرێتە مەرجێکی ڕێپێدانی مۆڵەتی کاریان لەلایەن وەزارەتی ڕۆشنبیرییەوە. ئەم بەرنامانە بە ڕاوێژ لەگەڵ پسپۆڕانی بواری فێرکردنی زمان لە وڵاتانی پێشکەوتوودا، سازبکرێن. هاوکات بەرژەوەندیی باڵای نەتەوە لەم کارەدا ڕەچاو بکرێت.

**ئەنجام**

• پرسی زمانی زگماک و چەمکی دەستەواژەکە، ئەگەر لە ڕوانگەی بەرژەوەندیی بالای نەتەوەی کوردەوە سەیر نەکرێت، ئەوا ڕەنگە زیان بە داهاتووی زمانیمان بگەیەنێت، بەتایبەت لەم هەلومەرجەی ئێستای جیهان و بارودۆخی کورد بەگشتی و هەرێمی کوردستانی فیدراڵدا، کە ڕامیاریی زمانی لەئارادا نییە و بەجۆرێک لە جۆرەکان زمان دراوەتە دەست قەدەر.

• ئەم پرسە ئەگەر لەلایەن حکوومەتی هەرێمی کوردستانەوە بە هەند نەگیرێت، ئەوا دوور نییە، کە داگیرکەرانی کورد لەلایەک، بیرۆکراتییەتی ناو ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکانیش لەلایەکی ترەوە نەخەنە ڕاژەی خۆیانەوە و بۆچوونی کەسانێکی ئەو ڕێکخراوە، لە لێکدانەوەی واتای دەستەواژەی زمانی زگماکدا، نەکەنە پاڵپشت بۆ خۆیان و لەڕێگەیەوە کار لەسەر دژیەتیکردنی نەتەوەکەمان بکەن و لەباتیی یەکخستن، پەرتبوونمانی لێ بەرهەمبهێنن.

• زمان هەروەک ئەوەی کە کۆڵەکەی یەکەمی مانەوەی نەتەوەیە، هاوکات دەکرێت لە ڕۆژگاری ئەمڕۆدا، کە بڕیاری نێودەوڵەتی لەئارادایە، بکرێتە چەکێکی کاریگەر بۆ بەدەستهێنانی ئاواتە نەتەوەییەکان، کە ئەویش سەربەخۆیی نەتەوەکەیە، هەروەکچۆن لەڕێگەی بزووتنەوەی زمانییەوە، بەنگلادیشییەکان بە هەوڵدان بۆ داننان بە زمانەکەیاندا، کە بەنگالی بوو، کردیان و دواجار سەربەخۆییان بەدەستهێنا.

• زاراوەگەلی زۆر لەلایەنی زمانەوە لەئارادان، لەوانەش زمانی زگماک، زمانی دایک، زمانی نیشتمانی، زمانی یەکەم...تاد، جا ئەگەر حکوومەتی هەرێم یەکلاکردنەوەی دۆزی زمان ڕەچاو نەکات، ئەوا لە یەک دوو دەیەی داهاتوودا، بە پاڵپشت بە بڕیارە نێودەوڵەتییەکان، نەتەوەی کورد، کە تائێستا زمانی ناوکۆیی یاخود نەتەوەیی یان فەرمیی بۆ خوێندن و ڕاگەیاندن و بەڕێوەبردنی سەرانسەری، نییە، ئەوا ئەم دۆخە بەرەو پەرتبوون و هەڵوەشاندنەوەی ڕایەڵە گرنگە نەتەوەییەکەمانمان دەبات.

• هەلومەرجی تەکنۆلۆژیای پێوەندیکردنی هاوچەرخ، دەکرێت بۆ پرسی زمان وەک چەکێکی دوو دەم بێت، جا ئەگەر حکوومەتی هەرێمی کوردستان

بەپێی بەرنامەی نەتەوەیی ئەم هۆکارانە بەگەڕبخات، ئەوا ئاکامی خوازراوی لێدەکەوێتەوە. خۆ ئەگەر وا نەکات و هەر کەس و لایەن و ناوچە و زارێک، چی بە بیریدا بێت بیکات، ئەوا ناکرێت جگە لە ڕەشبینی بەرامبەر بە داهاتووی زمان و نەتەوەمان، دیدێکی ترمان هەبێت.

## سەرچاوە و پەراوێزەکان

(١) بۆ زانیاری لەو بارەیەوە بڕوانە: www.amazigh.org. 11/2014

(٢) بۆ زانیاریی پتر، بڕوانە سایتەکانی: www.wikipedia.org، www.amazigh.world.org

(٣) شەڕی زمان و سیاسەتی زمانەوانی، لویس جان کالفی، ل (٩٩ — ١٠٠).

(٤) بۆ زانینی پتر، بڕوانە: شەڕی زمان و سیاسەتی زمانەوانی، لویس جان کالفی، ل (١٠٠ — ١٠١).

(٥) بڕوانە: علم اللغة بين التراث والمناهج الحديثة، دكتور محمود فهمي حجازي، ص (٩٦).

(٦) بڕوانە: الفكر القومي وقضايا التجدد الحضاري، ص (٢٩).

(٧) بڕوانە: زبان مادری چیست و چرا اهمیت دارد، دکتر صدیقه عدالتی، www.azerturkforum.org

(٨) سەیر ئەوەیە، کە بزووتنەوەی ئیخوان ئەلموسلمین، لە میسردا هاتووەتە ئاراوە، کە وەک ڕەچەڵەک خۆیان عەرەبنین و قیبتین، بەڵام بە کاریگەریی چەند هۆکارێک و لەپێشیانەوە ئیسلام و دەسەڵاتی دەوڵەتی خەلافەت، زمانیان لە پاشەکشەدا بووە و لەناوچووە، ئەو خەڵکە بە ڕاستڕە و و چەپڕەویانەوە لە هەوڵی پێشەنگێتیی عەرەبدا بوون، بەشێوەیەکی ڕەگەزپەرستانە و کاریشیان بۆ تواندنەوەی نەتەوەکانی تر، لە بۆتەی عەرەبدا کردووە.

(٩) هەر بەو ئاڕاستەیەش، کەسێکی وەکو (میشیل عەفلەق) کە خۆی عەرەب نییە، کەچی سەرباری خۆ تواندنەوەی لە عەرەبدا، دیمانەسازیی بۆ تواندنەوەی نەتەوەکانی تریش کردووە، سەرجەم نەتەوەکانی باکووری ئەفریکا و کورد و تورکمان و کلدان و ئاسووریی عیراق و سووریا و لوبنانی لەنێو بۆتەی ئەندێشەسازیی لە کەنداوەوە بۆ زەریا، دەعەرەباندین.

(١٠) لەوبارەیەوە بڕوانە: شەڕی زمان و سیاسەتی زمانەوانی، لویس جان کالفی، ل (١٢٥ — ١٢٦).

(١١) بڕوانە: سەرچاوەی پێشوو، ل (١٢٨).

(۱۲) بڕوانە: ناسیۆنالیزم و سەفەر — کورد لە دیاسپۆرا، مەریوان وریا قانع، ل (۱۷۵).
(۱۳) بڕوانە: زمانی کوردی لە ئاستانەی سەردەمێکی تازەدا، فەرهاد شاکەلی، ل (۱٤۹).
(۱٤) بگەڕێوە بۆ: بەرنامەی شەپۆلەکانی ژیان، (KTV) شەوی ۳-٤/۱/۲۰۱۳.
(۱۵) نامەی خاتوو ئیرینا بوکوفا، بەڕێوەبەری گشتیی یۆنسکۆ، بەبۆنەی ڕۆژی جیهانیی زمانی زگماکەوە، لە ۲۱/فبرایر ۲۰۱۲.
(۱٦) بڕوانە: تاثیر اللغات الاجنبیة علی اللغة الام، د. نجاة عبدالعزیز المطوع، ۷ — ۳۷.
(۱۷) بڕوانە: تاثیر اللغات الآجنبیة علی اللغة الام، د. نجاة عبدالعزیز المطوع ، ۷-۳۷.
(۱۸) لغة الام.. وتعدد اللغات، م. سعید الفرحه الغامدي، www.salfarha.com
(۱۹) بڕوانە: سەرچاوەی پێشوو.
(۲۰) در آمدی بر زبان شناسی معاصر، ولیام اگریدی و...، ص (۵۱۵).
(۲۱) در آمدی بر زبان شناسی معاصر، ولیام اگریدی و...، ص (۵۱٦).
(۲۲) مەیلی نەتەوەیی کۆتاییەکانی سەدەی بیستەم، ئەریک هۆبز باوم، ل (۲۷-۲۹).
(۲۳) نوآم چامسکی و انقلاب زبان شناسی، دکتر رضا نیلی پور، ص (۱۱٦).
(۲٤) زمان و هزر و کەلتوور، پاول هینلی، ل (۱۱٤).
(۲۵) لینگوا فرانکای کوردی، کامیار سابیر، ص (٦۸).
(۲٦) زبان شناسی و زبان...، جولیا اس فالک، ل (٤۷۰).
(۲۷) حول اللغة الکردیة، صلاح سعدالله، ص (۱۸).
(۲۸) سەرچاوەی پێشوو، ل (۱۱۷).
(۲۹) مێژووی پەروەردەو فێرکردن لە ڕۆژگاری کۆنەوە تا ڕێنیسانس، عەلی ئەکبەر مێهرتارا و هاوڕێیانی، ل (۱۳۳).
(۳۰) ناسیۆنالیزم و سەفەر، مەریوان وریا قانع، ل (۱۷۹).
(۳۱) ناسیۆنالیزم و سەفەر، مەریوان وریا قانع، ل (۱۸۰).
(۳۲) لینگوافرانکای کوردی، کامیار سابیر، ل (٦۳).
(۳۳) اللغة والمجتمع — رأي ومنهج، دکتور محمود السعران، ص (۱۰۱).
(۳٤) سەرچاوەی پێشوو، ل (۱۰۰).
(۳۵) سەرچاوەی پێشوو، ل (۳۳).
(۳٦) بۆ زانیاری لەو بارەیەوە، بڕوانە: بزوغ وارتقاء اللغة عند الطفل من المیلاد الی السادسة، الدکتور صالح الشماع، ص (۷٤—۷۸).
(۳۷) بۆ زانیاریی پتر، بڕوانە: علم النفس التربوي، الدکتور عبدالمجید نشواتی، ص (۱۷۱).
(۳۸) بۆ زانیاریی پتر، بڕوانە: اکتساب اللغة، مارک ریشیل، ص (۱٤٦).

(٣٩) لینگوافرانکای زمانی کوردی، کامیار سابیر، ل (٧٠).
(٤٠) سەرچاوەی پێشوو، ل (٦٩).
(٤١) لینگوافرانکای زمانی کوردی، کامیار سابیر، ل (٦٤).
(٤٢) سەرچاوەی پێشوو، ل (٣٧).
(٤٣) کوردی سووریا – بوونێکی نکوولّی لێکراو، هیریەت مونتگومری، ل (١٣٨).
(٤٤) کامیار سابیر، بەراوردێکی بەجێ لەنێوان هەستی کورد لە سەردەمی حکومەتەکەی شێخ مەحموود و ئێستادا دەکات، کە چۆن هەموو کوردی باشووری کوردستان شانازییان بەوەوە دەکرد، کە زمانی حوکمدارییەکە کوردییە و کەس دەنگی ناوچەگەری لێ بەرز نەبووەتەوە. بۆ زانیاریی پتر، بڕوانە: ئەنسرۆپۆلۆجیای زمانی کوردیی پرۆسێسی ستاندەردبوونی، کامیار سابیر، ل (١٠٠).
(٤٥) منهج البحث اللغوي بين التراث وعلم اللغة الحديث، د. على زوين، ص (٨٧).
(٤٦) کوردی سووریا – بوونێکی نکوولّی لێکراو، هیریەت مونتگومری، ص (١٣٨).
(٤٧) سەرچاوەی پێشوو، ل (١٤٠، ١٥١، ١٤٢).
(٤٨) شەڕی زمان و سیاسەتی زمانەوانی، لویس جان کالفی، ل (٢٢١).
(٤٩) کەناڵی ئاسمانیی ڕووداو، بەرنامەی گوڵستان، دیدارێک لەگەڵ نووسەر و پەرلەمانتاری باکوور ئاڵتان تان، کاتژمێر (٩)ی شەوی ٧-٢٠١٤/٢/٨.
(٥٠) بۆ زانیاریی پتر، بڕوانە: زبان مادری چیست و چرا اهمیت دارد، دکتر صدیقه عدالتی، www.azerturkforum.org
(٥١) شەڕی زمان و سیاسەتی زمانەوانی، لویس جان کالفی، ل (٢٠١ – ٢١٣).
(٥٢) لەوبارەیەوە، بڕوانە: زبان شناسی و زبان...، جولیا اس فالک، ل (٤٤٣).
(٥٣) زمانی یەکگرتووی کوردی، جەمال نەبەز، ل (١٤).
(٥٤) زبان شناسی و زبان...، جولیا اس فالک، ص (٤٧٠).
(٥٥) اللغة والمجتمع – رأي ومنهج، دكتور محمود السعران، ص (٤٣).
(٥٦) سەرچاوەی پێشوو، ل (١٤).
(٥٧) زبان شناسی و زبان...، جولیا اس فالک، ل (٤٧٠ – ٤٧١).
(٥٨) لەم ساڵانەدا بەڕێز (ژێرار شالیان)ی فەڕەنسایی، کە نووسەر و ڕۆژنامەنووسێکی بەئەزموونە و کاری لە دۆسیەی کورددا، کردووە و ئاگاداری مێژوو و شۆڕشەکانمانە، بەئاشکراو بەڕاشکاوی لە سەردانێکیدا بۆ زانکۆی سلێمانی، ئەو بۆچوونەی دەربڕی.

## ملخص البحث

### يوم لغة الأم – اللغة الكوردية أمام التحديات التأريخية والعصرية

مما لاشک فيه، فأن اللغة هي العماد الاول في الحفاظ على إبقاء الامة أية أمة كانت، على الديمومة بأسمها وبهويتها القومية. هنالک أمم كثيرة ناضلت وجاهدت في سبيل الحفاظ على لغتها الأم، والتي هي بمثابة الوعاء التي تحتوي على التراث المتراكم عبر الحقب التأريخية لمسيرة الامة، كما وهنالک أمم غابت من على وجه البسيطة نتيجة محو لغاتها من على أطلس اللغاة بسبب الظروف القاسية التي مرت بها تلک الأمم تحت نير المحتلين المستبدين. فالآن ومنذ شهر شباط من عام (٢٠٠٠) الميلادية تحتفل الشعوب بمناسبة إعلان اليونسكو يوم ٢١ شباط يوم لغة الام، وذلک في مؤتمرها العام في شهر تشرين الثاني من عام ١٩٩٩. هذا بطبيعة الحال كانت بمثابة بادرة خير من تلک المنظمة العالمية تجاه الشعوب المضطهدة المحذورة لغاتها، ونحن ككورد المقسمة وطننا إلى أجزاء، لايتمتع أي جزء من تلک الاجزاء بالحرية في إستخدام لغته الأم في شؤونه التربوية والاعلامية، عدا قسم من هذا الاقليم أي جنوب كوردستان المحررة. كما وهنالک تفسيرات متناقضة حول مصطلح لغة الام. عليه أجرينا هذا البحث، والذى يبدأ بمقدمة وفصلين، فالاول يحتوي على ثلاثة محاور. فالمحور الاول يتناول التصورات المتباينة حول لغة الام، فأما الثاني فيتكلم عن طبيعة بعض التحديات التي تواجه لغة الام بصورة عامة. أما في المحور الاخير من هذا الفصل فنتكلم عن تلک التحديات التي تواجه لغة الام الكوردية. أما في الفصل الثاني والمنقسم على اربعة محاور، فالاول خصص للغة الام من منظار المصلحة القومية، والثاني يتكلم عن موقف حكومة إقليم كوردستان تجاه لغة الام الكوردية. فالمحور الثالث يتكلم عن وجهة النظر العلمية حول اللهجات واللهيجات المختلفة في اللغة، وفي المحور الرابع والأخير فنتسائل ونقول ماذا نفعل وكيف نتعامل مع لغة الام، بعدها نحاول الاجابة على تلک التساؤلات ومن ثم نقدم بعض المقترحات، تليها نتائج البحث في عدد من النقاط، كما ونقدم قائمة المصادر ونختتم البحث بملخص باللغتين العربية والانكليزية.

## Abstract

The day of Mother tongue – the Kurdish language in face of historic and modern challenges

Undoubtedly, the language is the fundamental pillar in helping any nation keeps its name and national identity. There are many nations that have struggled to preserve their mother tongue that serves as a container of the heritage accumulated over historical periods of the path of the nation. There are nations that disappeared from the face of the earth as a result of erasing their Languages of the map of languages because of the harsh conditions these nations went through under the yoke of despotic occupiers. Now and since the February 2000 the people celebrate the occasion of the UNESCO Declaration on February 21 as the day of mother tongue. This has been decided by its general conference in November 1999. This, of course, was a good sign of that international organization towards the oppressed languages, and we as Kurds whose homeland is divided into parts, there is not any part of those parts that free in the use of the mother tongue in the educational and media affairs, except the southern part of Kurdistan. The idea and concept of mother tongue are controversial, different contradictory interpretations can be found. This paper was conducted for the above reasons. The paper begins with an introduction and two chapters. The first chapter contains three sections. The first deals with the various perspectives about the mother tongue. The second section deals with the nature of some of the challenges facing the mother tongue in general, and the last section of this chapter discusses these challenges that face Kurdish mother tongue. The second chapter is divided into four sections. The first is devoted to mother tongue from the national interest perspectives, and the second sheds light on the attitude of the government towards the Kurdish mother tongue. The third section deals with the scientific point of view about different dialects in the language. The Fourth section is specified to what we should do and how we deal with the mother tongue, then we try to answer these questions, later on giving some suggestions. The paper is ended with some conclusions and it also provides with a list of references.

# یاسا فۆنۆلۆجییەکان لە شێوەزاری گەرمیاندا

**د. ئومێد بەرزان برزو**
بەشی زمانی کوردی – فاکەڵتی پەروەردە
– زانکۆی گەرمیان

**ناونیشانی توێژینەوەکە:**

ناونیشانی توێژینەوەکە بۆ (یاسا فۆنۆلۆجییەکان لە شێوەزاری گەرمیاندا) تەرخانکراوە. دیارە هەڵبژاردنی ئەم ناونیشانە بۆ چەند هۆکارێك دەگەڕێتەوە:

١- بە شێوەیەکی کەم لێکۆڵینەوە لەسەر ئەم بابەتە لە شێوەزاری گەرمیاندا کراوە. ئاشکرایە، کە شێوەزاری گەرمیانی یەکێکە لە شێوەزارەکانی زاری ناوەڕاست، بەڵام لە هەموو شێوەزارەکانی تری زمانی کوردی پتر گۆڕانی بە سەردا هاتووە، ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ زۆرتری ڕادەی لەباری هۆیە دەرەکییەکانی گۆڕانی زمان[1].

٢- بە مەبەستی خستنەڕووی دیاردەی گۆڕانی دەنگەکانو یاسا دەنگییەکان لەم شێوەزارەدا. چونکە زمان و ئاستەکانی زمان بەردەوام لە گۆڕان و گەشەکردندایە. بە تایبەتی ئاستی فۆنەتیك و فۆنۆلۆجی زیاتر لە ئاستەکانی تری زمان دەگۆڕێ و زۆرتریش هەستی پێدەکرێ[2].

٣- مۆرفۆنۆلۆجی لە سێ بەش پێکهاتووە[3]:

ا- زانستی دروستەی فۆنۆلۆجیی مۆرفیمەکان.

ب- زانستی گۆڕانە دەنگییە هاوتاکان کە مۆرفیمەکان لە ئەنجامی لێکدانیاندا تووشی دەبن.

پ- زانستی زنجیرەی گۆڕانە دەنگییەکان کە ئەرکی مۆرفۆلۆجی دەگێڕن.

واتە زاراوەی گۆڕانە وشەسازییە فۆنۆلۆجییەکان (مۆرفۆفۆنۆلۆجییەکان) بەو گۆڕانە دەنگییانە دەوترێت، کە بە سەر دروستە وشەسازییەکاندا دێت[4]. بەمەش تێکچڕژانو پەیوەندیی هاوبەش لە نێوان زانستی وشەسازیو فۆنۆلۆجیدا

دەنوێنێت[٥]. بۆیە نواندنو خستنەڕووی یاسا فۆنۆلۆجییەکان تەنها پەیوەندیو تێکچڕژانی هەردوو ئاستی فۆنۆلۆجیو مۆرفۆلۆجی (مۆرفۆفۆنۆلۆجی) ناگرێتەوە، بەڵکو پەیوەستە بە ئاستەکانی فەرهەنگسازیو وشەسازیو ڕستەسازییەوە، چونکە گۆڕانی دەنگەکان لە فەرهەنگی وشەکان لە نێوان زارەکان یان شێوەزارەکانی زمانێکدا دروستدەبن، هەروەهاش لە ئەنجامی لێکدانی مۆرفیمە سەربەخۆو وشەداڕێژەکان لە ئاستی وشەسازی بە مەبەستی داڕشتنو لێکدان، یان ڕیزکردنو خستنە تەکیەکی مۆرفیمە سەربەخۆو وشەگۆڕەکان لە ئاستی سینتاکسدا ئەم گۆڕانە دەنگییانە دروستدەبن.

### گرنگی توێژینەوەکە:

گرنگی ئەم توێژینەوەیە لەوەدایە، کە کۆمەڵێك ئەنجامی نوێی لەبارەی دیاردەی گۆڕانی دەنگەکان لە شێوەزاری گەرمیاندا خستووەتەڕوو.

### سنووری توێژینەوەکە:

سنووری توێژینەوەکە لە ئاستی فۆنۆلۆجیدایە، چونکە یاسای گۆڕانی دەنگەکان بە یاسا فۆنۆلۆجییەکان ناودەبرێن، گۆڕانی ئەم دەنگانەش پەیوەستن بە ئاستەکانی فەرهەنگسازی و وشەسازی و ڕستەسازییەوە.

### ڕێباز و کەرەستەی توێژینەوەکە:

لەم توێژینەوەیەدا ڕێبازی پەسنیی شیکاری پەیڕەوکراوە. کەرەستە و نموونەی ناو باسەکەش لە زمانی ئاخاوتنی ئێستای خەڵکی شێوەزارەکەوە (ناوچەکانی کفری و کەلار و دەوروبەریان) وەرگیراون.

**سەرەتا:**

زمان بوونەوەرێکی زیندووەو هەمیشە لە گەشەو گۆڕاندایە. بۆیە هەموو زمانەکان بە بەردەوامی دەگۆڕێن: دەنگەکان، ڕستە و واتا[٦]. هیچ گۆڕانکارییەکیش لەناکاو ڕوونادات، بەڵکو بە هێواشی ڕوودەدات[٧]. تەنانەت لە زمانی کوردیشدا کورتبوونەوەو گۆڕانی زمان زۆر بەزەقی هەستی پێدەکرێ، چونکە زمانی کوردی لەمێژ نییە، کە دەستی بە نووسین کردووەو زمانێکی ستاندەری سەراپای نییە[٨]. ئەم گۆڕانەش لە زمانێکەوە بۆ زمانێکی ترو تەنانەت لە ناو زمانێکیشدا لە زارێکەوە بۆ زارێکی تر یان لە شێوەزارێکەوە بۆ شێوەزارێکی تر جیاوازی هەیە، کە هەموو دانەو کەرەستە زمانییەکان لە هەموو ئاستەکانی زماندا دەگرێتەوە، بەمەش دەتوانرێت کەرەستەکانی ئەو زمانە یان زارەکانی زمانێك یان شێوەزارەکانی زارێك بەراورد بکرێن، تا بزانرێت تا چەند گۆڕانیان بە سەردا هاتووە، چونکە ئەم گۆڕانانە فاکتەرێکی سەرەکیی چەندێتیو چۆنێتی تێکچڕژانو تێکەڵبوونو پەیوەندیی نێوان ئاستەکانی زمان دەستنیشان دەکات، بۆ نموونە زۆرجار لە نێوان دوو زار یان دوو شێوەزاردا بەکارهێنانو بەراوردکردنی وشە فەرهەنگییەکان یان داڕشتنو لێکدانی مۆرفیمەکان یان ڕیزکردنو خستنەپاڵیەکی مۆرفیمەکان دەبێتە هۆی دروستبوونی جیاوازیی دەنگیو چەندین دیاردەی گۆڕانی دەنگەکان، کە بەمەش پەیوەندیی ئاستی فۆنۆلۆجی بە ئاستەکانی فەرهەنگسازیو وشەسازیو ڕستەسازییەوە دەبەستێتەوە. چونکە ئەگەر گوێ بە جۆری گۆڕانی وشەکانو جۆری داڕشتنی ڕستەکانو بەکارهێنانیان لە ڕووی زمانەوە نەدرێت، ئەوا بەراوردکردنو بەرامبەریکردنی وشەکانو نێوە کەسییەکان بە تەواوی لەناودەچنو ئەهمیەتی زانستییانەیان نامێنێت[٩].

فۆنۆلۆجیش دووەم لقی سەرەکیی زانستی دەنگسازییە، کە گرنگی بە لێکۆڵینەوەی دەنگیی زمانی لە دروستەی ناوەوەدا دەدات، چ لە ڕووی پەیوەندی بە دەنگەکانی ترەوە ئەمە لە لایەك، لە لایەکی ترەوە واتا یان ئەرکی دەنگ لە دەستنیشانکردنی واتادا[١٠]. تەنانەت ئاستی فۆنۆلۆجیی کوردیش هەر لە سەرەتاوە مایەی گرنگی پێدانی زمانەوانە کوردەکان بووە و توانیویانە بە

سەرکەوتوویی زۆربەی فۆنیمەکانو یاسا فۆنۆلۆجییەکان دیاری بکەنو لە برگەی کوردی بکۆڵنەوە[11]. بەمەش زمانی کوردی کۆمەڵێك یاسای تایبەت بە خۆی بۆ ڕێکخستنو ڕیزکردنی فۆنیمەکانی لە سنووری برگەی فۆنۆلۆجیدا هەیە، ئەویش:

١- فۆنیمەکانی لە دەنگەکانییەوە دەستنیشان دەکات.

٢- لەناو قاڵبی برگەی فۆنەتیکدا، ئەم فۆنیمانە لێکدەدات بۆ پێکهێنانی برگەی فۆنۆلۆجی.

٣- لە ئەنجامی لێکدانی فۆنیمەکان، دەنگ هەیە دەگۆڕێ، هەیە دەتوێتەوە، هەیە تازە پەیدا دەبێ،...هتد[12].

بەم شێوەیە ئەو یاسایانەی فۆنیمەکانی زمان دەستنیشان دەکەنو لەناو قاڵبی برگەی فۆنەتیکی لێکیان دەدەن بۆ پێکهێنانی برگەی فۆنۆلۆجیو هۆی لێکچوون یان پەیدابوون یان تێچوون یان ..... هەندێك دەنگ پیشاندەدەن، بە یاسا دەنگییەکان (فۆنۆلۆجییەکان) ناودەبرێن. گۆڕانی دەنگەکانیش لە شێوەزاری گەرمیاندا بووەتە هۆی دروستبوونی کۆمەڵێك دیاردە و یاسای دەنگی، کە ئەمانەن:

**١- لێکچوونی دەنگ:**

لەم پرۆسەیەدا دەنگێك دەگۆڕێت، بۆ ئەوەی زۆرتر لە دەنگێکی دراوسێی خۆی بچێت. واتە بریتییە لە کاریگەریی دەنگێك لەسەر دەربڕینی دەنگێکی تر، بۆ ئەوەی دەنگەکان زیاتر وەك یەکیان لێبێت یان چونیەك بن[13].

### دوو جۆر لێکچوونی دەنگ هەیە :

**ا- لێکچوونی تەواو:**

لەم جۆرە لێکچوونەدا دەنگێك لە دەنگێکی تر نزیك دەبێتەوە بە هۆی کارتێکردنی یەکێکیان لە سەر ئەوی تریان، بە جۆرێك هەردوو دەنگەکە بە تەواوی وەك یەکیان لێدێت[14]. لێکچوونی تەواویش لە ڕووی ئاڕاستەکردنەوە بە سەر دوو جۆردا دابەشکراوە:

١- لێکچوونی ڕاستەوخۆ (progressive).

٢- لێکچوونی پێچەوانە (Regressive).

**١- لێکچوونی ڕاستەوخۆ:** ئەو لێکچوونەیە، کە دەنگێك کاردەکاتە سەر دەنگێکی پاش خۆی[١٥]. واتە کارتێکردنی دەنگی پێشەوە بۆ سەر دەنگی دواوە[١٦]. بۆ نموونە:

لەگەڵت دێم > وەلت تێم

مەحموود > مەحموو

مەولوود > مەولوو

**٢- لێکچوونی پێچەوانە:** ئەو لێکچوونەیە، کە دەنگێك کاردەکاتە سەر دەنگێکی پێش خۆی[١٧]. واتە کارتێکردنی دەنگی دواوە بۆ سەر دەنگی پێشەوە[١٨]. بۆ نموونە:

کردتەوە > کرتتۆ (کرتۆ)

بردتەوە > برتتۆ (برتۆ)

هێناتەوە > هاورتتۆ (هاورتۆ)

بردتان > برتتان (برتان)

کردتان > کرتتان (کرتان) [١٩]

سابوون > ساوین

**ب- لێکچوونی ناتەواو:**

لەم گۆڕانەدا بەشێك واتە سیفەتێك لە دەنگەکە دەگۆڕێت، بۆ ئەوەی جۆرە گونجانێك لەگەڵ دەنگێکی تردا پەیدا بکات، بە تایبەتی لەگەڵ دەنگە کارتێکردووەکەدا، واتە گۆڕانەکە هەموو سیفەتی دەنگەکە ناگرێتەوە، بەڵکو تەنیا لە سیفەتێکدا لەگەڵ دەنگە کارتێکردووەکەدا یەکدەگرنەوە، بۆ ئەوەی دوو دەنگە جیاوازەکە لەیەکتر نزیك ببنەوە، بە تایبەتی لە سیفەتی قەڵەوی یان گڕی یان کپی...هتد[٢٠]. واتە لەم دیاردەیەدا تەنها لەیەك ڕووەوە گۆڕان بە سەر سیفەتی دەنگەکەدا دێت، ئەویش لە سیفەتی کپی یان گڕی یان قەڵەوی یان لێوخڕبوونەوە یان سازگە....، کە لێرەدا باسیان دەکەین:

**یەکەم/ لێکچوون لە ڕووی کپییەوە:**

لەم جۆرە لێکچوونەدا دەنگێکی گڕ دەگۆڕێت بۆ دەنگێکی کپ[٢١]. بۆ نموونە:

١- /ز/ بۆ /س/:

گەڵێ جار دەنگی /ز/ کە گڕە لە بەردەم دەنگی کپدا وەك /س/ گۆ دەکرێت، بۆ نموونە:

نازك > ناسك

بەرزتر > بەرستر

٢- /ژ/ بۆ /ش/:

دەنگی /ژ/ گڕە، کاتێ لە پێش دەنگی /ت/ی کپەوە دێت، بە/ش/ی کپ دەردەبڕدرێت، بۆ نموونە:

ڕۆژتان باش > ڕۆشتان باش

تیژتر > تێشتر

ڕژان > ڕشیان

٣- /ب/ بۆ /پ/:

بسکیت > پسکێت

**دووەم/ لێکچوون لە ڕووی گڕییەوە:**

لەم جۆرە لێکچوونەدا دەنگێکی کپ دەگۆڕێت بۆ دەنگێکی گڕ[٢٢]. بۆ نموونە:

١- /س/ بۆ /ز/:

سڵق > زڵق

سۆپا > زۆپە

تەسبیح > تەزبیح

دەستگیران > دەزویران

٢- /ك/ بۆ /گ/:

چناکە > چناگە

جاجك > جاجگ

٣- /پ/ بۆ /ب/:

پاقلە > باقلە

پاتری > باتری

پەتاتە > بەتاتە

پاقلاوە > باقلەوا

٤- /ش/ بۆ /ژ/:

مەلاشوو > مەلاژگ

مەشغووڵ > مەژغوڵ

٥- /ف/ بۆ /ڤ/:

حەفت + دە > حەڤدە

٦- /غ/ بۆ /خ/:

مەغسەلە > مەخسەلە

**سێیەم/ لێکچوون لە ڕووی قەڵەوییەوە:**

ئەو دەنگانەی سیفەتی قەڵەوییان لەگەڵدا نییە، لە ئاکامی کارتێکردنی دەنگەکانی دەوروبەر درکاندنیان دەگۆڕێت و سیمای قەڵەوی وەردەگرن[٢٣]. واتە گۆڕانی دەنگی سووك بە قەڵەو بە مەبەستی گونجان لەگەڵ دەنگێکی تردا لە سیفەتی قەڵەویدا[٢٤]. بۆ نموونە:

١- /ل/ بۆ /ڵ/:

کەمال > کەماڵ

جەمال > جەماڵ

خالد > خاڵد

زەلاتە > زەڵاتە

٢- /ر/ بۆ /ڕ/:

بۆری > بۆڕی

موبەریدە > موبەڕیدە

**چوارەم/ لێکچوون لە ڕووی سازگەوە:**

بریتییە لە گۆڕانی سازگەی دەنگێك، بۆ ئەوەی لە سازگەی دەنگێکی تر نزیك بێتەوە، یان بە مەبەستی گونجانی سازگەی دوو دەنگی دراوسێ[٢٥]. واتە سازگەی دەنگی کارتێکراو دەگۆڕێت، بۆ ئەوەی وەکو سازگەی درکاندنی دەنگی

کارتێکردووی لێبێت، یان لێی نزیك بێتەوە. بەو واتایە هاوبەشی لێکچوون لە نێوان دەنگی کارتێکراو و دەنگی کارتێکردوودا لە ڕووی سازگەوەیە[٢٦]. بۆ نموونە:

بەرانبەر > بەرامبەر

جانباز > جامباز

**٢- تێچوونی دەنگ:**

ئەم زاراوەیە لە زانستی فۆنەتیكو فۆنۆلۆجیدا بەکاردەهێنرێت، کە ئاماژە بۆ تێچوونو فڕێدانی دەنگەکان لە ئاخاوتندا دەکات، ڕەنگە دەنگە ڤاوڵەکان یان کۆنسونانتەکان فڕێ بدرێن، ڕەنگە هەندێك جاریش هەموو بڕگەکە فڕێ بدرێت[٢٧].

تێچوونی دەنگ لە سێ باردا دەبینرێت:

**ا- تێچوونی کۆنسونانت. ب- تێچوونی ڤاوڵ. پ- تێچوونی بڕگەیەك (کۆنسونانتو ڤاوڵ پێکەوە).**

**ا- تێچوونی کۆنسونانت:**

١- فۆنیمی /د/:

ا- تێچوونی فۆنیمی /د/ لە ناوەڕاستو کۆتایی وشەدا بەرچاو دەکەوێت، بۆ نموونە:

توند > تن/تون

سوێند > سوێن

مەیدان > مەیان

سەید مەحموود > سەی مەحموو

دەربەندیخان > دەروەنیخان

دڕاندن > دڕانن

زامدار > زامار

لەگەڵماندا > وەلمانا

بە ئاسماندا > وە عاسمانا

لە زستاندا > لە زمسانا

ب- هەروەها زۆرجار فۆنیمی /د/ دەقرتێنرێت، بەهۆی کارتێکردنی ئەو دەنگەی کە بە دوایدا دێت، بە تایبەتی بکەوێتە پێش فۆنیمی /ت/ یان /ك/وە، بۆ نموونە:

زیاد + تر > زیاتر

زیاد + کردن > زیاکردن

پ- هەروەها لەم شێوەزارەیشدا تێچوونی فۆنیمی /د/ لە دەربڕین و نووسینی ژمارەکانیشدا بەدیدەکرێت، بۆ نموونە:

یەك + دە = یازدە > یانزە

دوو + دە = دوازدە > دوانزە

سێ + دە = سیازدە > سیانزە

پێنج + دە = پازدە > پانزە

شەش + دە = شازدە > شانزە

٢- فۆنیمی /ت/:

ا- بەزۆری لە کۆتایی وشەدا تێدەچێت، بۆ نموونە:

ڕاست > ڕاس

وەستا > وەسا

پێست > پێس

دەست > دەس

ماست > ماس

مەبەست > مەبەس

دەربەست > دەروەس

مەقەست > مەقەس

ئێستا > ئیسە

زستان > زمسان

خێوەت > خێمە

کۆست > کۆس

خەست > خەس

پێویست > پێویس

ناوەڕاست > ناوەڕاس

هەڵوێست > هەڵوێس

ب- ئەو وشانەی کە دەبنە بەشی یەکەمی وشەی لێکدراو و کۆتاییيان بە فۆنیمی /ت/ هاتووە، لە زۆر باردا تێدەچێت، بۆ نموونە:

دەست + کەفت > دەسکەفت

حەوت + سەد > حەوسەت

دەست + هاڕ > دەساڕ

دەست + گا > دەسگا

سەر+ تا + پا > سەراپا

پ- جێناوی لکاوی کەسی دووەمی تاك (یت)و کەسی سێیەمی تاك (ێت/ات)، لەم جێناوانەدا زۆرجار فۆنیمی /ت/ تێدەچێت، بۆ نموونە:

دەچێت > ئەچێ

دەخۆیت > ئەخۆی

دەچیت > ئەچی

دەخوات > ئەخوا

٣- فۆنیمی /ب/:

ا- لە هەندێ وشەدا تێدەچێت، بۆ نموونە:

تەمبەڵ > تەمەڵ

پێغەمبەر > پێغەمەر

ب- نیشانەی /ب/ لە پێکهاتنی کرداری فەرمانو ئیلزامدا بەشداری دەکات، هەندێ جار ئەو /ب/یە تێدەچێتو قووت دەدرێ، بۆ نموونە:

هەڕابکە > هەڕاکە

دابنیشە > دانیشە

پیشانم بدەن > نیشانم دەن

ڕێم بدە > ڕێم دە

بووبێت > بوێت

وەکو بناغەیەك بۆ چاوگە ڕەسەنەکان، چونکە لێکۆڵینەوە زمانەوانییەکان بەپلـەی یەکــەم لەلایــەن زمانــەوانانی بابــانی و ســۆرانی پــەرەی پێــدراوە ئینجــا لــە شێوەزارەکانی تر.

–بەکارهێنانی کۆڵەگەی چاوگ لەسەر زار و ئاخاوتنی شـێوە کۆنـەکان زیـاتر پارێزراوە، ئەمەش بەڵگەیەکە بۆ کۆن و کۆنتر و نـوێی شـێوەزارە کوردییـەکان لـە دوای سەرچاوە ئاڤێستاییەکە، بەواتای ئەوەی ئەگەر شێوەزارێك، هەرچەند زیاتر ئەم پاشگرە بەکاربهێنێت کۆنترە لەو شێوەزارەی کە کەمتر بەکاری دەهێنێت .

## دەستووری دروستبوونی چاوگ

دەستووری دروستبوونی چاوگ لە شـێوەزارە کۆنەکانـەوە وەك بنەواشـە تـا نوێترین شێوەزاری گـۆڕاو، پێکهاتـە و قۆناغـەکانی گەشـە و گـۆڕان لەسـەر ڕەگـی چاوگ، بـەلادانی (ن) و نیشـانەی چـاوگ، ڕەگـی چـاوگ دەدۆزرێتـەوە بێجگـە لـە چاوگەکانی نیشانەی (وو – ر) لەگەڵ ناوازەکان و ئەو چاوگانەی کە پیتی کۆتـایی ڕەگەکانیان (ژ–ش) نییە، بەڵام بە نیشـانەی (شـت) دروسـت دەبـن وەك (شـۆر–شووشتن/ ماڵ–ماشتن/ هێل–هێشتن.........تاد).

ا– **چاوگی تێپەڕ** ( نووسین – کێلان – خوێندن – فرۆشتن ........تاد

–ڕەگی ( نووس – کێل – خوێن – فرۆش)

١– (ڕەگ + ە) = ناوی چاوگ = (نووسە – کێلە –خوێنە – فرۆشە)

٢– ( ڕەگ + ەر ) = بکەر= ( (نووسەر – کێلەر – خوێنەر – فرۆشەر)

٣– (ب + ڕەگ) = بکەر = (بنووس – بکێل – بخوێن – بفرۆش )

٤– ( ڕەگ + یـان) = کۆڵەگـەی دیـاری چـاوگ = (نووسـیان ( نووسـان – نووسـین) / (کێلیان(کـالین–کـێلان– کـێلین)/ (خوەینیـان (خـوەینین–خوێنـدن–خوانـدن –خوونـدن –خینـدن –خانـدن )/(فرۆشـیان ( فرۆشـان – فرۆشـین – فرۆشتن)

٥– ( ڕەگ + ریـان (ران) = کۆڵەگـەی نادیـاری چـاوگ = (نووسـریان – نووسران) – (کێلریان – کێلـران ) – (خوەینریـان – خـوێنران) – (فرۆشـریان – فرۆشران )

٦- ( ڕەگ + یـار) = بکـەری کۆڵەگـە = (نووسـیار – کێلیـار – خوەینیـار (خوێنکار) – فرۆشیار

٧- ( ڕەگ + راو) = بـەرکار = (نووسـریاگ – نووسـریاس – نووسـریای – نووسریاو –نووسراو...........تاد

– شێوەزارەکانی کرمانجی ژووروو لەم بناغەیەدا لادەدەن (نڤیسـی–کێلـی– خواندی–فرۆشتی..........تاد)

٨- ( ڕەگ + را) = بکەری نادیار = (نووسریا – نووسرا.............تاد

– شێوەزارەکانی کرمـانجی ژووروو لـەم بناغەیـەدا لادەدەن بـەهۆی چـاوگی (هـاتن+چـاوگ) بکـەری نادیـاری دروسـت دەکـەن (هاتـە نڤیسـین –دهێتـە نڤیسین..........تاد).

**ب- چاوگی تێنەپەڕ** (کولاّن – فڕین – مردن – نیشتن )

– (ڕەگی ( کوڵ – فڕ – مر – نیش)

١- ( ڕەگ + ە) = ناوی چاوگ = ( (کوڵە – فڕە – مرە – نیشە)

٢- ( ڕەگ + یان) = کۆڵەگەی دیـار = (کوڵیـان / کـولاّن – کـوڵین) دەبێتـە (کـەلین) لـە شـێوەزارەکانی کرمـانجی ژووروودا) – (فڕیـان – فـڕین / ( مریـان – مرین – مردن –مرن ) – (نیشیان – نیشین – نیشتن)

**ج- چاوگی تێپەڕکراو**

١- (ڕەگـی تێنەپـەڕ + ێـن) = ڕەگـی تێپـەڕکراو:- (ێ) شـکانەوەی (ا) ی بنەڕەتییە، (ن) ی چاوگ هەمیشەییە، هەر لەبەر ئەمـە چـاوگی تێنەپـەڕ بـە هـەر نیشانەیەك بێت هەڵدەگەڕێتەوە بۆ نیشانە بنەڕەتییەکـەی خۆی.(کـولاّن / فـڕین / مردن / نیشتن........تاد ڕەگە تێپەڕکراوەکانیان دەبێتە (کوڵێن – فـڕێن – مـرێن – نیشێن................تاد)

٢- (ڕەگـی تێپـەڕکراو + ەر) = بکـەر = (کوڵێنـەر – فڕێنـەر – مرێنـەر – نیشێنەر.............تاد).

٣- (ڕەگی تێپەڕکراو + ران) = کۆڵەگـەی نادیـار = (کـوڵێنران – فڕێنـران– مرێنران–نیشێنران..........تاد).

٤– (ڕەگی تێپەڕکراو + را) = بکەری نادیـار = (کـولێنرا – فڕێنـرا–مرێنـرا–نیشێنرا..........تاد).

٥– (ڕەگـی تێپـەڕکراو + راو) = بـەرکار = (کـولێنراو–فڕێنـراو–مرێنـراو–نیشێنراو.............تاد).

– ڕەگـی تێپـەڕکراو و چـاوگی تێپـەڕکراو لەسـەر ڕەگـی تێنەپـەڕ دروسـت دەبێت (کولێن – کولاندن / فڕێن – فڕاندن / مرێن– مراندن / نیشێن – نیشـاندن ..............تاد).

**سەرنج:–**

ا– ناوی چاوگ هاوبەشە لـە چـاوگە تێپـەڕ و تێنەپـەڕەکان (نووسـە – کوڵـە .............تاد)

ب– کۆڵەگەی دیار هاوبەشە لە نێوان چاوگە تێپەڕ و تێنەپەڕەکان (نووسیان – کولێیان..............تاد)

ج– کۆڵەگـەی نادیـار هاوبەشـە لـە نێـوان چـاوگە تێپـەڕ و تێپـەڕکراوەکان (نووسران – کولێنران............تاد)

## جیاکردنەوەی ڕەگ

جیاکردنەوەی ڕەگ لە چاوگ و لـە کـاردا وەك دوو باسـی جیـا لـە بابـەتێکی ڕێزمانیدا شیکردنەوە و ڕوونکردنەوەکان ئاسانتر دەکات، بەلاَم جیا نەکردنەوەیان دەبێتە هۆی ئەوەی کە بابەتی ڕەگ بە تێکئالاَوی بمێنێتەوە، چونکە بـە گـوێرەی توێژینـەوەکان، لـە هەنـدێ چـاوگدا ڕەگـی چـاوگ و ڕیشـەی کـار بـەبێ جیـاوازی بەدەردەکـەون بـە تایبـەتی لـە چـاوگە ئاسـاییەکاندا وەك (کـڕین–فرۆشـتن – برژان......تـاد)، بـەلاَم لـە هەنـدێ چـاوگی تـردا گـۆڕانی ڕەگ لـە یـەکێك لـە قۆناغـەکانی گەشـە و گـۆڕانی چـاوگەکەدا یـا لـە گەردانکردنـدا بەدەردەکـەوێت هەروەك ڕەگی (گیر) کە چـاوگی (گـرتن)ی لەسـەر دروسـت دەبێـت یـا لـە هەنـدێ چاوگی تردا لە شێوەزارێکدا دەستوورییە، بەلاَم لە شێوەزارێکی تـردا بـە نـاوازە و لە دەستوور لادەر هەژمار دەکـرێن هـەروەك (شـۆرین–خـوازین–نێـژین......تـاد) دەستوورینە، بەلاَم (شووشتن –خواستن –ناشتن) ناوازە و بە لـە دەسـتوور لادراو هەژمار دەکرێن .

لــە ڕاســتیدا بــەکارهێنانی چــاوگەکان بــە جیــاوازیی شــێوەزارەکان و نەگەڕاندنەوەیان بۆ شێوە بنەڕەتییەکانیان لە شێوەزارە کۆنەکانـدا چاوبەسـتی و بەلاڕێدا ڕۆیشتنێکی زۆری لە لێکدانەوەکانماندا کـردووە، چـونکە هـەر شـێوەزارێك شێوەی بەکارهێنانی چاوگەکانی دەکاتـە نموونـە بـۆ سـەلماندنی لێکدانـەوەکان و هەڵهێنجانی دەستوور و بنەما لە دەستنیشانکردنی نیشـانەکانی چـاوگ و شـێوەی گەردانکردنی کارەکـان و جیاکردنـەوەی چـاوگی نـاوازە و ئاسـایی، بـەبێ ئـەوەی چـاوگ و ڕەگـە بنەڕەتییەکـەی دەستنیشـان بکرێـت تـا گۆڕانکارییـەکانمان بـۆ بەدەربکەوێت لە شێوەی ئەو گۆڕانانەی کە لە پێکهاتەکاندا پەیدا دەبێت.

–چاوگی ئاسایی و ناوازە لە سەر ڕەگی بنەڕەتیی چـاوگەکان، پێکهاتـەکانی لە ناوی چاوگ و کۆڵەگەی دیار و نادیار و بکەری دیار و نادیار و بەرکاری لە سـەر دروست دەبێت، بەڵام ڕیشەی کار بە گوێرەی نیشانەکانی چاوگ و دەمـەکانی کـار لە گەردانکردندا جیاوازی لێ بەدەردەکەوێت .

ئێمە لـەم باسـەدا هـەوڵ دەدەیـن کـە ڕەگـی چـاوگ و ڕیشـەی کـار لەیـەکتر جیابکەینـەوە، لـە هـەمان کاتـدا چـاوگەکانیش بـە نیشـانە جیاوازەکـان بەیـەکتر ببەستینەوە، بۆ ئەم مەبەستەش ئەو نموونانە دەخەینە بـەر بـەراورد و لێکدانـەوە کە لە کتێبەکانی زمان و ئەدەبی کوردیدا هاتووە، چونکە پرۆگرامـەکانی خوێنـدن کۆکەرەوەی بیر و بۆچوونی زۆربەی سەرچاوەکانن.

لە کتێبـی زمـان و ئـەدەبی کـوردی پـۆلی نۆیـەمی بنـەڕەتی، لـە چـاوگەکانی نیشــانەی (ا – ی) تێپــەڕ بــە لابردنــی نیشــانە و (ن) ی چــاوگ، ڕەگ و ڕیشــە دەدۆزرێتەوە وەك (هێنان – هـێن / پیڤـان – پیڤـــ / کـێلان – کێـل / شـێلان – شێل / کێشان – کێش / بڕین – بڕ / نڤیسین– نڤیس / کڕین – کـڕ / بەخشـین – بەخش / زانین – زان ) [٥] هەروەك دیارە لەبەر ئەوەی نیشانەی (ا – ی) نیشانەی بنــەڕەتی چــاوگەکانن لــە زمــانی کوردیــدا، هــیچ جیاوازییــەك لــە نێــوان ڕەگ و ڕیشەکانیاندا نییە.

– لــە چــاوگەکانی ( ا )ی تێنەپــەڕ جیاوازییــەك کــراوە بــە دەســتوور لــە دۆزینەوەی ڕیشەی کاردا کـە نیشـانەی ( ا ) لـە کـاری داهـاتوودا دەشـکێتەوە بـۆ (ێ)، لە چـاوگە تێپـەڕەکانی بـە هـەمان نیشـانەی جیادەکاتـەوە وەك (خنکـان –

خنکـێ/ بـرژان – بـرژێ / زان – زێ / شـکان – شـکێ/ دڕان – دڕێ) [٦] چـاوگە تێنەپەڕەکانی نیشانەی (یائی) وەك ( فـڕین – فـڕ / ڕەڤـین – ڕەڤــ / لـەرزین – لەرز / زڤڕین–زڤڕ).

– چاوگی (زان) لە چاوگە ناوازەکاندا لێکدانەوەی بۆ دەکەین، چونکە ئـەم چاوگە دەستووری دروستبوون و دەستنیشانکردنی ڕەگ و ڕیشەی جیاوازە لەگەڵ چاوگەکانی تر.

لە کتێبی زمان و ئەدەبی کوردی پۆلی دوازدەی ئامادەیی چـاوگی (ترسـان) ڕەگی کارەکەی بە (ترس) نووسراوە، بەڵام چـاوگی (گـەڕان) ڕەگـی کارەکـەی بـە (گەڕێ)[٧]

(ترسان) چاوگێکی تێنەپەڕی ئانییە هەروەك ( گەڕان – خنکـان – بـرژان – شکان – دڕان .......تاد ).

لە گەردانکردنی کاری ڕابوردوودا (ترسا/ گەڕا / خنکا.........تاد).

لە گەردانکردنی کاری داهاتوودا ( دەترسێ + ت/ دەگەڕێ +ت/ دەخنکـێ + ت.........تاد)، هەروەك گەردانکردنی چاوگی تێنەپـەڕە بـە نیشـانەکانی تـر وەك (فڕین – مردن – کەوتن...........تاد). نیشانەی چاوگەکەی لێ بکرتێنـی، ڕەگـە بنەڕەتییەکە دەمێنێتەوە .

گەردانکردنی کاری ڕابوردوو(ترسا–فڕی –مرد – کەوت)

گـــەردانکردنی کـــاری داهـــاتوو (دەترســـێ+ت/دەفڕێ + ت /دەمـــرێ +ت /دەکەوێ + ت)

هەروەك دیارە هیچ جیاوازییـەك لـە نێـوان گـەردانکردنی چـاوگەکاندا نییـە . نیشـــانەکانی چـــاوگ بەدیارخـــەری کـــاری ڕابـــوردووە، شـــکانەوەی (ا) بـــۆ (ێ) بەدیارخەری کاری داهاتووە.

ئێمــە یاســایەکمان هەیــە کــە دەڵــێین هــەموو چــاوگێکی تێنەپــەڕ بەهــەر نیشانەیەك بێت لە گەردانکردنی کاری داهاتوودا بـە (ێ ت ) گـەردان دەبێـت، (ێ) شکانەوەی (ا)ی بنەڕەتییە بۆ چاوگە تێنەپەڕەکان، لەبەر ئەمە دەستنیشانکردنی ڕەگ و ڕیشە لە چاوگە تێنەپەڕەکان هەروەك چاوگە تێپەڕەکان دەکەونە ژێر یـەك یاسـای دۆزینــەوە، بــەڵام ئــەو دەســتوورەی کــە کــراوە بــە جیــاوازی لــە نێــوان

دۆزینەوەی ڕیشەی کاری چاوگە تێنەپەڕی (ا–ی) لەگەڵ تێپەڕی (ا – ی) ەکان، هیچ لێکدانەوەیەکی پشتبەست بە بنەمایەکی ڕێزمانی هەڵناگرێ، بەڵکو هەر جیاکردنەوەیەکە لە ڕووکەشە دیارەکاندا، بەبێ قووڵبوونەوە و لەیەکتر نزیککردنەوەی یاسا و دەستووره ڕێزمانییەکان، چونکە ئەگەر بە گوێرەی ئەم یاسایە بێت کە لە پرۆگرامەکانی خوێندندا هاتووە دۆزینەوەی ڕیشەی کار لە چاوگە تێنەپەڕە (ا) یەکان بە شێوەیەکە، بەڵام لە چاوگە (ی) ەکان بە شێوەیەکی ترە، کەواتە ئەگەر چاوگێك بە هەردوو نیشانە دروست ببێ، دەبێتە خاوەن دوو ڕەگ، ئەمەش لەگەڵ هیچ دەستوورێکی ڕێزمانیدا ناگونجێ وەك (لەرزان – لەرزێ/ لەرزین – لەرز/ زڤڕان –زڤڕێ/ زڤڕین – زڤڕ/ هەژان – هەژێ/ هەژین –هەژ / خشان –خشێ/ خشین –خش / دڕان – دڕێ/ دڕین – دڕ / بڕان – بڕێ / بڕین – بڕ / گۆڕان – گۆڕێ / گۆڕین – گۆڕ / قەومان –قەومێ / قەومین – قەوم.........تاد).

– ڕیشەی کار بە گوێرەی نیشانەکانی چاوگی لەجیاتی هەندێ جیاوازیمان بۆ دروست دەکات، وەك ئەوەی لێ دێت کە هەر کۆمەڵێك چاوگ بە یاسایەکی تایبەت ڕەگەکانیان بدۆزرێتەوە، لەهەمان کاتیشدا ئەوە بەدەردەکەوێت کە کۆمەڵێك چاوگ بە هەمان نیشانەش جیاوازییان دەکەوێتە نێوان .

– چاوگەکانی نیشانەی لەجیاتی(ت – د) هەندێکیان بە لابردنی نیشانەی (تن–دن) ڕیشەی کاریان دەردەهێنرێ وەك (فرۆشتن– فرۆش / ڕێستن – ڕێس / کەڤتن – کەڤ / گرتن – گر / خوێندن – خوێن / مردن – مر /بووردن – بوور.......تاد) هەروەك دیارە دۆزینەوەی ڕەگ و ڕیشە لەم چاوگانەدا هیچ جیاوازییەکی لەگەڵ چاوگەکانی بە نیشانەی (ا – ی) تێپەڕدا نییە، چونکە گۆڕانی نیشانەکەی لە بنەڕەتییەوە بۆ نیشانەی لەجیاتی:

أ– گۆڕانی لە ڕەگی چاوگەکەدا نەکردووە .

ب– ڕێککەوتووە لە گەردانکردن و جیاوازی لە نێوان دەمەکانی کاردا لێ دروست نەبووە .

– هەندێ چاوگی تر بە لابردنی نیشانەی چاوگ و گۆڕینی پیتی بزوێنی (ا – ە) لە ڕەگەکەیدا بۆ بزوێنی (ێ) وەك (سپێر–سپاردن/ چێن–چاندن/ نێر–ناردن/ سێن–سەندن / پاڵێو–پاڵاوتن/ ڤەشێر–ڤەشارتن) [٨]

– چاوگی(سەندن – سێن ) لەم لیستەدا جیادەکەینەوە لە چاوگە ناوازەکاندا لێکدانەوەی بۆ دەکەین، هەروەها ڕەگی چاوگی تێپەڕکراوی (بـرژان + دن (برژ + ێن) / ستان + دن ( ست + ێن) لەگەڵ ئەوەی کە تێکەڵی هەمان لیستی ڕەگ و چاوگەکان کراون، بەلاَم لە ڕاستیدا دەستنیشانکردنی ڕەگ لەم چاوگانەدا یاسایەکی تایبەتی هەیە و لەسەر ڕەگی تێنەپەڕ دروست دەبن .

– هەندێ چاوگی ترمان هەیە پیتی کۆتایی ڕەگ (ز – ژ) دەگۆڕێ بۆ (س – ش) + تن) دەخرێنە لیستی چاوگە ناوازەکان وەك (خـواز–خواستن/ گەز – گەستن/ پارێز – پاراستن/ کوژ – کوشتن/ هاڤێژ – هاڤێشتن/ چێژ–چێشتن/ ڕێژ – ڕێشتن)[٩] ئەم شێوە گۆڕانە لەم چاوگانەدا ئەوە بەدەردەخات کە گۆڕانی نیشانەکانی چاوگ لە بنەڕەتییەوە بۆ لەجیاتی بۆتە هۆی لەیەکتر جیابوونەوەی ئەو یاسایەی کە ڕەگی چاوگ و ڕیشەی کاری پێدەدۆزرێتەوە، چونکە ئەگەر ئەم چاوگانەش بۆ نیشانە بنەڕەتییەکانیان بگەڕێنینەوە هەروەك چاوگەکانی نیشانەی بنەڕەتی دەکەونەوە ژێر هەمان یاسا بۆ دۆزینەوەی ڕەگ و ڕیشەکانیان. وەك:– (چێن) – چێنین–چاندن /(شێر) – شێرینەوە–شاردنەوە /(نێر) – نێرین–ناردن /(سپێر) – سپران – سپێرین–سپاردن/(پالوو) – پالێو – پالووین – پالێن–پالزنین–پالاوتن /(پیەرێز) – پارێز – پیەرێزان – پیەرێزین–پیەرێزانن– پاراستن /(ژمێر) – ژمێرین–ژماردن / (خوان) – خوازین–خواستن /(گەن) – گەزین – گەستن /(کوژ) – کوژان + ەوە – کوژین–کوشتن /(هاوێژ) – هاوێژان – هاوێژین –هاوێشتن/(چێژ) – چێژین–چێشتن / (ڕێژ) – ڕێژین–ڕێشتن / (کرۆژ) – کرۆژین–کرۆشتن /(نێژ) – نێژین–نێشتن–ناشتن /(گۆز) – گۆزانەوە – گۆزینەوە – گوێزینەوە —– گوێزانەوە – ڤەگۆزین –گواشتنەوە–ڤەگواستن/(پێژ) –پێژین–پێشتن /(قۆز) – قۆزینەوە–قۆستنەوە /(مژ) – مژین–مشتن.....تاد ).

هەروەك دیارە گۆڕانی نیشانەکانی چاوگ لەهەردوو شێوە گۆڕاندا هەر هەمان هۆکارە کە لە هەندێ چاوگدا (ا)ی شکاندۆتەوە بۆ(ێ) لە هەندێکی تر (ز–ژ) کردووە بە(س–ش)، بە واتایەکی تر کە نیشانەی چاوگەکە لە بنەڕەتییەوە گۆڕاوە بۆ لەجیاتی، ئەگەر پیتی کۆتایی ڕەگ (ز – ژ) بێت دەیگۆڕێ بۆ (س – ش)، بەلاَم ئەگەر پیتی کۆتایی ڕەگ ئەم پیتانە نەبێت و لە ڕەگەکەدا (ا) هەبێت

وا گونجاوترە کە بشکێتەوە بۆ (ێ)، لە هەمان کاتدا لەهەندێ چاوگدا هەردوو گۆڕان بەیەکەوەش ڕوودەدەن وەك (پارێز–پاراس تن/ نێژین–ناش تن / چێژین–چەش تن)

– هەندێ چاوگی ترمان هەیە دۆزینەوەی ڕەگ تیایاندا دەستوورێکی تایبەتییان نییە وەك (گەیشتن– نووستن –خواردن – شووشتن – خستن – ڕۆیشتن – بردن – کردن – هێشتن – ویستن – گووتن – دان)[10] بە هەمان شێوە ئەگەر ئەم چاوگانەش بگەڕێنینەوە بۆ نیشانە بنەڕەتەکانیان دۆزینەوەی ڕەگ تیایاندا دەکەوێتەوە ژێر هەمان ئەو دەستوورەی کە ڕەگی چاوگ و ڕیشەی کارەکانی پێ دەدۆزرێتەوە وەك ( گەیین – نڤین – خۆرین – شۆرین – ڕۆیین – هێلان – ڤییان.........تاد، بەلاَم چاوگەکانی (خستن – بردن – کردن – گووتن – دان........تاد) دۆزینەوەی ڕەگەکانیان لە دەستوور لادەدەن، چونکە هۆکاری ناوازەیی و دروستکردنی پێکهاتەکان و شێوەی گەردانکردنیان جیاوازە . بۆیە دەیانخەینە ئەو بەشەی کە بە تەنیا لە چاوگە ناوازەکان دەکۆڵینەوە .

## تایبەتمەندیی ڕەگەکان

بە شێوەیەکی گشتی ڕەگ ئەو بەشەی وشەیە کە ئەمێنێتەوە دوای لابردنی هەموو ئەفێکسەکان (پاشگر و پێشگر و ناوگر)[11]

لە ئەنجامی بەدواداگەڕان و بەراوردکردنی چاوگەکان لە شێوەزارە جیاوازەکاندا چەند سیفەت و تایبەتمەندییەکی هاوبەش لەنێوان ڕەگاکاندا بەدەردەکەوێت :

١– بناغەی دروستبوونی چاوگی ئاسایی و ناوازەکانن.

٢– لە دروستبوونیدا خۆڕسکن و بەهیچ بنەمایەکی یاسایی نابەسترێنەوە، چەند پیتێك یەکتری دەگرن دەبنە بناغە بۆ واتایەك.

٣– هەرگیز تاکە پیت نابێتە ڕەگی بنەڕەتیی چاوگ، ئەگەرچی لە ئێستادا پیتی (چ) بۆ (چوون) (ب) بۆ (بوون) وەك ڕەگ هەژمارکراون، بەلاَم لەڕاستیدا (چ–ب) پیتی سەرەتای ڕەگن، لەئەنجامی چەند هۆکارێك بەجیاوازی شێوەزارەکان گۆڕانکاری بۆ مەبەستی گونجان بەسەر ئەم دوو چاوگەدا هاتووە، لە چاوگەکانی نیشانەی لاوەکی لێکدانەوەی زیاتر بۆ ئەم دوو چاوگە دەکەین.

٤- زۆرترین ڕەگ لە سێ پیت پێکهاتووە ئینجا ڕێژەکانی تر بە شێوەیەکی کەمتر.

٥- پیتی بزوێنی (ە-ا-ۆ-ێ) هەرگیز نابنە پیتی کۆتایی ڕەگە بنەڕەتییەکان.

٦- بە گشتی دەبنە کەرتی وشە ڕەسەن و فەرهەنگییەکان .

٧- دەتوانین جۆرەکانی چاوگ لە ڕەگەکاندا بناسینەوە، هەر لەبەر ئەمە ڕەگەکانی چاوگ دابەش دەکەین بۆ:-

(ا- ڕەگی تێپەڕ/ ب- ڕەگی تێنەپەڕ/ ج- ڕەگی تێپەڕکراو/ د- ڕەگی دەنگی)[١٢]

### ا- ڕەگی تێپەڕ:

ئەو ڕەگانەن کە کۆڵەگەی دیار و نادیاریان لەسەر دروست دەبێت، بە نیشانەکانی چاوگ، چاوگی سادە و کاری تێپەڕیان پێدروست دەکرێت بە بەبێ یاریدەی پاشگر ی(اندن) وەك (نووس-نووسیان -نووسران -نووسین / کێڵ- کێڵیان -کێڵران-کێلان/ خوەین-خوەینیان -خوەینین-خوێندن/ فرۆش- فرۆشیان-فرۆشران- فرۆشتن............تاد).

### ناسینەوەی ڕەگی تێپەڕ

١- دەبنە پاشگر بۆ دروستکردنی ناوی بکەر وەك (ڕۆژنامە نووس - وڵات پارێز ... تاد)

٢- (ڕەگ + ەر = بکەر) وەك (نووسەر - خوێنەر - پارێزەر - فرۆشەر...تاد)

٣- (بـ + ڕەگ = بکەر) وەك (بنووس - بفرۆش - بکێڵ - بکوژ... تاد).

٤- (ڕەگ + یار = بکەری کۆڵەگە) وەك (نووسیار- خوازیار - فرۆشیار- ژەنیار ... تاد).

### سەرنج:

- بەکارهێنانی شێوەکانی بکەر بە گوێرەی واتای چاوگ و سەلیقەی ئاخێوەری شێوەزارەکانە نەوەکو شێوە دەستوورییەکانیان، چونکە لەڕاستیدا

هەموو شێوەکان دەستوورینە، بەڵام دەتوانین ئەوە بڵێین کە بکەری دروستبوو بە پاشـگری (ەر) لـە هـەموو شـێوەکان چـالاك و کـاراترە لـە بەکارهێنانـدا لـە نێـو شێوەزارەکاندا .

لەهەندێ شێوەزاردا شێوەیەك چالاکە لەهەندێ شێوەزاری تر شێوەیەکی تـر بۆ نموونە :– لە کۆنەوە بە کەسێکی دەسەڵاتدار و زۆردار دەڵێن (بکوژ و ببڕ هـەر خۆیەتی) نەگوتراوە (کوژەر و بڕەر یا کوژیار وبڕیار یا پیـاوکوژ و سـەربڕ) یـاخود دەڵێن (کڕیار ڕازی، فرۆشیار ڕازی تۆ چ کارت بەسەریانەوە هەیە) نەگوتراوە (بکـڕ و بفرۆش یا کڕەر و فرۆشەر ڕازی).

یـا لـە شـێوەزارەکانی کرمـانجی ژووروو زیـاتر (کـوژەر) بـەکاردێت، بـەڵام لەشێوەزارەکانی کرمانجی خواروو (بکوژ).

٥– بکـــەری نادیـــار وەك (نووســـرا –خـــوازرا – پـــارێزرا – فرۆشـــرا – کوژرا....تاد).

٦– بـــەرکار وەك (نووســـراو – خـــوازراو – پـــارێزراو – فرۆشـــراو– کوژراو....تاد).

### ب– ڕەگی تێنەپەڕ:

ئەو ڕەگانەن کە کۆڵەگەی دیار و (چاوگی سادە و کاری تێنەپـەڕ) و (ڕەگ و چاوگی تێپەڕکراوی) لەسەر دروست دەبێـت، (ڕەگـی تێنەپـەڕ + نیشـانە و (ن) ی چاوگ = چاوگی تێنەپـەڕ) / (ڕەگـی تێنەپـەڕ + ێـن = ڕەگـی تێپـەڕکراو) (ڕەگـی تێنەپەڕ + اندن = چاوگی تێپەڕکراو) وەك :–(بـرژ – برژیـان– بـرژان – بـرژێن – برژاندن / ست – ستیان–سـتان – سـتێن –سـتاندن / هـەژ – هـەژیان–هـەژان – هەژین – هـەژێن – هەژانـدن / بـار –باریـان– بـارین – بـارێن – بارانـدن / مـر – مریـان– مـرین – مـرێن – مرانـدن / نـیش – نیشـیان– نیشـین – نیشـێن – نیشاندن........تاد).

### ناسینەوەی ڕەگی تێنەپەڕ

پێچەوانەی ڕەگە تێپـەڕەکانن، نابنـە سەرچـاوە بـۆ بکـەری دیـار و نادیـار و بەرکار .

**ج- ڕەگی تێپەڕکراو:**

ئەو ڕەگانەن کە لەسەر ڕەگی تێنەپەڕ دروست دەبن، چاوگ و کاری تێپەڕکراو دروست دەکەن .

**ناسینەوەی ڕەگی تێپەڕکراو**

بە گشتی هەمان سیفەتی ڕەگە تێپەڕەکانیان هەیە.

١- دەبنە پاشگر بۆ دروستکردنی ناوی بکەر وەك (مێزەر ڕفێن / کۆتر فڕێن..........تاد).

٢- (ڕەگی تێپەڕکراو+ ەر = بکەر) وەك (لەرزێنەر/ هەژێنەر/ مرێنەر / بەزێنەر.........تاد).

٣- (ڕەگی تێپەڕکراو+ران=کۆڵەگەی نادیار) وەك (لەرزێنران- هەژێنران.............تاد).

٤-بکەری نادیار (لەرزێنرا-هەژێنرا-مرێنرا........تاد).

٥-بەرکار وەك (لەرزێنراو-هەژێنراو-مرێنراو..........تاد).

**د-ڕەگی دەنگی:**

ئەم ڕەگانەن کە لەسەر دەنگە سروشتییەکان دروست دەبن وەك (حیل - جووك - قیژ - زیڕ- نووز.......تاد).

**ناسینەوەی ڕەگە دەنگییەکان**

١- (ڕەگی دەنگی + ە = ناوی چاوگ) وەك (حیلە - جووکە - قیژە - زیڕە - نووزە........تاد).

٢- قۆناغەکانی دروستبوونی چاوگ لەسەر ئەم ڕەگانە جیاوازە لەگەڵ ڕەگەکانی تر.

(ڕەگ + ە + ڕەگ = کۆڵەگەی دەنگدار) (ناوی چاوگ + ڕەگ = کۆڵەگەی دەنگدار) وەك (حیلە حیل - جووکە جووك - قیژە قیژ - زیڕە زیڕ- نووزە نووز..........تاد).

٣- چاوگی دروستبوو لەسەر ئەم ڕەگانە زیاتر لە شێوەی چاوگە تێپەڕکراوەکانن، بەلاَم هەر تێنەپەڕن، چونکە مەبەستی بکەر و بەرکارەکانیان

لەیەکتر جیانابێتەوە و نابنە دوو کاراکتەری جیاواز و کاریگەر بەسەریەکتردا هەروەك چاوگە تێپەڕ و تێپەڕکراوە ئاساییەکان، بەلاّم بە یارمەتی کاری یاریدەدەری (هێنایە – دەهێنێتە) دەکرێن بە تێپەڕ وەك (حیلاندن (هێنایە حیلاندن – دەهێنێتە حیلاندن) (جووکاندن) هێنایە جووکاندن –دەهێنێتە جووکاندن .......تاد).

٤–(کۆڵەگەی دەنگدار + کردن = چاوگی دروستکراو) وەك (حیلە حیل کردن / جووکە جووك کردن .....تاد).

٥–(کۆڵەگەی دەنگدار + هاتن =چاوگی دروستکراو) وەك (حیلە حیل هاتن / جووکە جووك هاتن ........تاد).

## ڕیشەی کار

ئەو بەشەیە کە لەسەر ڕەگی چاوگە ئاسایی و ناوازەکاندا دروست دەبێت، بۆ مەبەستی گونجان گۆڕانکاری بەسەر دادێت لە کاتی گەردانکردنی دەمەکانی کاردا، دابەش دەبن بۆ: ١– ڕیشەی کاری ڕابوردوو ٢– ڕیشەی کاری داهاتوو

### ١– ڕیشەی کاری ڕابوردوو:

کاری ڕابردووی نزیکە، دەبێتە ڕیشە بۆ جۆرەکانی تری کاری ڕابردووی (دوور–بەردەوام – تەواو) لە چاوگە تێپەڕ و تێنەپەڕ و تێپەڕکراوەکاندا، نیشانەکانی چاوگ دەبێتە دوا فۆنیم و مۆرفیمی کاری ڕابوردوو .

– لە تێنەپەڕدا

(سووت +ا )/ (سووتابوو – دەسووتا – سووتاوە (سووتایە)

(مر+د )/ (مردبوو – دەمرد – مردووە (مردییە)

– لە تێپەڕدا

(خوێن+د) / (خوێندبوو – دەخوێند – خوێندووە (خوێندییە)

(کێڵ+ا)/ (کێڵابوو – دەکێڵا – کێڵاوە(کێڵایە)

– لە تێپەڕکراودا

(سووت+ان+د) / (سووتاندبوو – دەسووتاند – سووتاندووە (سووتاندییە)

(فڕ+ان+د) / ( فڕاندبوو – دەفڕاند – فڕاندووە (فڕاندییە)

**سەرنج:**

لە چاوگی تێپەڕکراودا پیتی (د) لە پاشگری (اندن) هەمان ڕۆڵی نیشانەکانی چاوگ دەبینێ لە دەستنیشانکردنی جۆرەکانی کاری ڕابوردوو.

– ئەگەر بۆ شێوەزارە کۆنەکانی کوردی بگەڕێینەوە وا بەدەردەکەوێت کە پیتی (د) وەك ناوبەند هاتۆتە نێوان (ن) ی چاوگ و(ن) تێپەڕکەر (سووتان – سووتانن – سووتاندن / فڕان –فڕانن – فڕاندن / کولاَن – کولاَنن – کولاَندن...........تاد) ئەمەش هونەرێکی دەنگسازییە بۆ مەبەستی گونجان لە دەربڕین و گۆکردندا، چونکە ئەگەر دوو پیتی وەك یەك بەدوای یەکترەوە بێن یا یەکێکیان دەسوێ وەك (ژیین – ڤیین ) دەبێتە (ژین – ڤین) یا پیتێکی ناوبەند دەخرێتە نێوانیان هەروەك (دیین) دەبێتە (دینین) لە شێوەی ئەو چاوگانەی کە پیتی کۆتایی ڕەگەکانیان (ڕ) ی لاوازە، کە (را) ی بکەری نادیاری بەدوادا دێت بەهەمان شێوە (د) ێکی ناوبەند دەکەوێتە نێوان (نێر+را) دەبێتە (نێر+د+را).

**٢ – ڕیشەی کاری داهاتوو:**

لەدوای لادانی پێشگری کار، دوا فۆنیم شکانەوەی (ا–ی) بنەڕەتییە بە هەر نیشانەیەکی چاوگ بێت، (ڕەگی چاوگی تێپەڕ و تێپەڕکراو + یت / تێنەپەڕ + ێت) = ڕیشەی کاری داهاتوو) وەك (کڕیت/ کێلیت/ خوێنیت/ فرۆشیت/ شکێت – شکێنیت / فڕێت – فڕێنیت/ مرێت – مرێنیت / کەوێت – کەوێنیت..........تاد).

**سەرنج:**

نیشانەی چاوگ و شکانەوەی نیشانەی چاوگ دەور و ڕۆڵی پێشگری (دە) دەستنیشان دەکەن، کە ئایا بۆ کاری ڕابوردووی بەردەوامە یا بۆ کاری داهاتووە.

(دە سووت+ا – ڕابوردووی بەردەوامە) بەلاَم (دە سووت+ێت – ڕانەبوردووە)

(دە فرۆش+ت – ڕابوردووی بەردەوامە) بەلاَم (دە فرۆش+ێت – ڕانەبوردووە)

**چاوگەکانی نیشانەی لاوەکی ( وو- ر )**

(بوون – چوون – فەرموون – گروون – سوون – جوون– دروون ) (مرن – کرن – برن – خوارن)

چاوگەکانی بەم دوو نیشانەیە تایبەتن لە دروستبووندا، ژمارەیان لە هەموو چاوگەکانی زمانی کوردی کەمترە، لە هەمان کاتدا تایبەتمەندیی شێوەزارێك بوونی ئەم نیشانانە دەسەپێنیٚ و لە شێوەزارێکی تردا بوونیان نامێنیٚ، چونکە لە ڕاستیدا ئەم نیشانانە پیتی کۆتایی ڕەگی چاوگەکانن، بەلاّم جیاوازییان لەگەلٚ چاوگە ئاسایی و ناوازەکاندا ئەوەیە، لەگەلٚ ئەوەی سوان و گۆڕان و تێچوون لە ڕەگی چاوگەکاندا ڕوودەدات، بەلاّم بە پێچەوانەی هەموو چاوگەکانی زمانی کوردی، سوان و تێچوون لە نیشانەکانی چاوگیشدا دەکەن.

بە شۆڕبوونەوە بۆ شێوە زمانی کۆنی کوردی ئەو ڕاستییە بەدەردەکەوێت کە لە شێوەزارە کۆنەکاندا چاوگ بە نیشانەی (وو–ر) نییە، ئەگەر بەکارهێنانیشی لەم سەردەمەدا هەبێت هەر لەبەر ئەو هۆکارەیە کە لە شێوەزارەکانی کرمانجی ژووروو – خوارووشدا پەیدا بووە، ئەم هۆکارەش گونجانیانە لە دابینکردنی واتای کاری ڕابوردوودا.

- **چاوگی ( بوون – چوون )**

دووچاوگی هاوبەشن لە بەکارهێنانـدا لە نێوان شێوەزارەکانی کرمانجی ژووروو–خوارووادا .

چاوگی (بوون) وەك هەموو چاوگێکی دی، سەرچاوەیە بۆ دروستکردنی دەمەکانی کاری ڕابوردوو+ ڕانەبوردوو، هەروەها وەك کاری تەواو و ناتەواو بە تێپەڕ و بە تێنەپەڕ لە ڕستەی کوردیدا ئەرکەکانی ئەنجام دەدات [١٣]

لە ڕووکەشە دیارەکانیاندا وا دەردەکەوێت کە ڕەگەکانیان (ب – چ) بێت، چونکە نیشانەی چاوگەکەیان دەسوێت، هەروەك چاوگە ڕانییەکان لە کرمانجی ژووروودا .

دەستووری دروستبوون (بوو –بووە – بوویان (بوان –بوین)–بوون

دەستووری دروستبوون (چوو –چووە – چوویان ( چووان – چووین) – چوون

گەردانکردنی دەستووری لە کاری ڕابردوودا (بوا – بوی/ چوا –چوی)

لە کاری داهاتوودا (دەبوێت –دەبویت/ دەچوێت– دەچویت)

هۆکاری کورتبوونەوە و سوانی هەردوو نیشانەی بنەڕەتی (ا — ی ) بەلای ئێمەوە ئەوەیە، کە زیاتر ئامادەیی سوان و گونجانی تێدایە، چونکە پیتی کۆتایی ڕەگەکە (وو)ە لە دابینکردنی واتای کاری ڕابردوودا لە شوێنی نیشانەی بنەڕەتی چاوگەکە واتا و مەبەستی ئاخێوەری دابینکردووە، ئەمەش سیفەتێکە هەموو چاوگە وانییەکان هەیانە .

لە شێوەزاری فەیلی نیشانەی چاوگەکە دەبێتە (گ) (بووگن — چووگن) لە هەندێ شێوەزاری تردا پیتی کۆتایی ڕەگ (وو) سواوە و بە (بین – چین) گۆ دەکرێن ، لە شێوەزاری بادینیدا لە هەندێ بنەزاردا لەوەش زیاتر کورت دەبێتەوە (ی) لە (دبیت) دەسوێ و دەبێتە (دبت)

لە شێوەزارەکانی کرمانجی ژووروو—خواروودا نیشانەی بنەڕەتیی (ا — ی ) سواوە هەر بە (بوون – چوون) گونجاوتر بووە، بەلام لە کاری داهاتوودا شێوە دەستوورییەکەی (دەبوێت / دەچوێت ) پیتی کۆتایی ڕەگەکەیان دەسوێ، تایبەتمەندییەکی ناوازە بۆ خۆیان دروستدەکەن، وەك چاوگەکانی دیکە لە زمانی کوردیدا بە (یت—ێت) گەردان (دەبیت — دەبێت/ دەچێت – دەچیت) .

لە بەر ئەوەی چاوگی تێنەپەڕی (چوون ) ڕەگ و چاوگی تێپەڕکراوی (چووێن) (چواندن)ی لەسەر دروست دەبێت هەروەك چاوگە تێپەڕکراوەکان پێکهاتەکان دروست دەکات (چوێنەر — چوێنران — چوێنرا — چوێنراو)

ڕەگە بنەڕەتییەکەی لە پێکهاتەکان ون ناکات، بەڵکو لە گەردانکردندا گۆڕان و سوانی، بۆ مەبەستی گونجان بەسەر دادێت

لە کاری ڕابوردوودا نیشانەی چاوگەکە دەسوێ (بوا —بوی/چوا—چوی) دەبێتە (بوو —چوو)

لە کاری داهاتوودا پیتی کۆتایی ڕەگ دەسوێ (بوێت —چوێت) دەبێتە (بێت — چێت)

– کەواتە ڕەگی چاوگ و ڕیشەی کاری ڕابردوو لەم دوو چاوگەدا (بوو – چوو)ە، بەلام ڕیشەی کاری داهاتوویان (بێ+ ت / چێ + ت) ڕیشەی کاری فرمانی (چوون) (چۆ) یە.

**- چاوگی ( فەرموون )**

چاوگێکی ئاڵۆزە لە واتا و لە دروستبووندا، هەروەك دیارە مەبەستی بەکارهێنانی لە واتادا (فەرموو وەرە ژوورەوە — فەرموو قسەبکە — فەرموو نان بخۆ) واتای کارەکانی بۆ مەبەستی جیاوازە.

دەستووری دروستبوونی لەسەر ڕەگی (فەرموو) فەرموویان (فەرموان — فەرموین) بە تێچوونی نیشانەی چاوگ دەبێتە (فەرموون) بەلاّم مامۆستا هەژار لە فەرهەنگی هەنبانە بۆرینە (فەرمین)ی بەرانبەر (فەرموون) نووسیوە[١٤].

دەستووری دروستبوونی لەسەر ڕەگی (فەرم) فەرمیان (فەرمان—فەرمین) دروست دەبێت.

دوو لێکدانەوە بۆ شێوەی دروستبوونی ئەم چاوگە بەدەر دەکەوێت.

ا— لەسەر ڕەگی (فەرموو) گەردانکردنی کاری ڕابردووی (فەرموا—فەرموی) کورت دەبێتەوە بۆ(فەرموو) لێرەدا نیشانەی چاوگەکە دەسوێ، بەلاّم لەکاری داهاتوودا دەگەڕێتەوە سەر بناغەکەی خۆی (دەفەرموێت ) .

ب— لەسەر ڕەگی (فەرم) دەبێتە (فەرمی — دەفەرمیت) وا بەدەردەکەوێت کە پیتی کۆتایی ڕەگ دەسوێ .

کە ڕەگی تێپەڕکراوی لەسەر ڕەگی تێپەڕ بۆ دروست دەبێت (فەرمووێن) — فەرمووێنەر — فەرمووێنران — فەرمووێنراو — فەرمووێنرا) وا بەدەردەکەوێت کە ڕەگی چاوگەکە لەشێوەی (فەرموو) بەلای ڕاستیدا دەشکێتەوە .

ئەگەر بەراوردێکی چاوگی (فەرموون )ی کوردی بکەین لەگەڵ (فەرموودن )ی فارسی کە هەمان ڕەگ ڕیشەی هاوبەشیان هەیە، بەدەردەکەوێت بە بەراوردکردنی ئەو چاوگانەی کە هاوبەشن لە بەکارهێنان و بناغەدا، لە کوردیدا پیتی کۆتایی ڕەگ شوێنی نیشانەی چاوگی گرتۆتەوە، بە گوێرەی گونجان و سەلیقەی ئاخێوەری شێوەزارەکان، لە هەندێ شێوەزاردا پیتی کۆتایی ڕەگ دەسوێ لە هەندێکی تر نیشانەی چاوگەکە دەسوێ، ئەمەش دەبێتە هۆکاری جیاوازی لە پێکهاتەکان و گەردانکردندا، بۆیە هەروا لێك دەدرێتەوە کە لەبەر ئەوەی نیشانەی (وو) ڕەسەن و جێگیر نییە لە زمانی کوردیدا لەوانەیە نیشانەی (ی) گۆڕابێ بۆ (وو) لەهەمان کاتدا دروستبوونی (فەرمان) وەك وشەیەکی فەرهەنگی (فەرمین)

وەك چاوگ لەسەر ڕەگی (فەرم–فەرمیان) لەشێوەی (ستران و باران / سترین و بارین) زیاتر بەلای ڕاستی لە دەستووری دروستبوونیدا دەشکێتەوە .

کەواتە ڕەگی چاوگ (فەرموو) ڕیشەی ڕابوردوو (فەرمووی) ڕیشەی ڕانەبوردووی (فەرموێت).

- **چاوگی (گروون)**

چاوگێکی تێپەڕە، دەستووری دروستبوونی (گروو – گرووەر – گرویان (گروان – گروین ) –گرووران – گرووراو – گروورا).

شێوەی دروستبوونی ئەم چاوگە هیچ جیاوازییەکی لەگەڵ چاوگەکانی تردا نییە، تەنیا ئەوەندە هەیە کە نیشانەی چاوگەکەی سواوە بە تایبەتمەندیی ئەو شێوەزارانەی کە لە شێوەی (گروون) بە کاری دەهێنن .

(گروان) بۆ تێنەپەڕی، (گروین) بۆ تێپەڕی، وەك چاوگێکی تێپەڕ، بکەر بە پاشگری (ەر) لەگەڵ پیتی کۆتایی ڕەگ کە (وو)ە لە بەدواداهاتنی یەکتردا تایبەتمەندییەکی نەگونجانی سەرزاری لێ بەدەردەکەوێت لە گۆکردندا بۆیە (گرووەر)، ( ر) ێکی لاوازی دەخرێتە نێوان بۆ گونجان لە گۆکردندا دەبێتە (گرو+ر+ەر) .

لە شێوەی چاوگە وانییەکان، تەنیا لە کاری ڕابوردوودا بە سوانی نیشانەی چاوگەکە واتاکەی دابیندەکات (گروو)، بەڵام لە کاری داهاتوودا وەك هەموو چاوگەکانی تر دەبێتە (دەگروێت – دەگرویت) لە هەمان کاتدا ئەم چاوگە تایبەتمەندییەکی تریشی هەیە هەروەك هەندێ چاوگی تێپەڕی بنەڕەتی بۆ جاری دووەم تێپەڕ دەبێتەوە (گروین) تێپەڕە، بەڵام (گرواندن) تێپەڕکراوە هەروەك (نووسین–نووساندن/ ناسین–ناساندن/ دڕین–دڕاندن.....تاد).

لەسەر ڕەگی تێپەڕکراوی ( گروێن) (گروێنەر – گروێنران – گروێنراو – گروێنرا ) دروست دەکات.

کەواتە ئەم چاوگە لەشێوەی (گروون) ڕەگی چاوگ و ریشەی ڕابردووی (گروو)ە، ڕیشەی ڕانەبردووی (گروێت).

لەشێوەی (گروین) ڕەگی چاوگ (گروو)ە، ڕیشەی ڕابوردووی (گروی)، ڕیشەی ڕانەبوردووی (گرویت).

**- چاوگی ( سوون – جوون )**

دوو چاوگی تێپەڕن، شێوەی گۆڕانی ئەم دوو چاوگە لەنێو شێوەزارە جیاوازەکاندا گۆڕانی زۆری بەسەردا هاتووە .

ڕەگی بنەڕەتی ئەم دوو چاوگە (سای – جای) ە، چونکە قۆناغەکانی گەشە و گۆڕانی لەسەر ئەم دوو ڕەگە دروستبووە.

دەستووری دروستبوونی (سای) – سایە – سایەر – سایيان (سایین–ساین) – سایریان سایریا –سایرا – سایریاگ – سایریای – سایریاو–سایراو) .

دەستووری دروستبوونی (جای) – جایە – جایەر – جاییان (جایین–جاین) – جایریان – جایریا / جایریاگ – جایریای – جایریاو–جایراو).

پیتی کۆتایی ڕەگەکە (ی) دەگۆڕێ بۆ (و)، (سایین – جایین ) دەبێتە (ساوین – جاوین).

پیتی (ا) لە ڕەگەکەدا دەسوێ (ساوین – جاوین) دەبێتە ( سوان – سوین – جوین).

لە کۆتا کورتبوونەوەدا نیشانەکەیان سواوە و بوونە بە (سوون – جوون) هەمان سیفەتی چاوگە وانییەکانی وەرگرتووە. لە گەردانکردندا واتای کاری ڕابوردوویان دابینکردووە (سوو– جوو).

بە هەمان شێوەی چاوگە ئاساییەکان لە کاری داهاتوودا دەگەڕێتەوە سەر هەمان یاسا و ڕێسا دەستوورییەکەیان (دەسویت – دەسوێت / دەجویت – دەجوێت).

لە ڕاستیدا گۆڕانی پیتی کۆتایی ڕەگ لە (ی) بۆ (و) هەموو گۆڕانکارییەکانی تری بە دوادا هاتووە، ئەم چاوگانەی خستۆتە سەر شێوە و سیفەتی چاوگە وانییەکان، کاریگەری لەسەر شێوەی دروستبوونی پێکهاتەکاندا کردووە

کۆڵەگەی نادیاری (سایریان–سایران بووە بە سووران) (جایریان–جایران بووە بە جووران) بە هەمان هۆکاری کورتبوونەوە و گۆڕانەکان ، بکەری (سایەر– جایەر) گۆڕاوە بۆ (سووەر – جووەر) بەرکاری (سایریاو – جایریاو ) بووە بە (سووراو – جووراو) بکەری نادیاری (سایریا –جایریا) دەبێتە (سوورا – جوورا).

لە چاوگی (جوون) دا هەروەك چاوگی (گروون) بکەرەکەی بۆ گونجان (ڕ) ێکی لاوازی خراوەتە نێوان، ( جووەر) بووە بە (جوو+ڕ+ەر ).

چاوگی (سوون) شێوەی تێپەڕکردنی دووەم وەردەگریت دەبێتە (سواندن) ئینجا لەسەر ڕەگی تێپەڕکراوی (سوێن) سوێنەر –سوێنران – سوێنرا –سوێنراو) دروستدەکات.

کەواتە:– ڕەگی چاوگی (ساین–ساوین/جاین–جاوین) دەبێتە (سای–ساو/جای–جاو).

ڕەگی چاوگی (سووین–جووین) دەبێتە (سوو–جوو).

ڕیشەی کاری ڕابوردوو(سوی–جوی).

ڕیشەی کاری داهاتوو(سویت–جویت).

ڕەگی چاوگ و ڕیشەی کاری ڕابردووی (سوون–جوون) دەبێتە (سوو–جوو).

ڕیشەی کاری داهاتوو دەبێتە (سویت–جویت) .

**– چاوگی ( دروون )**

چاوگێکە تێپەڕە، هۆکاری دروستبوونی ئەم چاوگە جیاوازە لەگەڵ چاوگە وانییەکان، چونکە جێگۆڕکێی پیتی کۆتایی ڕەگ (ڕ)ی لاواز لەگەڵ پیتی ناوەڕاستی ڕەگ (وو) ئەم چاوگەی خستۆتە سەر شێوەی چاوگە وانییەکان، (دوورین)ی کردووە بە (دروین) پاشان نیشانەی چاوگەکەی سواوە و بووە بە (دروون) کەوتۆتە سەر شێوەی چاوگە وانییەکان ، بەڵام گونجاو بووە لەسەر زار و ئاخاوتن و واتای کاری ڕابردووی دابین کردووە (درووە)، لەهەمان کاتدا نەبۆتە هۆی گۆڕانی واتاکەی، بەڵکو لە دروستکردنی پێکهاتەکانیشدا بەتایبەتمەندی هەندێ شێوەزار گونجاوە (درو+را– درو+راو) بەرگ درووە –درونە –دروێنە ) لە شوێنی (دوو+را–دووراو) بەرگ دوور–دوورنە) بەکار دەهێنرێت .

لە شێوەزارە کۆنەکانی کوردی و سۆرانی لە هەولێر چاوگی (دوورین) بەکاردێت، چونکە چاوگی (دوورین) دەستووریترە لە (دروون) بۆ ڕۆنانی وشەی وەك (دووراو) کە لە شێوەزارەکانی گەرمیانیشدا بەکارە، باشترە ئەم بەکار بهێنرێت نەك (دروون)[١٥]

ڕەگی بنەڕەتیی ئەم چاوگە (دوور) ە، چونکە قۆناغەکانی گەشـە و گۆڕان و پێکهاتەکانی لەسەر دروست دەبێت، لە شێوەزارە کۆنەکاندا کۆڵەگەی (دووریـان ) بەکار دێت نەوەکو (درووریان).

دەسـتووری دروسـتبوون ( دوور– دوورەر– دووریـان (دووران – دووریـن– دووریار– دووران (دووران)– دوورا – دووراو).

هەروەك چاوگە وانییەکان لە دروستکردنی بکەردا (درو+ ەر) پێویستی بە (ڕ) ێکی لاواز هەیە بۆ گونجـان دەبێتـە (درو+ ر+ ەر) هـەروەك (گـروو + ر + ەر/ جوو+ ر+ ەر ).

لەبەر ئەوەی ڕەگی (دوور) و چاوگی (دوورین) شێوە بنەڕەتییەکەی خۆیەتی هەروەك هەموو چاوگەکانی زمانی کوردی بـەبێ نیشـانەکانی بنـەڕەتی و لـەجیاتی ڕەگی (دوور) واتای کاری ڕابوردوو دابین ناکات .

لە کاری داهاتووشدا بە هەمان شێوەی چاوگە وانییەکان و چاوگەکانی دیکە دەگەڕێتـەوە سـەر یاسـا و ڕێسـای گـەردانکردنی ئاسـایی چـاوگە تێپـەڕەکان (دەدووریت – دەدوورێت / دەدرویت – دەدروێت).

کەواتـە ڕەگـی چـاوگ و ڕیشـەی کـاری ڕابـردووی (دروون–دروو)ە، ڕیشـەی کاری داهاتوو (درویت) .

ڕەگــی چــاوگی (دووریــن–دوور) /ڕیشــەی ڕابــوردوو(دووری) /ڕیشــەی داهاتوو(دووریت).

- **چاوگی ( مرن )**

چـاوگێکی تێنەپـەڕە، لـە شـێوەزارە جیاوازەکانـدا لـە شـێوەی (مـرین – مردن)یش بەکار دەهێنرێت، بە تایبەتمەندیی شێوەزار لە شێوەزارەکانی کرمـانجی ژووروودا لە شێوەی (مرن) بەکار دەهێنرێت .

پیتی کۆتایی ڕەگ (ر)ی لاواز لـەکرمانجی ژووروودا هـەروەك پیتـی (وو) لـە کرمانجی خوارووودا هەمان دەور دەبینێ، واتای کاری ڕابوردوو دابین دەکات .

دەستووری دروستبوونی (مر–مریان (مران – مرین – مردن – مرن) ڤەمریان – ڤەمرین).

هەر بە هەمان شێوەی چاوگە وانییەکان و بە تایبەتمەندیی شێوەزار و گونجاوی، نیشانەی چاوگەکەی سواوە بە بێ ئەوەی کاریگەری هەبێ لەسەر واتای کاری ڕابردوو(مر)، بەڵام لە کاری داهاتوودا بە هەمان یاسا و ڕێسای گەردانکردنی کاری داهاتوو دەگەڕێتەوە بۆ شێوە بنەڕەتییەکەی خۆی (دمریت – دەمرێت) .

هەروەك هەموو چاوگێکی تێنەپەڕ لە سەر ڕەگی تێپەڕکراوی پێکهاتەکانی (مرێن – مرێنەر – مرێنران – مرێنراو – مرێنرا) چاوگی (مراندن) دروستدەکات.

بە شۆڕبوونەوە بۆ شێوەزارە کۆنەکانی کوردی واپێدەچێت، لە بنەڕەتدا ڕەگی (مر) لە ڕەگی(مرك) دروست بووبێت.

(مرك – مرکە – مرکیان (مرکان – مرکین) لە چاوگی داڕێژراوی (دامرکان – دامرکاندن) بە تێچوونی پیتی (ك)ی کۆتایی ڕەگەکە بووبێتە (مراندن) هەروەك (پرووشکیان –بۆرشکیان ) کە دەبنە (پرووشان –پرووشاندن – بۆرژان).

کەواتە ڕەگی چاوگ و ڕیشەی کاری ڕابردووی (مرن) دەبێتە (مر) ڕیشەی داهاتوو دەبێتە (مرێت).

لە (مردن) ڕەگی چاوگەکە (مر) ڕیشەی ڕابوردووی (مرد) ڕیشەی داهاتوو(مرێت).

پوختەی قسە ئەوەیە، ئەوەی بۆ چاوگە وانییەکانمان گوت بۆ چاوگە ڕانییەکانیش دەیڵێینەوە .

چاوگی (کرن – برن – خوارن)یش بە هەمان هۆکار، بەڵام لەبەر ئەوەی چاوگی تێپەڕ و ناوازەن لە چاوگە ناوازەکان لێکدانەوەیان بۆ دەکەین.

**پێشنیاز:**

وەك ڕایەکی تایبەت پێویستە چاوگ بەنیشانەی (وو –ر) لە ڕێزمانی کوردیدا یا بە ناوازە هەژمار بکرێن یا لە نووسین و خوێندندا بگەڕێنرێنەوە سەر شێوە بنەڕەتییەکانی خۆیان چونکە:

١– بەکارهێنانی ئەم چاوگانە تایبەتمەندیی شێوەزارە، کراوە بەدەستوور بۆ زمانی کوردی بەگشتی .

٢– بە پێچەوانەی هەموو چاوگەکانی زمانی کوردی نیشانەکانی چاوگیان دەسوێ .

٣- پیتی کۆتایی ڕەگ (وو) واتای کاری ڕابووردوو دابین دەکات .

٤- بۆتە هۆی جیاوازی لە دۆزینەوەی ڕەگ و ڕیشەکانیاندا .

٥- بەکارهێنانی نیشانەکانیان گشتی و سەرتاسەری نییە لەنێو شێوەزارەکاندا، بێجگە لە چاوگی (بوون - چوون) کە هاوبەشن لە بەکارهێناندا لە نێوان هەردوو زاراوە سەرەکییەکەی زمانی کوردی (کرمانجی ژووروو - کرمانجی خواروو) لە هەمان کاتیشدا ئەم دوو چاوگە تایبەتن (بوون) وەك كارێكی ناتەواو، (چوون) لە جیابوونەوەی واتاکەی لە تێپەڕکردندا، چونکە (چواندن) هەڵگری هەمان واتای (چوون) نادات هەروەك (سووتان - سووتاندن / شكان - شكاندن.........تاد).

٦- ئەم چاوگانە گۆڕانكارییەكی زۆریان بەسەردا هاتووە، لە پێناسەی چاوگە ناوازەكان نزیك بوونەتەوە كە دەڵێین، ڕەگی بنەڕەتیی چاوگ لە كاری ناوازەدا ئەو ڕەگەیە كە گۆڕانكاری لەسەر دەكرێت بۆ مەبەستی گونجان لە گەردانكردن و دروستكردنی پێكهاتەكان، هەروەك دیاریشە زۆرترین گۆڕان لەم چاوگانەدا ڕوویانداوە هەر لە دەستووری دروستبوون و دروستكردنی پێكهاتەكانی تا گەردانكردنی كارەكان .

## ڕەگی چاوگە ناوازەکان

ئەو ڕەگانەن كە گۆڕانیان لەسەر دەكرێت بە هۆكاری كرتان و سوان بۆ مەبەستی گونجان لە گەردانكردنی كارەكان یا لە دروستكردنی پێكهاتەكان لەم توێژینەوەدا پشت بەو لیستە چاوگانە دەبەستین و دەیانكەین بە نموونەی لێكدانەوەكان، كە مامۆستا محەممەد وەسمان لە كۆنفرانسی زانستی زمانی كوردی لە هەولێر (٢٠١١) خستوویەتییە بەرچاو[١٦] بەڵام لە سەرەتاوە ڕایەكی تایبەت دەخەمە ڕوو لە هۆكاری ناوازەیی و ئاسایی چاوگەكاندا، چونكە هۆكارەكانی ناوازەیی جیاوازن لە چاوگێكەوە بۆ چاوگێكی تر، بۆیە ناتوانین هەموو چاوگە ناوازەكان بخەینە چوارچێوەی ئەو دەستوورەی كە تەنیا لە دەرهێنانی ڕەگی داهاتوودا نەوازەیی و ئاسایی چاوگەكانی پێ دەستنیشان دەكرێت .

## هۆکارەکانی ناوازەیی

١- هەژمار نەکردنی نیشانەی (ست-شت) بە نیشانەی چاوگ .

٢- کاریگەری گۆڕانی نیشانەی چاوگەکان لە بنەڕەتیی (ا - ی) بۆ لەجیاتی(ت - د - ست - شت) ئەگەر بووە هۆی گۆڕان لە ڕەگە بنەڕەتییەکەی .

٣- جیاوازی بکەوێتە نێوان ئەو ڕەگەی کە بکەری دیار و نادیار و بەرکاری لەسەر دروست دەبێت لەگەڵ ڕیشەی کارەکاندا.

٤- لە یەکتر جیابوونەوەی ڕیشەی کار لە دەمەکانی کاردا .

٥- کاری داهاتوو بە (ات - ەت - ۆت) کۆتایی بێت .

٦- چاوگەکە خوازراو بێت لە زمانێکی تر و ڕێك نەکەوتبێ لە گەردانکردندا کە ببێتە هۆی لە دەستوور لادانی بە گوێرەی دەستووری دروستبوون و گەردانکردن و دەستنیشانکردنی ڕەگ و ڕیشە لە زمانی کوردیدا.

**سەرنج:**

ا- ئەو چاوگانەی کە پیتی کۆتایی ڕەگەکانیان (ز - ژ) ە لە پێشدا لێکدانەوەمان بۆیان کردووە.

ب- ئەو چاوگانەی کە لە لیستی ناوازەییدا ماونەتەوە و هۆکاری ناوازەییيان جیاوازە بریتین لە (کردن - بردن - خستن - دان - نان - خواردن - مان - بەستن - بیستن - ڕستن - ڕشتن - دیتن - هاوێشتن - هێشتن - ویستن - گووتن - ووتن - سەندن -(هەڵ) ستان - ژیان - نووستن - گەیشتن - ڕۆیشتن -هاتن -پشکووتن)

**- چاوگەکانی ( کردن - بردن - خستن - دان - نان - خواردن )**

ئەم چاوگە تێپەڕانە لەگەڵ ئەوەی چاوگی ناوازەن، بەڵام بەکار و چالاکن لە دروستکردنی هەموو جۆرەکانی چاوگ بە سادە و ناسادەوە، لە بەشی هەرە زۆری نموونەی سەرچاوەکان لەگەڵ لیستی چاوگە ئاساییەکان دەنووسرێن.

لە سەرەتاوە دەبێت ئەو ڕایە دووبارە بکەینەوە کە جیانەکردنەوەی ڕەگی چاوگ و ڕیشەی کار یەکێکە لەو هۆیانەی وای کردووە لێکۆڵینەوە لە چاوگە ناوازەکان جیاوازی لە بیر و بۆچوونەکاندا دروستبکات، چونکە هەردەم ڕای

تایبەت و لۆژیك دەکرێتە یاسا بۆ ساغکردنەوەی بیر و بۆچوونەکان نەوەك بنەمایەکی ڕێزمانی گشتی بۆ شێوەزارە جیاوازەکان لەسەر شێوەزارە کۆنەکان .

مامۆستا نووری عەلی ئەمین لە ژێر بابەتی ئاوەڵناوی بکەری لێکدراو ڕەگی چاوگی (لەناو–بردن)ی بە (لەناو– بـ) (پێ لێ خستن) بە (پێ لێ– خ) داناوە [17] ئێمە لێرەدا مەبەستمان چاوگی (بردن – خستن)ە بە شێوەی سادەیی نەوەك بە لێکدراوی، لە بابەتی ڕەگی فرمان چییە لە ژێر ناوی ئەو چاوگانەی کە لە بنەواشەدا لائەدەن لەژێر لیستی چاوگە تێپەڕەکان ڕەگی (کردن)ی بە (کر– کە – کا) ڕەگی (خستن)ی بە (خس – خ – خە – خا) نووسیوە[18] .

لە ڕێزمانی ئاخاوتنی کوردی کۆڕی زانیاری کورد لەژێر ناوی هەندێ کار بێ قاعیدەن ڕەگی (کردن) بە (کە – ك) نووسراوە[19] .

لە کتێبی پۆلی نۆیەمی بنەڕەتی لەژێر ناوی ڕەگی کاردا ڕەگی (کردن = کە) (بردن = بە) نووسراوە[20] .

لە لێکدانەوەیەکی دکتۆر ڕەفیق شوانیدا (پێ لێ خستن – پێ لێ خە + ەر) (لەناو بردن – لەناوبە + ەر) کە دەڵێ بزوێنی(ە) نامێنێ دەبێتە (پێ لێ خەر– لەناو بەر)،هەر لە پەراوێزەکەیشدا دەنووسێ (کەر) بریتییە لە (کە)ی ڕەگی (کردن) و پاشگری (ەر)ی نیشانەی ناوی بکەری، هەمان لێکدانەوەشی بۆ(خۆر+ ەر)[21] هەروەها بۆ (دان – نان) هەیە کە دەڵێ وەك ئاشکرایە بەپێی دەستووری زمانی کوردی دوو بزوێن پێکەوە نایەن لەم چاوگانەدا دەنگی (ە) کەیان تێچووە و(ر)ی نیشانەی (ەر)ی ناوی بکەری ماوەتەوە[22] .

ئەگەر بە گوێرەی ئەم لێکدانەوەیە بێت، دەبێت (ر)ی لاوازی کۆتایی لە (کەر–بەر–خەر– دەر– نەر–خۆر) بە یەکگرتنی ڕەگی چاوگ و(ر) لە پاشگری (ەر) دروست بووبێت و بە ناوی بکەر هەژمارکراون نەك وەکو ڕەگی چاوگەکان، کەواتە دەبێت ئەم (ر)ە لە (کریان–کردن–کرن–کرد–کرا–دەکرێت – بکرێت – کراو– کریار – بکەر – بکەرە/ بریان – بردن – برن– برد – برا – دەبرێت – بردرا – براو – ببەر–ببەرە/ خریان – خران – خرا – دەخرێت – خراو – بخەر – بخەرە / دریان – دران – درا – دەدرێت – دراو – بدەر– بدەرە/ نریان – نران – نرا – دەنرێت – نراو/ خووریان– خۆرین – خۆران – خوارن – خارن –

خواردن – خواردنـەوە – خـوارد – خـوورا – دەخورێـت – خـووراو – خۆریـار – بخۆر – بخۆرە) لە پاشگری (ەر) مابێتەوە.

بە لێکدانەوەیەکی لۆژیکی و لە ڕووکەشە دیارەکەیانـدا ئـەم لێکدانەوەیـە لـە ڕاستییەکی بەرچاو نزیکە، بەڵام ئەگـەر بـە شـێوەیەکی قـووڵتر بـۆ بـنج و بنـاوانی شێوەی دروستبوون و گەشە و گۆڕانی ئـەم چـاوگانە شـۆڕببینەوە، لـە شـێوەزارە کۆنەکانەوە شێوەی ئەم چاوگانە ببەسـتینەوە بـە لێکدانـەوەکان و بـەراوردێك لـە نێوانیاندا بکەین، دەبێت وەڵامی ئەو پرسیارانە بدەینەوە.

یەکەم/ ئایا هیچ چاوگێکی تر هەیە (ڕ)ی لاواز لە پاشگری بکەری (ەر) ببێتە بەشێك لە ڕەگ و هەمان دەور و کاری ڕەگە تێپەڕەکانی هەبێت ؟ بۆ دروستکردنی پێکهاتەکان و گەردانکردنی کارەکان ، ئەگەر ڕەگەکـە لـە بنەڕەتـدا پیتـی کۆتـایی ڕەگەکەی (ڕ)ی لاواز نەبێت .

دووەم / پیتی بزوێنی (ە) بکەوێتە کۆتایی ڕەگ .

بێگومان لە هیچ چاوگێکی زمانی کوردیدا ئەمـە نییـە، چـونکە (ڕ)ی لاواز لـە پاشگری (ەر) نابێتە بەشێك لە ڕەگی چـاوگ و لـە ڕیشـەی کـاردا تـا فۆناغـەکانی گەشە و گۆڕان ببڕێ و ببێتـە بەشـێك لـە پێکهاتـەی بنـەڕەتی لـە چـاوگ و ڕەگـی تێپەڕ تا ببێتە کەرتێك لـە نـاوی بکـەر و بـەرکار و بکـەری نادیـار، لەهـەمان کاتـدا گەردانکردنی کارەکانی پێبکرێت .

لـە ڕاسـتیدا ئـەم (ڕ)ە لـە پاشـگری (ەر) نەماوەتـەوە بـەڵکو بـنج و بناغـەی ڕەگەکانن، بەڵام هۆکاری ئەو بیر و ڕا جیاوازانـەی کـە لـە دۆزینـەوەی ڕەگـی ئـەم چاوگانەدا هەیە .

ا– هاوشێوەیی (ەر) ی کۆتایی ڕەگ و پاشگری بکـەر (ك ەر+ەر/ب ەر+ەر/ خ ەر+ەر /د ەر+ەر/ن ەر+ەر) .

ب– نەبوونی چاوگی تێپەڕی بنـەڕەتیی دیکەیـە کـە پیتێـك و پاشـگری (ەر) ببێتە ڕەگی چاوگەکە تا بەراوردی ئەم چاوگانەی پێبکرێت و زیـاتر ئـەو ڕاسـتییە بەدەربکەوێت کە (کەر– بـەر– خـەر– دەر– نـەر) ڕەگـی بنـەڕەتیی چـاوگەکانن، بەڵام لـە ڕەگـی تێنەپـەڕدا لـەم جـۆرە ڕەگـەمان هەیـە هـەروەك (ل+ەر– لـەرین/ و+ەر– وەرین) .

بۆ سەلماندنی ئەوەی کە ئەم (ر)ە لاوازە پیتی کۆتایی ڕەگ و بنچ و بناغەی ئەم چاوگانەیە، لەسەر ڕەگە بنەڕەتییەکان دەستووری دروستبوون و فۆناغـەکانی گەشە و گۆڕانیان دروست دەکەن، وەك هەموو چاوگێکی کوردی .

کەر – بکەر–کەریان

بەر – ببەر–بەریان

خەر –بخەر–خەریان

دەر –بدەر– دەریان

نەر–بنەر–نەریان

لەم قۆناغەدا (ە)ێك تێدەچێت دەبێتە (کریان–بریان–خریان–دریان–نریـان) ئینجا پێکهاتەکانی لەسەر دروست دەبێت (کریان (کران––کرین–کـردن –کـرن)– کریار–کرران–کرا–کراو) چاوگەکانی تریش بەهەمان شێوە .

وەك هــەر چـاوگێکی تێپـەڕ کـە دوا فـۆنیمی ڕەگەکـەی (ر)ی لاوازە تێکـەڵی پاشگری (ران)ی کۆڵەگەی نادیار دەبن، (کرران) دەبێتە (کران–کرا–کراو.....تاد) وەك (نێر+ران–نێرا–نێراو–نێر د را –نێر د راو – لە ناردن/ سـپێر+ ران – سـپێرا – سپێراو – سپێر درا – سپێر د راو لە سپاردن)، (ر)ێك تێدەچێت.

ئەگەر دوا فۆنیمی ڕەگ (ڕ)ی قەڵەویش بێت بە هەمان شێوە (ر)ە لاوازەکـە دەسوێ وەك (کڕ+ ران – کڕا – کڕاو – کڕد را –کڕد راو لە کـڕین/ گـۆڕ + ران – گۆڕا – گۆڕاو – گۆڕ د را – گۆڕد راو لە گۆڕین .....تاد بە هەمان شـێوە و هۆکـار (کـرا – کـراو – دەبێتـە – کـر د را –کـر د راو) چـاوگی (بـردن ) یـش بـە هـەمان شێوە.

لە شێوەزارەکانی کرمانجی ژووروودا نیشانەی چاوگ لە (کرن–برن) تێچووە، بەڵام لە گەردانکردنی کاری ڕابـوردوودا هـیچ جیاوازییـەکی نییـە لەگـەڵ چـاوگێکی دروستبوو بەنیشـانەی (ی) بنـەڕەتی (کـری– بـری) هـەروەك (دزی–بـڕی ) بـەڵام لەهەردوو زاراوەدا، گەردانکردنی کاری داهاتوو دەیانخاتـە بـەر پێـوەری نـاوازەیی (دەکات–دەبات) .

کەواتە دەبێت شێوە بنەڕەتییەکەی ئەم دوو چاوگە ( کریان–کران – کـرین/ بریـان–بـران –بـرین )، لـە شـێوەزارەکانی کرمـانجی خـواروودا نیشـانەی (ا) ی

تێنەپەڕ تێکەڵی بکەری نادیاری دەبێت، بە نیشانەی لەجیاتی (د) لە شوێنی (ی) دەبێتە تێپەڕ ، بەلأم لە کرمانجی ژووروودا (کرن—برن—خوارن —مرن) نیشانەی چاوگەکەیان دەسویٚ هەروەك چاوگە وانییەکان.

**- چاوگی ( خواردن )**

چاوگێکی تێپەڕە، بە ئاڵوگۆڕی (ۆ) بۆ (وو) — (خۆر — بخۆر —خۆریان) دەبێتە (خووریان (خۆران —خۆرین) — خووران — خۆریار — خوورا — خوراو) لە ئەنجامی گۆڕانی نیشانەکەی لە بنەڕەتییەوە بۆ لە جیاتی (ۆ) دەبێتە (وا) — (خۆرین) دەبێتە (خواردن—خوارن).

ئەگەر سەیری ڕەگی (خۆر) بکەین جیادەبێتەوە لەم تاخمە چاوگە، چونکە (خۆرەر) واتای بکەرییەکەی ڕوون و ئاشکرایە هەروەك (فرۆشەر — کوژەر — پارێزەر......تاد بە هەمان شێوەی ئەو چاوگانەیە کە پیتی کۆتایی ڕەگەکانیان (ر)ی لاوازە لە دروستکردنی ناوی بکەردا وەك (شۆر— شۆرەر/ نێر— نێرەر/ سپێر— سپێرەر/ بژێر —بژێرەر.....تاد بەلأم چاوگەکانی تر ئەم تایبەتمەندییەیان نییە (کەرەر—بەرەر—خەرەر—دەرەر—نەرەر) واتای بکەری و گۆکردنیان نەگونجاوە.

پیتی (ر)ی لاوازی کۆتایی ڕەگ دەورێکی ئێجگار کاریگەر دەبینیٚ لە ڕواڵەت و شێوەی دروستکردنی پێکهاتەکان بە تایبەتی لە چاوگە تێپەڕەکان، ئەمەش هەر لە چاوگە ناوازەکاندا وا نییە، بەڵکو لە چاوگە ئاساییەکانیش هەمان دەور دەبینن، بەلأم جیاوازییەکانیان ئەوەیە کە لە گەردانکردندا ناسوێن و ڕێك دەکەون لە گۆکردندا (نارد — دەنێری/ سپارد—دەسپێری) .

**– چاوگی ( خستن )**

چاوگێکی تێپەڕە، بە تێچوونی پیتی(ە) دەستووری دروستبوون و پێکهاتەکانی بە (خریان) دروست دەکات، لە دروستکردنی چاوگ و لە گەردانکردندا بەیەکجاری (ر)ی ڕەگەکەش دەسویٚ هەر(خ) دەمێنێتەوە، بە نیشانەی چاوگی (ست) دەبێتە (خستن)—خست—دەخات) بەلأم لە شێوەی (خسیان)یش بەکاردێت[٢٣].

دەستووری دروستبوون (خەر)—خەریان—خریان—خران—خرا—خراو).

**- چاوگی (دان-نان)**

دوو چاوگی تێپەڕن، دەستووری دروستبوون و پێکهاتەکانیان بە (دریان) (نریان) دروست دەکەن، بە سوانی (ر)ی کۆتایی ڕەگ و(ی) لە (یان) دەبێتە (دە + ان / نە + ان)، لە ئەنجامی ئاڵوگۆڕی (ە — ا) بوونە بە (دان — نان) بە نیشانەی (ی) بوونە بە(داین — ناین)، بەڵام جیاوازی (نان) لەوەدایە کە (ا) دەشکێتەوە بۆ (ێ) لە کاری داهاتوودا (نا — دەنێ).

**ڕەگی چاوگ و کار بەم جۆرە دەبێت :**

ڕەگی چاوگ (کەر — بەر — خەر —دەر — نەر) بەتێچوونی (ە) پێکهاتەکان دروست دەکەن، (کریان—بریان—خریان—دریان—نریان—خۆریان (خووریان).

(کردن—بردن) لە دروستکردنی چاوگ و لە کاری ڕابردوودا ڕەگە بنەڕەتییەکانیان بەدیار دەخەن بە پێچەوانەی دەستوور کە چاوگەکان لە کاری داهاتوودا ڕەگە بنەڕەتییەکان بەدەردەکەوێتەوە .

(خستن—دان—نان) لەسەر ڕەگی بنەڕەتیی پێکهاتەکان دروست دەکەن، بەڵام لە دروستکردنی چاوگ و گەردانکردنی کاری ڕابوردوودا تەنیا(خ—د—ن) لەگەڵ نیشانەی چاوگ بەدەردەکەوێتەوە.

(خواردن) بە گۆڕانی (ۆ) بۆ (وو) پێکهاتەکان دروست دەکات، بە گۆڕانی (ۆ) بۆ (وا) چاوگ و ڕیشەی کاری ڕابردوو دروست دەکات، لەکاری داهاتوودا (ر) ی لاوازی کۆتایی ڕەگەکە تێدەچێت .

ڕیشەی کاری ڕابوردوو، بەگوێرەی هەردوو زاراوەی ژووروو—خواروو (کرد—کر/ برد—بر/خست / دا / نا/ خوارد—خوار) .

ڕیشەی کاری داهاتوو، بەگوێرەی هەردوو زاراوەی ژووروو—خواروو (کا—کە + ت) (با—بە+ت ) (خا — خە + ت) (دا — دە + ت) (نێ + ت) (خوا—خۆ+ت)

کەواتە بە پێوەری هەموو لێکدانەوەکان ئەم چاوگانە ناوازەنە .

بۆ سەلماندنی ئەم لێکدانەوەیە پێویستیمان بە بەڵگەی لێکچواندن هەیە لەنێو چاوگەکانی تری زمانی کوردیدا، کە بە هەمان شێوە لە قۆناغێکدا لەیەکتر دەچن، بەڵام لە قۆناغێکی تردا لەیەکتر جیادەبنەوە.

**- چاوگی ( گرتن-گر )**

چاوگێکی تێپەڕە، دەستووری دروستبوونی لەسەر ڕەگی (گیر) – گیرە – گیرەر – گیریان – گیرران (گیران) – گیریار (گیرۆدە) – گیرا – گیراو).

بە تێچوونی (ی) لە ڕەگە بنەڕەتییەکە چاوگی (گرتن) دروست دەبێ، بەڵام جیاوازی ئەم چاوگە لەوەدایە کە (ی) ناوەڕاستی ڕەگە بنەڕەتییەکە بەیەکجاری سواوە و ڕێکیش کەوتووە لە گەردانکردندا، پێچەوانەی چاوگی (کردن – بردن – خستن – دان – نان – خواردن) چونکە ئەم چاوگانە ڕەگە بنەڕەتییەکانی خۆیان تەنیا لە دروستکردنی ناوی بکەردا بەدەردەخست، بەڵام چاوگی (گرتن) هەموو پێکهاتەکانی لە گەشە و گۆڕان بە ڕەگی (گیر) دروست دەکات، کەچی لە گەردانکردندا بە ڕەگی(گر) دەمەکانی کار و فرمان دروست دەکات (گرت – دەگرێ – بگرە) .

کەواتە ناوازەیی ئەم چاوگە لەوەدایە، جیاوازی دەکەوێتە نێوان ڕەگی بنەڕەتیی چاوگ و ڕیشەی کارەکە .

**- چاوگی ( شووشتن )**

چاوگێکی تێپەڕە، (شۆرین – شۆردن) چاوگی ئاسایی و دەستووریترن، چونکە لەسەر ڕەگە بنەڕەتییەکەی دروست بووینە، ڕەگە بنەڕەتییەکەی لە قۆناغەکان و گەشە و گۆڕان و گەردانکردندا ون ناکات .

دەستووری دروستبوونی (شۆر – شۆرەر – شۆریان (شۆرین –شۆردن) – شۆرران – شۆرا – شۆراو –شۆریار.

لە گەردانکردندا (شۆری – شۆرد / دەشۆری–دەشۆرد).

لەشێوەی (شووشتن) ناوازەیە، چونکە کە نیشانەکەی دەگۆڕین بۆ (شت) پیتی کۆتایی ڕەگ دەسوێ دەبێتە (شووشتن) و لە ڕەگە بنەڕەتییەکەی جیادەبێتەوە (شووشت – دەشوات) ئەمەش تایبەتمەندییەکی نیشانەی (شت)ە کە بۆ گونجان لە هەندێ چاوگدا پیتی کۆتایی ڕەگ دەسوێ هەروەك (هێڵان – هێشتن/ ماڵین – ماشتن/ دێران – داشتن.....تاد).

**- چاوگی (ڕشتن-ڕستن)**

دوو چاوگی تێپەڕن، بەهۆی سوانی (ێ) لە ڕەگی (ڕێژ–ڕێس) بە ناوازە هەژمار کراون، لە کاری ڕابوردوودا گونجاوە لە گەردانکردندا (ڕشت – ڕست)، بەڵام لە کاری داهاتوودا دەبێت بگەڕێتەوە سەر ڕەگە بنەڕەتییەکەی خۆی بە پێچەوانەی (کردن–بردن) کە لە کاری ڕابوردوودا بە شێوە دەستوورییەکەیان گەردان دەکران .

شێوەی دەربڕین لەم دوو چاوگەدا تایبەتمەندیی شێوەزارە و کراوە بە یاسایەکی ڕێزمانی، چونکە شێوە دەستوورییەکەی (ڕێژ – ڕێژە – ڕێژەر – ڕێژیان – ڕێژران – ڕێژرا – ڕێژراو – ڕێژیار) چاوگی (ڕێژین – ڕێشتن) کورت دەبێتەوە بۆ (ڕشتن) چاوگی (ڕێسین – ڕێستن) بە هەمان شێوەیە و دەبێتە (ڕستن) .

هەروەك لە پێشتردا گوتمان تایبەتمەندیی شێوەزار نابێت بکرێت بە یاسا و بنەمای ڕێزمانی لێ هەڵبهێنجرێ، چونکە لەم کاتەدا هەر شێوەزارێك تایبەتمەندییەکانی خۆی لەلا دەبێتە دەستوور بەبێ ئەوەی بۆ بنج و بناغە و قۆناغەکانی دروستبوونی چاوگەکان بگەڕێتەوە لە شێوەزارە کۆنەکاندا، چونکە ئەگەر سوانی پیت لە ڕەگدا بکرێتە دەستووری ناوازەیی .

ئەگەر ئەم تایبەتمەندییە پێوەری ناوازەیی بێت، دەبێت لەتەك ئەم چاوگەدا چەندین چاوگی تریش بخەینە لیستی ناوازەیی، چونکە لە هەندێ شێوەزاردا (فرۆشتن دەبێتە فرۆتن/ کرۆشتن دەبێتە کرۆتن/ خواستن دەبێتە خاستن/ خواردن–خوارن دەبێتە خارن/ توانین دەبێتە تانین /خواندن و خوێندن دەبێتە خاندن.........تاد.

کەواتە سوانی پیت لە چاوگەکان و ڕێککەوتنی لە گەردانکردن و گۆکردنی بە گوێرەی تایبەتمەندیی شێوەزارەکان پێوەری نەوازەیی نییە .

**– چاوگی (مان – مێن)**

چاوگێکی تایبەتە، بە گوێرەی ئەو دەستوورەی کە چاوگەکانی زمانی کوردی پێدروست دەبێت، چونکە بەدەرکەوتنی (ن)ی چاوگ لە گەردانکردنی کاری داهاتوودا جیای دەکاتەوە لە گەردانکردنی هەموو چاوگەکانی زمانی کوردی.

(مان) چاوگێکی سەرنجڕاکێشە، ڕواڵەتی چاوگ و ڕابوردووی هی کاری سادە و تێنەپەڕە، بەڵام کە بە ئایندە دەدرێ لە جیاتی ئەوەی وەك (زا–دەزێ) ببێتە (ما–دەمێ) دەگوترێ (دەمێنێت)(٢٤).

هەروەك دیارە ئەم چاوگە لە دەستووری گەردانکردنی کاری داهاتوو لادەدات، چونکە بە گوێرەی دەستووری گەردانکردن لە زمانی کوردیدا هەرگیز (ن)ی چاوگ نابێتە بەشێکی پێکهێنەر و سەرەکی لە دەمەکانی کاردا، هەروەها ڕەگی کار لە چاوگی(مان) دەبێتە (مێن) ئەمەش لە دەستوور لایداوە، لەوانەیە چاوگەکە لە بنەڕەتدا (ماندن) بێت ئەمجا ڕەگی کار دەبێتە (مێن)(٢٥).

ئێمە لێرەدا دوو لێکدانەوە بۆ ئەم چاوگە دەکەین، ئینجا ئەنجامی هەردوو لێکدانەوەکە بەراورد دەکەین تا ببێتە هۆی بەدەرکەوتن و ڕوونبوونەوەی ڕاستیی شێوەی دروستبوونی ئەم چاوگە.

– **لێکدانەوەی یەکەم** / دەستووری دروستبوون و پێکهاتەکان لەسەر ڕەگی (مێن) دەبێتە (مێنەر–مێنیان (مێنان – مێنین) مێنران – مێنرا – مێنراو)

هەروەك دیارە پێکهاتەکان ئاسایی و دەستوورینە، بەکارهێنانیشیان لە شێوەزارەکانی کوردیدا هەیە، بەڵام لە دروستکردنی چاوگ و ئەو دەستوورەی کە چاوگەکانی پێدروست دەبێ لە کۆڵەگەی دیاردا (مێنیان) چاوگی (مێنان – مێنین) دروستدەکات، شێوە دەستوورییەکەی لە گەردانکردندا دەبێتە (مێنا– مێنی/دەمێنی–دەمێنێ).

– **لێکدانەوەی دووەم** / دەستووری دروستبوون و پێکهاتەکان لەسەر ڕەگی (مان) دەبێتە (مانەر– مانیان(مانان – مانین) –مانران – مانرا – مانراو)

هەروەك دیارە پێکهاتەکان بەکارهێنانیان نییە، بەڵام لە دروستکردنی چاوگ و ئەو دەستوورەی کە چاوگەکانی پێدروست دەبێت لە کۆڵەگەی دیاردا (مانیان) چاوگی(مانان – مانین) دروستدەکات، شێوە دەستوورییەکەی لە گەردانکردندا دەبێتە (مانا–مانی/دەمانێ– دەمانی).

ئەنجامی هەردوو لێکدانەوەکە ئەوەمان بۆ دەردەخات کە ڕەگی(مان–مێن) پێکهاتەکانی ئاڵۆز و تێکئاڵاوە .

بە گوێرەی دەستووری دروستبوونی چاوگەکان لە زمانی کوردیدا دەبێت (مانان/ مانین) یا (مێنان–مێنین) چاوگە دەستوورییەکە بێت .

لە گەردانکردندا شێوە دەستوورییەکەی (مانان– مانا – دەمانێت ) ( مانین – مانی – دەمانیت) بە شکانەوەی (ا) بۆ (ێ) لە کاری داهاتوودا دەبێتە (دەمێنێت – دەمێنیت).

لێرەدا ئەوە بەدەردەکەوێت کە (ان) لە (مانان) یا(ین) لە (مانین) سواوە و بووە بە (مان–مێن) کەوتۆتە سەر ئەم شێوەیەی ئێستا، وا بەدەردەکەوێت کە ڕەگی چاوگ و چاوگ یەك شتن .

ئەگەر لە بنچینە ئاڤێستاییەکەوە شێوەی دروستبوونی ئەم چاوگە بدۆزینەوە، هەروەك (پرسە–ترسە–وارە) لە ئاڤێستادا[٢٦] کە کۆڵەگەی (پرسیان–ترسیان–باریان) چاوگی (پرسین–ترسان– (وارین–بارین)ی لەسەر دروست دەبێ،دەشێ هەروەك ئەو تاخمە چاوگەی پێشەوە (مانە) لە ئاڤێستادا بووبێتە (مانیان) ئینجا بە گوێرەی دەستوور، کرتانی (ا) لە (یان) یا (ی) لە (یان)ی کۆڵەگەی دیاری (مانیان) –(مانان–مانین)ی لەسەر دروستبووبێ، پاشان لە ئەنجامی هاوشێوەیی (ان) لە(م+ان)ی ڕەگ و نیشانە و (ن)ی چاوگی (ان) یەکێکیان سوانی بەسەرداهاتبێت و کورت بووبێتەوە بۆ(مان)، لە پاشاندا ئێمەی کورد وازمان لە(مانین) هێنابێت .

ئەگەر بەراوردێك لە نێوان ئەو چاوگانەدا بکەین کە لە کوردی و فارسی بۆ یەك ڕەگ و ڕیشە دەگەڕێنەوە زیاتر ئەو ڕاستییە ڕوون دەبێتەوە کە هەر (مانان – مانین)ە بە گۆڕانی نیشانەکەی بووە بە (ماندن) هەروەك (پرسە – پرسیان – پرسان – پرسیدن/ ترسە – ترسیان – ترسان – ترسیدن / (وارە – بارە) – باریان – بارین – باریدن.......تاد (مانە – مانیان–مانان–مانین – مانیدن– ماندن) دروست بووبێت و کورت بووبێتەوە بۆ (مان–مێن).

ئەو چاوگەی کە بۆ بەراوردکردن لە شێوەی ئەم چاوگە نزیك بێت چاوگی (هێنان – هانین)ە، چونکە ڕەگی ئەم چاوگەش لە هێنان (هێن)ە، لە هانین (هان)ە، بە هەمان شێوە (ا) و (ێ) ئاڵوگۆڕ دەبن، بەڵام ئەوەی کە ئەم چاوگە لە (مان) جیادەکاتەوە ئەوەیە چاوگی (هێنان – هانین) نیشانە و (ن) ی چاوگی

وەرگرتووە و هەموو پێکهاتەکانی بە شێوەیەکی ئاسایی دروستکردووە (هانەر– هێنەر/هانرا–هێترا/هانراو–هێنراو...........تاد).

هەروەك بینیمان چاوگی (مان) جیاوازە لە دروستکردنی پێکهاتەکان، نیشانە و(ن)ی چاوگەکەی سواوە و سوانێکی یەکجارەکی بەسەردا هاتووە، بە جیاوازی لەگەڵ چاوگە (وو–ر)ەکان کە تەنیا نیشانەکانی چاوگیان لێ دەسوا .

کەواتە چاوگی (مان) و ڕەگی (مێن) یەك شتن، چاوگێکی ناوازەیە بە پێوەری دەستووری دروستبوون و قۆناغەکانی گەشە و گۆڕان و لە گەردانکردندا.

**- چاوگی ( بەستن - بەس / بیستن – بیس )**

دوو چاوگی تێپەڕن، دەستووری دروستبوونی (بەس – بەسەر– بەسیان (بەسان) – بەسریان–بەسران – بەسرا – (بەسریاگ –بەسریاو–بەسراو)– بەسیار).

نیشانەی بنەڕەتی (ا)ی گۆڕاوە بۆ(ت)، (بەسان) بووە بە (بەستن)، چاوگی (بیسین)یش بووە بە (بیستن) .

نیشانەی چاوگەکە لە شێوەزارەکانی کرمانجی ژووروو– خوارووو تێکەڵی چاوگ و پێکهاتەکانی دەبێت، گونجاوە لە گۆکردندا (بەست ان)– (بەستەر– بەسترا – بەستراو) / (بیستن)–(بیستەر–بیسترا–بیستراو).

لە گەردانکردندا (بەسی–دەبەسیت–ببەسە) دەبێتە (بەست– دەبەستیت – ببەستە).

لە گەردانکردندا نیشانەی چاوگەکە تێکەڵی دەمەکانی کار دەبێت (بیسی– دەبیسی–ببیسە) دەبێتە (بیست–دەبیستێت–ببیستە).

لەم دوو چاوگەدا لەگەڵ ئەوەی نیشانە گۆڕاوەکانیان تێکەڵی پێکهاتەکانیان بووە، بەلاّم ڕێککەوتوونە لەگەڵ یاسا ئاساییەکانی چاوگ و کار لە زمانی کوردیدا، لە هەمان کاتیشدا بووە بە هۆکاری ناوازەیی .

ڕەگی چاوگ (بەسان–بەستن–(بەس)/ بەستان–بەست / بیسین–بیستن– (بیس).

ڕیشەی کاری ڕابردوو (بەسا–بەست/ بیسی– بیست).

ڕیشەی کاری ڕانەبردوو (بەسیت–بەستێت/ بیسیت).

کەواتە تێکەڵکردنی نیشانەی چاوگ بۆتە هۆکاری ناوازەیی، بەڵام لەبەر ئەوەی شێوەیەکی گشتی وەرگرتووە دەشێ وەك ناوازە هەژمار بکرێن.

**- چاوگی (دیتن)**

چاوگێکی تێپەڕە، دەستووری دروستبوونی (دی — دیە — دیەر — دییان (دیین(دیتن) —دیران—دیرا—دیراو—دییار).

ئەو جیاوازییەی کە ئەم چاوگە لە چاوگەکانی تر جیادەکاتەوە، ئەگەر بە نیشانە بنەڕەتییەکەی بەکاربێ بۆ گونجان پێویستی بە (ن)ێکی ناوبەند دەبێ لە نێوان (ی) کۆتایی ڕەگ و(ی) نیشانەی چاوگ،(دیین) دەبێتە (دینین) کە لە شێوەزاری سۆرانی و لە هەولێر بەکار دەهێنرێ لە ئاخاوتندا (دینی—دەدینی— بدینە) ئینجا لە ئەنجامی گۆڕان و گونجانی سەرزاردا جارێکی تر (د)ی سەرەتای ڕەگ گۆڕاوە بۆ (ب)، (دینین) بووە بە (بینین).

لێرەدا ئەوە بەدەردەکەوێت ئەو شێوەزارەی (دیتن) بەکاردەهێنێ دەبێت لە کاری داهاتوودا بۆ شێوە گۆڕاوە بنەڕەتییەکە بگەڕێتەوە (دیت—(دەدینی — دەبینی) ڕەگە بنەڕەتییەکە و گۆڕاوەکە لە گەردانکردندا تێکەڵی یەکتر دەکرێت، ئەمەش دەبێتە هۆی ناوازەیی، بەڵام ئەگەر لە شێوەی (دینی— دەدینی) (بینی — دەبینی) بەکاربهێنرێ لە ناوازەیی دەچێتە دەرەوە .

تایبەتمەندییەکی تری ئەم چاوگە لەوەدایە هەروەك (بەستن—بیستن) نیشانەی چاوگەکەی تێکەڵی پێکهاتەکانی دەبێت لە شوێنی (دیرا—دیراو)/ (دیترا— دیتراو) (دینرا—دینراو/بینرا—بینراو) بەکاردەهێنرێت .

کەواتە ڕەگی بنەڕەتیی چاوگەکە (دی)ە لە (دیین—دیتن)، گۆڕاوەکە (دین) لە (دینین)—(بین) لە (بینین).

ڕیشەی کاری ڕابردووی (دیین—دیتن) دەبێتە (دیی—دیت) /(دینین) دەبێتە (دینی)/ (بینین) دەبێتە (بینی).

ڕیشەی کاری داهاتوو دەگەڕێتەوە سەر شێوە بنەڕەتییەکەی دەبێتە (دینیت — بینیت).

**- چاوگی ( گوتن - وتن - لێ )**

ئەم چاوگە تێپەڕە لە شێوەزارە جیاوازەکاندا بە زۆر شێوە دەردەبڕێ لە ئاخاوتندا (گوتن - وتن - وشین - وژین) هەموویان لە ڕیشەیەکن، واوی (وژین) دەگۆڕێ بە(ی)و دەبێتە (بێژین) وەك (دەبێژم—دەبێژی) پاشان (دێژم- دێژی)(٢٧) لەوانەیە گۆڕانی (ی) لە (بێژین) یش بۆ(ب) جارێکی تر گۆڕابێ، بووبێتە (بێژین) —(بێژی - دەبێژی).

ئەم چاوگە ڕەگ و ڕیشەکەی گۆڕانی زۆری بەسەردا هاتووە (گوتن - گۆتن - وتن - واتن - وەتن) پێوەندی بە یەکتربەسترانەوە لە نێوانیاندا ڕوون و ئاشکرایە.

(گوتن) بە کوردی و(گفتن) بە فارسی، لە ئەنجامی ئاڵوگۆڕی (گ) و (خ) و نیشانەی چاوگ لە زاراوەی کرمانجی ژووروودا بووە بە (خفین -خفتن) بە پێشگری (ئا) بووە بە (ئاخڤین - ئاخفتن) بووە بە بناغەی (ئاخڤاندن - ئاخافتن - ئاخاوتن).

- بە هۆی نەبوونی دەستووری دروستبوونی سەربەخۆ، دەکەوێتە بەر پێوەری ناوازەیی .

- هۆکارێکی تر جیابوونەوەی ڕیشەی دەمەکانی کارە (گوتم - دەڵێم) هەروەك دیارە هیچ پێوەندییەکیان لە نێواندا نییە، بەڵام بە گوێرەی دەستووربێ، دەبێت چاوگی (لان) هەبووبێت، بەڵام بە کاریگەری هەر هۆکارێك بێت سواوە و تێچووە، هەرچەندە هەندێ شێوەزار دەلێرێ بە واتای دەگوترێ بەکار دەهێنن(٢٨).

**- چاوگی ( سەندن - سەن - سێن )**

ئەم چاوگە تێپەڕە کە گەردان دەبێت ڕەگی داهاتووی بە(سەن-سێن) بەدەردەکەوێت (دەسەنم-دەسێنم).

دەستووری دروستبوونی (سەن - سەنەر - سەنیان (سەنین - سەندن) - سەنران - سەنرا - سەنراو- سەنیار).

لە گەردانکردندا (دەسەنی-دەسێنی)، ڕەگی (سێن) دەیخاتە بەر پێوەری نەوازەیی.

– بە لێکدانەوەیەك وا بەدەردەکەوێ کە (سەن– سێن) لە نێوان خۆیاندا (ە) بۆ (ێ) ئاڵوگۆڕ دەبێت .

– بە لێکدانەوەیەکی تر وا پێدەچێت کە (سێن) لە ڕەگ و چاوگی تێپەڕکراوی (ستێن) (ستاندن) بە سوانی (ت) دروست بووبێ (دەستێنم – بووبێتە – دەسێنم ) پاشان گۆڕابێ بۆ (دەسەنم).

دەستووری دروستبوون و پێکهاتەکانی چاوگی تێنەپەڕی (ستان) لەسەر ڕەگی ( ست) دەبێتە ستیان (ستان).

لەسەر ڕەگی تێپەڕکراوی (ستێن)– ستێنەر– ستێنران – ستێنرا – ستێنراو (ستاندن).

بە شێوەی چاوگی داڕێژراوی تێپەڕ (هەڵ ستان+دن – هەستاندن) (هەڵ ساندن) وا بەدەردەکەوێت کە (ساندن) کورتکراوەی (ستاندن) بێ لە سلێمانی جارێکی دی قرتاوە و بووە بە (سەندن)(٢٩).

– بەلێکدانەوەیەکی تر وادەردەکەوێ کە پاشگری (اندن) تێکەڵی شێوەی چاوگەکە بووە، هەروەك هەندێ جار و بەهەمان شێوە چاوگی (زان – زایاندن) کورت دەکرێتەوە بۆ (زاندن) (هوونانەوە–هووناندنەوە – (هۆنینەوە) لە کرمانجی ژووروودا دەبێتە (ڤەهۆندن) پاشان دەگۆڕێ بۆ (ڤەهاندن) یا چاوگی (خواندن) کە دەبێتە (خاندن) وا بەدەردەکەون کە پاشگری (اندن) تێکەڵی چاوگەکان دەبێت، بەڵام لە ڕاستیدا گۆڕان و سوان و لەیەکچوونی شێوەی ڕەگ و نیشانە و (ن) ی چاوگ لەگەڵ پاشگری (اندن) ئەم چاوگانە وا بەدەردەخات، چونکە ئەگەر پاشگری (اندن)یان لێ بکرتێنی هەروەك چاوگەکانی تر هەر تەنیا تاکە پیت لە جێگای ڕەگ دەمێنێتەوە ئەمەش پێچەوانەی ڕەگی چاوگەکانە .

**تایبەتمەندیی ئەم چاوگە لەوەدایە :**

– هەردوو شێوە ڕەگی ( ست – سەن) دەستووری دروستبوونی سەربەخۆیان هەیە (سەنیان – ستیان ).

– ڕەگ و چاوگی تێپەڕ و تێپەڕکراو هاوواتای یەکترن (سەن –ستێن) (سەنین – سەندن – ستاندن).

–وا بەدەردەکەوێت گەردانکردنی کاری داهاتووی (دەسێنم) کورتکراوەی (دەستێنم) بێت، ڕەگی (سێن) کورتکراوەی (ستێن) بێت، تێکەڵی شێوەی (سەندن) بووە لە ئاخاوتن، چونکە گونجاوە لەسەر زار و واتادا.

– ئەگەر لە گەردانکردندا هەردوو شێوە تێکەڵی یەکتر نەکەین ناکەوێتە بەر پێوەری ناوازەیی هەروەك (سەنیم – سەندم – (دەسەنم) – (ستاندم – دەستێنم) ئاسابییە، بەلاّم لەشێوەی (سەنیم– سەندم – ستاندم (دەسێنم) ناوازەیە .

کەواتە پاشگری (اندن) تێکەڵی (ساندن –سەندن) نەبووە، بەڵکو (سێن) لە کورتکراوەی (ستێن) تێکەڵی گەردانکردنی کاری داهاتوو بووە، تایبەتمەندییەکی شێوەزارەو کراوە بە یاسایەکی گشتی .

**- چاوگی ( هاوێشتن – هاوێ – اوێ )**

ئەم چاوگە تێپەڕە بە سێ هۆکار کەوتۆتە لیستی نەوازەیی:

١– گۆڕانی پیتی کۆتایی ڕەگ لە (ژ) بۆ (ش) کە لەپێشتردا ئەم باسەمان کردووە (هاوێشت – دەهاوێژیت –بهاوێژە).

٢– سوانی پیتی کۆتایی ڕەگەکە لە کاری داهاتوودا (هاوێشت – دەهاوێ – بهاوێ) ڕەگەکەی دەبێتە (هاوێ).

٣– سوانی پیتی سەرەتای ڕەگ و کۆتایی ڕەگەکەیە بەیەکەوە (هاوێشت – داوێ – باوێ) کە ڕەگەکەی دەبێتە (اوێ).

ئەم شێوە چاوگە لەم چاوگانەن کە بە تایبەتمەندیی شێوەزارەکان و لە ئاخاوتندا بە هۆی سوان و کورتکردنەوە ئەم شێوە دەربڕینە وەردەگرن .

دەستووری دروستبوونی شێوە بنەڕەتییەکەی پاراستووە (هاوێژ – هاوێژەر– هاوێژیان (هاوێژان –هاوێژین) – هاوێژریان – هاوێژران – هاوێژرا – هاوێژراو).

لە گەردانکردندا شێوە دەستوورییەکەی (هاوێژا–هاوێژی–هاوێشت) – دەهاوێژیت – بهاوێژە).

لێرەدا دەبێ ئەوە بڵێین ئەگەر شێوە ئاخاوتنی شێوەزارێك و گفتوگۆی تایبەتی نێوان ئاخێوەرانی هەر شێوەزارێك بکەینە بنەما بۆ بابەتێکی ڕێزمانی،

نەوەك هەر زمانی كوردی بەڵكو هیچ زمانێك پێویستی بە ڕێزمانێكی گشتی زمانەكە نابێت، چونكە هەر شێوەزارێك شێوەی ئاخاوتنی تایبەتی بۆ دەبێتە ڕێزمانێكی ئامادە، لەم كاتەشدا ئەو چاوگەی دەستووری بێت ئەوا هیچ گرفتێكی تێدا نابێت، ئەوەی لە دەستووریش لابدات بنەمایەكی ڕێزمانی بە گوێرەی دەربڕینی لەگەڵ شێوەزارێكدا بۆ دەكرێتە چوارچێوە و ناگەڕێنرێتەوە بۆ شێوە دەستوورییەكەی، بەڵام لێرەدا دەور و كاری ڕێزمان بەدەردەكەوێت كە چاوگی لەم شێوە بگەڕێنێتەوە بۆ شێوە دەستوورییەكەی، واتە دەبێت ئەو چاوگەی لە ئاخاوتندا لە دەستوور لادەدەن بیگەڕێنێتەوە بۆ شێوە بنەڕەتییەكەی لە نووسین و ڕێزماندا .

پیتی سەرەتای ڕەگی ئەم چاوگە (ھ)ە بۆیە ئەم تایبەتمەندییەی بۆ دروستبووە، كە لە گەردانكردنی كاری داهاتوودا دەسوێ، چونكە ئەگەر پیتی سەرەتای ڕەگ (ھ ) یا( ئـــ) بێت زیاتر بۆ سوان و كرتان لەباردەبن هەروەك:

(هێنان – دەهێنیت – بهێنە ) دەبێتە (دەینیت – بێنە – بینە).

(هێڵان – دەهێڵیت – بهێڵە ) دەبێتە ( دێڵی (بەجێی دێڵی – بەجێی نایەڵی – بەجێی بێڵە).

(ئێشان – ئێشاندن – دەئێشیت – دەئێشێنیت ) دەبێتە ( دێشی – دێشینیت).

(هاژووشتن – دەهاژوا – دەهاژویت – بهاژۆ) دەبێتە ( داژوا – باژۆ).

(ڕا هەژاندن – ڕا دەهەژێنیت) دەبێتە ( ڕا دەژێنیت – ڕا دەژەنیت).

(ئاخافتن – دئاخڤیت – بئاخڤە ) دەبیتە ( داخڤیت – باخڤە).

(هات – دهێت) دەبێتە ( دێت).

كەواتە ڕەگی چاوگ (هاوێژ) / ڕیشەی ڕابردوو (هاوێشت) / ڕیشەی داهاتوو (هاوێژیت).

**- چاوگی ( هاتن )**

یەكێك لەو هۆكارانەی كە چاوگی (هاتن)ی كردووە بە ناوازە ئەم تایبەتمەندییەیە كە پیتی(ھ) لە سەرەتایدایە (هات–دهێت) بووە بە(دێت).

هۆکارێکی تری ناوازەیی ئەم چاوگە لەوەدایە کە دەستووری دروستبوون و قۆناغی گەشە و گۆڕانی سەربەخۆی نییە، چونکە بناغەی دروستبوونی لە سەر ڕەگی تێپەڕی (هان) بۆ دروست بووە، کە نیشانەکەی لە (ی) بۆ (ت ) دەگۆڕێ (هانین) دەبێتە (هانتن) بە سوانی (ن) ی کۆتایی ڕەگ دەبێتە (هاتن)، ئەم گۆڕانەش دەبێتە هۆی دروستبوونی چاوگێکی تێنەپەڕ لەسەر ڕەگێکی تێپەڕ، ئەمەش پێچەوانەی ئەو دەستوورەیە کە دەڵێین:

ا– هەموو ڕەگێکی تێپەڕ چاوگێکی تێپەڕی لەسەر دروست دەبێ، هەموو ڕەگێکی تێنەپەڕیش چاوگی تێنەپەڕ و تێپەڕکراوی لەسەر دروست دەبێت .

ب– ئەگەر نیشانەی چاوگ بگۆڕێت نابێت واتاکەی بگۆڕێ .

هۆکارێکی تری نەوازەیی لەم چاوگەدا، جیابوونەوەی ڕەگ و ڕیشەی کاری فرمانە (وەرە) لە دەمەکانی کاردا (هات – دهێت – وەرە) بەڵام کاری فرمان لە شێوازی داخوازی (بهێت) هەمان ڕێژەی یاسایی هەیە .

کەواتە ئەم چاوگە ناوازەیە بە گوێرەی دەستووری دروستبوون و لە گەردانکردندا.

**- چاوگی ( هێشتن- هێل )**

هۆکاری نەوازەیی لەم چاوگە تێپەڕەدا سوانی پیتی سەرەتا (ه) و(ل)ی کۆتایی ڕەگە لە کاتی گۆڕانی نیشانەی (ا)ی بنەڕەتی بۆ نیشانەی (شت)ی لەجیاتی، ئەم نیشانەیەش ئەو تایبەتمەندییەی هەیە، پیتی کۆتایی ڕەگ دەسوێ بە مەبەستی گونجان (هێلان) دەکا بە (هێشتن) هەروەك (شۆرین–مالین–دێران) یش دەکا بە (شووشتن– ماشتن– داشتن).

دەستووری دروستبوونی لە سەر ڕەگی(هێل – هێلیان (هێلان – هێلین – هێشتن) هێلەر – هێلران – هێلراو – هێلرا).

لە گەردانکردندا نیشانەی چاوگ دوافۆنیمی کاری ڕابردووە (هێلا – هێشت/ لە کاری داهاتوودا بۆ بنچینەی خۆی دەگەڕێتەوە (دەهێلی–دێلی/ بهێلە–بێلە).

کەواتە ڕەگی چاوگ (هێل) / ڕیشەی ڕابردوو (هێلا–هێشت)/ ڕیشەی ڕانەبردوو(هێلیت).

**– چاوگی ( ویستن- ە وی )**

چاوگێکی تێپەڕ و تایبەتە،هۆکاری نەوازەیی لەم چاوگەدا دەستنیشانکردنی ڕەگ و هەژمارنەکردنی نیشانەی (ست) ە .

ڕەگی (ە وێ) لە گەردانکردنی کاری داهاتوودا بە شێوەی (دەم + ەوێ + ت – دەی + ەوێ + ت) دەرهێنراوە، بەڵام لە شێوەی (دەم + وێ + ت – دەی + وێ + ت) یش بەکاردەهێنرێت، کەچی نەکراوە بە بناغە بۆ دەرهێنانی ڕەگەکەی کە دەبێتە (وێ).

دەستووری دروستبوونی لەسەر ڕەگی (وی – ڤی– (ڤییان –ڤیان – ڤیین –ویستن).

گەردانکردنی (ڤیا – دڤێت ) (ویست– دەیەوێت).

بە گوێرەی دەستوور و قۆناغی گەشە و گۆڕانی چاوگ لەسەر ڕەگێکی تێپەڕ لە شێوەی (ڤیەر – ویەر/ ویران – ڤیران/ ویرا – ڤیرا / ویراو – ڤیراو) بکەر و کۆڵەگەی نادیار و بکەری نادیار و بەرکاری لێ دروست نابێ .

نیشانەی چاوگی (ست) لە (ویستن) هەروەك (ت) لە (دیتن – بیستن – بەستن) تێکەڵی پێکهاتەکانی دەبێت (ویستەر– ویسترا – ویستراو).

کەواتە ڕەگی چاوگ (وی–ڤی) / ڕیشەی ڕابردوو (ویست–ڤیا) / ڕیشەی ڕانەبردوو (وێت–ڤێت–ەوێت).

**– چاوگی ( نووستن – نوو )**

چاوگێکی تێنەپەڕە، دەستووری دروستبوونی لە سەر ڕەگی (نوو –نڤ) (نوویان – نڤیان (نڤین – نوین – نووستن).

گەردانکردنی کاری ڕابردوو (نوی –نڤی – نووست ) کاری داهاتوو (دەنوێ+ت).

کە ڕەگ و چاوگی تێپەڕکراوی بۆ دروست دەبێت پێکهاتەکانی دەبێتە (نوێن)–نوێنەر–نوێنران–نوێنراو–نوێنرا) (نواندن).

لە گەردانکردندا (نواند–دەنوێنیت) .

لەم چاوگەشدا ئەو ڕاستییە بەدەردەکەوێت کە (ست) نیشانەیەکە لە نیشانەکانی چاوگ هەروەك نیشانەکانی تر لە زمانی کوردیدا، چونکە هەمان

سیفەتی نیشانەکانی چاوگی هەیە، دەکەوێتە شوێنی نیشانە بنەڕەتییەکە بەبێ ئەوەی واتاکەی بگۆڕێ (نو ی ن—نف ی ن—نو ست ن—نف ست ن)

کەواتە ئەگەر نیشانەی (ست) بە نیشانەیەکی چاوگ هەژماربکەین، کە لە ڕاستیشدا نیشانەیەکی چاوگە، ئەم چاوگە ناکەوێتە بەر پێوەری ناوازەیی، بەلاّم ئەگەر بەنیشانەی چاوگ هەژماری نەکەین وەك ناوازە بەدەردەکەوێت، بەلاّم لەم کاتەدا دەبێت هەموو ئەو چاوگانەی کە بەنیشانەی (ست) دروست دەبن لە تەك ئەم چاوگەدا چەندین چاوگی تریش بە هەمان هۆکار بخەینە لیستی ناوازەیی هەروەك (زانین—زانستن/ توانین—توانستن/ زایین—زەیستن/ کەلین—کەلستن..........تاد).

**– چاوگی ( ڕۆیشتن – ڕۆ )**

چاوگێکی تێنەپەڕە، هۆکاری ناوازەیی لەم چاوگەدا سوانی پیتی کۆتایی ڕەگ و هەژمار نەکردنی نیشانەی (شت)ە بەنیشانەی چاوگ.

هۆکارێکی تر لە دەستوورلادانی ئەم چاوگەیە کە هەروەك چاوگە ئاساییەکان لە کاری داهاتوودا بە (ێت) گەردان نابێت بە(ات) گەردان دەبێت (دەڕوات)

هۆکارێکی تر سوانی پیتی کۆتایی ڕەگە بنەڕەتییەکەیە کە(ی) لە (ڕۆیین – ڕۆیشتن) دەبێتە (ڕۆشتن)

ڕەگی بنەڕەتی ئەم چاوگە (ڕۆی)ە، بەلاّم بە تایبەتمەندی شێوەزاری پیتی کۆتایی ڕەگەکە (ی) دەسوێ و دەبێتە (ڕۆشت) سوانی پیت لە ڕەگەکەیدا دەبێتە هۆی بەدەرکەوتنی لە شێوەی (ڕۆشتن) هەروەك لە (ڕێستن—ڕستن / ڕێشتن—ڕشتن)

دەستووری دروستبوونی ( ڕۆی – ڕۆییان ( ڕۆیین— ڕۆیشتن)

گەردانکردنی (ڕۆیی – ڕۆیشت) – دەڕوات) کە ڕەگی تێپەڕکراوی بۆ دروست دەکەین پێکهاتەکانی دەبێتە (ڕۆیێن —ڕۆییێنەر – ڕۆییێنران – ڕۆییێنراو – ڕۆییێنرا)

لەبەر ئەوەی گۆکردنی پێکهاتەکانی ئەم چاوگە نەگونجاوییەکی سەرزارمان بۆ پەیدا دەکا لە بەکارهێنرانیشدا بەرەو لاوازی چووە، چونکە شێوەی گۆکردنی لە چاوگی (ڕوان – ڕواندن) نزیك بۆتەوە، بۆتە هۆی ئەوەی تێکەڵی یەکتربن

( ڕۆییێنەر– ڕوێنەر/ ڕۆییێنرا – ڕوێنرا/ ڕۆییێنراو – ڕوێنراو)

بە لێکدانەوەیەکی تر دوور نییە کە ڕەگی ئەم چاوگە پێوەندی لەگەڵ ڕەگی ( ڕەو – ڕەڤ) – ڕەڤیان (ڕەڤین) –ڕەڤاندن – ڕەواندن) دا هەبێت .

کەواتە ئەگەر (شت) بەنیشانەی چاوگ هەژمار بکەین، لەشێوەی (ڕۆیین– ڕۆیشتن) لە کاری ڕابوردوو گەردانی بکەین (ڕۆیی–ڕۆیشت)، گەردانکردنی کاری داهاتووی (دەڕوات) دەیخاتە بەر پێوانەی ناوازەیی.

**– چاوگی ( گەیشتن )**

چاوگێکی تێنەپەڕە، (گەی) ڕەگی بنەڕەتی چاوگەکەیە کە چاوگی (گەیین)ی لەسەر دروست دەبێ، ڕیشەی کاری لەیەکتر جیا دەبێتەوە و دەبێتە هۆی ناوازەیی (گەیی– گەیشت/ دەگا+ت)

کە تێپەڕی دەکەین لەسەر ڕەگی تێنەپەڕ (گەی+ێن) پێکهاتەکانی دەبێتە (گەیێنەر–گەییێنران–گەیێنراو–گەیێنرا) گەیاندن.

ئەگەر بە چاوگی (گەیین) گەردانی بکەین لە شێوەی (گەیی – دەگەیێت ) وەك چاوگێکی ئاسایی بەدەردەکەوێت لە شێوەی (مەیین – مەیی – دەمەیێت)

هەردوو چاوگی (ڕۆیشتن–گەیشتن) لە کاری داهاتوودا لە ڕەگە بنەڕەتییەکانی خۆیان دادەبڕێن و سیفەتی نەوازەیی وەردەگرن (دەڕوات – دەگات) لە هەمان کاتدا لە کاری فرمانیش جارێکی تر دەگۆڕێن و دەبێتە (بڕۆ – بگە)

کەواتە ڕەگی چاوگ (ڕۆی –گەی )ە، ڕیشەی ڕابوردوو( ڕۆیی – ڕۆیشت/ گەیی –گەیشت) ڕیشەی ڕانەبوردوو (ڕوا + ت/ گا+ت)

**- چاوگی ( ژیان – ژی - ژیی )**

چاوگێکی تێنەپەڕە، ئەگەر پیتی کۆتایی ڕەگ بزوێن بێت تایبەتمەندی بە شێوەی چاوگ دەدات لە قۆناغەکانی گەشە و گۆڕان و گەردانکردندا.

دەستووری دروستبوونی (ژی) – ژی یان (ژی ین –ژیان)

پیتی (ی) کۆتایی ڕەگ و نیشانەی چاوگ لە (ژیین) یەکێکیان دەسوێ و کورت دەبێتەوە بۆ (ژین) هەروەك (گریین – گرین / ڤیین – ڤین / زایین – زاین/جایین–جاین/سایین–ساین ........تاد

کە ڕەگ و چاوگی تێپەڕکراوی بۆ دروستدەکەین پێکهاتەکانی دەبێتە (ژیێن) – ژیێنەر – ژیێنران – ژیێنرا –ژیێنراو) (ژیاندن)

کـە گـەردانی دەکـەین بـۆ دەمـی داهـاتوو چـاوگەکە بەهـەردوو نیشـانەی بنەڕەتیی (ا – ی) تێکەڵی یەکتر دەبن

(ژیان – دەژییێ+ت) / ( ژیین– دەژیی+ت)

کە کورتی دەکەینـەوە بـۆ گونجـانی سـەرزار دەبێتـە (دەژی+ت) بـە هـەمان شێوە (گریان–دەگرییێ+ت/گریین – دەگریی+ت (دەگریت)

کەواتە ئەگەر چـاوگەکە بەهـەردوو نیشـانە تێکـەڵی یـەکتر نەکـەین و کـورتی نەکەینەوە لـە کـاتی دەربـڕین و گەردانکردنـدا وەك نـاوازە بەدەرناکـەوێت، بـەلاّم سروشـتی ئـەم چـاوگە لەوەدایـە کـە چـاوگەکە بەهـەردوو نیشـانەی (ا–ی) لـە گەردانکردنـدا تێکـەڵی یـەکتر دەبـن، وا بەدەردەکـەوێت کـە جێنـاوی (ێـت) بـە ناڕەوایی خپ کراوە[٣٠]

چاوگی (شیان–ڤیان) لە شێوەی ئـەم چاوگەدایە (شـیا–دەشـیێت ) کـورت دەبێتـەوە بـۆ( دەشـێت–دشـێت)( ڤیـا– دڤیێـت دەبێتـە (دڤێـت) بـە جیـاوازی سوانی(ی) هەروەها شکانەوەی (ا) بۆ(ێ)

**– چاوگی ( پشکووتن – پشکوێ )**

چـاوگێکی تێنەپـەڕە، هۆکـاری نـاوازەیی لـەم چـاوگەدا جیـاوازە، چـونکە دەستووری دروستبوون و قۆناغەکانی گەشە و گۆڕان و گـەردانکردنی ئـەم چاوگە هـەروەك چـاوگێکی ئاسـاییە کـە کۆتـایی ڕەگەکـەی بـە پیتـی بـزوێن هاتبێـت (پشکوین –پشکڤین – پشکووتن – پشکفتن)

گـۆڕانی نیشـانەکەی لـە (ی) بنـەڕەتیی بـۆ (ت) هـیچ گۆڕانکارییـەکی لـە ڕەگەکەدا نەکردووە .

لــە گەردانکردنیشــدا ڕیشــەی دەمــەکانی کــار و ڕەگــی چــاوگ لەیــەکتر جیانەبوونەتەوە (پشکوا–پشکوی –پشکووت – پشکفت) – دەپشکوێت)

کـە ڕەگ و چـاوگی تێپـەڕکراوی بـۆ دروسـت دەبێـت پێکهاتـەکانی دەبێتـە (پشکووێن)– پشکوێنەر – پشکوێنران – پشکوێنرا – پشکوێنراو) (پشکواندن)

هۆکاری ناوازەیی لەم چاوگەدا ئەوەیە کە هەروەك دکتۆر وریا عومەر ئەمین دەنووسێت، بە لێکدانەوەیەکی لۆژیکی ڕوودانی لە ژوور ئارەزوو و دەسەڵاتی مرۆڤدایە، هیچ هێزێکی دیار دەستنیشان ناکرێ بکرێ بە بکەری ئەم جۆرە فرمانە(٣١)

ئەگەرچی ئەم لێکدانەوەیە بۆ ئەوەیە کە چاوگی تێنەپەڕی (پشکووتن) ناکرێ بە تێپەڕ، بەڵام هەمان هۆکاریش ئەم چاوگە دەخاتە لیستی ناوازەیی، بە هەمان شێوە (زاندن (زایاندن) — گەناندن)یش، هەروەها ئەو چاوگانەی کە لە دەنگە سروشتییەکانیش پەیدا دەبن دەکەونە بەر هەمان پێوەری ناوازەیی، چونکە ناتوانرێ کەسێك بکرێ بە (حیلێنەری ئەسپێك) یا (جووکێنەری جووجەڵەیەك .............تاد

کەواتە ئەم هۆکارەش هۆکارێکی ترە بۆ دەستنیشانکردنی چاوگی ناوازە

**– چاوگی (زان - زێ)**

چاوگێکی تێنەپەڕە، قۆناغەکانی گەشە و گۆڕانی ئەم چاوگە لەسەر ڕەگی (زای) دروست دەبێت .

دەستووری دروستبوونی (زای — زایە —زای+یان (زایان — زایین)

ڕەگ وچاوگی تێپەڕکراوی بۆ دروست دەکەین (زایێن)—زایێنەر —زایێنران — زایێنراو — زایێنرا) (زایاندن)

بە سوانی پیتی (ی) کۆتایی ڕەگ لە (زای ان) پاشان سوانی (ا) ێك لە ئەنجامی بەدواداهاتنی دوو(ا) (زایان) بووە بە (زا ان) ئینجا کورت بۆتەوە بۆ(زان)

کە ڕەگ و چاوگی تێپەڕکراوی بۆ دروست دەبێت بەدەردەکەوێت کە پێکهاتەکانی (زای+ێن) (زایاندن) دەستووریترە لە (زاندن) (زێن)— زێنەر —زێنراو — زێنرا) چونکە ئەگەر وابێت لەم چاوگەدا تاکە پیت وەك ڕەگ دەمێنێتەوە (ز+اندن/ ز+ێن) ئەمەش لە هیچ چاوگێکی کوردیدا نییە .

چاوگی (زاندن) بە گۆڕینی نیشانەی چاوگەکەی دەکەوێتە بەرانبەر چاوگی (زانین —زانستن) ئەمەش پێچەوانەی دەستووری چاوگەکانە، چونکە هەرگیز نابێت گۆڕانی نیشانەی چاوگ ببێتە هۆی گۆڕانی واتا لە چاوگدا، بەڵام هەروەك دیارە لە شێوە دەستوورییەکەیدا، گۆڕانی نیشانەی چاوگ لە (زایان—زایین) کە دەبێتە

(زەیستن) وەك هەموو چاوگێك كە نیشانەی چاوگەكە ئاڵوگۆڕ دەبێت نابێتە هۆی گۆڕانی واتاكەی.

چاوگی (زان) كورتكراوەی (زایان)ە، (زاندن) كورتكراوەی (زایاندن)ە .

شێوە دەستوورییەكەی لە گەردانكردندا (زایا–دەزایێ)ە كورت بۆتەوە بۆ (زا–دەزێ) بەلاّم لە ڕووكەشە دیارەكەیدا وا بەدەردەكەوێت كە (ێ) شكانەوەی(ا)ە

ڕەگی چاوگ (زای) / ڕیشەی كاری ڕابردوو (زا) / ڕیشەی كاری داهاتوو (زێ)

كەواتە هۆكاری ناوازەیی لەم چاوگەدا یەكێكیان هەروەك (پشكووتن)ە ئەوی تریان كورتبوونەوە و گونجانی ڕیشەی كارەكەیەتی.

## ئەنجام

١– چاوگ لەسەر ڕەگەکەی دەستووریکی دروستبوونی تایبەتی هەیە لەدوای بناغە ئاڤێستاییەکە، قۆناغەکانی گەشە و گۆڕان و پێکهاتەکانی لە کۆڵەگەی دیار و نادیار و بکەری دیار و نادیار و بەرکاری لەسەر دروست دەبێت.

٢– چاوگ بناغەی زمانی سەربەخۆ و پارێزەری تایبەتمەندیی شێوەزار و بەدەرخەری ڕەسەنی و خوازراوی وشە فەرهەنگییەکانە،چونکە ڕەگ و ڕیشەی دەبێتە کەرتێك لە کەرتەکانی وشە لەنێو زمان و خاوەنە ڕەسەنەکەی .

٣– ڕیشەی کار لە بەرهەمی چاوگەکان و لە گەردانکردندا بە گوێرەی دەمەکانی کار و تایبەتمەندیی شێوەزارەکان جیاوازییەکانی خۆی بەدەردەخات و گۆڕانکاری لیێ بەدەردەکەوێت .

٤– کۆڵەگەی چاوگ بە دیارخەری کۆن و کۆنتر و نوێی شێوەزارەکانە بە بەراوردکردنی ڕێژەی بەکارهێنانی لە شێوەزارێکەوە بۆ شێوەزارێکی تر .

٥– گۆڕانی نیشانەکانی چاوگ لە شێوەزارێکەوە بۆ شێوەزارێکی تر دەبێتە هۆی ئەوەی کە هەندێ چاوگ لە شێوەزارێك دەستووری بێت، بەلأم لە شێوەزارێکی تر لە دەستوور لابدات و لە ڕووکەشە دیارەکانیاندا ناوازەیی و لە دەستوورلادانیان لێ بەدەربکەوێت .

٦– لەبەر ئەوەی هەر شێوەزارێك بە گوێرەی ئاخاوتن و دەربڕین و گۆکردنی چاوگەکان و گەردانکردنی کارەکان، ڕەگ و ڕیشەکانیان دەستنیشان دەکەن بەبێ ئەوەی چاوگەکان بگەڕێننەوە بۆ بەراوردکردنی شێوە بنەڕەتییەکانیان لە شێوەزارە کۆنەکانی دوای بناغە ئاڤێستاییەکە ئینجا بۆ شێوە گۆڕاوەکانیان، لەم کاتەدا دۆزینەوەی ڕەگ و ڕیشە بە جیاوازیی شێوەزارەکان لە یەکتر دووردەکەوێتەوەو هەر شێوەزارێك ئاراستەی سەربەخۆ وەردەگرێ لە یاسا ڕێزمانییەکانی بابەتی چاوگ و کارەکاندا بۆ دەستنیشانکردنی نیشانەکانی چاوگ و ئاسایی و ناوازەیی تیایاندا.

## سەرچاوەکان

(١) کازم عەباس عەلی، شێوەزارەکانی زمانی کوردی لە نێوان کۆن و کۆنتر و نوێدا، گۆڤاری ڕامان، ژ٢١٠، ٢٠١٤.
(٢) ئەورەحمانی حاجی مارف، گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد، بەرگی٣، بەشی٢، ١٩٧٥، ل٢١٧.
(٣١) ڕێزمانی ئاخاوتنی کوردی بەپێی لێکۆڵینەوەی لیژنەی زمان و زانستەکانی لە کۆڕی زانیاری کورد، چ٢، ٢٠١١، ل٢٢٢.
(٤) کازم عەباس عەلی، پەیوەندی چاوگەکان لە زاراوە جیاوازەکانی زمانی کوردیدا ، چ١، ٢٠١٤، ل٤٧ .
(٥) زمان و ئەدەبی کوردی، پۆلی نۆیەمی بنەڕەتی (کرمانجی ژێری)، چ٦، چاپخانەی دار لوبنان، ٢٠١٢، ل٤٠ تا ٥٠، کرمانجی ژووروو، چ١، ٢٠١٠، چاپخانەی المستقبل– لوبنان.
(٦) هەمان سەرچاوەی پێشوو.
(٧) زمان و ئەدەبی کوردی، پۆلی دوازدەی ئامادەیی، چ٥، ل٥٢ ، چاپخانەی المستقبل – لوبنان، ٢٠١٠.
(٨) زمان و ئەدەبی کوردی، پۆلی نۆیەم، چ٦ ،٢٠١٢ .
(٩) هەمان سەرچاوەی پێشوو.
(١٠) هەمان سەرچاوەی پێشوو.
(١١) پ. د.وریا عومەر ئەمین، پیتۆکەکانی زمانەوانی، چ١، ٢٠١١، ل٩٢ .
(١٢) کازم عەباس عەلی، چاوگ سەرچاوە و ژێدەرە، ٢٠١٣، چ١– ل٤٤.
(١٣) زمان و ئەدەبی کوردی، پۆلی دوازدەی ئامادەیی، چ٥ ، ٢٠١٠، ل٤٠.
(١٤) هەژار موکریانی، فەرهەنگی هەنبانە بۆرینە، چ٦، ل٥٢٥.
(١٥) د. ڕەفیق شوانی، ئەو وشانەی لە چاوگەوە وەردەگیرێن، چ١، ٢٠٠٨، ل١٥.
(١٦) توێژینەوەکانی کۆنفرانسی زانستی زمانی کوردی (١٩–٢٢ ئەیلوولی ٢٠١١) چ١، هەولێر ٢٠١٢، ل٢٦٥.
(١٧) نوری عەلی ئەمین، ڕێزمانی کوردی، چ٢ ، ٢٠١٢، ل١٢٢.
(١٨) هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل١٤٤ .
(١٩) ڕێزمانی ئاخاوتنی کوردی، کۆڕی زانیاری کورد، چ٢ ، ٢٠١١، ل١١٢.
(٢٠) زمان و ئەدەبی کوردی، پۆلی نۆیەم، چ٦، ٢٠١٢، ل٤٦.
(٢١) د. ڕەفیق شوانی، ئەو وشانەی لە چاوگەوە وەردەگیرێن، چ١، ٢٠٠٨، ل٢١.
(٢٢) هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل٤٤.

(٢٣) عەباسی جەلیلیان، فەرهەنگی باشوور، ل٣٥٤.
(٢٤) مەسعوود محەممەد، زاراوەسازی پێوانە، چ٢ ، ٢٠١١، ل٨٢ .
(٢٥) زمان و ئەدەبی کوردی، پۆلی نۆیەم، چ٦، ٢٠١٢، ل٤١.
(٢٦) فەرهاد عەبدولحەمید پەهلەوان، زەردەشت و ئاڤێستا و فەلسەفەی یەکتاپەرستی، چ١، ٢٠١٣، ل١٨٠.
(٢٧) حەسەن قزڵجی، گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد، بەرگی ٦ ، ١٩٧٨ ، ل١٧١.
(٢٨) مەسعوود محەممەد، چەند حەشارگەیەکی زمانی کوردی، چ١، ١٩٧٦، ل٣٧ .
(٢٩) مەسعوود محەممەد، زاراوەسازی پێوانە، چ٢، ٢٠١١، ل٨٠.
(٣٠) د.شێرکۆ بابان، بنچینەی ڕێزمانی کوردی، چ١، ٢٠١٤، ل٣٨.
(٣١) پ . وریا عومەر ئەمین، پیتۆکەکانی زمانەوانی، چ١ ، ٢٠١١، ل٦٦.

## ملخص البحث

— الغرض من هذه الدراسة توضيح الاختلاف بين جذر المصدر وجذر الفعل كموضوعين مختلفين، وفي نفس الوقت ربط المصادر في اللهجات القديمة كأساس موحد باللهجات الكرمانجية (كرمانجي الشمالية والجنوبية) كمتغير على هذا الاساس.

— التغيير في مؤشرات المصدر يتسبب باختلاف المصدر من لهجة الى أخرى، قد يكون دستورياً في لهجة وغير دستوري في لهجة أخرى (قياسي وغير قياسي) . وقد يرجع السبب الرئيس لهذه المتغيرات الى عدم وجود لغة موحدة . لهذا السبب ياخذ كل لهجة نمط معين من التلفظ والتنسيق والتنظيم في كيفية أسس وتكوين المصدر واستخراج الجذور.

هكذا نرى بان جذر المصدر تستخرج دون الرجوع الى اللهجات القديمة بعد الاسس الأفيستية لمعرفة المتغيرات في هذه المصادر وجذورهم، في هذه الحالة سيتم استخراج الجذر حسب اللهجات ويتباعد الجذور وتظهر الفروقات حسب اللهجة. وان كل اللهجات ياخذ منحى مستقل في أنظمة قواعد اللغة الكوردية في موضوع الجذور، وتظهر في هذه الحالة الفروقات بين جذور المصادر والافعال.

— تكوين المصدر على جذوره له دستور خاص ، وقد تبين لنا بان تكوين المصدر يعتمد على المتغيرات (المبني للمعلوم والمبني للمجهول — الفاعل المعلوم والفاعل المجهول ومفعول به )، ولكن جذر الفعل يعتمد على تصريف الفعل وزمن الحدوث لهذا الفعل، وهكذا فان التكوين يكون مختلف لكل لهجة من اللهجات، في هذه الحالة نستطيع الحصول على الفروقات لكل فعل حسب الحالة.

# Abstract

The study aims at showing the difference between the roots of the infinitive (source) and the root of the verb as two different subjects; meanwhile to join the source of the classical accents as unified foundation of the Kirmanji dialects (both Northern and Southern Kirmanji).

The variations of the source / infinitive components from one dialect to another depends on the type of the infinitive from one dialect to another, with probability of being regular or irregular. The reason behind this variation is non-existence of a unified / standardized language. Then each accent / dialect has special method of pronunciation and word formations and root diversification.

Then, it seems clear that the infinitive root is derived without concepts of classical dialects based on the Avesta foundation to specify the variations occurred to this source and its roots. Then it becomes clear that the root is derived based on the dialect with root diversification and the variation of each accent will be clear.

Based on these facts the each dialect has special concepts of Grammar / subject of root formations. Then the differences between the infinitive root and the verb root is clear depending on the dialects.

Formation of the source / infinitive base on its roots has special categories / systemization. then it seems clear that the roots of the verb is depending on the verb diversification, patterns, tenses arrangement. Then the formation is varied as per the dialects, the variation will be clear of each verb in compliance with the case requirements.

# ئێستاتیکای زمان لە ڕۆمانی (نەتەوەی زێرابەکان)ی جەبار جەمال غەریبدا

**محەمەد ئەحمەد حەسەن ( حەمە مەنتك )**

بەشی زمانی کوردی– کۆلێژی پەروەردە–
شەقلاوە– زانکۆی سەلاحەددین – هەولێر

## پێشەکی:

زمان وەکو کایەکی زیندوو، لە ئەدەبدا بە پلەی یەکەم دێت. واتە نووسەر بە پلەی یەکەم کار لە ناو زمان دەکات. ڕۆماننووس مامەڵەی ڕاستەوخۆی لەگەڵ زمانە. بەڵام ئەوەی لێرەدا پرسیارە ئایا چۆن ئێستاتیکایەك بەو زمانە دەئافرێنی؟ خۆ مێژوونووسیش ڕووداوەکان لە ڕێی زمانەوە دەگێڕێتەوە، کەچی ئەرکی ڕۆماننووس قورسترە، چونکێ مامەڵە لەگەڵ خەیاڵ بە هاوکاری واقیع دەکات. ئێستاتیکا بە هاوکاری کۆمەڵێ تەکنیك و لایەنی هونەری لە ڕۆماندا دێتە بوون.

ئەم توێژینەوەیەی من (ئێستاتیکای زمان و ئاسۆکانی ئەزموون) لە ڕۆمانی (نەتەوەی زێرابەکان)ی جەبار جەمال غەریبدا، هەوڵێکە بۆ دەرخستنی لایەنی جوانیناسانەی زمان و ئاسۆکانی لە ڕۆمانی نێوبراودا. توێژینەوەکەمان لە دوو بەش پێکهاتووە. بەشی یەکەم بە ناونیشانی (ئێستاتیکای دەروازەکانی دەق)، لەوێدا کۆششمان کردووە، دەروازەکانی دەق، وەکو بەرگی ڕۆمانەکە، ناونیشان و شیعرییەتی ناونیشانی دەق شی بکەینەوە. لە کۆی شیکردنەوەکەدا ئێستاتیکای ناونیشانی سەرەکی و لاوەکییەکانی ناو ڕۆمانەکەمان دەرخستووە.

بەشی دووەم هەوڵێکە بۆ توێژینەوە لە ئێستاتیکای شەپۆلی هۆش لەو ڕۆمانەدا. لە سەرەتادا وەکو لایەنی تیۆری، تەکنیکی شەپۆلی هۆشمان بەرباس داوە. لە دووەمدا شعرییەتی گوتاری شەپۆلی و ئێستاتیکای زمانمان بەرباس داوە. لەوێدا چۆن کارەکتەر کێشەی ناسنامە وەکو خود و کێشەی نیشتیمان وەکو کێشەیەکی کۆی هەیە. ئەمانە لە ڕووی سایکۆلۆژییەوە نموونەیان بۆ

هێندراوەتەوە. هەر لێرەدا ئەو چەپاندنانەی لە کۆی ڕۆمانەکەدا کاریان لەبارەوە کراوە وەکو: سێکسی، سیاسی، ڕۆشنبیری...تاد ڕوون کراونەتەوە.

لە کۆتاییدا، لە کۆی توێژینەوەکە بە چەند ئەنجامێك گەیشتووین و خستوومانەتە ڕوو. لەگەڵ لیستی سەرچاوەکان.

## بەشی یەکەم: ئێستاتیکای دەروازەکانی دەق

### ١- دەروازەکانی دەرەوە:

لە هەر دەقێك، یان ڕۆمانێك یەکەم دیمەنێك، یان کۆدێك بەری دەکەوین، ناونیشان و بەرگی پێشەوەی ڕۆمانەکەیە. بۆ لێکدانەوە و ڕاڤەکردنی ئەم دوو کۆدەیش دەبێ پەنا وەبەر سیمیۆلۆجیا ببەین.

بەرگی ڕۆمانی (نەتەوەی زێرابەکان)، هەمان دەلالەتی ناونیشانەکە دەگەیەنێ. لەسەرەوەی بەرگەکە بۆرییەکی زێراب هەیە، لەوێوە پیسی و شتی بێکەڵك بۆ ناو زێرابەکە فڕێ دەدا. بەگشتی دیمەنی ناو زێرابێك هەیە، بەڵام ئەو زێرابە پڕیەتی لە مرۆڤی بێ سەر، ڕووت، بێ قاچ و دەست، یان قاچێکی ئاسنە، لەش پڕ لە تەقەڵ، هاوکات گیانداری سەیر. ئەوەی تێبینی دەکرێ زۆربەی ئەو مرۆڤانە دەمیان کراوەتەوە، وەکو بڵێی لە دۆخێکی هاوارکردندا بن. هەموو بوونەوەرەکان ناتەواون، هیچیان جەستەیان ساغ نییە. لەسەرەوەی وێنەکە کەسێك لەسەر کورسییەك دانیشتووە و قاچێکی لە گەسك دروست کراوە و، سەری خۆی بەدەستەوەیە. کۆی ئەو وێنانە پێمان دەڵێن پێکهاتە و کەرەسەکانی ناو زێراب شتی پیس و بێکەڵکن. لەبەر ناتەواوی و کێماسییان بۆ ناو زێراب فڕێدراون، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ئەو بوونانەی ناو زێراب خەریکی ژیانن، واتە لەبارێکی جوولەدان، خەم و شادی بە ڕوخسارییانەوە دیارە.

زۆربەی مرۆڤەکان بە ڕەنگی ژەنگاوی و سپی دەردەکەون. ئەم دوو ڕەنگەیش دەلالەتی خۆیان هەیە. ئێمە دەزانین ئاسن، یان هەر ماددەیەکی دیکە، ئەگەر ژەنگ هەڵێنن، ئەوا لە کەڵك دەکەون و فڕێ دەدرێن. ئەم مرۆڤانەیش، چونکێ مرۆڤی پەراوێزخراوی کۆمەڵگەن، لەناو کۆمەڵدا فڕێدراون (بێگومان ئەمە لە دیدی مرۆڤە دەوڵەمەندەکانەوە) لەسەر زەوی ئاوارە کراون، ناچار پەنایان بۆ

زێرابـەکان بـردووە و کردوویانـە بـە نیشـتیمانی خۆیـان. ئـەو مـرۆڤ و شـتانەی لـە وێنەکەدا هاتوون، هەریەکەی لـە چـەند پارچـەیەك پێکهـاتوون، ئـەو پارچـانە هـی یەکدی نین، بۆ یەکدی تەرهیم کراون و گونجێندراون. بۆیەیش هەر مرۆڤێـك چـەند ڕەنگێکـی هەیـە، هەیانـە ڕوخسـاری سـپییە و جەسـتەی خۆڵەمێشـییە. هاوکـات ڕەنگێکی لەشێوەی سـەوزێکی کـاڵ، کـە ڕەنگـی بۆگەناوییـە، چـۆن گۆمـە ئاوێك وەستابێ و، لەبەری نەڕوات ئەم شێوە ڕەنگـە قەوزەییـە وەردەگرێـت، ئەمـەیش نیشانەی پیسی و بۆگەنیی ئەو شوێنەیە.

## ٢- شیعرییەتی ناوونیشان:

ناوونیشـــان یەکێکـــە لـــە ڕەگـــەزە ئێســـتاتیکییەکانی دەق. ڕەگـــەزێکی سەرەکییە، کۆمەڵێك دەلالەتی خـۆی هەیـە. "لیـۆ هـۆك Leo Hock" یەکێکـە لـە دامەزرێنەرانی زانستی ناونیشـان دەڵێـت: ((ناونیشـان کۆمـەڵێ نیشـانەی زمانییـە دەبێ لە سـەرووی دەقـەوە هـەبێ، دەلالەتـە لـە پێکهاتـەی گشـتی دەق.)) واتـە ناونیشـان دەتـوانی بڕێـك زانیاریمـان لـەبارەی دەقـەوە پـێ بڵێـت. شـیعرییەتی ناونیشـان، یەکێکـە لـە خاسـییەتەکانی شـیعرییەتی ڕۆمـانی نـوێ. زۆرێـك لـە ڕەخنەگران ناونیشان بە کـورتکراوەی دەق دادەنـێن. کەواتـە گرینگیـی ناونیشـان لەوەدایە وەکو دەروازەیەکە یارمەتی چوونە ژوورەوەی خوێنەر بۆ نـاو دەق دەدا. ئەگـەر ناونیشـان ڕەهەنـدێکی داهێنەرانـەی هـەبوو، ئـەوا شـیعرییەت تێیـدا ڕەنگدەداتەوە، چونکێ شیعرییەتی ناونیشان ((بە ئەو ماوەیـەی، کـە دالـەکان لـە پێوەندییان بـە ڕیـتم و جوولـەوە هەیانـە هەڵدەسـەنگێندرێن. هـەروەك پێکهاتـەی ڕێزمانی زۆرجار گەمە بە ڕۆڵی دالە زمانییەکان دەکا. بـە شـێوەیەك ئـەو جوولەیـە نرخ بە دالەکان دەبەخشێ.)) [1]

ڕۆمـانی (نەتـەوەی زێرابـەکان) ناونیشـانێکی شـیعری هەیـە. لـە دوو بـەش پێکهاتووە. بەشی یەکەم (نەتەوە) و بەشی دووەم (زێـراب)، بـەڵام بەشـی دووەم بە کۆ هاتووە. نەتەوە دەلالەتە لە کۆمەڵە خەڵکێك، کە خـاوەن کلتـوور و زمـان و فەرهەنگی هاوبەشی خۆیانن. هاوکات لە سنوورێکی جوگرافیی دیاریکراو بەیەکەوە دەژیـن. ئـەو خەڵکانـە زمـانێکی هاوبەشـیان بـۆ پـەیڤین لەگـەڵ یەکـدی هەیـە.

تایبەتمەندیی هەر نەتەوەیەك ئەوە دەبێ زیندوو بێ و لەژیان بەردەوام بێ. دەزانین زۆر نەتەوە هەبوونە و ڕەچەڵەکیان نەماوە. تەنێ لەناو مێژوودا باسیان هەیە، دەنا وەکیدی بوونیان نەماوە، من مەبەستم ئەو نەتەوانەن، کە زیندوون. "ئێرنست ڕێنان" لە ساڵی ١٨٨٢ لە زانکۆی "سۆربۆن" کۆنفرانسێکی لەبارەی چەمکی نەتەوەوە پێشکەش کرد. لەوێدا دەڵێت: ((نەتەوە لەسەر دوو بنچینە، یان کۆڵەکە وەستاوە. یەکەم: یاداشتێکی هاوبەش لەنێوان ژیانی ئەو کۆمەڵە خەڵکەدا هەبێ. دووەم: ئیرادەی بەیەکەوە ژیانی هەمیشەیی... هاوکات جەوهەری هەر نەتەوەیەك لەوەدا کۆدەبێتەوە، هەموو تاکەکانی هەست بکەن زۆر شتیان هەیە بەیەکەوەیان دەبەستێتەوە، زۆر شتی دیکەشیان هەیە بەیەکەوە لە بیری بکەن.))[2] بە بۆچوونی "ڕێنان" ئەمانە خاڵی بوونی هەر نەتەوەیەکن. ئەم چەمکە بە واتا مۆدێرنەکەی دەلالەتە لە پێکەوە ژیانی کۆمەڵێك خەڵك، کە ڕابردوویەکی وەکو یەکیان هەیە، هاوکات ئیرادەی ئەوەیان هەیە، سەرەڕای جوایەزیی بیرکردنەوە و شێوە و فۆرم بە یەکەوە بژین. کەواتە ئەم چەمکە (نەتەوە) بۆ کۆمەڵە خەڵکێکە لەم ڕۆمانەدا دەیانەوێ بەیەکەوە بژین، هاوکات وەکو لە درێژەی ڕووداوەکانەوە دەزانین، هەموویان ڕابردوویەکی نێزیك لە یەکیان هەیە. هەموویان بەیەکەوە بڕیار دەدەن، لە شوێنێك (زێراب) بە هەموو خۆشی و ناخۆشییەکانەوە بەیەکەوە بژین.

(زێرابەکان)، ئەم وشەیە بە کۆ هاتووە. ئاشکرایە زێراب تەنێ لە شار هەیە، بەتایبەتی شارە گەورەکان، بە واتا مۆدێرنەکەی. شارگەلێکی وەکو: نیۆیۆرك، پاریس، لەندەن...تاد دەیان خەڵك لەبەر بێ جێیی و نەبوونیان لەناو زێرابەکاندا دەژین. سروشتی زێراب ئەوەیە دەبێ بکەوێتە ژێرزەوی، واتە لەگەڵ سەرزەوی جودا کراوەتەوە. بوونی ئەو دابڕانە لەنێوان سەرزەوی و ژێرزەوی دەلالەتی بوونی دوو ژیانی جوایەزە لە یەکدی. تەنێ چەند کونێك ئەم دوو شوێنە بەیەکەوە دەبەستێتەوە، کونی بازنەیی، یان لاکێشەیی، ئەویش تەنێ بۆ فڕێدان و شۆڕکردنەوەی پیسایی و پیسییە بۆ ناو زێرابەکان. کەواتە زێراب شوێنێکە هەرچی پیسی و پاشماوەی سەرزەوی هەیە، هەرچی شتێك، کە مرۆڤ بە بێکەڵك و پاشماوەی دادەنێ و، دەیەوێ سەرزەوی لێ پاك بکاتەوە، بۆ ناو زێرابی فڕێدەدا.

ئاشکرایە لە هەموو شارێکدا چینێك مرۆڤ هەن، کە پەراوێز خراون، لەسەر زەوی جێیان نابێتەوە، جا بەهەر هۆکارێك بێ، کۆمەڵایەتی، سیاسی...تاد.

کەواتە لەم ناونیشانەوە خوێنەر بڕێك زانیاری دەست دەکەوێ. دەزانین ئەم ڕۆمانە لەبارەی مرۆڤگەلێکەوەیە لەسەر زەوی فڕێدراون. خەڵکانێکن دوای ئەوەی مرۆڤەکانی سەر زەوی سوودیان لە تواناکانیان وەرگرتوون و دواتر کەڵکیان نەماوە، بە نیوەچڵی و کەمئەندامی فڕێدراون. ئەوان لەناو زێرابدا لە هەوڵی چێکردنی ژیانێکی دیکەدان، هەوڵدەدەن خۆیان لەگەڵ یەکدی بگونجێنن. پێکهاتەی ئەم نەتەوەیە تەنێ مرۆڤەکان نین، بەڵکو مشك و جورج، مرۆڤی مردوو...تاد هەرچی شتێکی بێکەڵك و فڕێدراو و پیس هەیە لەوێدا کۆبوونەتەوە.

ئەم ناونیشانە سەرەکییە، هاوکات ناونیشانێکی لاوەکیشە، لە ناوەڕۆکدا چەندین ناونیشانی دیکەیش هەن، واتە ڕۆمانەکە بەسەر چەند بەشێك دابەش کراوە، وەکو:

- خودا بە ڕەنگی شین
- دابەزینە سەرزەوی
- ژنەکانی بەغدا شووشەن
- هاڕوونە ڕەشید
- لەشکری تارمایی
- نەتەوەی زێرابەکان
- زێرابەکانی بەغدا نیشتمانی گەورەمان
- مێرگی خیانەت
- زستانی ناو زێرابەکان یان پرچی کچانی بەغدا
- کۆتر یان پەیامی دووەم
- سەردەمی تونێڵەکانی ژێرزەوی
- شاری ئێسقان
- پەیکەری عەبدولئەمیر ئەلحوسێری
- تونێڵەکانی بیابان یان barووتێك لەناو دڵدا تەقیبێتەوە
- لە ئومێد کوشندەتر

- لەتبوونی تەرسەقوڵ
- سوڵتانی کتێب
- ئەو دێرانەی نەدەبوو هەبن

هەریەك لەم ناونیشانە لاوەکیانەیش ئەرکی خۆیان هەیە. ئەمانەیش دەبنە یارمەتیدەری خوێنەر بۆ پتر زانین. لێرەدا لەبەر زۆریی ناونیشانە لاوەکییەکان تەنێ دەلالەتی یێك–دووانیان لێکدەدەینەوە.

ئەگەر ناونیشانی (دابەزینە سەرزەوی) وەرگرین. دەلالەتێکمان هەیە، ئەویش واتەی ئەوەیە کارەکتەر نابی لەسەر زەوی بێ. دەمەوێ بڵێم کارەکتەر پێی نەخستۆتە سەرزەوی و، لەسەری ناڕوا و ناخەوێ. کەواتە ئەی لەسەر چی دەژیەت؟ کارەکتەر (هاوکات وەگێڕیشە) کاتێ باوکی لە ماڵەوە دەری دەکا، شوفێری لۆرییەك لەلای خۆی دەیکا بە سەکن. شەو و ڕۆژ لەسەر ئەو لۆرییە دەبێ. ئەو لۆرییە چەندین جار دەکڕێ و دەفرۆشرێ، ئەم کوڕە هەر لەگەڵیەتی. هەر لەناو لۆرییەکە، دەنوێ، دەخوا...تاد. واتە هەر لەناو لۆرییەکەیە، بەبێ ئەوەی لە لۆرییەکە دابەزێ و پێ بخاتە سەرزەوی. ئەمە فیلمی (ئەفسانەی ١٩٠٠)ی دەرهێنەر "جۆزیب تۆرناتۆری"مان بیر دەخاتەوە. هەمان شێوە لەسەر پشتی کەشتییەك منداڵێك لە دایك دەبێ. هەر لەسەر ئەو کەشتییە گەورە دەبێ و دەبێتە بەناوبانگترین پیانۆژەن. بەبێ ئەوەی یەك جار پێ بخاتە سەرزەوی. کەشتی لەو هەموو لەنگەرانە دەوەستێ، بەڵام ئەو دانابەزێ، تەنانەت ئەو کەسە لەسەر کەشتییەکە عاشقی کچێك دەبێ، کچەکە داوای لێ دەکا لە کەشتییەکە دابەزێ و لەگەڵی بژی، بەڵام دانابەزێ.

کارەکتەری ڕۆمانەکە هەمیشە لەسەر لۆرییەکە بووە، شارەزای هیچ شوێن و شتێکی سەرزەوی نییە. ((من تەنها لە جامی تەڵخی ئەو لۆرییە زلانەوە دنیام دەدیت، من تا ئێستا گوڵێکم نەدیوە پەردەی جامێك لەنێوانمدا نەبووبێت، لە پشت جامەکانەوە دەشتی پان و بەرین، تا چاو بڕکات گەنم، گوڵە گەنمی قورس و پڕ و بە هەیبەت ڕادەکەن، لەوسەری دنیا بۆ ئەو سەری دنیا ڕادەکەن بەبێ ئەوەی ئاوڕ بدەنەوە.))[3] بۆیەیش، کە لۆرییەکیان تێکدەچێ لە ناوچەی پیشەسازیی شەقامی شێخ عومەر چاکی بکەنەوە جێ دەمێنێ. هەموو ئەو شتانەی ئەوێ بۆ

ئەو تازەن، نامۆن. وەکو ئادەم چۆن یەکەم مرۆڤە لەسەر زەوی و هەموو شتەکان بۆ ئەو نامۆ و تازەن. کارەکتەر یەکەم شوێنێك پێی لەسەر دادەنێ، ناوچەی پیشەسازییە، ناوچەیەکی پیسە ، شوێنی مرۆڤە هەژارەکانە، سیکڕابخانەیە، مندالّباز و چەقۆ وەشێن و بێ مالّ و خانوو لەوێ دەژین. ئادەمیش، کە سزادرا فڕێ دەدرێتە سەرزەوی وەکو شوێنێکی پیس، چونکێ بەهەشت شوێنێکی خاوێنە و، ئادەمیش گوناهبارە. هەمان لێکدانەوە، مرۆڤە دەولّەمەندەکان سەرزەوی بە شوێنێکی پاك دادەنێن، دەیانەوێ لە هەموو شتێکی پیس پاکی بکەنەوە. مرۆڤە لاتەکان، هەژارەکان...تاد بە پیس دادەنێن. دەبینین لەم ناونیشانە لاوەکییەوە لەڕێی سیمیۆلۆجیاوە چەندین زانیاریی نوێمان دەست دەکەوێ.

## بەشی دووەم: ئێستاتیکای شەپۆلی هۆش لە ڕۆمانی (نەتەوەی زێرابەکان):

### یەکەم: لایەنی تیۆریی:

شەپۆلی هۆش تەکنیکێکی ڕۆمانی نوێیە. لە ڕووی زاراوەوە لە ئینگلیسی (Stream conxiousness) پێ دەلّێن. لە کوردی دەبێتە (شەپۆلی هۆش) و لە زمانی عەرەبی (التيار الوعي). لە دوو وشە پێکهاتووە، وشەی یەکەم واتای ڕەوت، شەپۆل و بزووتنەوەیەك دێت. هەرچی وشەی دووەمە (هۆش) ئەو هەست و هۆشەیە مرۆڤ لە دلّ و دەروونی دەیپارێزێ. ((ئەو هەستەیە مرۆڤ لە دەروونیدا بەرانبەر بە شتەکان هەیەتی.))[4] کەواتە دەبێتە ئەو ڕەوت و هەلّچوون و شەپۆلەی لە دەروونی کەسێکدا هەیە، بەلّام بە شاراوەیی، تەنێ خۆی پێی دەزانێت. ئەم دەستەواژانە وەکو هێمایەك بۆ تەکنیکێکی ڕۆمان سوودیان لێ وەرگیرا، کە پتر واتای ڕێڕەوی هۆش، ڕووباری کات، هۆشی خود دەگەیەنێ.

فەیلەسووف و دەروونناس (ولیەم جێمس William james) لە زنجیرە وتارێکی دەروونیدا لەو یەکەم کەسانەیە ئەم زاراوەیەی بەکار هێنا. بەو واتایەی دەلالەتە لەو هونەرەی نووسەر بۆ وەسفکردنی ژیانی ناوەوەی دەروونی کارەکتەرەکانی بەکاری دەهێنێت. لەبەرئەوە ((وشەگەلی وەکو زنجیرە، یان قافلّە بەشێوەیەکی دروست گوزارشتی لێ ناکەن، زۆر لەوە قوولّترە وشەی وەکو شەپۆل Flaw، ڕووبار River، ڕەوت Stream بۆ ئەم چەمکە زۆر گونجاون. بۆیەیش نێوی

شەپۆلی بیرەکان، یان هۆش، یان ژیانی خودی لێ دەنێن.))[5] دەبینین لەکن "ولیەم جێمس" زاراوەکە پتر شێوەیەکی زنجیرەیی و بەدوای یەکی هەیە، بەڵام لەکن "همفری" واتاکەی قووڵتر دەبێتەوە، شێوەی ڕووبار و شەپۆل وەردەگرێ. واتە لێرەدا هەڵچوون و داچوون هەیە. ئەو شەپۆلە هەڵچووانە دەردەخات.

لەلایەکی دیکە ئەم زاراوەیە بە واتای دیکەیش هاتووە. "ئەی. ئێم. فۆرستەر" پێداگری لەسەر ئەوە دەکاتەوە ئەم زاراوەیە بە واتای لەرەلەری زهنی دێ. لە کاتێکدا " دۆس باسۆس" ئەم زاراوەیە بەو جۆراوجۆرییەی لە کرداری مۆنتاجکردندا هەیە دادەنێ. کەواتە ئەم چەمکەیش سەرەتا لە سایکۆلۆجیاوە هاتووە، دواتر بۆ ناو ئەدەب وەکو زاراوەیەك پەڕیوەتەوە، واتە ڕووداو و بیرەکان لە زهنی کارەکتەر دەجووڵێنێ. دواتر دەتوانین بپرسین ئایا ئەم زاراوەیە چۆن هاتۆتە ناو ئەدەب بەگشتی و ڕۆمان بەتایبەتی؟ وەکو پێشتر گوتمان لە هونەری گێڕانەوەدا ئەم تەکنیکە لایەنە زهنی و دەروونییەکانی کارەکتەری ڕۆمان نیشان دەدا.

ئەم زاراوەیە لە مەیدانی ڕەخنەی ئەدەبیدا بۆ یەکەم جار لە ساڵی ١٩١٨ لە وتارێکی ڕەخنەگر "مای سینکلێر My Sinclair" لەبارەی ڕۆمانەکانی "دۆنپی ریشاردسۆن" بڵاوی کردەوە، بەکار هاتووە. لەوێدا دەڵێت: ((هیچ شێوە درامایەك، هەڵوێستێك، دیمەنێك لەم زنجیرەیەدا ڕوونادات، بەڵکو تەنێ ژیان دەڕوا و دەڕوا. ئەوە شەپۆلی هۆشی مریام ئەندرسۆنە ڕادەبری و ڕادەبرێ...))[6] ئەوەی تێبینی دەکرێ هێشتا ئەم زاراوەیە لەکن ئەم ڕەخنەگرە لە پێناسەکەی سەرەوە دەرنەچووە، کە کۆمەڵێ کرداری عەقڵی و دەروونییە لەناو هۆشی کارەکتەر ڕوودەدات. پاشان ئەم زاراوەیە بە تەواوی لە بواری ڕەخنەی ڕۆماندا چەسپا. تەنانەت زاراوەی هاوواتای وەکو: شەپۆلی بیرStream of thought، مەنەلۆگی ناوەوە Interior monologue ، شیکاری ناوەوە Interior analysis ...تاد. "ئیدوارد بۆلینج" دەڵێت: ((ڕێبازێکی گێڕانەوەیییە، ڕۆماننووس لە هەوڵدا دەبێ هاوگونجانییەکی ڕاستەوخۆ لە زهنی کارەکتەر نەك لە زمانی، بە شێوەیەکی چڕ و پچڕپچڕ دروست بکا، کە ڕاستەوخۆ ژیانی ناوەوەی کارەکتەر پیشان بدات، بەبێ ئەوەی خۆی بەشدار بێ، یان ڕاڤەی بکا. لە هەر بارێکدا ئەگەر ڕۆماننووس

بەشداری کرد، بەمەبەستی شیکردنەوە و ڕاڤەکردن، ئەوا نابێتە تەکنیکی شەپۆلی هۆش، بەڵام نێزیکە لێی. لە جەوهەردا یەکن دەکرێ بە شیکاریی ناوەوە بناسێندرێ.))[7]

"ڕۆبێرت هێمفری" کتێبێکی تەواو لەبارەی ئەم تەکنیکەوە دەنووسێت. ئەم تەکنیکە لە ڕۆمانی نوێی جیهانی پراکتیك دەکا. لەوێدا دەڵێت: ((شەپۆلی هۆش جۆرێکە لە چیرۆك پێداگری لەسەر ئاستەکانی پێش قسەکردن لە هۆش دەکاتەوە، بە ئامانجی ئاشکراکردنی دەروونی کارەکتەرەکان.))[8] ئەم کتێبە کاریگەرییەکی گەورەی دەبێ لەسەر ناساندنی ئەم تەکنیکە چ لەڕووی تیۆریی و چ لەڕووی پراکتیکییەوە. هەر لەڕێی ئەم کتێبەوە، نووسەرێکی وەکو "حوسێن عارف" لە ساڵی ١٩٧٧ توێژینەوەیەکی تەواو لەبارەی ئەم تەکنیکەوە دەکات. توێژینەوەکەی بەنێوی (مۆنۆلۆجی ناوەوە لە چیرۆکی نوێی کوردیدا) بوو.

سێ ڕۆماننووس بە داهێنەری ئەم تەکنیکە لە ڕۆمانەکانیان دادەنرێن، ئەوان ئەم تەکنیکە بۆ ناو ئەدەبیات دەگوازنەوە. ئەوانیش "جێمس جۆیس، ڤێرجینا وۆڵف، ولیەم فاکنەر"ن. ئەمانە بە شێوە هونەرییە قووڵەکە بە کاریان هێناوە. دەقەکانی ئەم ڕۆماننووسانە وەکو: ((ڕۆمانی "یۆلیسیس و فینیگاتزوێك"ی جۆیس و، "میسز دالوی و شەپۆلەکان"ی وۆڵف و، "ئاژاوە و تووڕەیی و لە کاتی ڕاکشانی سەرەمەرگدا"ی فاکنەر.))[9] ئەم تەکنیکە تەواو تێیاندا ڕەنگی داوەتەوە.

کەواتە ئەم تەکنیکە تەنێ هۆکارێکە، فێڵێکی دروستکراوە، نەك واقیعێکی زهنی. ڕۆماننووس لە ڕێیەوە شیکردنەوەی دەروونی بۆ کارەکتەر دەکا. واتە کارەکتەر بەهۆی ئەم تەکنیکەوە ئەوەی لە ناخیەتی و ناتوانێ بە ئاشکرا بۆ خەڵکی دیکەی باس بکا، لەڕێی ئەم تەکنیکەوە بۆ خۆی باس دەکا. لێرەوەیە کاریگەریی گەورەی لەسەر بونیادی ڕۆمان و چیرۆك دانا، چونکێ ڕووداوەکان لەناو ناخی کارەکتەر ڕوودەدەن، لە قووڵترین هەستەکان خۆی بەرجەستە دەکا، کەناڵی دیکە لە دەروونی کارەکتەر دەکاتەوە، خۆی لە دەرەوەی کارەکتەر دادەبڕێت. لە ناخی کارەکتەر هێما و ڕەمزە شاراوەکانی ئاشکرا دەکا، چونکێ پێشتر کارەکتەر و هەموو توخمەکانی دیکە لەژێر دەسەڵاتی وەگێڕ/ ڕۆماننووس

بوون، بەمەیش کارەکتەر نەیدەتوانی تەنانەت بیر بکاتەوە، کارەکتەر هێندە کۆیلە بوو، ڕێی پێ نەدەدرا لەگەڵ خۆیشی بپەیڤێ، کەواتە خاوەن دەروونی خۆیشی نەبووە. لە کۆی هەموو پێناسەکانی تەکنیکی شەپۆلی هۆشدا کۆمەڵێ شێوازی ئەم تەکنیکەمان بۆ ڕوون دەبێتەوە، لە خوارەوە هێندێك لەو شێوازانە دەخەینەڕوو:

**١- وەبیرهاتنەوە بەهۆی وێکچوون و بەریەککەوتنی شتێك:**

ئەمە یەکێکە لە شێوازەکانی ئەم تەکنیکە. لێرەدا دوو وێنە، یان دوو هەڵوێستمان دەبێ، کە کارەکتەر بە هۆیەوە ڕووداوێکی بیر دەکەوێتەوە و بۆی دەگەڕێتەوە. دەبینین لە سایکۆلۆجیادا "فرۆید" زۆر پشتی بەم شێوە تەکنیکە بۆ چارەسەرکردنی نەخۆشەکانی دەبەست. هەمیشە بۆ ڕووداو و ئەزموونە کەسییەکانی نەخۆش دەگەڕایەوە، داوای لە نەخۆشەکانی دەکرد، بیرکردنەوە و دەروونی خۆیان بەبێ هیچ بەربەستێك هەڵڕێژن. ڕۆمانیش ئەمەی بۆ ئاشکراکردنی پێکهاتەی دەروونی کارەکتەرکانی خواست. ئەم تەکنیکە بۆ ئاشکراکردنی ژیانی ناوەوەی کارەکتەرە، بەشێوەی گەڕانەوە بۆ ڕووداوە تێکچڕژاوەکانی ڕابردوو. ((ڕابردوو بە هەموو شێوەکانییەوە، کە دەبێ بۆی بگەڕێینەوە، ئەمەیش دەبێ بەهۆی ناوەندێکەوە بێ. پێوەندیی نێوان ڕابردوو لەگەڵ ئەو ناوەندە بە گەڕانەوەی بیرەکان نێو دەبرێت.))[10] لە ڕێی ئەم گەڕانەوە ڕابردوو (وەکو کات) لە ئێستا ئامادەیی دەبێ، بەڵام ئەم ئامادەیییە بە شێوەیەکی نارێکوپێك دەبێت.

**٢- خۆدواندن:**

لەم شێوازەیش، وەگێڕ ڕووی گێڕانەوەی لە کەسی بەرانبەرە، کەسی بەرانبەر لە هەموو بیر و هەستێکی خۆی لە ڕێی قسەکانییەوە ئاگەدار دەکاتەوە. واتە لەم تەکنیکەدا گوێدێرێك (مخاطب) ئامادەیە. خۆدواندن وتارێکی درێژە. یەکێك لە کارەکتەرەکان بە دەنگێك، کە بەرانبەرەکەی گوێبیستی دەبێ، دەپەیڤێ، بەبێ ئەوەی کەس قسەکانی پێ ببڕێ. ((مەبەست لەم وتارە گوزارشتییە قووڵترین هەستی کارەکتەر بە بیرکردنەوە شاراوەکانییەوە بەرانبەر گوێدێرەکان بۆ بیستنی ئەوەی لەسەر شانۆ ڕوودەدا، دەربخات.))[11] ئەوەی

لێرەدا گرینگە کارەکتەر هەست بە کەسی بەرانبەری ناکا، واتە ئاگەداری ئەوە نییە، کەسێك بەرانبەریەتی و، گوێی لە قسەکانیەتی.

۳- تاکدەنگی دەروونی- مەنەلۆگی ناوەوە:

لەم شێوەیەدا کارەکتەر بە جێناوی کەسی یەکەمی تاك (م) دەپەیڤێ. لەم مەنەلۆگەدا کارەکتەر هەموو هەست و نەستەکانی لە ڕێی قسەکانی خۆیەوە پێشکەش دەکات. هیچ ڕێکخستنێکی لۆژیکی و زەمەنی نییە. ((وەگێڕی دەروونی تەنێ لەگەڵ دەروونی خۆی دەپەیڤێ، لە دەروونی خۆیەوە لێکدانەوە بۆ دەرەوە دەکات. هەڵیاندەسەنگێنێ. زمانی پەیڤینی لە وڕێنە دەچێ.))[12] هاوکات ((هەرگیز چاوەڕێی ئەوە نییە، کە کەسێکی تر ڕوو لەو بکات، یان وەرامی بداتەوە.))[13] لە کۆی ئەمانە دەردەکەوێ کارەکتەر دیالۆگ لەناو بیر و هۆشی خۆی ئەنجام دەدا، ئاگەداری دەرەوەی خۆیشی نییە. دەروونی دەبێتە شوێنێك بۆ چارەسەری کۆی گرفتەکان. نموونەی ئەم شێوە تەکنیکە ڕۆمانی (شازادە ئیحتیجاب)ی "هۆشەنگ گولشیری"یە. ئەم شێوە مەنەلۆگەیش بۆ دوو شێوە دابەش دەبێت:

**أ- تاکدەنگی دەروونیی ڕاستەوخۆ:**

ئەو مەنەلۆگەیە لەنێوان کارەکتەر و دەروونی خۆی بە شێوەیەکی ڕاستەوخۆ ئەنجام دەدرێ. نە گوێگر(چ خوێنەر، یان ڕۆماننووس) بەشداری ئەم مەنەلۆگە ناکەن. واتە کارەکتەر لەم مەنەلۆگەدا تەنێ لەسەر ئاستی زهنی و دەروونی خۆیدا دەپەیڤێ، بەبێ ئەوەی لەژێر پەیڤی، یان ڕێنمایی نووسەر بێ. "ڕۆبەرت همفری" لەبارەی ئەم شێوەیەوە دەڵێت: (( ئەو جۆرە مەنەلۆگەیە، کە بایەخ بە بوونی نووسەر نادا و وەهاشی دادەنێ، کە هیچ گوێگرێك لە کایەدا نییە.))[14] لێرەوە دەردەکەوێ پەیڤەکان لەم شێوەیەدا دەکەوێتە پێش قسەکردنەوە، واتە تەواو پێ نەگەیشتووە، بۆیەیش دەبینین پچڕپچڕە.

**ب- تاکدەنگی دەروونیی ناڕاستەوخۆ:**

دەتوانین جیاوازیی ئەم شێوەیە لەگەڵ شێوەی ڕاستەوخۆ لەوەدا بدۆزینەوە، لێرەدا نووسەر بەشداری مەنەلۆگی کارەکتەر دەکا. لەم شێوەیەدا راناوی کەسی سێیەم وەگێڕە. نووسەر خۆی پەیڤەکانی کارەکتەر ئاراستە دەکا.

خوێنەر هەست دەکا ئەوە نووسەرە دەپەیڤێ. بەمەیش جۆراوجۆری لە گۆشەنیگا دێتە کایەوە، چونکێ دوو دەنگی تێکەڵاو لە گوزارشتەکاندا هەن، دەنگی وەگێڕ و دەنگی کارەکتەر هیچیان یەکدی ڕەت ناکەنەوە.

**٤- تێڕوانینە هەستی و دەروونییەکان:**

ئەو تێڕوانین و هەستانەی، کە کاریگەرییان لەسەر دەروون و زهنی کارەکتەر هەیە، دەگرێتەوە. بۆ نموونە دەنگەکان، ڕەنگەکان...تاد. ئەمانە بۆ تێڕوانینی دەروونی لە نائاگایی کارەکتەر دەگۆڕێن. نموونەی ئەمە لە ڕۆمانی (یۆلیسیس)ی "جێمس جۆیس" و، (سەفەری حەج)ی "ڕیشاردسۆن" و، (خاتوو دالوی)ی "ڤێرجینا وۆڵف"دا هەن. ڕەخنەگر "ئەحلام حادی" لەبارەی ئەم شێوەیە دەڵێت: ((ئەم تەکنیکە بارێکی هەستی و کاریگەرییە، زهنی کارەکتەر لەباری هۆشی جیاواز لە ئاستی پێش قسەکردن بۆ باری نائاگایی دەگۆڕێ، ئەمەیش لە کاتی بەرکەوتنی بەو کاریگەرییە هەستییە دەرەکییانەی زهن وەریان دەگرێ.))[15]

**٥- شیکاری ناوەوە:**

ئەم شێوەیەش پێچەوانەی شێوەی چوارەمە، بە شێوەیەکی ناڕاستەوخۆ لەلایەن ڕۆماننووسەوە دەبێت. لێرەدا وەگێڕی هەمووشتزان ڕووداوەکان دەگێڕێتەوە، ئاگەدار و دەسەڵاتی بەسەر تەواوی ڕووداو و، دیمەن و، کاریگەرییەکانی سەر کارەکتەرەوە هەیە. ئەم شێوەیە پتر پێداگری لەسەر ڕێی وەسفکردنی ناوەوە دەکاتەوە. ڕاناوی کەسی دووەم، یان سێیەم، کە ناسنامەکەی لەنێوان ڕۆماننووس و کارەکتەری ڕۆمان بزرە، خۆی نمایش دەکا.

## دووەم: شیعرییەتی گوتاری شەپۆلی هۆش و ئێستاتیکای زمان لە ڕۆمانی (نەتەوەی زێرابەکان)دا.

### ١- شیعرییەتی گوتاری هۆش لە زمانی خود و ناسنامەدا:

#### أ- زمانی خود/ کێشەی من (الأنا):

کێشەی (من) سەرەتا ڕیشەیەکی فەلسەفی هەیە. پێش ئەوەی "فرۆید" کاری لەبارەوە بکا، لە فەلسەفەدا وەکو کێشەیەك سەبارەت بە بوون مامەڵەی لەگەڵ

کراوە. مەبەستمان لەوەیە هەمیشە فەلسەفە بە درێژایی مێژووی خۆی کاری لەبارەی پرسیارەکانی بوون، وەکو: من کێم؟ کردووە. تاکو ئێستایش وەرامەکان بە گوێرەی فەیلەسووف و قوتابخانە فەلسەفییەکان دراونەتەوە و جیاوازییان هەیە. "دیکارت" لە کۆجیتۆکەیدا (من بیر دەکەمەوە، کەواتە من هەم)، سەرەتایەکە بۆ بەخشینی ناسنامە بە خود و من. ناسنامەیەکە ((لەسەر بنەمای بیرکردنەوەیە، بە واتای مرۆڤ کاتێ بیردەکاتەوە، ئەوا ناسنامە بە خۆی دەبەخشێ.))[16] لێرەدا پێوەندیی جەدەلی لەنێوان (من+جیهانی ناوەوە) و (ئەو+جیهانی دەرەوە) دەبینین.

هەرچی "فرۆید"ە، (من) بە بەشێك لە کەسایەتیی مرۆڤ دادەنێ. (من) هەوڵی شیکردنەوەی ئەو غەریزە و ئارەزووانە دەدا، کە لە واقیع و کۆمەڵدا هەن. لەکن "فرۆید" ئەمە بە بنکەی ئاگایی هەستی دەرەوە دادەنرێ. بەپێی ئەو ژینگە و کۆمەڵگەیەی تێیدا دەژین رەفتار دەکا. کەواتە (من) پێوەندیی بەهێزی بە واقیعەوە هەیە، لایەنێکی دیاری کەسایەتی مرۆڤە، ئەم لایەنەیش هەر لە منداڵییەوە لەگەڵ هەڵکشانی تەمەن گەشە دەکا. بە نوێنەری عەقڵ و لۆژیك دادەنرێت، دەبێتە نێوانێك لەنێوان (ئەو– الهو) و جیهانی دەرەوە، لێناگەڕێ (ئەو) دژ بە عەقڵ و لۆژیك بوەستێتەوە.

لە ڕۆمانی (نەتەوەی زێرابەکان)دا کارەکتەر، هاوکات وەگێڕی ڕۆمانەکەیشە، کێشەی ناسنامەی (من)ی هەیە. هەر لە دەسپێکی ڕۆمانەکە ئەم کێشە دەردەکەوێت. ((من چەك کرام، بێ دەنگ و ئاسان چەك کرام، لە گەورەترین شەڕ، شەڕی دەستەو یەخە، شەڕی مان و نەمان، چەك کرام و فڕێدرامە ناو جەنگەوە، جەنگێك کە هەمیشە و بۆ ئەبەد درێژەی هەیە.))[17] لێرەدا کارەکتەر بە ئاشکرا لەبارەی لێ سەندنەوەی ناسنامەوە دەپەیڤێت. کارەکتەر تەمەنی کەمە، منداڵێکە، ئەو ئەزموونەی نییە بۆ چوونە ناو ململانێی ژیان و ڕووبەڕووبوونەوەی بەربەستەکان. بە واتایەکی دیکە ئەم کارەکتەرە هێشتا ناسنامەیەکی بۆ خۆی دەستەبەر نەکردووە. دایکی بەهۆی ئەوەی مێردەکەی واتە، باوکی کارەکتەر ژنی دووەم دەهێنێ، ماڵەوە جێدەهێڵێ، کەواتە گەورەترین پاڵپشتی لە دەست داوە، پاشان باوکیشی ئەو دەردەکا. لێرەدایە تەواو هەست بە

بێ ناسنامەیی دەکا. بە گشتی لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست، کاتێ لە منداڵێك دەپرسی: تۆ کێی؟ یان کوڕی کێی؟ یەکڕاست خۆی بە باوکی هەڵدەدا، واتە ناسنامەی خۆی، بە باوکی دەبەستێتەوە.

کارەکتەر دوای ئەوەی فڕێدەدرێتە ناو ژیانەوە، بە واتایەکی دیکە ناو ململانێی ژیان، بەر ژینگە و جوگرافیایەك، کە تەواو بەو نامۆیە دەکەوێ. بۆیەیش کۆمەڵێك پرسیار شەپۆل بۆ هۆشی ئەو دەهێنن:

((– بڕۆ دوای دایکە ڕوو ڕەشەکەت کەوە.

دڵم بەوە خۆش بوو، کە هێشتا داکم پەیوەندی بەو سەر زەمینەوە ماوە، هەر بۆیەشە دەکرێ بچی بۆ لای، پێش ئەوەی دەرگاکە داخاتەوە، پرسیم:

– بۆ کوێ؟ بۆ کوێ دوای کەوم؟

بابم لەودیو دەرگاکەوە گوتی:

– بۆ دۆزەخ.))(18)

ئەم پرسیارانە نیشانەی ترسی کارەکتەرن، ترسێك نازانێ بۆ کوێ هەنگاو بنێ. کەواتە ئەو نامۆبوونەی بە جوگرافیای دەرەوەی ماڵەوە. هاوکات نامۆبوونی دەروونی لەکن دروست دەکا. سەیر دەکا هەموو منداڵەکانی دیکە خاوەن ناسنامەی خۆیانن، بەڵام ئەویان ناسنامەی خۆی بزر کردووە. ئەمەیش بەریەککەوتنێکی دژوازە لەگەڵ بەرانبەرەکانی. ئەم دژبوونە کارەکتەر تووشی هەڵاتن، ڕەتکردنەوە و کەوتنە ناو کێشەوە دەکا. بە پێچەوانەوە خەڵکی تر ئارام و جێگرن، بەگشتی ژیانیان هەیە. لێرەدا ڕۆماننووس جۆرێك لە شیعرییەت بە هاوکاری ئەو چەمکە پارادۆکسانەی هەن، دروست دەکا. هەموو ئەمانەیش لەڕێی شەپۆلی هۆشەوە خوێنەر پێی دەزانێ. لەم نموونەیەدا زمانی هۆش لە دوو وێنەدا خۆی بەرجەستە دەکا. وێنەی یەکەم (ئەوان) لە بەرەی بەرانبەری کارەکتەرن، خاوەن جوگرافیای خۆیانن، خاوەن ژیانی خۆیانن. هەرچی وێنەی دووەمە کارەکتەر لە دەرەوەی نیشتمانی دایکە، ئەمەیش دەرگەیەکی پڕ لە ململانێ و، هەستکردن بە ڕەتکردنەوەی لەسەر دەکاتەوە. دایك لێرەدا هێما و نیشانەیە بۆ نیشتیمان، جوگرافیایەك بۆ کارەکتەر.

له کاتی گێڕانەوەدا، هەموو ئەمانه وەکو شـەپۆلێك بەسـەر زاری کارەکتـەردا دێن. دواتر شەپۆلێکی هوشیاری لەکن دروست دەبـێ، هـەموو ئـەو ژیانـه جوانـەی بەهۆی بوونی دایکـەوە هـەیبوو، لـه زهـنی کارەکتـەردا شـەپۆل دەدەن. قەڵـەم و دەفتـەرەکانی قوتابخانـەی، تەختـه سـڕەکەی، ڕووی ئـارامی بـاوکی لـه کـاتی ماستاوخواردنەوەدا، خواردنی بەیانیانی ڕۆژی جەژن، چوونه حەمامی ژنان لەگـەڵ دایکی...تاد. هەموو ئەمانه بۆ ئەو دەبنه ڕابردوو و له شێوەی شـەپۆلێکی هۆشـی بـه مێشـکیدا دێـن. هاوکـات لـه هـەموو ئەمانـه بێبـەش دەکـرێ و بـێ ناسـنامه دەمێنێتەوە. لێرەدایە کێشەی (خود/ من) دروست دەبێـت. جوگرافیایـەکی نییـە، تاکو تێیدا هەست به ناسنامه و خودی خۆی بکا.

## ب- زمانی نیشتیمان/ کێشەی منی کۆ:

دیاردەی کۆچکردن له شوێنێکەوە بـۆ شـوێنێکی دیکـه لـەم ڕۆمانـەدا چـەند جارێك دووپات دەبێتەوە. زمانی خود هاوواتای زمانی ئاگایی کۆیە، واته خـودێکی کۆ لەناو ئەو زمانه خودییەدا هەیە. ئەم خودە (من) چەند جارێك کۆچ دەکا. ئـەم کۆچـکردنه گەڕانـه بـەدوای خـود و ناسـنامەی (مـن) لـه بوونـدا. ئـەم کۆچـکردنی کارەکتــەر لـه ماڵــەوە، هاوکـات جێهێشـتنی ئـەو ماڵـه داماڵینیـەتی لـه هـەموو ناسنامەیەکی خودی. کۆچی دووەمی، که کۆچکردنی ڕاستەقینەی گەڕانه، لەگـەڵ لۆرییه زەردەکەیە. ئەم کۆچکردنه بەرەو نادیارە، بـەرەو هـەموو شـوێنێك و هـیچ کوێیەك. ((لەو ڕۆژەوە هەرگیز نازانم گەیشتن مانای چییە ! نازانم بۆ دەبێ بگەین. بۆ کوێ دەچین و له کوێ دەگیرسێینەوە. ئێمه دەڕۆیـن بـۆ ئـەوەی بگەڕێینـەوە. ئێمه دەچینه شارێك بۆ ئەوەی بمانگەیەنێته گونـدێك. دەچـینه شارۆچـکەیەك بـۆ ئەوەی بگەڕێینەوە شار.))[19] ئەم نەزانینی نێـوی شـار و گونـد، سـەرەتایەکه بـۆ نـامۆبوونی کارەکتـەر بـه سـەر زەوی. بـەو واتایـەی زەوی لەلایـەن کەسـانێکەوە کۆنترۆڵ کراوە، هەوڵی سڕینەوەی ناسنامەی مرۆڤانی دیکه دەدەن. لـه ڕێـی ئـەو شەپۆله مەنەلۆگەوە سەفەری خود بەرەو نادیار دەست پێ دەکـات. خودێـك پـڕە له ئـازار. تەنانـەت شـێوازی پـەیڤین و گێڕانەوەیشـی پـڕە لـه بـرین. هەوڵێکـه بـۆ دەرخستنی ئەوەی له ناخ و زهنی کارەکتەردایە. له ڕێی ئەم مەنەلۆگەوە دەزانـین ئەمه تەنێ کێشەی تاکێك نییە، بەڵکو ئاریشـەی نەتەوەیەکـە، خـەڵکانێکی زۆر لـه

هەمان سەفەردان، سواری لۆری دەبن و دادەبەزن. لۆری دەلالەتی خۆی هەیە، دەلالەتە لە بەردەوامیی ڕۆیشتن، لە گەڕان بەدووی ناسنامە، دەلالەت لە بێ نیشتیمانی. کەواتە هەموو ئەوانەی سواری لۆرییەکە دەبن، کێشەی منی کۆیان هەیە. هەموویان کێشەی بێ ناسنامەییان هەیە. سەر لۆری بۆ کارەکتەر دەبێتە نیشتیمان.

کارەکتەر سەفەرێکی دەستەجەمعی لەگەڵ هەموو لات و، بێنەوایان و، پیسوپۆخڵەکانی شار بۆ نیشتیمانێکی نوێ دەست پێ دەکا. ئەو کۆچکردنە، کۆچکردنێکی دەستەجەمعییانە بۆ دۆزینەوەی ناسنامەیەك، یان بەخشینی ناسنامەیەك بە خۆیان، چونکی هەموو ئەوانە یەك کێشەیان هەیە، کێشەی بێ نیشتیمانی و ناسنامەیی. بۆیەیش بڕیاری جێهێشتنی زەوی دەدەن. ((من یەکێکم لەو تارماییانەی بەشداریم لە دروستکردنی نیشتیمانی زێرابەکاندا کرد. واتە ژێرزەمینی تارمایی، وەك شاری قاجار، وەك یەکەم شاهەنشاهی پەهلەوی وەك باپیرە گەورەی عوسمانییەکان کە سەردەستە بوون و ئیمپراتۆریەتیان پێکهێناوە.))[20] ئەم نیشتیمانە تازەیە لە نائاگایی کۆیی هەموو کارەکتەرەکاندا هەیە، مەبەستمان ئەوانەی کۆچیان بۆ زێرابەکان کرد. ئەمەیش هەمان ئەو چەمکەیە، کە "یۆنگ" لە دەروونناسیدا بۆ هاوبەشبوونی کۆمەڵێ خەسڵەت و کلتوور و ئەفسانە لەکن میللەتانی دنیا. ئەم کارەکتەرانە لە کێشەی بێ ناسنامەیی و نیشتیمانیدا هاوبەشن. لە نائاگایی هەموویاندا ئەمە بوونی هەیە، بەڵام تەنێ لەڕێی کارەکتەری سەرەکییەوە گوزارشتی لێ دەکرێت.

**ج– زمانی خود/ ئەو:**

(ئەو) لە تیۆرەکەی "فرۆید"، بەرانبەرە بە غەریزە و حەزەکانی مرۆڤ. واتە (ئەو) کە بەشێکە لە دەروونی مرۆڤ هەوڵی تێرکردن و جێبەجێکردنی غەریزەکانی مرۆڤ دەدا، بەبێ ئەوەی گوێ بە هیچ لۆژیك و دابونەریتێك بدات.

لەم ڕۆمانەدا ململانێ و بەریەککەوتنی شارستانی و، ڕۆشنبیری و، فیکری بە شێوەیەکی بەرچاو دەبیندرێ. ئەم ڕۆمانە لەسەر دوو جیهان کار دەکا، جیهانێك، کە پێیوایە تاکە جیهانە و، بێ کەمایەسییە و، جیهانی پاکەکانە. ئەم جیهانە و کارەکتەرەکانی، جیهانی دەرەوەی خۆیان ڕەت دەکەنەوە. واتە جگە لە خۆیان

جیهانێکی دیکەیان قبووڵ نییە. پێیانوایە ئەوەی لەدەرەوەی ئەوانە، جیهانێکی پیسە، بۆگەنە، پۆخڵە. وەگێڕی ڕۆمان ئەو شەپۆلە هۆشییەوە، هاوکات لەڕێی ئێستاتیکای زمانی مەنەلۆگەوە، کە پتر زمانێکی شیعرییە، دەیوێ پێمان بڵێ، دەکرێ ژیانێکی دیکە لەو پۆخڵی و پیسییە دروست بکەین. گرینگی ئەو زمانە شیعرییە ئەوەیە ((وشەی بارگاوی بە شیعر، لە جیهانی نائاگایی نێزیکترە.))[21] زۆربەی ئەو ململانێیانەیش لە دەروون و نائاگایی کارەکتەر ڕوودەدەن، واتە پتر لە وڕێنە دەچن، بۆیەیش پێویستییان بەو زمانە شیعرییە هەیە.

بەریەککەوتنی ئەم دوو جیهانە، بۆ ئەوەی هەریەکەیان ناسنامەی خۆی بسەلمێنێ، یەکیان بە ڕێی زۆرداری و، ئەوی دیکەیان بە ڕێیەکی جیاوازتر، ئەویش دروستکردنی نیشتیمانێکی دیکەیە. لەلایەکی دیکە سێکس و، پێوەندیی جەستەیی، ڕەهەندی فیکری و فەلسەفییان لەم ڕۆمانەدا هەیە. سێکس بە بڕوای "فرۆید" سەرەکیترین هۆکاری کردەوەکانی مرۆڤە. لەم ڕۆمانەدا چەندین دیمەنی سێکسی هەن. یەکێك لەو دیمەنانە بە بڕوای من دەلالەتی زۆر هەڵدەگرێت، چونکێ ((کردارێکە دوو بەرە تێیدا ئامادەن: بەرەی گەرم (موجب) و بەرەی سارد (سالم)، یان بکەر و بەرکار.))[22] کەواتە بەرەی (من) لەگەڵ بەرەی (ئەو) هەن. (ئەو) هەوڵی تێرکردنی غەریزەکانی سێکس دەدا، سەرچاوەی ناوەندێتییەکەی جەستەیە. ((گڕی تەنوورە بۆ من دێت. بە ڕاستی هاڵاوی ئاگر بۆ من دێت. من خەریکە وەك پەنجەی پیاوە مسەکە بتوێمەوە. خەریکە بخنکێم. من فێری ئەو هەموو گەرمییە نیم. ملم درێژکردووە ئاگر بۆ ناوگەڵم ڕوژوم دێنێ. هاڵاو بەرەو ڕووم دێت. ئەگەرچی گەرمی خەریکە لاقەکانم بسووتێنی. ئەوەی سەیرە ئەو ئاگرە بۆنی دووکەڵی لێ نایە، تەنگە نەفەست دەکا. کەچی ئاو بە چاوتدا نایەتە خوارێ، بۆنێکی دیکەی فێنك و مەستکەر لەو ئاگرە دێت.))[23] وێنەیەکی تەواو سێکسییە. زمانی گێڕانەوەی کارەکتەر لەگەڵ دیمەنە سێکسییەکە بەرز و نزم دەبێتەوە. واتە ڕاستەوخۆ کاریگەری لەسەر پەیڤی کارەکتەر هەیە. دەکرێ دەلالەتی ئەو دیمەنە ئەوە بێ، لەناو پیسی و سیکراب و لاتەکان. ژیان بە شێوەیەکی زۆر ڕۆمانسی و پڕ لە چێژ دروست بکرێ. ئەو ژنە نیشانی دەدا، ئەو مرۆڤانەیش شایەن بە ژیانن. هاوکات "ژنە سفوورەکە" ڕەمزە بۆ ژیان، چونکێ

زوو زوو دەستەواژەی وەکو: بۆنی قەرسیلی دوای بارانبارین، بۆنی مێکوٚك، بۆنی ژن، دەماری ژیان، ڕەگی هەتاو...تاد. لەلایەکی دیکە کارەکتەر/ من نازانێ ژیان چییە؟ تەنانەت یەکەم جاریەتی لە ڕێی سێکسەوە دەزانی چێژێکی وەها هەیە. (ئەو) لە ڕێی سێکسەوە ناسنامەیەك بە (من) دەبەخشێ، هەرچەندە سێکس پتر بۆ حەز و غەریزە دەگەڕێتەوە، بەلاّم ئەمەیش بەشێکی دانەبڕاوە لە ژیان. چێژی ژیانی لەکن دروست دەکا. پێی دەڵێ دەبی لە گەڕان بۆ دۆزینەوەی ناسنامەیەك بەردەوام بیت. پێی دەڵێ: ئەو مرۆڤانەی لە کۆشکە جوانەکانن، دەوڵەمەندەکان شەوەکان بەو شێوەیە بەڕێ دەکەن. (ئەو) لەناو ئەو سیکڕابخانەیە واتایەك بۆ ژیان لەکن کارەکتەر دروست دەکا. ئەمەیان دەبێتە ((بەریەککەوتنی نێوان دوو ناسنامە، لە ڕۆژئاوا ناکرێ تۆ بەبێ ئەوی دیکە بژی، مرۆڤەکان تەماشای خۆی خۆیان ناکەن لە (ئەو)دا نەبێ، ئەو (ئەو)ی ژنە.))[24]

**٢- شیعرییەتی نائاگایی لەنێوان نووسین و شێوازی چەپاندندا:**

لەکن زانایانی دەروونی، بەتایبەت "فرۆید و ئەدلەر" چەپاندن هۆکارێکە بۆ داهێنان. لە قووڵترین چینەکانی  نائاگایی خود و نائاگایی کۆ، غەریزە و ئارەزووە چەپێنراوەکان خۆیان مەڵاس داوە. لەکن "فرۆید" عەقڵی نائاگایی کۆگای ئارەزوو و غەریزە چەپێندراوەکانە.. تەنانەت داهێنان وەکو دۆخێکی نەخۆشی تەماشا دەکرێت. ئەگەر تەماشای ڕۆمان بە شێوەیەکی گشتی بکەین، وەکو کۆمەڵگە دێتە پێش  چاو. چۆن لەناو کۆمەڵگە خەڵك دەڕۆن، دەخۆن، دەخەون، دەپەیڤن...تاد، لەناو ڕۆمانیش هەمان شێوە. بە بۆچوونی "باختین"، کارەکتەری ڕۆمان خۆی و پەیڤەکانیشی کۆمەڵایەتین. چۆن مرۆڤ لە ژیان تووشی باری دەروونی خۆش و، ناخۆش دەبێ، تووشی چەپاندن لە هەموو بوارەکان دەبێتەوە، کارەکتەریش هەمان باری بەسەر دێت. لێرەدا هێندێك لەو چەپاندنانە بەرباس دەدەین:

**١– چەپاندنی سێکسی:**

"فرۆید" هەموو نەخۆشییە دەروونی و، گرفتەکانی ژیان، بۆ چەپاندنی سێکسی دەگەڕێنێتەوە. تەنانەت پێداگری لەسەر ئەوە دەکرد، جەنگی جیهانی یەکەم، لە ئەنجامی چەپاندنی سێکسییەوە هەڵگیرساوە. وەکو پێشتر ئاماژەم دا عەقڵی نائاگایی لەکن ئەم دەروونناسە، بە کۆگای هەموو غەریزە چەپێندراوەکانی

دادەنا. ((فرۆید ڕووی خۆی بەلای داهێنەرەکان وەرچەرخاند و بەرهەمی چەند داهێنەرێکی لە مەیدانی ئەدەب و هونەردا شی کردەوە وەکو: لیۆماردۆ داڤنشی، ڤان کۆخ، دیستۆیفسکی، مارکیز دوو ساد و چەندانی تر.))[25] بە بۆچوونی ئەم دەروونناسە هەموو داهێنانێکی ئەدەبی پاڵنەرێکی سێکسی لە پشتەوەیە. هەر لە منداڵییەوە ئەم هۆکار و پاڵنەرانە دروست دەبن. پاشان لەگەڵ گەورەبوون، بە شێوەی جودا و ناڕاستەوخۆ دەردەکەون. بۆیەیش ((ناتوانین بە سانایی کارە ئەدەبییە گەورەکان بۆ ڕێکەوت بگەڕێنینەوە، بەڵکو هەموویان بۆ تراژیدیای (ئۆدێب)ی سۆفۆکلیس و، (هاملێت)ی شەکسپیر و، (برایانی کارامازۆف)ی دیستۆیفسکی و، هەمان بابەتی کوشتنی باوك دەگەڕێنەوە. لە هەر سێ ئەم کارەی سەرەوە، پاڵنەری کێبڕکێ لەسەر ژن دەدۆزینەوە.))[26] ئەو پاڵنەر و چەپاندنە سێکسییانە بەسەر کارەکتەرەکانیش پراکتیك دەبێ. لە ڕۆمانی (نەتەوەی ژێرابەکان)دا زۆر بە وردی لەبارەی چەپاندنی سێکسییەوە کار کراوە. هەر لە دەسپێکی ڕۆمانەکە، باوکی کارەکتەر ژنێکی دیکە بەسەر دایکی کارەکتەر دەهێنێت. هێنانی ژنی دووەم بۆ برسییەتی ئەو مرۆڤە دەگەڕێتەوە. ئەو چەپاندنانەی لە منداڵییەوە تووشی تاکی ڕۆژهەڵات دەبێ، کە گەورە دەبێ، هەوڵی قەرەبووکردنەوەی دەدات. ((ئەو ڕۆژەی بابم ژنێکی تازەی هێنایەوە ماڵی داکم دوو ڕۆژ بوو کراسێکی ڕەش ڕەشی لەبەر کردبوو. ئەویش کراسێکی سووری ئاودامانی لووسی لەبەر بوو. پێڵاوی بە بریق و ئەویش هەر سوور. تەق تەق تەق بە ڕاڕەوی ناو چیمەنەکەدا هات.))[27]

لەم پەیڤانەوە دەزانین دوو ژن هەن. یەکیان کراسی ڕەش و، ئەویتریان کراسی سووری لەبەرە. ڕەش نیشانەی بوونی خەم و دڵتەنگییە. ڕەنگی سوور نیشانەی سێکس و خۆشی و ئاهەنگە. هەرچەندە دیاردەی فرەژنی پێوەند بە ئایین کراوە، بەڵام لە ڕاستیدا پێوەندی بە چەپاندنی سێکسەوە هەیە، چونکێ لە ئایینیش بە مەرج ڕێ بە ژنی دووەم دەدرێ، دەبێ بەهانەیەکی شەرعی هەبێ.

شاری بەغدا وەکو سەنتەرێك لەم ڕۆمانەدا ڕووداوەکانی تێدا ڕوودەدات. ئەم شارە وەکو شوێنێك بۆ خۆشگوزەرانی و، سێکسکردن تەماشا کراوە. لە دەیەی شەست و حەفتا و هەشتاکانی سەدەی ڕابردوو، گەنجانی ئەو کاتی شارەکانی

هـەولێر و سـلێمانی بـۆ سێکسـکردن دەچـوونە ئـەو شـارە. مـن هـەم لـە خۆیـانم بیستووە، هەم کتێبی (سەفەرنامە)ی "هیوا قادر" بەڵگەیە، لەوێدا نووسـەر ئـەوە بەرباس دەدا چۆن خۆی و هاوڕێکانی بۆ سێکسکردن بۆ بەغدا سەفەریان کردووە.

هەموو ئەو ڕێبوارانـەی سـواری لۆرییەکـە دەبـن، شـاری بەغـدا وەکـو شـاری سـێکس دەبیـنن. لـە ڕێـی پەیڤەکانیانـەوە دەزانـین چ چـەپاندنێکی سێکسـی لـە ناخیان هەیە. ((یەکی دیکە چوو بـوو بـۆ کـڕینی پسـکیت و چـۆرەك و لـوقم، ئـەو پیاوە زوو زوو دەیگوت:

- بەڵام کوڕەکانی بەغدا لە کچەکانیان لوقمترن.

لەگەڵ ئەو قسەیەش دوو سێ جار توند دەستی بە ڕانی مندا دەکێشا.

تەنها یەکێکیان ڕاستەوڕاست دەیگوت:

- بەڕاستی من لەبـەر خـاتری ژنـەکانی دەچـووم، لەبـەر خـاتری مـەلهاکان، مەلها پڕ گلۆپە سوورەکان.))(28)

شاری بەغـدا وەکـو شـوێنێك بـۆ دامرکاندنـەوەی حـەزە سێکسـییەکان وێنـا کـراوە. لـە پشـت پەیڤەکانـەوە بۆشـایی دەروونـی قـووڵ هەیـە. تەنانـەت پیـاوی یەکەم، دەست بـۆ ڕانـی کارەکتـەر دەبـات. ئەمـەیش نیشـانەی حـەزی سێکسـی ئەوە. نیشانەی ئەو شەپۆلە چەپێنراوانەیە لە نائاگایی پیاوەکەدا.

دەستەواژەی (ژنی سفوور) تایبەت بە شاری بەغدا کراوە. لەم ڕۆمانـەدا ژنـی سـفوور واتــە چـێژ، واتــە سـێکس. ((ئـاخ ئـاخ سـەدجار ئـاخ بـۆ ژنـی سـفووری بەغدا.))(29) ژنی سفوور لەکن کارەکتەر دەبێتە خەون و خولیا. خۆی لـە ڕووتیـدا دەبینێتەوە، لە سێکسـدا بەرجەسـتە دەبێـت. ئـەم ژنانـە چـاوی ڕێبوارەکـان تێـر دەکەن. ئەو شەوەی کارەکتەر لەگـەڵ یـەکێ لـە ژنـە سـفوورەکان سـێکس دەکـا، لەوێدا هەست بە گەرمیی ژن، بە چێژی ژیـان دەکـات. لـەناو ئـەو سـیکڕابخانەیەدا ژنێك واتا بە ژیانی کەسێك دەبەخشێ. لەوێدایە کارەکتەر تێدەگا، کە ژنی سـفوور چ واتایەکی هەیە. هوتێلەکانی بەغدا بەرناکەون، لەبـەر لێشـاوی ئـەو خەڵکـەی بـۆ دامرکاندنەوەی حەزە سێکسییەکانیان هاتوون. ((لە قورسی ئـەو هـەڵم و تەمـەوە دەمانزانی ئوتێلەکان جمەیان دێت و دەمـانزانی هێرشـی پیـاو بـۆ ژن لـەو شـەوە تەڵخانەی بەغدادا چەند توند و بێ بەزەییانەیە.

زستانان بەغدا شاری هارووونە ڕەشیدە، ئەو هاروونە رەشیدەی تەنها بەسەر ژندا دەسەڵاتی هەیە، مەملەکەتی ئەو جەستەی ژنە.))[30]

لەم مەنەلۆگەدا ئاوازێکی سێکسی لە وشەکاندا هەیە. لە نەسەقی وشەکان تەنێ دەلالەتی سێکس هەیە. بەتایبەت کارەکتەر دەیوێ دیمەنی شەوی زستانانی بەغدامان بۆ وێنا بکات، لە ڕێی هۆشی کارەکتەرەوە، دەزانین هاروونە ڕەشید، بەو ژیانە خۆشەی، کە لە حەرەمسەرادا هەیبووە، تەنێ ژن لە حەرەمسەرا و دەوروبەری بووە. دەلالەت لە دەسەڵاتی پیاو، پیاوی ڕۆژهەڵاتی، کە ژن تەنێ وەکو ئارەزوو و کەرەسەیەك بۆ دامرکاندنەوەی غەریزەکانی دەبینێ.

**٢- چەپاندنی سیاسی:**

یەکێك لە باشییەکانی شەپۆلی هۆش ئەوەیە، هەرچی شتی شاراوە لە دەروونی کارەکتەردا هەبێ، ئاشکرای دەکات. کارەکتەر، لەبەرئەوەی تووشی چەپاندن دەبێ و، ناتوانی بە ئاشکرا لە ڕێی دیالۆگەوە، ئەوەی هەیەتی بیلێت، ناچار پەنا وەبەر ئەم تەکنیکە دەبات. بۆ ئەوەی لە ناخی خۆیدا لێکدانەوە بۆ ڕووداوەکان بکات.

لەم ڕۆمانەدا لە سەرەتای گێڕانەوە بەر دوو جۆر لە پێڵاو دەکەوین. دوو پێڵاوی ڕەنگ ڕەش. پێڵاوێکیان پاژنە بەرزە و ژنانەیە. ئەمەیان نیشانەیە بۆ پۆشتەیی، ژنی مۆدێرن، هاوکات جوانیی ژیان. کەواتە نیشانەی ژیانە، خۆشییە، سێکسە. لەلایەکی دیکە پێڵاوێکی گەورە و سەربازی ڕەنگ ڕەش هەیە. ((دوو پیکابی درێژ کە دیارە هی چەکدارەکانی میرین لەو سەروسەری شەقامەکە وەستاون. پیاوە چەك بەدەست و ئاگرەکان دێنە خوارێ و بە ئەندازە دابەش دەبن. یەکێکیان ڕێك لەبەردەم ئەو گۆڕە شاراوەی مندا دەوەستێ، من تەنها پێڵاوە گەورە و ئەستوورەکانی دەبینم، لە بەدبەختی منیش ئەوانیش هەر ڕەشن.))[31] لێرەدا بە ئاشکرا ئاماژە بە لەشکر، کراوە. دەلالەتی ئەم پێڵاوە ڕەشانە، پێچەوانەی پێڵاوەکەی پێشترە. ئەمەیان دەلالەت لە هێزی چەکداری، هێزی کوشتن و گرتن دەکات. هێزێکە بۆ ئەوەی جودا لە ڕەنگی خۆی هیچ ڕەنگێکی دیکە ڕێ پێنادات. ئەو زمانە هۆشییەی کارەکتەر، بە شێوەیەکی نیشانەیی هاتووە. بەتایبەت پەیڤی کارەکتەر پتر لەسەر ڕەنگی پێڵاوی

چەکدارەکانە. ئەم چەکدارانە لە گەڕاندان بۆ ئەوەی، دەنگی دیکە، هێزی دیکە، ژیانی دیکە کپ بکەن. بۆ ئەوەی شوناسی سیاسی ئەو کەسانە بسڕنەوە، کە نەیاری دەسەڵاتن.

((– کوانێ خاوەنی ئەو پێڵاوانە کوانێ؟ هەر ئەویشە ئەو بەیانە بۆگەنانەشی لەناو ئێوەدا بڵاوکردۆتەوە.

لەگەڵ ئەو قسەیەدا چەند پارچە کاغەزێکی نیشاندەدەن.

سەردەستەکەیان دەنەڕێنێ.

- ئێرە کارگەی فەسادە، بەیانەکان لێرە دەنووسرێن و بڵاو دەکرێنەوە.))(32)

یەکێ لە هۆکارەکانی کۆچکردنی تارمایی و، مردوو و، شتە کۆن و، پیسەکانی شار بۆ ناو زێرابەکان، نەبوونی هەناسەی ئازادی و، سەربەستییە لە ڕووی سیاسییەوە، بۆیەیش ئەوان پەنا وەبەر شوێنێکی پیس دەبەن، بۆ ئەوەی لەویدا پرۆسێسەی ئەو ئازادییە بکەن. دەسەڵات ماف تەواو بە خۆی دەدا و دەیەوێ هەموو شتێك بەپێی بیرکردنەوەی ئەو بجوولێتەوە. ئازادیی سیاسی و فیکری ئەوانی دیکە دەچەپێنێ، بۆیەیش لە تەواوی فەزای ڕۆمانەکەدا کەمترین دیالۆگ دەبینین.

### ٣– چەپاندنی فیکری/ ڕۆشنبیری:

کتێب و سەرچاوە مەعریفییەکان، کاریگەریی گەورەیان لەسەر ئاستی هوشیاریی تاکەکانی کۆمەڵگە هەیە. هەر بۆ نموونە ئەم ڕۆمانە (نەتەوەی زێرابەکان) بەهانەیەکە بۆ گوزارشتکردن لە پرۆسێسەیەکی فیکری و سیاسی.

لەم ڕۆمانەدا دوای ئەوەی هەموو تارماییەکان، مرۆڤە بێلانەکانی شار کۆچ بۆ ناو زێرابەکان دەکەن. دوای ماوەیەك ژیان لەوێدا، بە لێشاو کتێب و گۆڤار و دەستنووس بۆ ناو زێرابەکان فڕێدەدرێن. ((مەبەستی ئەوان کتێب بوو، کتێبی گوواوی، لەگەڵ مەیتەکان بە سەدان کتێب و هەزاران لاپەڕەی سووتاو و دڕاو، گۆڤار و دەستنووسی جزوبەندی قەبەقەبە، ڕۆژنامەی تەجلیدکراو دەبارینە ناو زێرابەکانەوە. تارماییە شاعیرەکان، هەستەوەرە باریکەکان هەموو کتێب و گۆڤار و ڕۆژنامەکانیان دەدۆزییەوە بە ڕۆژ بەدوای لاپەڕەیەکی ون، یان بەرگی کتێبێکدا

دەگــەڕان.))[33] دەبیــنین لەگــەڵ هــاتنی كتێــب، مــەیتیش فڕێــدەدرێ، واتــە نووسەرەكانیش، یان خوێنـەرەكانی ئـەو كتێبانـەیش فڕێـدەدرێن. ئـەم چـەپاندنە هەوڵێكە بۆ سـڕینەوەی دەنگـی دیكـەی جـودا لـە دەسـەڵات. سـڕینەوەی وشـەی ئـازادە، وشــەیەك بــە دڵــی دەســەڵات نەنووســراوە. وێناكردنەكـەی كارەكتــەر و بەستنەوەی كتێب و مەیت بەیەكەوە. ئەوە نیشان دەدا، كـە پێوەندییـەكی كامـڵ لەنێوان زهن و دەروونی خۆی لە جیهانی ناوەوەی خۆی و جیهـانی كۆمەڵایـەتی و ڕۆشـنبیری لــە جیهــانی دەرەوەی خۆیــدا هەیــە. ئــەوەی لــە بــەرەی دەرەوەی دەسەڵات بێ، ئەوا ڕەت دەكرێتەوە، بە پیس دادەنرێ، دەكوژرێ.

((ئەو تارماییە كاغەز پەروەرانە قەفەزەی سنگیان لەو بەرگـە كتێبـە بـۆر و زەردانە بوو، بۆیە كون كون بوون و تاكە وشەیەكی ڕابردوویان لەناو گیر نەدەبوو، بەرگی ئەو كتێبانەی پێش ئەوەی بڵاوبكرێنەوە هەر لە چاپخانەوە فڕێدرابوونە ناو مەنهۆڵە گـەورەكانی زێرابـەكان، یـان ئـاوەڕۆ سـەرەكییەكان.))[34] ئەگـەر لەسـەر زەوی، هــەوڵی كپكردنــی نووســین و وشــە بــدرێت، ئــەوا لــەژێر زەوی هــەوڵێك بـۆ پاراســتن و خوێندنــەوەی ئــەو كتێبانــە هەیــە. هــەموو نەتەوەیــەك پێویســتی بــە سەرچاوەی مەعریفی هەیە، نەتەوەی زێرابـەكانیش، هـەوڵی سـوود وەرگـرتن لـەو سەرچــاوە مەعریفییانــە دەدەن، كــە لەلایــەن دەســەڵاتەوە ڕەت دەكرێتــەوە. لەلایــەكی دیكــە ئــەوە نیشــانەی ئەوەیــە، نەتــەوەی زێرابــەكان، كتێبگــەلێك ناخوێننەوە، كە سەر دەنگی دەسەڵات بێت.

### ئەنجامەکان:

١- ناونیشان وەکو توخمێکی سەرەکیی ڕۆمان، بە دەروازەی یەکەمی دەق دادەنرێت. خوێنەر لە ڕێیەوە دەتوانێ زانیارییەکی سەرەتایی لەبارەی دەقەکەوە دەست بخات. ڕۆمانەکە ناونیشانێکی شیعری بەرزی هەیە. هەردوو بەشەکەی (نەتەوە و زێراب) دەلالەتی خۆیان هەیە. نەتەوە دەلالەتی کۆمەڵێ خەڵکە لە کلتوور، زمان، نیشتیمان هاوبەشن. زێراب شوێنی پیسی و پۆخڵییە. شوێنی فڕێدانی پاشماوەیە. لەسەر زەوی فڕێدراون، هەوڵدەدەن لەناو زێرابەکان ژیانێکی تازە بژین.

٢- شەپۆلی هۆش وەکو تەکنیکێك، شیکردنەوەی دەروونی بۆ کارەکتەرەکان دەکات. کارەکتەر لە ڕێی ئەم تەکنیکەوە شتەکان، ڕووداوەکان بۆ خۆی باس دەکا. واتە کەناڵی دیکە لە دەروونی خۆی دەکاتەوە.

٣- لە ڕێی ئەم تەکنیکەوە ڕۆماننووس، کۆمەڵێ چەپاندنی بەرباس داوە. وەکو چەپاندنی سێکسی، کە هەر لە منداڵییەوە لەگەڵ کارەکتەر هاتووە. کۆمەڵێ دەستەواژەی وەکو پێڵاوی سووری ژنانە، ژنی سفوور، شاری بەغدا بە چەمکی شار، ئەمانە ئاماژەن بۆ لایەنی سێکسی. هاوکات بەغدا وەکو ناوەندێکی ڕۆشنبیری، پایتەختێك شوێنی ململانێی سیاسی و ڕۆشنبیرییە.

٤- چەپاندنی سیاسی لە ڕێی پێڵاوەوە، وەکو دەلالەتێك کاری لەبارەوە کراوە. پێڵاوی ڕەشی سەربازی ئاماژەیە بۆ دەسەڵات، ئەو دەسەڵاتەی هیچ بیرکردنەوەیەکی دیکەی جودا لە خۆی قبووڵ نییە. بۆیەیش لە زۆر شوێنی ئەم ڕۆمانە دەبێ کۆمەك لە سیمیۆلۆژیا وەرگرین.

## پەراوێز و سەرچاوەکان

(1) العنوان وسيميوطيقا الاتصال الادبي، محمد فكر الجزار، الهيئة المصرية العامة للكتاب، ١٩٨٨، ص٧٧.
(2) نەتەوە، ئێرنست ڕێنان، لە ئیتاڵییەوە: جەمال زەندی، لە پەیجی فەیسبووکی نەتەوەوە وەرگیراوە:
www.facbook.com/pages/NATAWA/366799870101908?ref=stream
(3) نەتەوەی زێرابەکان، جەبار جەمال غەریب، ڕۆمان، ناوەندی ئەندێشە، سلێمانی، ٢٠١٣، ل٢٤.
(4) معجم المصطلحات العربية في اللغة والادب، مجدي وهبة و كامل مهندس، مكتبة لبنان، ط٢، ١٩٨٤، بيروت، ص١٢٨.
(5) تيار الوعي في الرواية الحديثة، روبرت همفري، ت: د. محمود الربيعي، دارالغريب، القاهرة، ٢٠٠٠، ص٩.
(6) جماليات اللغة في القصة القصيرة، قراءة تيارالوعي في القصة السعودية:١٩٧٠–١٩٩٥، احلام حادي، المركز الثقافي العربي، الدارالبيضاء، ٢٠٠٤، ص٣٣.
(7) سەرچاوەی پێشوو، ل٣٧.
(8) تيار الوعي في الرواية الحديثة، روبرت همفري، ت: محمود الربيعي، ط٢، القاهرة، ١٩٧٥، ص٢٠.
(9) نووسینەکانم لەبواری ڕەخنە و لێکۆڵینەوەدا، حوسێن عارف، دەزگای ئاراس، هەولێر، ٢٠٠٠، ص١١١.
(10) اللاوعي، جان كلود فيليو، ت: جان كمبيد، سلسلة ماذا اعرف ٤٧، المنشورات العربية، ص٤٢.
(11) معجم المصطلحات العربية في اللغة والادب، مجدي وهبة و كامل مهندس، ص٣٨٩.
(12) تەکنیکی فرەدەنگی لە ڕۆمانی کوردیدا ٢٠٠٠ – ٢٠١٠، حەمە مەنتك، بەڕێوەبەرێتیی چاپ و بڵاوکردنەوەی سلێمانی، سلێمانی، ٢٠١٣، ل٧١.
(13) عناصر داستان، جمال ميرصادقي، انتشارات سخن، چاب چهارم، تهران، ١٣٨٠، ص٤١١.
(14) تيار الوعي في الرواية الحديثة، روبرت همفري، ت: محمود الربيعي، ص٤٤.
(15) جماليات اللغة في القصة القصيرة، احلام حادي، ص٤٧.
(16) محنة الهوية، مسارات البناء وتحولات الرؤية، رسول محمد رسول، المؤسسة العربية للدراسات والنشر، بيروت، ٢٠٠٢، ص٢٦.

(17) نەتەوەی زێرابەکان، جەبار جەمال غەریب، ڕۆمان، ناوەندی ئەندێشە، سلێمانی، ٢٠١٣، ل٧.
(18) سەرچاوەی پێشوو، ل١٠.
(19) نەتەوەی زێرابەکان، ل٢١.
(20) نەتەوەی زێرابەکان، ل٩٣.
(21) راهی بە هزار توی رمان نو در ێپار کوندرا– ساروت– روب گری، جواد اسحاقیان، نشر گل ێژین، چاپ دوم، ١٣٨٧، تهران، ص١٥٧.
(22) شرق و غرب رجولة و انوثة، جورج طرابشي، دار الطليعة، بيروت، ١٩٧٨، ص١١.
(23) نەتەوەی زێرابەکان، ل٦٠.
(24) محنة الهوية: مسارات البناء و تحولات الروية، رسوك محمد رسول، ص٥٥.
(25) پرۆسێسەی داهێنان لە دیدگای فرۆیدەوە، موعتەسەم ساڵەیی:
www.kurdistanynwe.org/direje
(26) التحليل النفسي والفن (دافنشي و دوستويفسكي)، فرويد، ت: سمير كردم، دار الطليعة للطباعة والنشر، بيروت،١٩٧٩، ص١٠٩.
(27) نەتەوەی زێرابەکان، ل٨.
(28) نەتەوەی زێرابەکان، ل٣٦–٣٧.
(29) سەرچاوەی پێشوو، ل٣٩.
(30) نەتەوەی زێرابەکان، ل١١٨.
(31) نەتەوەی زێرابەکان، ل٦٩.
(32) سەرچاوەی پێشوو،ل٧٢.
(33) نەتەوەی زێرابەکان، ل١١٢.
(34) سەرچاوەی پێشوو، ل١١٣.

## ملخص البحث

بما ان اللغة تعتبر كيان حي، كذلك تأتي في المرتبة الاولى ضمن العمل الادبي بمعنى ان الكاتب يبدي عمله داخل اللغة.

الروائي يعامل مباشرة مع اللغة، ولكن السؤال هو: كيف يستطيع الروائي ان يجعل من اللغة مادة للابداع؟

ولا ننسى أن المؤرخ يقوم بسرد الاحداث خلال اللغة، ولكن مهمة الروائي اصعب، لأنه يتعامل مع الخيال من خلال الواقع الحي، كذلك تأتي الجمالية، ضمن التقنيات وجوانب فنية في الرواية.

هذا البحث (جمالية اللغة وآفاق التجربة) في رواية (نهتهوهى زێرابهكان) للروائي (جبار جمال غريب) محاولة لأبراز جوانب جمالية اللغة، وآفاقه المتعددة ضمن الرواية المذكورة.

البحث يتكون من جزئين :

الجزء الاول بعنوان (جمالية عتبات النص) خطونا الى تحليل (عتبات النص) مثل (غلاف الرواية، العنوان، شعرية عنوان النص) .

في مجمل هذا الجزء قمنا بابراز جمالية العناوين الرئيسي والثانوي في الرواية المذكورة. الجزء الثاني محاولة للبحث عن جمالية (تيار الوعي) في الرواية، في البداية من الجانب النظري بعد ذلك تحدثنا عن شعرية خطاب (التيار الوعي) وجمالية اللغة .

من خلال هذا الحديث بيّنا ان الهوية هي قضية ذاتية عند البطل الروائي. وقضية الكيان والوطن هي مسئلة عامة وشاملة عنده. لاثبات ذلك اتينا بامثلة حية من الرواية. اضافة الى ذلك تحدثنا عن الكبت الجنسي، السياسي، الثقافي... الخ. الموجود في الرواية..

وأخيرا قمنا بتلخيص النتائج التي توصلنا اليها من خلال البحث. . اضافة الى تثبيت قائمة المصادر..

## Abstract

As language is a living entity and comes first in literary works , in other words authors work within the frame of language.

Novelists work directly with language but the question is how can a novelist turn language into material for his creativity?

One should bear in mind that historians narrate events through language but the mission of novelists are more difficult because they deal with imagination through a living entity and then comes aesthetics within techniques and artistic aspects of novels.

This paper entitled language aesthetics and horizons of experiment) in ‘nation of drainages’ by the novelist Jabbar Jamal Gharib is an attempt to show the aesthetic aspects and horizons of experiments.

The paper consists of two parts:

The first is aesthetics of the text that deals with the cover of the novel, the title and poetics of the title. It shows that aesthetics aspects of the main and secondary titles in the novel

The second part deals with the aesthetics of stream of consciousness both theoretically and then on the poetic aspects of the stream and language.

It has been concluded that identity is an individual issue to the hero of the novel and entity and homeland are public issues. To prove these issues , samples from the novel have been presented.

Finally, we summarize our findings throughout research.

# رەهەندەکانی شوێن

## لە شیعرەکانی (بێدڵ)دا

**عەبدوڵڵا رەحمان عەولا**

بەشی زمانی کوردی – کۆلێژی پەروەردە/ مەخموور
زانکۆی سەلاحەددین – هەولێر

**پێشەکی**

شوێن توخمێکی گرنگە لەو توخمانەی کە تەکنیك و شێوازگەلێك دروست دەکەن و لەپانتایی دەقدا جێگەی خۆیان دەکەنەوە. لەهەمان کاتیشدا شوێن بەبێ ئەو توخمانە ( رووداو، کات، کەسایەتی....هتد) ناتوانێت بژێت و هەناسە بدات. بۆیە شوێن هەمیشە گرنگیی خۆی لەگەڵ ئەو توخمانەدا دەبینێتەوە.

شوێن پێگە و قەبارە و رەگ و ریشاڵی دەمێکە لەنێو شیعردا بۆ خۆی بنیات ناوە و شاعیران لەگەلێك بوار و هەلدا بۆ گەیاندنی مەبەستەکانیان پەنایان بۆ بردووە. لەزۆر جێگەدا شوێن وەکو تەکنیکێك بەهانای شاعیر چووە و بەشداری لە تەونی سەرتاپای دەقە شیعرییەکەدا کردووە و وزە و هێزێکی ئەوتۆی پێبەخشیوە کە نەمری بۆ دەستبەر بکات.

لەم لێکۆڵینەوەیەدا هەوڵدەدەین پێگە و کەسایەتی و قەبارەی شوێن بناسێنین و رەهەندەکانی دەستنیشان بکەین و ئاماژە بەجۆرەکانی بدەین و رۆڵ و بزاڤی لەنێو دەقی شیعریدا روون بکەینەوە. ئەو پێناساندن و رۆڵ نیشاندانەی شوێن لە نموونەی شیعری شاعیرێکەوە بەدی دەکەین کە (بێدڵ)ی شاعیرە و لەگەلێ جێگەدا شوێن بووە بە بناغە و رۆڵگێڕی شیعرەکانی.

ئەم لێکۆڵینەوەیەمان بۆ دوو بەش تەرخانکردووە، لەبەشی یەکەمدا لەمیانەی دەروازەیەکی تیۆریدا هەوڵدەدەین شوێن وەکو زاراوە و زمان و چەمك شیبکەینەوە و رەهەند و جۆرەکانی دەستنیشان بکەین.

لەبەشی دووەمیشدا رەنگدانەوەو قەبارەو پێگەی شوێن لەشیعری کوردی و دواتر لە خودی شیعرەکانی (بێدڵ)ی شاعیردا بەرجەستە و راڤە بکەین.

## بەشی یەکەم

## شوێن وەکو چەمك و زاراوە و زمان

ئـەو بۆشـاییيە بـەرين و فراوانەيـە، کـە هەرچـی شـتی مـاددی و نامادييـە دەتوانرێت لەناويدا دابنرێت و بپارێزرێت، بۆيە ناتوانين سنوور بۆشوێن دابنێين بـە شـێوەيەکی ڕەهـا، ئەمـەش لـە بـەر فراوانـی پێکهاتـەی شـوێنە. شـوێن هـەموو گيانـدارەکان و بـێ گيانـەکان لـەخۆ دەگرێـت، هـەروەکو دەزانـين مـرۆڤ هـەر لـە سەرەتای ژيانييەوەبيری لەوە کردۆتەوە کەوا شوێنێك بۆخۆی دابين بکات، کەواتە لەگـەڵ دروسـتبوونی مرۆڤايەتيـدا شـوێن هـەبووە ، لـەناو ئەشـکەوت و شـاخ و بيابانەکاندا ژيانی بەسەر بردووە لەگەڵ تێپەڕبوونی ڕۆژگاردا بيری لەوە کردۆتەوە کـە دەبێـت ژيـانێکی نـوێتر و ئـارامتر دروسـتبکات٠ لەبـەر ئـەوەی کاريگەرييـەکی ڕاستەوخۆی لەسەر بيری مرۆڤ هەيە ئەمەش بووەتە هۆی ئەوەی کەوا دەستبکات بەدروستکردنی چەندان خانوو و کوخ لەناو گوندەکاندا ٠ دروستکردنی ئـەو خـانوو و کوخانـەش بـە بـەرد و قـوڕ پێکيـان وەنـابوو، بـەڵام دواتـر بـەرەو شـارەکان پێشـڕەوييان کـرد و دەسـتيان کـرد بەدروسـتکردنی چـەند خانوويـەکی ديکـە کـە جياواز بوو لەخانووی گوندەکانيان. دەکـرێ بڵـێين بـەهيچ جۆرێـك مـرۆڤ ناتوانێـت بەبێ شوێن بژی شوێن کە نەبێت مرۆڤيش بوونی نابێت.

**لە ڕووی زاراوە و زمانەوە:** لەزمانە جياوازەکاندا چـەندين زاراوەی بـۆ بـەکار هـاتووە، لـەزمانی ئينگليزيـدا بەرانبـەر بەشـوێن زاراوەی (place) [١] دانـراوە، و لەزمانی عەرەبيدا بەرانبەر بەشوێن زاراوەی (موقع) [٢] دانراوە، جگە لەم زاراوەيـە چەندان زاراوەی تريش دانراوە وەکو (مکـان،أثر، جهـة، طريـق، مرتبـة، مرکـز)[٣]. لەزمانی فارسيشدا زاراوەی (أثر، بهراز، خـط، شـيار) [٤] لەبەرانبـەريان دانـراوە ٠ لەزمانی کورديشدا جگە لەوشـەی شـوێن چـەندان زاراوەی بـۆ بـەکار دێـت، وەکـو (جێگـا، شـۆپ، دوای،پـاش، شـۆن، خـەت، هتـد...) [٥]، بـەڵام زاراوەی (شـوێن) دەمێکە لەبواری ئەدەبيات چەسپيوە و پێگەی خۆی کردۆتەوە.

**لـە ڕووی چـەمكەوە:** چـەمكی شـوێن زۆر لایـەنی فـراوان دەگرێتـەوە هـەر ئەمەش وای لەنووسەر و زانایان كردووە هەریەكەیان بەپێی بیرو بۆچوونی خۆی و تێگەیشتنی لەگەردوون ڕای خۆی دەربڕێت ٠

بیركردنەوەو تێڕامانمان بۆشوێن زۆر جار ئەو هەستەمان لا دروست دەكات تەنها قەوارەیەكەو لەسەری دێین و دەچین، بەڵام بەزیاتر وردبوونەوە لێی بیرمان بۆ گەلێك شتی وردتر و فراوانتر دەچێت، هەر بۆیە (( شوێن تـەنها خـۆڵ و بـەرد و شاخ و ڕووبارێكی چەسپاو نین لەلای مرۆڤدا، بـەڵكو بەشـێكە لـە شـێوازی ژیـان و بیركردنەوەی پۆرترێتەكانی مرۆڤ)) [٦].

دەكـرێ بڵـێین مـرۆڤ بـەهۆی شـوێنەوە زمـان و جلوبـەرگی و ڕوخسـاری بەدەردەكەوێت، هەروەها شوێن كلتوورو داب و نەریتی وڵاتان دەپارێزێت، لەگـەڵ ئەوەشدا كاتێ كەسێك لەشـوێنێكەوە دەچـێتە شـوێنێكی تـر بـەگۆڕانی شـوێنەكە لەهـەمان كاتـدا، كەسـەكەش لـە ڕووی زمـان و جلوبـەرگ و ڕەوشـت و.....هتـد ٠ دەگۆڕێت. جگە لەمەش مرۆڤ تا ئەوكاتەی لـەژیان مابێـت ئامـادەبوونی هەیـە، لـە شوێندا، ئەستەمە لەدەرەوەی شوێن بوونمان هـەبێت، هـەروەها لـەدوای مـردنیش دیسانەوە ڕوحی مرۆڤەكان لەشوێنێكی تردا جێگیر دەبنـەوە، ئـەو شـوێنەش یـان بەهەشتە یاخود جەهەنەم ٠

ئەو شوێنەی كە لەواقیعدا بوونێكی فیزیكی هەیە دەتوانین دەستی لێبـدەین و، لەڕێگەی هەستی بینینەوە دەتوانین چاومان پێكـەوێت، جگـە لەمانـەش شـوێن دەكەوێتـــە ژێـــر دەرككردنـــی هەســـتەوەرەكانمانەوە، بێتایبەتمەنـــدی هەستەوەرەكانمان شوێن دەكرێت ببینرێـت بەهـەمان شـێوەش دەسـتی لێبـدرێت تەنانەت ناتوانرێت شوێن جودا لەم دوو ئەندامەی هەستكردنە دابڕێت [٧] ٠

كەواتە كاتێك مرۆڤ بتوانێت لەڕێگای هەستەكانیەوە ئاشنای شوێن بێ لێرەدا مرۆڤ پەیوەندی لەگەڵ شوێندا دروست دەكـات و دوای ئەمـەش وا لـەمرۆڤ دەكـات شوێنەكەی لەلا خۆشەویست بێت و بۆی بە پەرۆشەوە بێت، هـەر شـوێنە هەسـتی مرۆڤ دەجووڵێنێت.

گەورەیی شوێن لەوەدا بەدیار دەكـەوێت كـە ئایینـەكان كردوویانەتـە بنكـەو بناغەی ئایدۆلۆژییان و كاریان لەسەر كردووە، ئەوەتا لە ڕوانگەی ئایینەوە كاتێـك

خوای گەورە ئادەم و حەوا دروست دەكات راستەوخۆ رەوانەی شـوێنیان دەكـات كە بەهەشتە و لەوێوەش سزاكەیان شوێنێكی دیكە دەبێـت كـە زەوییـە. هـەروەها بوونی دوو شوێن دژ بەیەك ( بەهەشت ـ دۆزەخ) دوو دنیای دیاریكراو ( دنیای سەر زەوی ـ دنیـای ئـاخیرەت) بناغـەی دامەزرێنـەری ئایینـەكان و مرۆڤـەكان لەسـەر باوەڕیبوون و هەوڵدان و كاركردن لەم شوێنانە و بـۆ ئـەو شـوێنانەی كـە بـەڵێنیان پێدراوە پەروەردە دەكرێن و رادەهێنرێن، لە ئایینەكاندا شوێن بووە بە ترسێنەر و سـزادەر و هـەر شـوێنیش بـووە بـە مـژدەدەر و دڵخۆشـكەر و پاداشـت. بۆیـە لـە ئایینەكاندا شوێن تا رادەی پیرۆزی و پەرستن بەرزكراوەتەوە و مرۆڤـەكانی پێـوە بەستێنراوەتەوە.

دەكرێ بڵێین لەسـەرەتادا ڕەگـەزی شـوێن لـەنێو دەقـەكانی ئەدەبیـدا بـەو شـێوەیە ناسـراو نـەبووە و لێكۆڵینـەوەی وردی لەبارەیـەوە نـەكراوە، بـەڵام پێشكەوتنی كۆمەڵگاو پەیدابوونی لێكۆڵەری ئەدەبیی سەركەوتوو دەبیـنین شـوێن بەشـێوەیەكی فـراوان و بـەربڵاو باسـی لێـوەكرا، چـونكە شـوێن لایـەنێكی فكـری لەكۆمەڵگادا پێكهێنـا، لـەدوای ئەمـەش شـوێن زیـاتر پێگـەی خـۆی بـەرزكردەوە لەهـەموو زانسـتەكانی وەك فەلسـەفەو زانسـت و كۆمەڵایـەتی و هـەروەها لەدەروونناسی و بایلۆژیدا بـەدیار كـەوت، لەهـەر یـەكێك لـەم زانستانەشـدا پێگـەو بنەمای شوێنیان بوونی كـارای هەیـە. ئـەم فراوانییـەی شـوێن وای لەنووسـەران و توێژەران كرد بیرو بۆچوونی هەریەكـەیان بۆچـوونی جیاوازیـان هـەبێت لـە بـارەی چۆنیەتی لەدابەشـكردنی شـوێندا، شـوێنیان دابەشـكرد بەسـەر چـەند یەكەیەكـدا هەروەكو دەبینین ((گریكەكان شوێنیان كرد بەچەند بابەتێك بۆ ڕامان، هەرچەندە لەسـەلماندنی بوونـە بابەتییەكەیـدا، ڕای جیـاواز هـەبوو لـە نێوانیانـدا، یـاخود ڕەتكردنـەوەی ئـەو بوونـە، بـەپێی ئایدیاییـەكان و ماتریالییـەكان، جـا دەبیـنن تێڕوانینی شوێن لای ( هیرا قلیتس) تێكەڵ بە تێڕوانینی ماددە و چۆنیەتی گۆڕانی بوو (فیساگۆرسییەكانیش) شوێنیان بەشێوەیەكی ماتماتیكی لەڕێی درێژبوونەوەی ئەندازەی تەنەكانەوە لێكدەدایەوە[٨]٠ جگەلەمەش (پارمندیس)ی یۆنانی وای بۆ دەچوو كە (نـەبوون — العـدم) بۆخـۆی شـوێنی پەتییـە ٠ ئـەمیش بـوونی مەحاڵـە مـادام شـوێن گشـت لایەنـەكانی شـوێن پـڕ دەكاتـەوە، قوتابخانـەی (گەردیلـە—

ذرة)یش کەوا (یۆفیۆس) و ( دیمو قرەتیس) دایانمەزراند، بەپەچی نەبووندا، کە بەخۆی نەمانێکی ڕەهایە، بەرەو چەمکی و بۆشایی و دانی بەبوونیدانا، بەلاّم بەڕادەیەك، کە لە بوونی خۆی کەمتر نییە، هەرچی ئەفلاتوون بوو ئەوا بنیاتی جیهانی گەڕاندەوە بۆ سێ توخم وەك ((مادە، درێژبوونەوەی شتەکان دەگرێتەوە خۆی و بەها و دروستکەر، چەند ناوێکیشی لە مادە نا، هەروەها چەند ناو لێکچوواندنێکیشی بۆ مادده دانا وەکو : جێی شوێن، دایەن، ئەوەی شتەکان تێدا دەردەکەون، جەستە، منداڵدان، ئایندە، هیوڵا (المادة ألاولیة) )) [9].

دەکرێ بڵێین بەهۆی فراوانبوونی لایەنەکانی شوێن، قسەکردن لەبارەی شوێن کارێکی ئاسان نییە، هەر لەبەر ئەمەش چەمکی شوێن بەرەو وردی و قووڵی چوو. لەگەڵ ئەوەشدا کاتێ چەمکی شوێن دابەش دەکرێت بەسەر سێ بەشی زۆر سەرەکیدا ئەوانیش (فەلسەفەو، کۆمەلاّیەتی و هونەری) شوێن، بەهیچ جۆرێك نابێت لەم چەمکانە داببڕێن کەواتە (شوێن لەسەر ڕووی فەلسەفییەوە، ئەرستۆ لەم بارەیە پێیوایە شوێن ڕوویەکی ناوەکی هەیە بۆ ئەو تەنانەی کەوا لەخۆی گرتووە، ئەویش دوو جۆرە: تایبەت هەر تەنێك شوێنێکی هەیە داگیری کردووە، هاوبەش: کریتر تەنێکی لەخۆ گرتووە، بەلاّم ڕوانگەی کۆمەلاّیەتییەوە قەوارەیەکە کە پوختەی کارلێککردنی نێوان مرۆڤ و کۆمەڵگای لەخۆ گرتووە هەروەها لەڕووی هونەرییەوە خوێنەر لەکاتی خوێندنەوەی دەقی ڕۆماندا لەشوێنی خۆی دەگوێزرێتەوە بۆ ئەو جیهانە خەیاڵییەی کە بەوشە داڕێژراوە وەدەردەبرێت لەجیهانە واقیعەکەی کە تیایدا دەژی دەکەوێتە ناو ئەو جیهانەی کەوا بە وشە داڕێژراوە) [10].

لەلایەن خۆیەوە (ئەفلاتوون ) بەو شێوەیە باسی شوێنی کردووە و دەڵێت: ((شوێن گرتنەخۆو تێدابوونە، بوونێکی ڕاستەقینەی هەیە لە سێ دووری پێك دێت)) [11]. مەبەستی (ئەفلاتوون) ئەوەیە شوێن، هەموو شتەکان لەخۆ دەگرێت و ڕاستەقینە و شتێکی تێدا نییە بەواتای خەیاڵ بێت، هەروەها شوێن هەموو شتەکان لەخۆ دەگرێت و هەروەها مەبەستی ئەفلاتوون لەو سێ دوورییە ئەوەیە، شوێن پێکدێت لە درێژی و پانی و بەرزی.

لەگەڵ ئەوەشدا شوێن وەکو بەشێك لە پێکهاتەی ئەدەبی بەو شێوەیە نەخرایە بەر نەشتەر و باسی لێوە نەکراوە بۆیە لە رەخنەی نوێدا چەمکی شوێن بەشێوەیەکی فراوان و وردتر خرایە بەر دید و لەپێشەوەی هەموومانیش فەیلەسووفی فەرەنسی (گاستۆن باشلار) لە کتێبەکەیدا ( ئێستاتیکای شوێن) بەوردی لەبارەی رەهەند و چەمکی شوێنەوە دەدوێت و بەلای ئەوەوە ( ماڵ) وەکو شوێنی یەکەم وایە، ئەوەش بەو مانایە نایەت کە هیچ شوێنێك لە دنیادا نییە، تەنیا ماڵ نەبێت، بەڵکو بەو مانایە دێت کە بە پشتبەستن بە بەهای ئاسایش و سەقامگیری، هەر شوێنێك کە لێی نیشتەجێ بیت و ببێتە هۆکاری ئەوەی کە یادەوەری و خەنەوکانت لەخۆ بگرێت، بە ماڵی خۆت هەژمار دەکرێت. لێرەوە باشلار روئیای خۆی لەسەر شوێن بنیاد دەنێت و پێیوایە کە ماڵی کۆن ماڵی رۆژگاری منداڵی، ماڵێکی هۆگر و خۆشەویستە، چونکە تێیدا خەیاڵ چالاك دەبێت، هەر کاتێکیش لێی دوور کەوتینەوە، هەوڵ دەدەین لە رێگای یادەوەرەییەوە کەلوپەل و شمەکەکانی ئەو ماڵە بهێنینەوە پێش چاوی خۆمان کە باشلار بە (ماڵی کەلوپەل و شمەکەکان) ناوزەدی دەکات، چونکە هەستی ئاسایش و سەقامگیریمان پێدەبەخشێت، ئەو ماڵەش دیارە ماڵە کۆنەکەمان کە بوونمان بەشێوەیەك چڕ دەکاتەوە کە هەستی سەقامگیری و هۆگریمان پێدەبەخشێت. ئەو هەستەش دڵنیاییمان لەبەرامبەر جیهان بەهێزتر دەکات [١٢]، باشلار لەم بارەیەوە نموونە چۆڵەکە دێنێتەوە کە ئەگەر غەریزەی دڵنیایی و بڕوای بە جیهان نەبێت، چۆن هێلانە کە ماڵی ئەوە، دروست دەکات. بەلای باشلارەوە شوێنێك کە خەیاڵی بۆخی رابکێشێت، تەنیا وەکو شوێنێکی ئەندازەیی نامێنێتەوە، چونکە لەو شوێندا مرۆڤ ژیاوە، مرۆڤیش تەنیا بەشێوەیەکی بابەتی نەژیاوە، بەڵکو بە هەموو شیانەکانی خەیاڵەوە ژیاوە، بۆیە هەر کاتێك مرۆڤ شوێنێکی شیاو بدۆزێتەوە و تێیدا بحەوێتەوە یەکسەر خەیاڵی چالاك دەبێت و دیواری بەو شوێنەدا دروست دەکات و تێیدا لە وەهمی پارێزگاربوونی خۆی نقوم دەبێت [١٣].

باشلار ئەم بۆچوونەی لەسەر دووانەی ( ناوەوە / دەرەوە) داڕشتووە، بەلای ئەوەوە ناوەوە واتە ماڵ و دەرەوەش، دەرەوەی ماڵەوە. لەم چوارچێوەیەشدا باشلار پێی وایە کە ماڵ لەگوند زیاتر لە ماڵی ناو شارەکان هۆگرتر و شیعریترە،

بەو پێیەی کە ماڵ لەگوند زیاتر ڕووبەڕووی بارودۆخی توندی کەشوهەوای وەکو ڕەشەبا و با و بۆران دەبێتەوە، بەحوکمی ئەوەی کە لەگوند ژمارەی ماڵەکان کەمن و بەشێوەیەکی ئەندازەیی واش دروست نەکراون کە باوبۆران نەیانگرێتەوە، بۆیە ماڵی گوند زیاتر لە ماڵی ناو شارەکان خۆڕاگرترە، چونکە ماڵی ناو شارەکان ژمارەیان زۆرترە و ڕەنگە لەپاڵ یەکدی بن و کەمتر کاریگەری بارودۆخی کەشوهەوایان لەسەر بێت، لەبەر ئەوەشە کە ماڵی گوند زیاتر هەستی ئەمان و ئاسایش و سەقامگیری بە مرۆڤ دەدات و بەتەواوەتی دژی دەرەوە دەوەستێت کە ئەو دەرەوەیە بەلای باشلارەوە وێنای گەرمنەبوونەوە و ناسەقامگیری دەدات[١٤]. بێگومان باشلار لەڕوانگەیەکی دەروونییەوە باس لە شوێن دەکات و بەپێی هەست و نەستەکانی مرۆڤەوە لەشوێنی کۆڵیوەتەوەو لەسەر دووانەی (ناوەوە / دەرەوە) دا کە بەپێی گونجاوی شیانی مرۆڤەوە، ئەم دووانەیە دیاری دەکرێن و مەرج نییە هەمیشە ناوەوە سەقامگیر و هۆگر بێت و بەپێچەوانەشەوە مەرج نییە هەمیشە دەرەوە ناهۆگر و ناسەقامگیر بێت، ئەوە خودی مرۆڤە کار دەکاتە سەر شوێن بەهەموو ڕەهەندەکانییەوە و مرۆڤیش واتا بوون، کە مرۆڤی بەرەو شوێن ڕادەکێشێت بۆ ئەوەی بوونی لەچوارچێوەی سەقامگیری و هۆگری چڕتر بکاتەوە [١٥] بوونێك کە لەدەرەوەی هیچ شوێنێکدا نییە، واتە بوونێکی فراوانە و لەدرەرەوەی هەموو پێوانە و سەردەمەکانە، بۆیە کاتێکیش کە مرۆڤ زاراوەی (جیهان) بەکاردەهێنێت، ئەوا دەربڕینێکی شوێن بەکاردەهێنێت و بۆیە لەم چوارچێوەیەدا کۆمەڵەی خۆر و زەوی و کیشوەرەکان و نیشتمان و ماڵ هەمووی شوێنن لەناو بووندا[١٦]، ئەو بوونەش لەبازنەی هەست و نەستەکانی مرۆڤدا جێگیر بووە، ئەمەش دەمانگەیەنێتە سەر بیروڕاکانی ( ابراهام أ. مۆل و ئیلزابیت ڕۆمەر) کە چەمکی بوون بە خودی مرۆڤ دەبەستنەوە و مرۆڤ دەکەنە بنچینەی شوێن و پێیان وایە کە (( مرۆڤ سەنتەری جیهانە و شوێنیش لە هەموو لایەکەوە دەورەی داوە )) [١٧] بەو واتایەی کە مرۆڤ خودی خۆی دەسەڵاتی بەسەر شوێندا هەیە و بەپێی پێداویستییەکان و حەزو ئارەزووەکانی شوێن هەڵدەبژێرێت و گەلێ جاری واش هەیە هەر مرۆڤ خۆی شوێن بۆ مرۆڤی دیکە دیاری دەکات، وەکو زیندانیکردنی مرۆڤ و یاخود پێداویستی نەخۆشی کە وا

دەکات مرۆڤ لە شوێنێکی وەکو نەخۆشخانە بمێنێتەوە تا چارەسەر وەردەگرێت. بە واتای ئەوەی مرۆڤەکان خۆیان سەنتەری شوێنەکانن و مرۆڤ شوناس و ناسنامە بەشوێنەکان دەبەخشێت.

هەر لەم چوارچێوەیەشدا (سیزا قاسم) نووسەری عەرەب لەپێناسەی شوێندا دەڵێ: ((شوێن ئەو چوارچێوەیە کە ڕووداوەکانی تێدا ڕوو دەدەن))[18] ٠ بەو واتایەی کە شوێن دەبێتە سنوورجیاکەرەوەی ڕووداوەکان و بەهۆیەوە ڕووداوەکان ئەرك و مافیان دیاری دەبێت.

(کامل خطیب) بەشێوەیەکی دیکە دەڕوانێتە شوێن و وای دەبینێ کە ((شوێن ئیمکاناتێکی کراوەیە بۆدروستکردن و پێکهێنان))[19] واتا لێرادا شوێن کراوەیە تاکەکان دەتوانن بەئارەزووی خۆیان تێیدا بجوولێن و شوێن فراوان بکەن، ئەمەش بەهەوڵ و کۆششی تاکەکان دەکرێت. (یاسین النصیر) سەبارەت بە شوێن دەڵێ: ((ئەو زەمینەیە کەئەم بنیاتەی لەسەر بەرز دەکرێتەوە)[20] لێرەدا هەموو ئەو ڕووداوانەی کەوا ڕوودەدەن : لەسەر شوێندا ڕوو دەدات، بەو واتایەی کەوا ڕووداو لەهەوادا ڕوو نادات ٠

**<u>لە ڕووی جۆرەوە:</u>** بەپێی چۆنیەتی بەکارهێنانی لەدەقی ئەدەبیدا، شوێن چەندین جۆری بەخۆیەوە دیتووە و لەلایەن لێکۆڵەر و ڕەخنەگرانەوە بەسەر ڕەهەندی چەندین ڕۆڵ و پێگەی شوێن شوناسکراوەو لێیکۆڵراوەتەوە. ئەم جۆرو دابەشکردنەی شوێن خۆی لەخۆیدا پێگە و ڕۆڵی پڕ بایەخی شوێن دیاریدەکات.

بۆ نموونە (ابراهام.أ.مۆل و ئیلزابیت ڕۆمەر) کە مرۆڤ بە سەنتەری شوێن دەدانێن و لەسەر ئەو بنچینەیەش شوێن دابەشی ئەم جۆرانە دەکەن:

١ـ لای من: ئەو شوێنەیە کە هۆگرە و مرۆڤ هەموو دەسەڵاتێکی تێدا هەیە.

٢ـ لای ئەوانی دیکە: لە شوێنی یەکەم دەچێت و شتێك لە گەرمی و خۆشەویستی بە مرۆڤ دەبەخشێت و بەوە لە جۆری یەکەم جودا دەبێتەوە کە مرۆڤ هەست دەکات کەوتۆتە ژێر دەسەڵاتی ئەوی دیکەوە.

٣ـ شوێنە گشتییەکان: ئەو شوێنانەن کە دەکەونە ژێر دەسەڵاتی گشتی، تێیدا هەست بە ئازادی دەکەین، بەڵام ئازادییەکی سنووردار.

٤ـ شوێنی بێ کۆتایی: دەتوانین بە بیابان نموونەی بۆ بهێنینەوە، کە موڵکی کەس نییە و دەسەڵاتی دەوڵەتیش لێی دوورە [٢١].

لەلایەن خۆیەوە ( غالب هلسا) شوێن بەسەر سێ جۆردا دابەش دەکات کە ئەمانەن:

١ـ شوێنی خواستراو: ئەو شوێنەیە کە خاوەنی بوونێکی ڕاستەقینە نییە و زیاتر شوێنێکی گریمانکراوە و تەنیا فەزایەکە کە ڕووداوەکانی تێیدا ڕوودەدەن، وەکو سەکۆی شانۆ کە ئەکتەرەکان لەسەری جووڵە دەکەن.

٢ـ شوێنی ئەندازەیی: ئەو شوێنەیە کە لەڕۆماندا بەدی دەکرێت و لەڕێگای وەسفەوە، نووسەر ئەو شوێنە دەخاتەڕوو کە حیکایەتەکەی تێدا ڕوودەدەن، بەبێ ئەوەی کە ڕۆڵی لە ڕەگەزەکانی دیکەی کاری ڕۆماندا هەبێت.

٣ـ شوێنی ژیان ـ شوێنی هۆگر: ئەو شوێنەیە کە یادەوەری خوێنەر دەوروژێنێ، ئەو شوێنەشە کە نووسەر تێیدا ژیاوە و دواتر لەبەر ئەوەی لێی دوور کەوتۆتەوە بەخەیاڵ تێدا دەژی [٢٢].

هەر لەم چوارچێوەیەدا (فتحیە کحلوش) لە کتێبەکەی خۆیدا بەناونیشانی (بلاغة المكان، قراءة في مكانية النص الشعري) دا شوێن بەسەر دوو جۆری سەرەکی دابەش دەکات کە ئەمانەن:

١ـ شوێنی چاپکراو یان شوێنی دەق: مەبەست لەو شوێنەیە کە دەق لەسەر لاپەڕە لەخۆی دەگرێت، چونکە لێرەدا نووسین تەنیا ڕیزکردنی چەند ڕستەیەکی ئاسۆیی و ستوونی نییە، بەڵکو پێش هەموو شتێك ڕەش و سپیکردنی چەند دەستنووسێکە لە گشت حاڵەتەکاندا کاغەزێکی سپییە، لەم شوێنەدا هەموو ئەو شتانەی کە پەیوەندیدارن بە دەق لەخۆ دەگرێت، هەر لە کاغەزی سپییەوە و بە جۆری کاغەزەکە و سەرجەم ئەو تەکنیکی چاپەمەنییانەی کە شاعیر دەیگرێتە بەر لە ڕێکخستنی لاپەڕەکەی لە بۆشایی و پەراوێز و ڕەنگ و تا دەگاتە بەرگ و ئەو وێنە و ڕەنگانەی کە لەخۆی گرتووە.

٢ـ شوێنی جوگرافی: کە ئەو شوێنەیە کە ڕووداوەکانی تێدا ڕوودەدەن، یان ئەو شوێنەیە کە شاعیر سەرنجی شاعیر ڕادەکێشێت و دەبێتە بابەتێکی خەیاڵ

بۆكراو. ئەم شوێنەش لە دوو لقی سەرەكی پێكدێت ئەوانیش : شوێنی هۆگر و شوێنی نامۆ [٢٣].

هەروەها (صلاح صالح) شوێن بەسەر چەند جۆرێك دابەش دەكات : شوێنی فیزیاوی، شوێنی بیركاری - ئەندازەیی، شوێنی جوگرافی، شوێنی كاتی - مێژوویی، شوێنی خودی - دەروونی، شوێنی واقیعی - بابەتی، شوێنی فەلسەفی - هزری، شوێنی تەكنیكی - ستاتیكی [٢٤].

هەر لەم روانگەیەوە ( ابراهیم خلیل) شوێن بەسەر ئەم جۆرانەدا دابەش دەكات: شوێنی ئەندازەیی، شوێنی گریمانكراو، شوێنی ئایدۆلۆژی، شوێنی ناسنامە، شوێنی ئەفسانەیی، شوێنی دەروونی، شوێنی كراوە و داخراو [٢٥].

لێرەدا بە پشتبەستن بەم را و بۆچوونانە دەتوانین بەشێوەیەكی گشتی شوێن بەسەر ئەم جۆرە سەرەكییانە دابەش بكەین:

١ـ شوێنی واقیعی: ئەو شوێنەیە كە بوونێكی ڕاستەقینەی هەیەو لەناو زەویدا هەیە و دوور لەو شوێنەی كە زیاتر لەدەرەوەی زەویدایە، هەروەها شوێنی ڕاستەقینە مرۆڤ دەیبینێت وە دەیكاتە شوێنی نیشتەجێبوونی. ئەم جۆرە شوێنە دەبێتە هۆی ئەوەی خوێنەر ڕاستەوخۆ شوێنەكە بهێنێتە بەرچاوی هیچ دیمەنێكی خەیاڵی لەلا دروست نابێت، هەربۆیە شوێنی ڕاستەقینە ((ئەو شوێنە ئەندازەیییە دەگرێتەوە كە بەهۆی بینینەوە وەسفێكی وردی دوورییەكانی دەرەوەی دەكرێت، واتا كاتێك دەبێتە كۆمەڵێك ڕەنگ و ڕوو كە چاو یەكەیەكە هەڵیاندەقۆزێتەوە وەهەوڵ نادات دیمەنێكی هەمەلای لێ دروست بكات )) [٢٦]. هەروەها شوێنی واقیعی لەكاتی گواستنەوەی بۆ نێو دەقێكی ئەدەبی گۆڕانی بەسەر دادێت، چونكە شاعیر لەڕێی ئەندێشەو خەیاڵ و وەسفەكەیەوە گۆڕانكارییەكی لەبەر چاو دروست دەكات و تام و چێژێكی زیاتر دەدات بەخوێنەر وەبیری فراوانتر دەكات بۆ لێكدانەوەو ڕوونكردنەوەی شوێنەكە واباشە شوێنەكە وەك خۆی وەرنەگرێ وەكو ئەوەی لە واقیعدا هەیە، بەكارهێنانی بەو شێوە سادەییە كەمتر جوانی بەدەقەكە دەبەخشێت و، هەروەها بیری خوێنەریش سنووردار دەكات، لەبەر ئەوەی ((..... بەكار هێنانی ڕاستەوخۆی شوێنی ڕاستەقینە وا لەنووسەر دەكات زۆر جار خۆی دەزانێت ببەستێتەوەو نەتوانێت لەڕاستییەكان لابدات و لەخۆیەوە شت زیاد

بکات، یان شتێك کەم بکاتەوە )) [٢٧] کەواتە ئەم هۆکارە وای لە شاعیران و ڕۆماننووسان کرد ئەوەندە خۆیان بە شوێنی ڕاستەقینە نەبەستنەوە، بەڵکو زیاتر ئەو شوێنانە بخەنە ڕوو کەوا بیری خوێنەر بەرەو خەیاڵێکی دوور دەبات ئەویش شوێنی خەیاڵییە ٠

٢- شوێنی خەیاڵی: ئەو شوێنە دەگرێتەوە کە مرۆڤ هەست بە بوونی ناکات و، هەروەها شوێنێکی نابەرجەستەو لەواقیعییەتی شوێندا بوونی نییە، کەواتە شوێنی خەیاڵی مرۆڤ ناتوانێ بیکاتە شوێنی نیشتەجێبوونی و لەسەری بێت و بچێت.

شوێنی خەیاڵی لەناو دەقی ئەدەبیدا لە ڕێگای ئەندێشەی نووسەرەوە ئەم جۆرە شوێنە بنیات دەنرێت، شوێنی خەیاڵی ئەو شوێنانەن کە پەیوەندییان بەخەیاڵی نووسەرەوە هەیە کە دەکرێ لەسەر بناغەی واقع بنیات بنرێت یان لەسەر بناغەی خەون و خەیاڵ دروست بکرێ ٠ کەواتە شوێنی خەیاڵی بەبەراورد لەچاو جۆرەکانی دیکەی شوێن جیایە چونکە ((شوێنی خەیاڵی کە مێشك دروستی دەکات و بەشێوەیەکی سەرەکی سەرچاوەی بناغەکەی خەیاڵ و ئەندێشەی ڕۆماننووسە، واتە لەو جۆرە شوێنەدا کە مێشك ئاماژەی بۆ دەکات و دەری دەخات، بەڵام لەناویدا ناژین، دەزانین لە کات و شوێنێکدا هەبووە، بەڵام کات و شوێنی ئێمە نییە )) [٢٨].

شوێنی خەیاڵی بەیەك شێوە نامێنێتەوە واتا گۆڕانی بەسەردا دێت بۆ چەند جۆر لەبەر ئەوەی (شوێنی خەیاڵی لەنێو ڕۆماندا گۆڕانی بەسەردادێت و بەپێی گۆڕانی باری دەروونی کەسەکان یا جیاوازی بارودۆخی کۆمەڵایەتی و ئابووری و سیاسیی ئەو کەسانە، چونکە پەیوەندییەکی قووڵ و پتەو شوێن و کەسێتییەکان بەیەك دەبەستێتەوە...... هەروەها شوێنی خەیاڵی هەموو پەیوەندییە ڕاستەقینەکان دەپچڕێت ئەو تاکە پەیوەندییەی کە لەگەڵیدا دەمێنێتەوە و دەتوانرێت بەکاربهێنرێت ئەوەیە کە وەك ئەندێشەیەك بهێنرێتە بەرچاو )) [٢٩].

٣- شوێنی هۆگر: شوێنی هۆگر ئەو شوێنە دەگرێتەوە کەوا مرۆڤ بەشێکی زۆری ژیانی تێدا بەسەر بردبێت و تیایدا گەورە بووبێت شوێنەکە کاری تێ کردبێ، جگە لەمەش شوێنی هۆگر ئەو شوێنەیە، کە تیایدا ژیاوین و هەستمان بە پاراستن

و گەرمی کردووە. شوێنی هۆگر ((بەتوندی کار لە دەروون و هەڵسوکەوتی مرۆڤ و کاردانەوە و چالاکییە سایکۆلۆجی و تەنانەت بایەلۆجی و بیرو بۆچوون و ژیانی ڕوحی و هەڵوێستی ڕۆژانەو خەون و خەیاڵیشی دەکات)) [٣٠].

مرۆڤ لەهەر شوێنێکی ئەم دونیایەدا بژی خۆشەویستی بۆ ئەو شوێنە دەبێت. دەکرێ بڵێین ئەو شوێنەی مرۆڤ زۆر هۆگریەتی و قەت ناتوانێت بۆی نەگەڕێتەوە، ئەویش ماڵەکەی خۆیەتی، بۆیە لەهەر شوێنێکی ئەم دونیایەدابێ قەت ماڵەکەی بیر ناچێتەوە ٠ ئەمەش بۆ ئەو یادگاری و ناخۆشییانە دەگەڕێتەوە کە وا لە مرۆڤ دەکات خەون و هیوایەتەکانی بێنێتەدی، شوێنی هۆگر لە هەر دەقێکی ئەدەبیدا بێت بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ بیری خوێنەر بۆلای خۆی ڕادەکێشێت وای لێدەکات لەکاتی خوێندنەوە بیرو هۆشی بۆ ئەو شوێنە بڕوات ٠

سەرەڕای ئەوەش ئەگەربێت و کەسێك لەماڵ و گەڕەکەکەی خۆیدا دوور بخەیتەوە بۆ جێگەیەکی تر ئەگەر هات و ئەو شوێنە نەبووە هۆی هێنانەوەی حەزو یادگارییەکانی ئەوا ئەو کاتەش ئەو شوێنە دەبێتە شوێنێکی ناهۆگر، کەواتە شوێنی هۆگر ((ئەو شوێنە دەگرێتەوە کە تیایدا لە ژیاندا هەستمان بە پاراستن و گەرمی کردووە بەشێوەیەك کە ئەم شوێنە بووە هێنانەدی یادەوەرییەکانمان)) [٣١]، هەروەها مرۆڤ ئەگەر بێت و بۆ ماوەیەکی زۆریش ژیان لەشوێنێکدا بەسەر ببات وە تەواوی ئەو شوێنە شارەزا بێ، بەلاّم ئەگەر بێت و ئەو شوێنە بووە هۆی بێزار بوونی و دڵتەنگی ئەوکاتە ئەو شوێنە دەبێتە شوێنی ناهۆگر سەرباری ئەوەش شوێنی هۆگر لەنێو ڕۆماندا بایەخ و گرنگییەکی وای هەیە و، ئەو شوێنە هۆگرییە هەمیشە وا لە کەسێتی دەکات هەست بە ئارامی بکات تیایدا، بەو هۆیەشەوە هەستی خوێنەر دەجووڵێنێ، چونکە کارەکتەرەکانی نێو ڕۆمانەکە هەر کەسانی ناو کۆمەڵگایە، هەروەها شوێنی هۆگر کاریگەرییەکی زۆر بەهێزی دەبێت لەسەر هۆش و بیر و ڕەوشی کەسێتی.

٤- شوێنی ناهۆگر: شوێنی ناهۆگر ئەو جۆرە شوێنەیە، کە مرۆڤ ناتوانێ ئارامی و خۆشگوزەرانی تیایدا بێنێتە دی ٠ ئەمەش بەهۆی نەبوونی هەستی خۆشەویستی و دڵخۆشی لەو شوێنەدا هەروەها لەو کاتەدا هەست دەکات ناتوانێ ئەوەی کە دەیهەوێت بەدەستی بهێنێت و خۆی لە چوارچێوەیەکی تەسکدا دەبینێتەوە.

جگە لەمەش شوێنی ناهۆگر چەندان دیمەنی جوان و سەرنجڕاکێشی لێبێت مرۆڤ ناتوانێت پێیان کاریگەر بێت و هەموو ئەو دیمەنانە ناتوانن کار لەمرۆڤ بکەن، هەروەها لەو جۆرە شوێنەدا مرۆڤ (( هەست بەهۆگری و خۆشەویستی و ئارامی ناکات، بەڵکو هەستێکی وای بۆ دروست دەبێت جۆرە کێشەیەك لەنێوان شوێن و کارەکتەردا دروست دەکات)) [٣٢].

مرۆڤ هەر چۆنێك بێت دەتوانێت لەهەر شوێنێکدا بێت بژی، بەڵام ئەگەر بێت و بەناچاری لەشوێنێك دابێت ئەوا ئەو شوێنەی لێدەبێتە شوێنی ناهۆگر، چونکە بەویست و ئارەزووی خۆی نەچۆتە ناوی ٠ هەروەها مرۆڤ هەموو شوێنەکان بەیەکسانی بەرانبەر یەك دانانێ، شوێنی ناهۆگر تەنها زیندان و بیابان و نەخۆشخانەو... هتد، بەڵکو مرۆڤ لەهەر شوێنێك ئەگەر هات و باری دەروونی تەواو نەبوو ئەوکاتە شوێنەکەی لێدەبێتە شوێنی ناهۆگر، چونکە هەست دەکات لەو شوێنەدا دیل و دەست و پێ بەستراوە و هیچ ترووسکاییەکی ژیانی تێدا بەدی ناکات، شوێنی ناهۆگر گۆڕانێکی گەورە دروست دەکات لەهەردوو توخمی ڕووداو کارەکتەر ٠ ڕووداوەکان بەرەو خاڵێکی بەرز هەڵدەکێشێت و هەروەها زۆر بەتوندی وا لەکارەکتەرەکان دەکات هەڵوێستی خۆیان بەرانبەر بەو شوێنە دەربڕن.

٥- شوێنی کراوە: ئەو شوێنە دەگرێتەوە کەوا هەموو کەسێك دەتوانێ لەسەری بێت و بچێت، پێداویستییەکانی تێدا جێبەجێ بکات شوێنە کراوەکانیش ئەو شوێنانە دەگرێتەوە وەکو شار، بازاڕ، مەلەوانگە، پارك، دام و دەزگا حکومییەکان... هتد. هەروەها ئەو جۆرە شوێنانە هیچ بەربەستێك لەبەردەم کەسەکاندا دروست ناکات و ئازادییەکی تەواو بەکەسایەتی دەدات ٠

زۆر جار شوێنی کراوە دەبێتە شوێنی ئاشنا بۆ کەسێتییەکە لەبەر ئەوەی ((مرۆڤ لەبەرانبەر شوێنی کراوەدا هەست بەدڵنیایی و هێمنی و ئارامبوونەوە و حەسانەوە دەکات و ئاشنایەتی لەگەڵ پەیدا دەکات ٠ بەمەش ئەو شوێنە دەبێتە شوێنێکی ئاشنا لەدەروونی کەسەکاندا و، هەندێ جاریش هەست بەنامۆیی و نیگەرانی و دڵتەنگی و دوورەپەرێزی بەرانبەر بەهەندێ لەو شوێنانە دەکات ئەمەش دەبێتە هۆی بێزاری و ڕق و کینەیان بەرانبەر پەیدا دەکات، لە ئەنجامدا ئەو شوێنە سروشتی شوێنێکی نائاشنا وەردەگرێت )) [٣٣] ٠

٦- شـوێنی داخـراو: ئـەو شـوێنە دەگرێتـەوە کـەوا لەبـەردەم مرۆڤەکانـدا داخراوە بەشێك لەسەر ڕووی زەمین داگیر دەکات، شـوێنە داخراوەکـانیش وەکـو ((ماڵ، ژوور، ئۆفیس، ڕەشماڵ))[٣٤]. دەکرێت شوێن بکەین بەدوو بەشەوە (بەشی کراوە، بەشی داخراو) ئەم دوو بەشەی شوێنیش لەلایەن مرۆڤ خـۆی بـووە، لەبـەر ئەوەی مرۆڤ پێویستی بەهەردوو شـوێنەکە دەبێت، چـونکە ناتوانێـت بەتـەنها لـە شوێنێکی داخراوی وەکو (ژوور) تاکۆتایی تەمەنی هەر لەوێدا بمێنێتەوە، هەروەها لەشوێنێکی کراوەی وەکو شەقام بەردەوام تێیدا بمێنێتەوە، کەواتە ئەگـەر شـوێن دابـەش بکـەین بەسـەر داخراوکراوەکـەدا بەهـەمان شـێوە مـرۆڤیش لـەدوو بـەش پێکهـاتووە دیـوی نـاوەوەی بریتـی دەبێـت لـەداخراو کـە پێکهـاتنی بـایلۆجی دەگرێتەوە، هـەروەها دیـوی دەرەوەشـی پێکـدێت لـە بەشـە کراوەکـە٠ دەتـوانین بڵێین شوێنی داخراو بـەپێی بـاری دەروونـی توانـای مانـەوەی کەسـەکان جیـاواز، چونکە لەوانەیە بۆهەندێك کەس پەناگەیەك بێت بۆ بیرکردنەوەو تێڕامان لـەژیان و حەزو ئارەزوو و نهێنییەکانی هـەروەها هەنـدێ کـەس بـەهۆی شـوێنی داخـراوەوە بیریان زۆر فراوان دەبێت و گۆشە نیگاکانیشیان جیاوازتر دەبێت، بەڵام بۆ هەنـدێ کەس دەبێتە شوێنێکی ناهۆگر ناتوانین بەهیچ شێوەیەك تێیـدا بمێنینـەوە مەگـەر بۆ کاتێکی زۆر کەم بتوانین بمێنینەوە ٠

ئەم جۆرانەی شوێنیش پەیوەندییان بەدەقی شیعرییەوە هەیە، دیارە دەقـی شیعریش ڕووبەرێکی سـنوورداری هەیـە و شـیانی درێژبوونـەوە و کورتبوونـەوە و بەرتەسکبوونەوە و فراونبوونەوەی هەیە، بۆیە ئەگەر ڕەهەند و سـنوورەکانی ئـەو جۆرانـەی شـوێن لەگـەڵ ڕووبـەری دەقێکـی ئـەدەبی بـەراورد بکـەین، بێگومـان سنوورێکی دیاریکراوی دەقمان لەبەرامبەر خەسڵەت و سیماکانی ئەو شـوێنانە بـۆ بەدیار دەکەوێت. لـەم چوارچـێوەیەدا بـۆ بەرجەسـتەکردنی شـوێن و چەسـپاندنی پێگەو جێگەیان لە دەقێکی شیعریدا، شاعیران هەریەکەو بەپێی دەسەڵات و توانـا و شیانی خۆیان لە دەقەکەدا، چەندین ڕێچکەو ڕێگای جۆربەجۆریان گرتۆتەبەر بۆ ئەوەی پێگە و جێگەی شوێن لە دەقدا بچەسپێنن، لێرەدا دەتوانین ئـەو ڕێچـکە و ڕێگـا جۆربەجۆرانـەی کـە شـاعیران لـە بایەخـدانیان بـە جۆرەکـانی شـوێن لەدەقەکانیان گرتوویانەتەبەر، لە سێ ڕێچکەی سەرەکیدا کورت بکەینەوە:

**١ـ شوێن وەکو تەواوکاری وێنەی شیعری:**

دەقی ئەدەبی بۆ ئەوەی دەقێکی زیندوو و چالاك بێت، پەنا بۆ هەموو ڕێوشوێن و هۆکارێك دەبات، یەکێك لەوانە شوێنە، شوێن بەحوکمی ئەوەی کە دەسەڵاتێکی فراوانی لە ژیانی مرۆڤدا هەیە و لە ساتی نووسینیشدا لە خەیاڵ و هزری شاعیردا ئامادەگی هەیە، بۆیە ڕەهەند و جۆرەکانی شوێن لە دەقی شیعریدا بەتایبەتیش لە پێکهێنانی وێنەی شیعریدا بەشداری دەکەن، ئەم بەشداریکردنەیان بەپێی جێگەو پێگەی خۆیان دەبێت، بەو واتایەی کە خەسڵەت و سیما و سیفاتەکانیان لە کاتی بەشداربوون لەدەقی شیعریدا ون ناکەن و هەروەها هیچ خەسڵەت و سیما و سیفاتێکی تایبەتی خۆشیان بۆ ناو دەق ناگوازنەوە و بەناونیشانی ئاسایی خۆیان کە پێی ناسراون بەشداری لە دروستکردنی وێنە شیعرییەکەدا دەکەن و دەبنە هۆکارێك بە بەخشینی مانا بە وێنە شیعرییەکە و بەشداری لە لایەنی ڕەوانبێژیی وشە و ڕستەکانی نێو وێنە شیعرییەکەدا دەکەن. لەهەمان کاتیشدا لە کاتی کردەی بەشداریکردنیان، هیچ زانیارییەکی سەیر و نامۆ لەلایەن شاعیرانەوە بەو شوێنانە ناسپێردرێن و زانیارییەکانیش هەر ئەو زانیارییە ئاساییانەن کە شوێنەکان خۆیان هەڵگری شوناسیانن، هەروەها هیچ پەیام و ئەرك و ڕوانین و دەربڕینی بیر و بۆچوونێکی تایبەت بە شاعیر لەکاتی کردەی بەشداریکردن بەو شوێنانە نادرێت.

**٢ـ شوێن وەکو پەیام و مەبەست:**

شوێن وەکو فەزایەك و پانتاییەك لەناو دەقی شیعریدا بەشدار دەبێت و لەگەڵ ناخ و دەروون و هەست و نەستەکانی شاعیردا ئاوێتە دەبێت و کاریگەری لەسەر شاعیردا دادەنێت، شاعیریش بەشێك لە پەیام و مەبەست و ڕوانین و بیر و بۆچوونەکانی لەمەڕ مەسەلەیەك یاخود ڕووداوێك بەو شوێنانەی کە لەکاتی کردەی بەشداریکردنیان لەدەقدا دەبەخشێت، ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت کە شوێنەکان لەکاتی کردەی بەشداربوونیان بەشێك لەو خەسڵەت و سیما و سیفاتە سروشتییانەی خۆیان ون دەکەن و لەدەست دەدەن و بەپێی هەست و نەستی شاعیر و بۆچوون و ڕوانگەکانی ئەرکی نوێی لە ئەستۆ دەگرن. بەو واتایەی کە شوێن جیا لەوەی کە خۆی بەهەڵگری شوناسی خۆیەوە لەوێنەی شیعری ناو

دەق بەشدارە، لەهەمان کاتیشدا پەیام و مەبەست و ڕوئیای شاعیری لە ئەستۆ گرتووە و ئەرکی ئەو شوێنانە گواستنەوەی ئەو دوو لایەنەی شوێنن بۆ وەرگر. لەو کردەوەو پرۆسەی گواستنەوەی پەیام و مەبەستی شاعیرەوە بۆ خوێنەر و وەرگر، شوێن بەشێك لە خەسڵەتەکانی خۆی ون دەکات.

**٣ـ شوێن وەکو بنچینە و بناغەی پێکهێنانی دەق:**

شوێن لێرەدا دەسەڵاتێکی ڕەهای بەسەر دەقەوە هەیە و بووە بە بناغە و بنچینەی پێکهێنەری دەقەکە و بەبێ شوێن دەق ناتوانێ کردەی خۆ خوڵقاندن و هاتنە ناو ژیانەوە ئەنجام بدات. بە واتای شوێن دەبێتە چەق و تەوەری گشت ڕووداوەکانی ناو دەق و دەسەڵات و فەرمانڕوایەتیی شاهانەی لەناو دەقدا هەیە. لێرەدا جۆرەکانی شوێن پەیام و مەبەستە ستراتیژییەکانی دەقیان لە ئەستۆ گرتووە و شوێن بووە بە هەوێنی لەدایکبوونی گشت هێڵ و ڕەنگ و بۆیەکانی دەقەکە. دەکرێت ئەم جۆرەیان کە شوێن بناغەی پێکهێنانیەتی دەتوانین بە (دەقی شوێن) ناویان ببەین، کە دەقی شوێنیش ئەو دەقەیە کە شوێن تێیدا فەرمانڕەوایە و خۆی سوڵتانی دەقە و بنچینە و بناغە و پانتایی دەق پێکدەهێنێت.

## بەشی دووەم

## ڕەنگدانەوە و پێگەی شوێن لە ئەدەبی کوردیدا

شوێن وەکو تەکنیکێك لە ئەدەبی کوردیدا بەحوکمی درەنگ سەرهەڵدان و لەسەرخۆیی ڕەخنەی ئەدەبی کوردی ئەو پێگە و جێگە تایبەتییەی خۆی لەبواری لێکۆڵینەوە و شیکردنەوە و ڕاڤەکردندا نەبینیوە، ڕەخنەی ئەدەبی کوردی بەسەرەتایەکی سادە کاروانی ژیانی دەستپێکردووە و زیاتر خۆی لە ڕاڤەکردنی مانا و لێکدانەوەی پەیام و مەبەستەکانی شاعیر خەریك کردووە و ئەوەندە بە گژ ڕەهەندی هزری و فەلسەفی و تەکنیکییەکانی دەقەوە نەچووە و ئەگەر لەم چوارچێوەیەشدا باسێك کرابێت لە سنووری ڕەوانبێژی و کێش و سەرواوە تێپەڕی نەکردووە. ئەمە لەلایەك، لەلایەکی دیکەشەوە باسکردنی تەکنیکەکانی وەکو( شوێن، ڕووداو، کات، کارەکتەر) لەدەقێکی شیعریدا ئەوەندە ئاوڕی لێ نەدراوەتەوە و بەپێی پێویست سەری لێ نەدراوە، بەتایبەتیش ئەو تەکنیکانەی وەکو ( شوێن، ڕووداو، کات، کارەکتەر) ئەوەندە لەگەڵ ئاستەکانی گێڕانەوە لە هەردوو فۆرمی (چیرۆك و ڕۆمان)دا هاتووە و جێگەی خۆی کردۆتەوە، ئەوەندە هزر و بیروڕای نووسەر و ڕەخنەگران بۆ ئەوە نەچووە کە کاریگەری ئەو تەکنیکانە بۆ دەقێکی شیعری بگێڕێتەوە. لەگەڵ ئەوەشدا ئەگەر ئاوڕ لە دەقەکانی فۆلکلۆری کوردی بدەینەوە، دەبینین شوێن ڕۆڵ و بایەخێکی گەورەی لە پێکهاتەی دەقەکانیدا هەیە. بۆ نموونە لە گۆرانی فۆلکلۆری کوردی شوێن یەکێکە لە پێکهێنەرەکانی دەق و ڕۆڵێکی کارای هەیە لە دروستکردنی پەیام و مەبەستەکانی شاعیر، بەشێك لەو گۆرانییانە بەم شێوەیە بوون:

((دەچمە شاری هەولێری بەقەیسەری و دووکانە
ئەگەر باوەڕم پێ ناکەی چاوکاڵی زۆر تێدایە
سەردارمان محەمەدی خۆشەویستی خودایە
سەری لە عەرشی فەلەك بەهیبەی حەسەنییە
گۆتم بەدایکی...... بڵێم! دایکی لەماڵ نییە
بابی وا لە هەولێرە کاکی وا لە جۆتییە)) [٣٥]

لەم دەقەدا شوێن کە شاری هەولێرە قورسایی دەق لەسەری چڕ بۆتەوە و بەشێك لە واتا و پەیامی دەقی لەئەستۆ گرتووە و لەهەمان کاتیشدا ناخی ناوەوەی بێژەرەکەی روون دەکاتەوە کە چەندە پابەندی شوێن بووە و کاریگەری لەسەر هەست و سۆزەکانی داناوە. لە پەندی پێشنیانی کوردیدا ئەو رۆڵ و بایەخەی شوێن زۆرتر و زەقتر بەرچاو دەکەوێت و شوێن دەبێتە ستراتیژییەتی گەیاندنی پەیام و مەبەست بە وەرگر. بۆ نموونە : (( **قسە لە زارێك دەکەوێتە شارێك** )). ئەوەتا لەم پەندەدا شوێن کاریگەرییەکی دەروونی و راگەیاندنی لەئەستۆدا بووە و ئەگەر شوێن لە پەنددا دەربهێنن واتا و مانا و پێکهاتەی دەق تێکدەچێت و شوێن لێرەدا کە شارە کۆی پرۆسەی گەیاندنی هزر و بیرکردنەوەی دانەرەکەی بۆ وەرگر لەسەر چڕ بۆتەوە. یاخود لە پەندێکی دیکەدا دەڵێت: ((کچی شەرمن شارێك دەهێنێت و کوری شەرمن شەیەك دەهێنێت)). لەم پەندەشدا بەراوردێك لەنێوان هەردوو رەگەزی کچ و کور دروستکراوە کە بناغەکەی لەسەر شەرمە، بنچینەو بناغەی ئەو بەراوردە لەسەر شوێن گیرساوەتەوە، شوێن لەم پەندەدا کە شارە گەورەیی و خۆشی و فەراهەمی و خۆشگوزەرانی بە کچێکی شەرمن بەروارد کراوە لەبەرامبەردا کور بەشانەیەك بەراورد کراوە کە هیچ بەها و نرخێکی نییە، لێرەشدا شوێن کە شارە چەقی ستراتیژییەتی دەقی لەسەر بنیادنراوە و بێ ئەو نەدەکرا ئەو پەندە بهێنرێتە کایەوە و پرۆسەی گەیاندنی مانا و مەبەستی لە دانەرەوە بۆ وەرگری لەئەستۆ گرتووە.

**شوێن لە شیعری کوردیدا:** شوێن لە شیعری کلاسیکی کوردیدا بوارێکی فراوانی گرتووە و بێ ئەوەی شاعیران خۆیان هەستیان پێکردبێت، شوێنیان وەکو ستراتیژییەتێکی دەق و پێکهێنەری راستەقینەی دەق بەکارهێناوە، ئەم بەکارهێنانە، بەکارهێنانێکی سەرپێیی و کاتی نەبووە و هەروەها دوور نەبووە لە ئەزموونی شیعری و هەستی خودی شاعیر خۆیەوە، بەڵکو بەکارهێنانی شوێن لە شیعری کلاسیکی کوردیدا سەرەتایەك بووە بۆ خستنەرووی قۆناغێکی هەستی و ئەزموونی شاعیر کە تێیدا هەست و سۆزەکانی شاعیری لەنێو دەقدا تۆمار کردووە. وێنای شوێنیش لە شیعری کوردیدا بەپێی گۆڕانکاریی کات و رۆشنبیریی

شاعیر و بەپێی بارودۆخی دەوروبەرەوە گۆڕاوە، بۆیە هەر شاعیرێك ڕێگا و شێواز و پەیڕەوێکی هەبووە لە دەربڕین و باسکردنی شوێنەوە.

شاعیرانی کورد کاتێك ئاماژەیان بە شوێن داوە، ئەوا لەهەمان کاتیشدا لەگەڵ ئەو شوێنە تواونەتەوەو گەیشتوونەتە پلەی ئاوێتەبوون، بەتایبەتیش کە بارودۆخی سیاسی و نیشتمانی کارێکی وەهای کردووە بە درێژایی ڕۆژگار شاعیران هەمیشە لە ریزی پێشەوەی داکۆکیکەران بن لە مافە نەتەوەییەکان و هەمیشە پابەندی خاك و نیشتمانیان بن کە وەکو شوێنێك داگیرکراوە و لەژێر چەپۆکی دوژمندایە، بۆیە لە دەقەکانیاندا ناوەرۆکی هزری و ئینتیمابوون بۆ شوێن کە خۆی لە نیشتمانی داگیرکراودا دەبینێتەوە، ئاوێتەی یەکتر بوونە و تا وای لێهاتووە ئاماژەدان بە شوێنێکی وەکو نیشتمان بەشێك بووە لە باسکردنی خودی شاعیر خۆی. لەم چوارچێوەیەشدا ئاماژەدان بەناوی شوێن لە شیعری کوردیدا بریتییە لە بوونێکی ئامادەبوو لە بنیادی دەقدا، چونکە مرۆڤ بەبێ نیشتمان وەکو شوێنێك ناژیت و لەم بارەیەوەش پێویستی بەوەیە، کە ئەو شوێنە بە روئیایەکی سۆزداری و ئینتیمابوون لە رێگەی شیعرەوە دەربڕێت. بۆیە شاعیرانی کورد هەمیشە پابەندی شوێنێکی دیاریکراوی جوگرافی بوونە کە لەرێگەی گۆڕانکاری لە شێوازەکانی دەربڕینەوە ئەو پابەندبوونەی بە وەرگر گەیاندووە و پەیامی پابەندبوونی ئەویشی بە شوێنەوە راگەیاندووە. بۆ نموونە نالی لە چامە بەناوبانگەکەیدا کە بەشێوەی نامەیەکی شیعرییە بۆ سالمی شاعیر دەنووسێت، کاریگەری تەواوی شوێن بەسەر دەقەکەوە دیارە. دیارە نالی لە شام کاتێك ئاوارەیی و دووره وەڵاتی تەنگی پێ هەڵدەچنێت و کاریگەری لە دەروونی دەکات و عەودالی هەواڵەکانی وڵاتەکەیەتی ئەو نامە دەنووسێت. واتە لە رووی شوێنەوە دەروونی شاعیر دووچاری هەڵچوون و شڵەژانێك بووە، ئەم هەڵچوون و شڵەژانەش وایان کردووە شاعیر پەنا بەرێتە بەر نووسینی دەقێکی شیعری، بەو واتایەی شوێن کە ئاوارەیی و بێکەسییە، شوێنێکی ناهۆگرە و شاعیر ئارەزووی لێ نەبووە، کاریگەرییەکی نەگەتیڤی لەسەر دەروون و ناخی شاعیر داناوە و ئەو کاریگەرییە گەیشتۆتە ئەو رادەیەی کە شاعیر هەمیشە خەیاڵ و هزری بۆ شوێنێکی دیکە گوزەر بکات کە ئەویش نیشتمان و شارەکەیەتی کە سلێمانییە. لە

ژێر ڕۆشنایی ئەمەوە شاعیر لە نامە شیعرییەکەیدا پرسیاری شوێن ئاراستەی سالمی شاعیر دەکات:

**ئایا جەمع و دائیرەیە دەوری (کانی با)**
**یاخۆ بووە بەتەفریقەیی شۆڕش و نوشوور؟!**
**( سەیوان) نەظیری گونبەدی کەیوانە سەبز و صاف،**
**یاخۆ بووە بەدائیرەیی ئەنجومەنی قوبوور؟!**
**ئێسەش مەکانی ئاسکەیە ( کانی ئاسکان)،**
**یاخۆ بووە بەمەلعەبەیی گورگ و لوورە لوور؟!**
**ئێستەش سوروشکی عیشقی هەیە( شیوی ئاودار)**
**یاخۆ بووە بە صۆفیی وشکی لە حەق بەدوور؟!**
**داخۆ دەروونی صافە، گورەی ماوە (تانجەڕۆ)،**
**یاخۆ ئەسیری خاکە بە لێڵی دەکا عوبوور؟!**
**سەیرێکی خۆش لە چیمەنی ناو (خانەقا) بکە**
**ئایا ڕەبیعی ئاهووە، یا چایری سنوور؟!** ( دیوانی نالی، ل١٨٨-١٨٩)

لەم دەقەدا شوێن بنچینە و بناغە و ستراتیژییەتی پێکهێنانی دەقی لەئەستۆ گرتووە، بەشێوەیەك خودی شوێنە کە دەقی دروستکردووە، بەو واتایەی گەر شوێن و کاریگەرییە دەروونی و هەستییەکانی نەبا، ئەو دەقە نەدەهاتە بوون و نەدەخولقا. بەکارهێنانی شوێن لەم دەقەدا بە چەندین ئاراستە و چەندین جۆر بووە، لەپێش هەموویانەوە دوو شوێن کۆڵەکە و پانتایی دەقیان پێکهێناوە، یەکێکیان شوێنێکی دەرەوەی دەقەکەیە، کە ئەویش وڵاتی شامە و نامەکەی تێدا هاتۆتە نووسین و ڕەوانەی شوێنێکی دیکەی کراوە کە ناوەڕۆکی دەقەکە پێکدەهێنێت، ئەویش شوێنێکی ناوەوەی دەقەکەیە کە شاری سلێمانییە، بە ئاراستەیەکی دیکەدا شوێن لەم دەقەدا بەشێوەیەکی بازنەیی لە بازنەی گەورەوە بۆ بازنەی بچووك دابەشکراوە و شاعیر لێهاتووانە مامەڵەی لەگەڵ ئەم بازنانە کردووە، لە بازنەیەکی گەورەوە کە شوێن وڵاتی شامە و ئاوارەییە بۆ بازنەیەکی دیکەی گەورە کە نیشتمانە و شاعیر لێی دوورە بۆ بازنەیەکی لەو بچووکتر کە شارەزوور و ناوچەیەکی فراوانە و بۆ بازنەیەکی دیکە کە شاری سلێمانییە و بۆ

بازنەیەكی دیكە كە كانی ئاسكان و تانجەڕۆ و شیوی دار و خانەقا...... هتد. كە ئەمانە هەموویان بەیەكەوە دیواربەندی دەق دروست دەكەن. لەم دەقەدا شاعیر لە ڕێگای پرسیاركردن لەو شوێنانەی كە خۆی مەبەستی بووە، دووانەیەكی بەراوردكاری دروستكردووە لەنێوان ( پێشتر و ئێستای شوێن) و شوێنەكان بوونە هەوێنی دروستكردنی وێنەی شیعری لەدەقەكەدا، بەو واتایەی شوێن سێبەری بەسەر تەواوی كەلێن و قوژبنەكانی دەقدا هەیە و باڵی بەسەر تەواوی دەقدا كێشاوە. بۆیە دەتوانین بڵێین ئەم جۆرە دەقە لە ئەدەبی كوردی (( دەقی شوێن))ن. دەكرێ دەقی شوێن بەو ڕەنگە پێناسە بكەین كە بنچینە و پێكهاتە و ستراتیژییەتی دەق و ئاراستەكانی لەسەر شوێن بنیاد دەنرێت و ئەگەر شوێن نەبێت دەق بوونی نابێت و لەسەر بوونی شوێن دەق دێتە نێو ژیانەوە، بەو واتایەی سەرەتا شوێن دەبێت، ئینجا بیر لە بنیادنانی دەق دەكرێتەوە و شوێن پانتایی و پەیامەكانی دەق دیاری دەكات.

لە شیعری نوێی كوردیشدا، شوێن ڕۆڵ و پێگە و پایەی خۆی پاراست و لەلایەن شاعیرانی نوێخوازەوە بە شێوەیەك مامەڵە لەگەڵ شوێن كرا كە لەگەڵ توخم و ڕەگەزەكانی دیكەی شیعرەوە ئاوێتە بكرێت و سوودێكی دوو لایەنە بە وەرگر بگەیەنێت، لەلایەكەوە ببێتە بنچینە و بناغە و ستراتیژییەتی دەق و لەلایەكی دیكەشەوە بەشدارییەكی كارا لە گەیاندنی وێنەی زیندووی پڕ لە بزاڤ و چالاكییەوە لەنێو وێنەی شیعریدا پیشانی وەرگر بدات. گۆرانی شاعیر لە هەردوو بەناونیشانی (گەشت لە هەورامان) (گەشت لە قەرەداغ)دا لە ژێر كاریگەری شوێندا ئەو دوو دەقە دێنێتە بەرهەم، دیارە شوێن كاریگەرییەكی لەڕادەبەدەری لەسەر هەست و نەستەكانی شاعیر داناوە كە لەو گەشتە هاوینییانەی كە بۆ ئەم ناوچانە ئەنجامی داون و لە ئەنجامدا بە دوو دەق هەست و سۆزی خۆی دەربڕیوە. واتا ئەو دوو دەقە ڕاستەوخۆ لەژێر ڕۆشنایی شوێنەوە هاتوونەتە بەرهەم و شوێن بووە بە بنچینە و بناغەی بنیادی دەقەوە. ئەم باڵادەستەی شوێن ئەوەندە كاریگەر بووە لەسەر شاعیر تەنانەت لەسەر ناونیشانی دەقەكەدا ڕەنگی داوەتەوە (گەشت لە هەورامان) (گەشت لە قەرەداغ)دا، بەوپێیەش كە ناونیشان زەمینە و ڕێنیشاندەرە و دەستپێكە بۆ دەق و كلیلێكە كە خوێنەر و وەرگر

دەرگاکانی دەقی پێ دەکەنەوە، دیارە شوێن لە وەها ناونیشانێکدا وەك چۆن دەسەڵات و باڵادەستیی خۆی بەسەر شاعیردا فەرز کردووە و بەهەمان شێوە دەسەڵات و باڵادەستیی خۆشی لەسەر وەرگریش داناوە و هەر لەسەرەتاوە لەڕێگای ناونیشانەوە چڕی و سێبەری شوێنی لەبەر چاو بنیادناوە. دەستپێکی ئەو دەقانەش ڕەنگڕێژە لەشوێن و وەسفی شوێن و دەرخستنی جوانییەکانی شوێن، بۆ نموونە لە ( گەشت لە هەوراماندا) دەڵێت:

**دیمەنی ڕێگاوبان**

| | |
|---|---|
| **کۆمەڵە شاخێك سەخت و گەردنکەش،** | **ئاسمانی شینی گرتۆتە باوەش** |
| **سەربۆشی لووتکەی بەفری زۆر سپی،** | **بە دارستان ڕەش ناو دۆڵی کپی** |
| **جۆگەی ئاوەکان تیایا قەتیسماو** | **هەر ئەڕۆن ناکەن پێچی شاخ تەواو** |
| **هاوار و هاژەی کەفچەڕێنی چەم** | **بۆ تەنیایی شەو لایەلایەی خەم!** |
| **تووڵەڕێی باریك، تووناوتوون پشکن** | **ڕێبوار ئەخاتە ئەندێشەی بێ بن** |

(( دیوانی گۆران، ل ١١٧))

گۆران ئەم دوو دەقەی دابەشی سەر چەند بەشێك کردووە، لە (گەشت لە هەورامان)دا دابەشی سەر (١٠) بەش کراوە، هەر بەشێك ناوی خۆی بۆ دیاریکراوە کە ئەمانەن ( دیمەنی ڕێگاوبان، ڕێگای ناوباخ، دێ، ژینی دیوەخان، مەلای دیوەخان، بەیان، مزگەوت، کانیی ژنان، ژن، گۆرانی). بە پێچەوانەوە لە ( گەشت لە قەرەداغ)دا کە دابەشی سەر (٢١) بەش کراوە، بەشەکان تەنیا ژمارەیان بۆ داندراوەو ناوی تایبەتی خۆیان نییە. بەم جۆرە شوێن تەنانەت لە ناونیشانی لاوەکییانەوەش زاڵە و چڕە بەسەر دەقەکەدا. دەکرێ ئەو دەقەش بە ( دەقی شوێن) ناوببەین.

لەشیعری هاوچەرخی کوردیشدا شوێن ڕۆڵ و پێگەی خۆی لە دەقەکاندا هەبووە و شاعیران سوودێکی زۆریان لە شوێن بینیوە لە بینادنانی دەقەکانیاندا، (عەبدوڵڵا پەشێو) یەکێکە لەم شاعیرانە کە شوێن پایەکی بەرزی هەیە، بەتایبەتیش کە ئەو بەچڕی نیشتمانپەروەری و بەرزی نیشتمانی وەکو هزر و فەلسەفەیەك لە شیعرەکانیدا ڕەنگی داوەتەوە، لە زۆربەی شیعرەکانیدا ئاوێتەیەك لەنێوان نیشتمان وەکو شوێن و ئەڤین و خۆشەویستی بەدی دەکرێت. نیشتمان

وەكو شوێنێك بووە بەخەمی گەورەی شاعیر و هەمیشـە تارمـایی و سـێبەری ئـەو شوێنە لەسـەر هەسـت و سـۆزەكانی شـاعیردا دەبینرێت، بـۆ نموونـە لـەم پارچـە شیعرەدا شاعیر دەڵێت:

**نیشتمان!**

**تۆ وەك تانەی لەسەر چاوم.**

**تۆ وەك تەمی،**

**لەگشت لاوە دەورەت داوم.**

**تۆ ئاوێنەی ـ**

**لەناو تۆدا هەموو دنیا بەدی دەكەم.**

**تۆ پەیمانی ـ**

**بەهۆی تۆوە هیچ نابینم:**

**نە كەل دەبینم، نە زەوی**

**نە خوا دەبینم، نە ئاسمان**

**جا نازانم**

**نە جیهان وەك تۆ بچووكە،**

**نە تۆ گەورەی بەقەد جیهان.**

**نیشتمانەكەم ـ ك و ر د س ت ا ن!** (٣٦)

لەم پارچە شیعرەدا شوێن بنكە و پانتایی دەق پێكدەهێنێت و دەكرێت بـە دەقێكی شوێنی لەقەڵەمی بدەین، چونكە ئەگـەر نیشـتمان و خەمـەكانی نەبوایـە، دەقەكە نەدەهاتە بەرهەم، ئەو نیشتمانە كاریگەرییەكی وای لەسەر شـاعیر دانـاوە كە بەراوردی بكات بە زەوی و ئاسمان و بەقەد جیهانیش گەورەی بكات.

(كەریم دەشتی)یش یەكێكـە لـەم شـاعیرانەی كـە لـە شـیعرێكیدا بـۆ هـەولێر هـەروەكو خـۆی دەڵێـت: (( بەشـێكە لـە وەفـام بـۆ ئـەو شـارەی منـی هێناوەتـە كایەوە)) (٣٧)، هەولێر وەكو شوێنێك دەكاتە هەوێنی خولقاندنی دەقەكـە و لـەوێوە تەواوی روئیا و هزر و فەلسەفەكانی دەخاتە كایەوە:

**یەكەم جار لەناو باخی بەها و بەهێدا**

**بە تەنها (ه) یێەكە بوو**

**چی هەور و هێلانە و هەیبەتی مێژوو بوو**
**هەر هەمووی هەڵمژی**
**ئەوەندە هاواری خۆی سەردا**
**تا بوو بەو قەڵایە**
**ئەو قەڵا باڵایە**
**هەر دەڵێی شاژنی سەر عەرشی میدیایە**
**دیرۆك و لەشکر و پاشایە**
**ئای لەم (هـ) ێیە جوانە**
**هەر دەڵێی بەهێیە خودایە**
**دووەم جار واوێك بوو**
**بوو بە وانەی وار و**
**وڵاتی خستە سەر زمانی ئەم کەونە......**

( دیوانی کەریم دەشتی، بەرگی سێیەم، ل ٧٥)

لەم دەقەدا شوێن دەسەڵاتدارە و بنچینە و بناغەی بینادی دەقی پێکهێناوە و تەواوی دەقی خستۆتە ژێر فەرمانداری خۆیەوە، هەر لە ناونیشانەوە کە (هەولێر)ە کلیلی دەقەکە بەشوێن گرێدراوە و دواتر هەر پیتەکانی ئەو ناونیشانە (هەولێر) بەسەر دەقدا پەرش و بڵاوبۆتەوە و تانوپۆی وێنە شیعرییەکانیان دروست کردووە. شاعیر کە خۆی وەکو وەفایەك ئەم شیعرەی بۆ شارەکەی نووسیوە لە رووی دەروونی و هەست و سۆزە بەتەواوەتی تەسلیمی شوێن بووە و کەوتۆتە ژێر کاریگەرییەکانی و شوێن کە هەولێرە هەست و نەستەکانی شاعیریان داگیرکردووە و توانیویانە دەسەڵاتی خۆیان بەسەر کردەی نووسینی دەق لەلایەن شاعیرەوە بسەپێنن و خۆی بکاتە تەوەری سەرەکی پێکهاتەی دەق. ئەگەر شوێن نەبوایە، بێگومان دەقێکی وا هەرگیز لە دایك نەدەبوو، ئەوە شوێنە بووە بە هاندەر و پاڵپشتێکی ماددی و مەعنەوی بۆ شاعیر و هانیداوە کە دەقێکی شوێنی وەکو (هەولێر) بنووسێت و تێیدا ئەو شوێنە پیرۆز بکات کە لێی لەدایك بووە.

هەروەها (سەباح رەنجدەر)ی شاعیریش لە رۆمانە شیعرییەکەیدا (زێوان) کە بەیەکەم دەقی رۆمانە شیعر لە ئەدەبیاتی کوردیدا دادەنرێت، تانوپۆی رۆمانە

شیعرییەکەی لەسەر شوێن و گێڕانەوەکانی شوێن و یادەوەرییەکانی بنیادناوە، شوێن لەم ڕۆمانە شیعرەدا بنیادنەر و بنچینە و بناغەی ئەو بیوگرافیایە کە شاعیر لە دەقەکەیدا بۆمانی دەگێڕێتەوە. هەر لەبەر ئەمەشە خوێنەر لەئەنجامی خوێندنەوەی دەقەکە هەست بە قەوارەیەکی گەورەی شوێن دەکات لە گۆڕەپانی دەقەکەدا و ڕووداوەکانیش بەشێوەیەك پەیوەستن بە شوێنەوە کە ناکرێت لێی دابڕێت و جودا بکرێتەوە، چونکە شاعیر بەشێك لەو ڕووداوانەی لەبارەی شوێنی نیشتەجێبوونی خۆیەوە باسکردووە و پەیوەندیی ڕاستەوخۆیان بە ئەو شوێنەوە هەیە، بۆیە ڕووداو تێیدا ڕوویەکی زیندووی شوێن لەخۆ دەگرێت. لەبەر ئەوەی دەقی ئەم ڕۆمانە شیعرە باس لە ژیاننامەی شاعیر دەکات و ڕووداوگەلێکی واقیعی دەگێڕێتەوە کە بەسەر خودی شاعیر و میللەتەکەیدا هاتووە، شاعیریش خۆی ئاماژەی بە دەسەڵات و باڵادەستیی شوێن بەسەر دەقەکەیەوە دەنێت و دەڵێت: ((هەموو یادەوەرییەکانم لە شوێنێکدا خەوتوون، کە چاو بواری نییە کۆیان بکاتەوە و بیانگرێت، مەگەر لە ڕێگای خەونبینینەوە بە ئاگایان بهێنمەوە ئاوی چاوی تیشکهاوێژم بدەم، بیانخەمە ناو چالاکییە هەستی و خەونییەکانم))[٣٨] لێرەدا شاعیر خۆی دان بەوەدا دەنێت کە یادەوەرییەکانی لەشوێنێکدا خەوتوون و لە ڕێگای خەونبینینەوە دەریان دەبڕێت. بۆیەش ئەو شوێنانەی کە شاعیر باسی لێوە کردوون شوێنی واقیعین و بوونێکی واقیعیان لەسەر زەویدا هەیە و تائێستاش ماون و لە ڕێگای ئەم دەقە شیعرییەوە گۆڕانکاری و مێژووی ئەو شوێنانەمان بۆ دەگێڕدرێتەوە و باس دەکرێت. ((بۆیە گێڕانەوەی حیکایەتی ئەو شوێنانە هەستەکانی ناوەوەی خوێنەر دەوروژێنن، وەك چۆن بۆ نووسەر دەبنە کەرەسەی هونەری، ئاواش بۆ خوێنەر فەزایەکی سەرنجڕاکێشن)) [٣٩]، هەروەها لەبەر ئەوەی شاعیریش خەڵکی شاری هەولێرە، بۆیە شوێنەکان لەو شارە و گوندەکانی دەوروبەری دەبنە گۆڕەپانی ڕووداوەکانی ئەم ڕۆمانە شیعرە. لەم چوارچێوەیەدا شاعیر هەر لەسەرەتاوە ئاماژە بە گوندەکەی دەکات و دەڵێت:

**(( پاشان دووکانە پڕ نهێنییە ڕەنگاوڕەنگەکانی گوندی گەنجینەی منداڵیم))**

( زێوان، ل ١٨)

لێرەدا تەنیا ئاماژە بە گوند کراوە وەکو شوێنێك کە ئیدی ڕووداوەکانی تێدا گوزەر دەکەن و هەستی خوێنەر بۆ ئەو شوێنە ڕاکێشراوە کە گوندە، ئەگینا لە سەرەتادا ناوی گوندەکە دیاری ناکات، ئەمەش بۆ ئەوەیە تا خوێنەر زیاتر

بکەوێتە ناو فەزایەکی سیحری و خەیاڵییەوە و لەوێوە دواتر شاعیر خوێنەرەکەی ڕووبەڕووی ناوی گوندەکەی دەکاتەوە:

**(( دار شەقەی ئیفلیجیم لە ڕۆژی شەهیدانی دەربەندی گۆم دانا))**

( زێوان، ل ٢٦)

لێرەدا شاعیر ڕاستەوخۆ ناوی گوندەکەی دەهێنێت کە ئەویش (دەربەندی گۆم)ە و لە دەشتی هەولێرە، ئەو گوندە بوونێکی واقیعیانەی هەیە و خوێنەر هەستی پێ دەکات، شاعیر کاتێك ناوی گوندەکەی خۆی بۆ یەکەم جار لەم دەقەدا دەهێنێت، لەگەڵ ڕۆژی شەهیدانی تایبەت بەو گوندە پەیوەستی دەکات، چونکە ئەم گوندە هەمیشە لە کارەسات و وێرانیدا بووە و ژیانێکی پڕ لە تراژیدیای هەبووە.

( ئەنوەر مەسیفی)ی شاعیریش لە فۆرمە گرانەکەیدا سوودێکی زۆری لە شوێن و تەکنیکەکانی شوێن بینیوە و توانیویەتی لە ڕێگای بە سمیبولکردنی شوێن ئاماژە بە ڕووداوەکانی ڕۆژگار بکات و لەیەك کاتدا چەندین دەلالەت و واتا و پەیام بکاتە ئەرکی شوێن و بە وەرگری بگەیەنێت. بۆ نموونە دەڵێ:

**(( لەناو ژێر زەمینیان پرچ))** (جلوبەرگ و جمکەکان، ل٢١-٢٢)

لێرەدا (ژێر زەمین) شوێنێکی ڕاستەقینەیە، وەلێ هەرگیز هۆگر و ویستراو نەبووە هەمیشە لەکاتی جەنگ و ترسدا مرۆڤەکان پەنای بۆ دەبەن، لێرەدا شاعیر جگە لەم واتایە، واتایەکی دیکەی وەکو ئەرك بە شوێن سپاردووە کە ئەویش ژێر زەوییە و دەکرێ وەکو گۆڕ یان تاوانی زیندە بەچاڵکردن و هەر تاوانێکی دیکەی پەیوەندی هەبێت بەلەناوبردنی مرۆڤ لە ژێر زەمینەوە، (ژێر زەمین) وەکو شوێنێك لەم دەقەدا چەندین دەلالەت و واتای لەخۆگرتووە و لەهەمان کاتیشدا شاعیر ئەرکێکی پێ سپاردووە ئەویش گێڕانەوەی تاوانێکی گەورەی بەعسە کە ئەنفال و زیندەبەچاڵکردنی مرۆڤی کوردە، شوێن وەکو زمانحاڵی تاوانێك بۆمان دەدوێت، شاعیر لە ڕێگای شوێنەوە و هەروەها زمانی جەستەی پرچەوە، تاوانێکمان بۆ دەگێڕێتەوە کە کوشتن و لەناوبردنی ئافرەتی کوردە (( ژێر زەمینەکان کە خەڵك لە ترسی تاوان پەنایان بۆ بردوون دەستی تاوانیان پێ گەیشتووە و پڕ بوون لە پرچی ژنان و کچانی شەهیدکراو)) [٤٠].

## بەشی سێیەم
## شوێن لە شیعرەکانی (بێدڵ)*دا

بێدڵ یەکێکە لەو شاعیرانەی شوێن کاریگەرییەکی گەورەی لەسەر خۆی وەکو شاعیرێك و لەسەر دەقە شیعرییەکانی داناوە، دیارە ئەو کاریگەرییە لە ئەنجامی کۆمەڵە هەستێکەوە هاتۆتە کایەوە لەوانە هەستی ئایینی و هەستی نیشتمانپەروەری کە وای کردووە شاعیر ئینتیمای بۆ شوێنەکانیان دەربڕێت و بەهۆیەوە هزر و تێڕوانین و پەیامەکانی بە وەرگر بگەیەنێت ، بەو واتایەی ئەم پرۆسەی گەیاندنەی بە شوێن سپاردووە و لەسەر بنچینە و بناغەی شوێنەوە بەشێك لە دەقەکانی داڕشتووە و ئاراستەی وەرگری کردووە.

وەکو دیارە بەهۆی ئەو بارودۆخەی کە کوردستان لە رووی سیاسییەوە بەدەستییەوە دەناڵێنێت و هەمیشە لەژێر چەپۆکی داگیرکەراندا بووە و بەردەوام پرۆسەی سڕینەوە و لەناوبردنی میللەتی کورد و وێرانکردنی خاکەکەی یەکێك لە ستراتیژییەتە هەرە باڵاکانی داگیرکەراندا بووە، وای کردووە هەمیشە تاکی کورد لە دۆخێکی یاخیبووندا ژیان بەسەر ببات و لەهەموو کات و سەردەمێکدا ئامادەیی بۆ سەر دەرهێنان و شۆڕش و راپەڕین لە وزەیدا هەبێت. ئەمەش بەدەوری خۆی جۆرێك لە هەست و نەستێکی وای لەناخی تاکی کوردیدا دروست کردووە و نیمچە پیرۆزییەکی وای بە نیشتمان داوە کە هەمیشە تاکەکانی بە دایکێکی گەورە کە زوڵمی لێکراوە لێی بڕوانن و رۆحی خۆیان بۆی فیدا بکەن، دیارە شاعیرانی کورد وەکو چینێکی دەستەبژێری رۆشنبیری لە کۆمەڵگەی کوردیدا لە چاو تاکێکی ئاساییدا زیاتر کەوتوونەتە ژێر باری ئەو بارودۆخە و ئەو هەست و نەستەدا و هەمیشە شوێن کە نیشتمان بووە، بووە بەخەمی گەورەیان، لەم ناوەدا (بێدڵ)ی شاعیر یەکێکە لەو شاعیرانەی کە نیشتمان وەکو شوێنێك بووەتە تارماییەك لەسەر دەقەکانیدا و بەردەوام لە زیهن و هزری شاعیردا ئامادەگی هەبووە و لەبەرچاوانیدا بووە. دیارە لە پرۆسەیەکی وادا کە نیشتمان وەکو شوێنێك لە هەست و نەست و هزری شاعیردا پەنگی خواردبێتەوە شاعیر لە دەقەکاندا ئاماژەی پێ کردبێت، ئەوە لە هەمان کاتدا لە رووی دەروونییەوە

خۆخاڵیکردنەوەی شاعیرە لەو هەست و نەستانەی و بەشداری پێکردنی وەرگرە لە پانتاییەکانی هەست و نەست و خەمەکانیدا، بەدیوێکی دیکەدا دەتوانین بڵێین ((شاعیر کاتێك لەدەقێکدا ئاماژە بە شوێن دەدات هەستێکی دڵنیابوون و دڵنەوایی لەلای دروست دەبێت)) [41] و وەکو کائینێك لە شوێن دەڕوانێت کە لە قووڵاییەکانی جەستەدا بەهەموو ڕەهەندەکان و نهێنییەکان و بەها و ئەفسانە و هێماکانییەوە لە بەدەنی روح جێگیر دەبێت و دەبێتە ناسنامەیەك و بەشێوەیەك لەناو یەکدی دەتوێنەوە کە جیاوازی لەنێوان شوێن و شاعیر نامێنێت و دەبنە یەك شت. بۆیە دەبینین بوونی ناوی شوێن لەناو دەقە شیعرەکانی (بێدڵ) بوونێکی ئێستایی وەردەگرێت و بە هەستەکانی، هەستی پێ دەکات، چونکە شاعیر پێویستی بە نیشتمانێك هەیە کە لە واقیعدا لەدەستی داوە و کەوتۆتە ژێر دەستی دوژمنەوە بۆیە لە زیهن و هزری خۆیدا گواستنەوەیەك ئەنجام دەدات، ئەو گواستنەوەیە لە ئەرزی واقیعەوە بۆ ئەرزی دەقە شیعرەکانییەوە و لەوێوە نیشتمانێك بنیاد دەنێت و دەیکاتە بنچینە و بنەمایەك کە دەقەکانی لەسەر دادەڕێژێت. لەبەر ئەم خاڵەشە کە (بێدڵ) بایەخێکی تەواوی بە شوێن داوە و هەمیشە شوێن چ وەکو بوونێك و چ وەکو یادەوەرییەك خاڵی دەستپێکی تێڕوانین و بیرکردنەوەکانی شاعیری کۆکردۆتەوە و لە پانتایی دەقدا تەوزیفی کردووە. ئەم حاڵەتە وای لە شاعیر کردووە کە شوێن بە شێوازێکی نهێنی و سۆزدارییەوە ڕوئیا بکات، چونکە ئەو شوێنانەی کە شاعیر لە دەقەکانیدا ئاماژەی بۆ کردوون، شوێنگەلێکن یان ئەوەتا لە رووی ئایینییەوە پارادۆکسی لە ناخی شاعیر خولقاندووە و دووچاری هەژانی کردووە، یانیش ئەوەتا لە رووی نیشتمانییەوە، شوێنێکی باوباپیرانی لەدەست دوژمنەکانییەتی و لەدەستی میللەتەکەی نەماوە، بۆیە ئەو بەشێوەیەك شوێنەکان دێنێتە ژێر دەسەڵاتی خۆیەوە و بوونێکی واقیعیان پێ دەبەخشێت کە هەر چەندە ئەو بوونە ئەندێشەییش بێت، بەڵام دواجار لە دووالیزمێکدا ڕووبەڕوویان دەکاتەوە لەگەڵ نەبوون، لەم حاڵەتەشدا شاعیر لە زۆربەی دەقەکانیدا جەخت لەسەر سەلماندنی ئەو بوونە دەکاتەوە، چونکە ((بوونێك نییە لە دەرەوەی شوێن)) [42] و هەموو بوونێك لە سنوورێکی دیاریکراوی شوێندایە و بەوپێیەش مرۆڤ وەکو بوونێك لە چوارچێوەیەکی

سنووربەندی شوێندا دەژیت. جا ئەو شوێنە ئەگەر بەشێوەیەکی وا لەلایەن شاعیرەوە هۆگر و ویستراو و ئارەزوومەند بێت کە لەخەیاڵ و لە نێو رستەو وشەکانی دەقەکەی دووبارە بنیادی بنێتەوە و هەوڵی ئەوە بدات پەیامێك بە وەرگرەکانی بگەیەنێت کە ئەو شوێنە داگیرکراوە ئازاد بکەن، ئەوا بێگومان شوێن دەسەڵات و هەیمەنەیەکی گرنگ لە سەر خودی شاعیر و دەقەکانیدا دەخولقێنێ.

بەرجەستەکردنی ئەم حاڵەتانەی سەرەوەش، شاعیر پەنای بۆ خودی خۆی بردووە و لەرێگەی خودی خۆیەوە ئاماژەی بە شوێنەکان داوە، بەدیوێکی دیکە شاعیر (خود)ی کردۆتە جەمسەرێك و تەواوی شوێنەکانی تێدا کۆکردۆتەوە و لە رێگای راڤەکردن و شیکردنەوەی خودەوە ئاسەواری شوێنی تێدا رەچاو کردووە، بەتایبەتیش کە ئەو راڤەکردن و شیکردنەوە لەسەر گۆڕانکاری شوێنەکانەوە، ئەوانیش گۆڕانیان بەسەردا هاتووە و شێوازی ئەو گۆڕانکارییانەش لە فەزای دەربڕیندا رەنگی داوەتەوە.

دەکرێ حاڵەتەکانی ئاماژەدان بەشوێن و تەوزیفکردنیان لە دەق و ئەرك پێسپاردنیان و رۆڵیان لەناو دەق و کاراکردن و راڤە و شیکردنەوەیان لەلایەن شاعیرەوە لەم چەند قۆناغەدا پۆلێنبەند بکەین:

**١ـ شوێن وەکو تەواوکاری وێنەی شیعری:**

بەو پێیەی شوێن یەکێکە لەتوخمە هەرە گرنگ و پڕ بایەخەکان لە ژیانی مرۆڤدا و هەمیشە پەیوەستە بە کات و سەردەمی مرۆڤەکانەوە و تێیدا سیما و خەسڵەت و ئادگارەکانی مرۆڤی لێ رەنگدەداتەوە. بۆیە شاعیر لە دروستکردنی وێنە شیعرەکانی پەنای بۆ بردووە و تەوزیفی کردووە. بەشداریکردنی شوێن لە وێنە شیعرییەکانی (بێدڵ)دا کاریگەری و پڕ بایەخی ئاسەواری شوێن لەسەر هەست و نەستەکانی شاعیر خۆیدا دەسەلمێنێت. دیارە شوێن پەیوەندییەکی تونودتۆڵی بە کاری ئەدەبییەوە هەیە، چونکە کاری ئەدەبی ناتوانێت رەهەندەکانی شوێن فەرامۆش بکات و سنوور و کاریگەرییەکانی پشتگوێ بخات ((کاتێك کاری ئەدەبی، شوێنگەی ون دەکات، ئەوا تایبەتمەندێتی و رەسەنایەتی خۆی لەدەست دەدات)) [٤٣] هەر لەبەر ئەمەش شوێن بەهەموو تانوپۆ و پێکهاتەو بەشەکانییەوە لەساتی نووسینی دەقی شیعری لەبەر چاوی شاعیر ئامادەگی هەیە

و ناتوانێت ئەو شوێنەی کە دواتر دەبێتە پێکهێنەر و بزوێنەری وێنەشیعرەکە فەرامۆش بکات و لەناو وێنە شیعرییەکە بەشداری پێنەکات.

لەم چوارچێوەیەدا (بێدڵ) توانیویەتی سوودێکی زۆر لە وزە و توانا و پێکهاتەو بەشەکانی شوێن وەربگرێت و لە سنووری وێنە شیعرییەکاندا بەکاریان بهێنێت و تەواوکاری وێنەی شیعرییان پێ ئەنجام بدات و بەهۆیەوە جوولە و بزاڤێك بخاتە ناو مانا و دەلالەتی وێنە شیعرییەکانییەوە، ئەوەتا دەڵێت:

**زەمین وەکو گۆ دروست کراوە**
**بەشێکی وشکە سێ بەشی ئاوە**
**لەناو ئەو ئاوە هەزاران هەزار**
**جۆری گیانداری تیایە بێ ژمار**
**لەسەر زەمینیش دیسان هەمان ڕەنگ**
**جۆرەها گیاندار دەنگدار و بێ دەنگ** ( دیوانی بێدڵ، ل ١٨)

لەم دێرە شیعرانەی سەرەوەدا، بێدڵ لەشیعرێکی ئایینیدا گێڕانەوەی دروستکردنی گۆی زەمینی باس کردووە، کە دیارە گۆی زەمین وەکو شوێنێك گەورە و فراوان تەنیا شوێنگەی ژیانی مرۆڤ نییە، بەڵکو هەزاران گیاندار و بێ گیانیش لەسەری دەژین، کەواتە لێرەدا شوێن فەزایەکی فراوانی بێ سنووری وەرگرتووە. شاعیر وێنەشیعرییەکەی لەسەر بنچینەو بناغەی ئەو شوێنە ڕۆناوە، بەو پێیەش کە زەوی لە جۆری شوێنێکی واقیعییە و خەیاڵی نییە و هەروەها هۆگر و دڵگیر و ئارەزوومەندە، بەهەمان ئەو خەسڵەت و ئادگارانەوەش بەشداری وێنە شیعرییەکەیان کردووە. بەدیوێکی دیکەدا شوێن کە گۆی زەمینە لە بەشداریکردنی وێنە شیعرییەکەدا هیچ ئەدگار و خەسڵەتێکی لەدەست نەداوە و شاعیر هەروەکو خۆی بەکاری هێناوەتەوە. لەهەمان کاتیشدا شاعیر ئەو زانیارییانەی لەبارەی شوێنەکەوە کە زەوییە بەوەرگری دەبەخشێت، زانیارییەکی نهێنی و تەلیسماوی نین کە کەس پەی پێ نەبردبێت، بەڵکو بە پێچەوانەوە ئەو زانیارییانەی لەدووتوێی وێنە شیعرییەکەدا خراوەتەڕوو، زانیاریی ئاساین و هەموو کەسێك دەیزانێت کە زەوی وەکو شوێنێك خاڵی کۆکردنەوەی هەموو ئەو گیانلەبەر و بێ گیانانەیە. بۆیە شوێن لێرەدا وەکو خۆی بەبێ گۆڕانکاری لە خەسڵەت و

سیفاتەکانیەوە لەلایەن شاعیرەوە بەکارهێنراوە و تەنیا کاری ئەوەیە بەشداری لە دروستکردنی وێنە شیعرییەکەدا کردووە.

لە پارچە شیعرێکی دیکەدا بەناونیشانی (یادی دلێران) کە بۆ هەر چوار ئەفسەرە کوردەکە نووسیویەتی دەڵێت:

**وازیان لە تاج و نەجمە هانی**
**چوون بۆ مهاباد لەگەڵ بارزانی**
**کۆماری کوردی لەوێ دامەزرا**
**بەڵام داخەکەم زوو لەناوبرا**
**بەهۆی خائن و کۆنەپەرستان**
**نەیانویست رزگار بێ کوردستان** (دیوانی بێدڵ، ل٢٣)

شاعیر لەم دێرانەی سەرەوەدا ڕووداوێکی مێژوویمان بۆ دەگێڕێتەوە کە دامەزراندنی کۆماری مهاباد و لەناوچوونییەتی، تانوپۆی ئەو وێنە شیعرییانەی سەرەوە لەسەر دوو شوێن وەستاوە، بەپلەی یەکەم لەسەر شوێنێکە کە شاری مهابادە، لەجۆری شوێنێکی واقیعییەو لەم دێرە شیعرانەدا دلگیر و هۆگر و ئارەزوومەندە، بەپلەی دووەمیش کوردستانە کە ئەویش شوێنێکی واقیعی و هۆگرە. هەر دوو شوێن لە لایەن شاعیرەوە بەشدارییان پێکراوە بۆ دروستکردنی وێنە شیعرییەکە، چونکە هەردوو شوێن بە تەواوی خەسڵەت و سیما و کێشە و تەنانەت کێشە و گرفتەکانیشیانەوە بەشداری وێنە شیعرییەکەیان کردووە و هیچ گۆڕانکاری و لادانێك لە واتا و مەبەست و دەلالەت بەسەریاندا نەهاتووە. شاعیر سوودی لە ڕووداوەکانی ئەو شوێنانە وەرگرتووە و بێ دەستکاریکردن و دەربڕینی بیروڕای خۆی و خستنەسەر و زیادە و گرێیەك ڕاستەوخۆ لە وێنە شیعرییەکەدا بەشداری پێکردووە و ڕاستەوخۆش زیهنی وەرگر و خوێنەری بۆ سەر هەردوو شوێن کە گۆڕەپانی ڕووداوەکە بوونە گواستۆتەوە، و لەهەمان کاتیشدا زانیارییەکانی لەسەر ئەو دوو شوێنەی کە خستۆتەڕوو، زانیاریی ئاساین و هیچ هەڵوەستە و وەستانێك لای وەرگر و خوێنەر دروست ناکات، چونکە هەمووان ڕووداوە مێژووییەکەی ئەو دوو شوێنە دەزانن و تا ئێستاش لەناو هەمان گرفت و کێشەدا دەژین و ڕزگار نەبووینە.

شاعیر لە پارچە شیعرێكدا بەبۆنەی نەورۆزەوە دەڵێت:

**ئەمڕۆژە كە نەورۆزە لە چوارچێوەی وڵاتە**

**ئاهەنگ و سەدای شادییە وا ڕۆژی نەجاتە** ( دیوانی بێدڵ، ل٣١)

لەم دێرە شیعرەدا شوێن وڵاتە و بووە بە بنچینە و بناغەی دامەزراندنی وێنـە شیعرییەكە و بەشدارییەكی كار و پڕ لـە بـزاڤ و جووڵـەی هەیـە. شـوێن كـە وڵات و نیشـتمانە شـوێنێكی واقیعـی و هـۆگر و دڵگـیرە و كراوەیـە و مـوڵكی هـەموو هاونیشـتمانییانە، ئـەم شـوێنە لەلایـەن شـاعیرەوە لـە حاڵـەتێكی دیـاریكراودا وێناكراوە كە جـەژنی نـەورۆزە و تێیـدا لـە سەرانسـەری وڵاتـدا ئاهـەنگ و سـەدای شادییە. شاعیر بە دەربڕینـی هەسـت و نەسـتەكانی خـۆی جۆرێـك لـە دڵنـەوایی و ئارامیی خودی خـۆی لـەو ڕۆژەدا خسـتۆتەڕوو، بۆیـە لـەم ڕێگایـەوە ویسـتوویەتی وڵات و نیشـتمان وەكـو شـوێنێك وەسـف بكـات و حاڵـەت و چـالاكییەكانی ئـەو ڕۆژەیان باس بكـات، بۆیـە شـوێن بـووە بـەو ڕێگـە و شـێوازەی شـاعیر و لـەوێوە هاتووە وێنە شیعرییەكەی خۆی داڕشتووە. لەلایەن خودی وەرگر و خوێنەریشەوە ئـەو زانیارییانـەی كـە شـاعیر لـەم چوارچـێوەیەدا خسـتوویەتییە ڕوو، زانیـاریی ئاسایین و هیچ جـۆرە نهێنی و نامۆییيـەكی لەخۆیدا هەڵنـەگرتووە، بـەڵكو زیـاتر پـەیام و مەبەسـتی شـاعیر ئـەوە بـوو كـە هەسـت و نەسـتەكانی خـۆی لـە چوارچـێوەیەكی نیشـتمانپەروەری و هانـدانی نـەوەی نـوێ بـووە بـۆ پاراسـتن و یادكردنەوەی ئەو بۆنەیـەی كـە دوژمنـان لەناخـەوە ڕقیـان لێبۆتـەوە و لەهەنـدێك پارچەی كوردستان قەدەغەش كراوە، بۆیە شاعیر هەوڵیداوە لـە ڕێگـای شـوێنەوە ئەو هەسـت و نەسـت و بیروڕایانـەی بـە وەرگـر بگەیـەنێت و لـە ڕووی دەروونـی و هزری نیشتمانپەروەرییەوە تەیار و ئامادەیان بكات.

هەر لەبارەی نەورۆزەوە شاعیر دەڵێت:

**وا دیسان نەورۆزە دەشت و شار هەموو ڕازایەوە**

**بەفری كوێستانان نەما كانی وشك وا زایەوە**

**هەر لە بەستۆرە و لە پیرمام تا دەگاتە سەر سنوور**

**ڕوو لە هەر لا كەی دەبینی ئاڵ و واڵا سەوز و سوور**

( دیوانی بێدڵ، ل٣٢)

لەم دێرانەدا شوێنەكانی (دەشت، شار، كوێستان، كانی، بەستۆرە، پیرمام، سنوور، هەر لا) شوێنی گشتین و واقیعین و كراوەن و بۆ هەموو كەسێك وەكو یەكە و مولكی هەموو هاونیشتمانییانە، ئەو شوێنانە لێرەدا لە مانگێكی دیاریكراوی ساڵ كە مانگی ئادارەو تایبەتتریش لە جەژنێكی نەتەوەییدا كە جەژنی نەورۆزە وێنایان كراوە و خەسڵەت و سیما و سیفاتەكانیان لەو كاتە دیاریكراوانەدا لە وێنەیەكی شیعریدا خراوەتەڕوو. كەواتە شوێن لەم دێرانەدا بنچینەو بناغەی پێكهێنانی ئەو وێنە شیعرییانەن كە شاعیر لەو كات و ساتە دیاریكراوەدا خولقاندوونیەتی. بەدیوێكی دیكەدا دەربڕی خودی شاعیرە لەو كاتە و ساتە دیاریكراوە كە پڕ لە جۆش و خرۆش و ئاهەنگ و شادییە، شوێن ڕێگە و شێوازی دەربڕینی ئەو هەست و نەستانەی شاعیرە و لە ڕێگەی شوێنەوەش ئەو هەست و نەست و حاڵەتە دەروونییەی شاعیر لە چوارچێوەی وێنەی شیعریدا لە پرۆسەیەكی گواستنەوەدا بە وەرگر و خوێنەر دەگەیەنرێت. ئەو زانیاری و هەواڵانەی كە لەو دێرانەشدا هاتوون، زانیاری و هەواڵی واقیعین و ئاساین و هیچ جۆرە نائاساییەكیان پێوە دیار نییە، چونكە دیارە لەو كاتانەدا دەشت و شار و تەواوی شوێنەكانی دیكە دەگەشێنەوە و بەرگی سەوز لەبەر دەكەن و ڕازاوە دەبن. گەیاندنی ئەو هەست و نەستانەش بە وەرگر و خوێنەر بەشداری پێكردنیانە لە دەقەكە و ئامادەگی دروستكردنێكە بۆ خۆشویستنی نیشتمانەكەیان.

**٢ـ شوێن وەكو پەیام و مەبەست:**

شاعیر بۆ گەیاندنی پەیام و مەبەستەكانی بە وەرگر و خوێنەر پەنای بۆ گەلێك شێواز بردووە لەوانە گێڕانەوە، دەمەتەقێ،.....هتد، یەكێك لەو شێوازە پڕ بایەخانەی كە شاعیر پەنای بۆ بردووە (شوێن) بووە، بەو پێیەی شوێن وەكو فەزایەك بۆ بوون و پانتاییەك كە خودی مرۆڤ و سروشت و گیانلەبەرانی لەخۆگرتووە، كاریگەریی زۆری لەسەر هەست و نەستەكانی شاعیر داناوە لەگەڵ ناخ و دەروونی ئاوێتە بووە و هەمیشە لەبەر چاو و دڵی شاعیردا بووە.

لەم چوارچێوەیەشدا شاعیر بەشێك لە پەیام و مەبەستەكانی بە شوێن سپاردووە و شوێنی كردۆتەوە ڕێگایەك بۆ گەیاندنی ئەو پەیام و مەبەستانە بە وەرگر. لێرەدا شوێن بەشێك لە خەسڵەت و سیماكانی خۆی لەدەستداوە و خاڵە

سەرەکییەکانی ئەو پەیام و مەبەستانەی شاعیری هەڵگرتووە. بەدیوێکی دیکەدا شوێن جیا لەوەی بەشداری لە دروستکردن و پێکهێنانی وێنەی شیعری کردووە، لەهەمان کاتیشدا بووە بە خاوەنی دوو ئەرك، ئەرکێکیان گەیاندنی ناواخن و ناوەرۆکی پێکهاتەی خۆی بووە وەکو شوێن، ئەرکەکەی دیکەیان گەیاندنی ئەو پەیام و مەبەست و دروشمانە بووە کە شاعیر پێی سپاردووە بە وەرگر و خوێنەری بگەیەنێت. دیارە هەست و نەستەکانی شاعیر زیاتر لەگەڵ ئەو شوێنانە و بەشداریکردنیان لەدەقدا جۆرە هارمۆنیایەکی دروستکردووە و دڵنەوایی و خۆشنوودییەکی بە شاعیر بەخشیوە. بۆ نموونە شاعیر دەڵێت:

**دیواری دیم ئەگەر چی چەوتە**
**دڵشادم بەوەی نادیم مزگەوتە**
**مزگەوتیش دیارە ماڵی خودایە**
**خۆخستنە ماڵیش پیشەی گەدایە** (دیوانی بێدڵ، ل١٩)

لەم دێرانەدا دوو شوێن لەلایەن شاعیرەوە ئەرکیان پێ سپێردراوە و بوونەتە هەڵگری پەیام و مەبەستی شاعیر و بەهۆی ئەو شوێنانە هزر و فەلسەفە و ڕوانینی شاعیر بۆ ئایین و دنیا بۆ وەرگر و خوێنەر گواستراونەتەوە. ئەو دوو شوێنە بریتین لە (مزگەوت) کە شوێنێکی ڕاستەقینە و دلگیر و هۆگر و گشتییە. لە بەرامبەردا (نادی) شوێنێکی واقیعی و تایبەتی و ناهۆگرە. ئەم دوو شوێنە بوونەتە هەڵگری هزر و فەلسەفە و تێڕوانینی شاعیر بۆ ژیان و هەر ئەم دوو شوێنەشە کۆمەڵێك واتا و مەبەست و دەلالەتی دەقەکە بۆ وەرگر و خوێنەر دەگوازنەوە و لەوێوە خوێنەر ڕێگایەکی ڕاستی پێ نیشان دەدرێت. شاعیر لە ڕێگای خولقاندنی دووانەی (نادی ـ مزگەوت) پارادۆکسێکی دروستکردووە و لە پێش خوێنەری داناوە بۆ ئەوەی سەرپشکی بکات لە هەڵبژاردنی شوێنێك، لەهەمان کاتیشدا هزر و فەلسەفە و ڕای تایبەتی خۆشی لەسەر ئەم دوو شوێنە بە وەرگر و خوێنەرەکە گەیاندووە (**دڵشادم بەوەی نادیم مزگەوتە**) ئەم ڕا دەربڕینە لایەنگریی شاعیر بۆ مزگەوت کە لێرەدا وەکو شوێنێك ئەرکێکی پێسپێردراوە کە نوێنەری بیروڕای ئایینی ئیسلامییە و هزر و فەلسەفەی ئیسلام بە وەرگر و خوێنەر دەگەیەنێت، لە بەرامبەردا ڕەتکردنەوەی (نادی) لەلایەن شاعیر کە دیارە وەکو شوێنێك ئەرکی

ئەوەی پێسپێردراوە کە نوێنەرایەتی ژیانی پڕوپووچی دنیا بکات کە کاتییە و پڕ لە دۆڕان و خۆ ونکردنە. سەرەڕای ئەمەش شاعیر بۆ دووپاتکردنەوەی بیروڕای خۆی شوێنی سێیەمی دروستکردووە کە زیاتر پارسەنگی بە هزر و فەلسەفەی ئیسلامیدا شکاوەتەوە و خواوەندیش بووە بە بەشێك لە پشتگیری لە گەیاندنی پەیام و مەبەستەکە، ئەو شوێنی سێیەم (ماڵ)ی خودایە **(مزگەوتیش دیارە ماڵی خودایە)**، لێرەدا ماڵ وەکو شوێنێك جیا لەوەی کە شوێنێکی راستەقینە و دڵگیر و هۆگر و تایبەتە، بەڵام پیرۆزییەکی وای پێبەخشراوە و بەناوی خواوەندی گەورە کراوە، لەمەشدا هێز لە دووالیزمی (نادی - مزگەوت) زیاتر بۆ لای مزگەوت شکاوەتەوە. ئەم دوو شوێنەش جیا لە واتای ئاسایی خۆیان لەم دێرە شیعرەدا بوونەتە هەڵگری واتا و مەبەستێك کە شاعیر وەکو ئەرکێك پێیانی سپاردووە.

لە پارچە شیعرێکی دیکەدا بەناوی (سکاڵا) شاعیر دەڵێت:

**ئەی خودایە تابەکەی ئێمە دەبێ ئاوارە بین**

**دەرکراو و بەش خوراو و بێ کەس و بێ چارە بین**

**گورگمان چاودێر بێ یا وەك چۆلەکە و کۆلارە بین**

**خاوەنی سامانی زۆر و بێ فلووس و پارە بین** (دیوانی بێدل، ل٣٣)

لەم دێرانەدا شوێن لە ئاستی سەرەوەی دەق بەدیار نەکەوتووە، بەڵکو لە ئاستی ناوەوەی دەق و لە ئەنجامی پێسپاردنی ئەرکێك لە لایەن شاعیرەوە بە شاراوەیی خۆی حەشارداوە. شاعیر هاوارو ناڵەو فیغانی بۆ خواوەند بەرز کردۆتەوە کە تا کەی میللەتەکەی ئاوارە بێت، ئاوارەبوونیش پەیوەندیی راستەوخۆی بەشوێنەوە هەیە و(( بەواتای دابڕان و دوورکەوتنەوە لە وڵات و خاك و نیشتمانی خۆت، لەخێزان و خزم و کەس و کار، جا بەزۆرەملێ بێت و ناچار بکرێت شوێنەکە جێ بهێڵێت، کە هەندێ جار ئەمە دەگاتە رادەی (نفي) کەسەکە، واتە لە شوێنە غەریبەکەش دەستبەسەر دەبێت و ناتوانێت بە ئارەزووی خۆی بجوولێتەوە، یان بەئارەزووی خودی کەسەکە دەبێت، کە لەلایەنی سیاسی، یان ئابووری، یان کۆمەڵایەتی، شوێنەکەی بەدڵ نییە و لەگەڵیدا ناگونجێت و کۆچ دەکات بۆ جێیەکی دیکە))[٤٤] کە لەوێش دووچاری نامۆیی و غەریبی و دەیان حاڵەتی دیکەی ناخۆشی دەروونی دەبێتەوە کە ئەمەش پەیوەستە بە خودی

شـوێنەکە، چـونکە ئـەو شـوێنەی کەبـە ئـاوارەیی پـەنای بـۆ دەبـەی، هەمیشـە شوێنێکە کراوە نییەو ناهۆگرە و دڵگیر و ئارەزوومەندانە نییە، بەتایبەتیش ئەگـەر وڵاتەکەت داگیرکراو بێت و لەسەر ئەوەی کە کورد بیت دەربکرێیـت و راو بنرێیـت. لێرەدا شوێن جیا لەوەی کە خۆی ئاماژەیەکـە بـۆ ئـەو جـۆرە حاڵاتانـە، لەهـەمان کاتیشدا بەشێك لـەو خەسـڵەت و سـیما و ئەدگارانـەی لەدەسـتداوە و شـوێنەکەی تەسـلیم بــە پــەیام و مەبەسـتەکانی شـاعیر کـردووە کـە دەربڕینـی ناڕەزاییيـە لەبەرامبەر ئەو زوڵم و زۆرداریيەی لـە میللەتەکـەی دەکرێت. شـوێن لێـرەدا وەکـو داواکارییەك بۆ کۆتایی پێهێنان بەو بارودۆخە خۆی دەنوێنێت.

لە شوێنێکی دیکەدا شاعیر دەڵێت:

**ژینی وای ناویٚ زەبوون بم، مردنم لا شادییە**

**گەر لە ڕێی هەولٚ و خەباتا تیٚ بچم ئازادییە**

**کۆت و زنجیر، بەندیخانە، وا دەزانم نادییە**

**بیٚ گومانە یەکیەتیمان گەر هەبیٚ رزگار ئەبین** (دیوانی بێدڵ، ل٣٤)

لێـرەدا دوو شـوێن ( بەندیخانـە) و (نـادی) هـاتوون و گشـتین بەرامبـەری یەکتری کراوان و بەیەکتری چوێندراون، شاعیر بۆ گەیاندنی پەیام و مەبەستەکانی خۆی پەنای بۆ دوو شوێن بردووە کە یەکێکیان چوونە ژوورەوەی بەدەست خـۆت نییە و ئەویتر بە ئارەزووی خۆتە بچی یان نا، هەڵبژاردنی ئەو دوو شـوێنە لەلایـەن شاعیرەوە بەهۆشیارییەوە تـەواوە بـووە و وێنایـەکی وای لای وەرگـر و خوێنـەر و ئەوی دیکە دورستکردووە کە کەسانی ئازا و تێکۆشەر چـوونیان بـۆ بەندیخانـە بـە دەست خۆیانەو بە ئارەزووی خۆیان هەر کاتێك بیانـەوێت دەچـن بـۆ بەندیخانـە و لای ئەوان بەندیخانە هیچ جیاوازییەکی ئەوتۆی لەگەڵ نادی نییە کـە شـوێنێکە بـۆ خۆشی و سەفا، بەهەمان شێوە سەبارەت بە شاعیرەوە بەندیخانەش شوێنێکە بـۆ خۆشــی و ســەفا و شــادی، ئەمــەش وەکــو بەگژداهاتنەوەیــەك بــۆ رژێمــە داگیرکەرەکانی کوردسـتان. شـاعیر بـۆ گەیانـدنی کـۆی ئـەو پـەیام و مەبەسـتانە پشتی بە شوێن بەستووە و کردوویەتییە کۆڵەکە و ستراتیژییەتی دەقەکەی.

لێرەدا ئەو شوێنانە خەسـڵەت و سـیما و ئـەدگارەکانی خۆیـان ونکـردووە و لەلایەن شاعیرەوە خەسڵەت و سیما و ئەدگاری نوێیـان بـۆ دروسـتکراوە و بـەپێی

پــەیام و مەبەســتەکانی شــاعیریش ئاراســتەکراون. ئــەو زانیارییانــەی کــە لــە بەکارهێنانی ئەم شوێنانەدا هاتووە، جۆرێکە لەو زانیارییانەی کە وەرگر و خوێنەر چاوەڕوانی ناکەن و هەست بەو جۆرە وەزیفەی ئەو شوێنانە ناکەن. هەروەها ئەم دوو شــوێنە ( بەندیخانــە) و (نــادی) هــەردووکیان شــوێنی واقیعــی و گشــتین و بێگومان بەندیخانە شوێنێکی ناهۆگر و داخراوە و نادیش بە پێچەوانەوە شـوێنێکە بە ڕێژەیەك لە ڕێژەکان ویستراوە و کراوەشە.

شاعیر لەبارەی جەژنی نەورۆزەوە دەڵێت:

**ئەمڕۆ نەورۆزە داخەکەم**

**وشك و بێ ئاوە باخەکەم**

**چەند چۆڵە شاخ و داخەکەم**

**لە جێی گۆرانی ئاخ ئەکەم** ( دیوانی بێدڵ، ل٦٤)

لەم دێرە شیعرانەشدا دوو شوێن بەکارهاتوون و لە پانتـایی دەقـدا ئـەرکیان پێ سپێردراوە، ئەوانیش شوێنی (بـاخ)ە کـە شـوێنێکی گشـتی و کـراوەو هـۆگر و واقیعییە و هەروەها شوێنی (شاخ) کە ئەویش شوێنێکی واقیعی و کراوە و هۆگرە. ئــەم شــوێنانە لەلایــەن شــاعیرەوە بــە پێچــەوانەی واتــا و دەلالەتەکانیانــەوە بەکارهاتووە، باخ ئەگەر وشك و بێ ئاو بێت، ئەو جوانی و ڕازاوەیییەی نامێنێـت و دوای ماوەیەکی کـورت کەسکایی نامێنێت و دەبێتـە خـۆڵ، هـەروەها چـۆڵبوونی شاخیش واتـە نـەبوونی ئـاوەدانی و نیشـتەجێبوونە و زیـاتر بـەمانای کارەسـات و وێرانییە، ئەو مانایانەی کە زیاتر شاعیر مەبەستی بووە و کردوویەتییە پەیامێك بۆ وەرگر و خوێنەر هەواڵێکی ناخۆش و پڕ لە نەهامەتی بووە کە بەو جەژنە نەورۆزە میللەتی کورد سەربەخۆ نییە و لـە ژێـر دەسـەڵاتی دوژمنـدا دەژیـت، کـە ئەمـەش زانیارییەکانی نێو دەقە و دیارە ئەو زانیارییانەش نوێ نـین و زیـاتر لـە دەربڕینـی هەست و نەستەکانی خـودی شـاعیر خۆیـەتی و لـەم پێناوەشـدا شـوێن بـووە بـە دەربڕی ئەو هەست و نەستانە.

هەروەها لە (جوانی بێ وێنەدا) دەڵێت:

**گوتی ئەی هەژار نزات بێ سوودە**

**هیچی دی مەکە قسەی بێ هوودە**

**من لە ئاسمان و تۆ لەسەر زەوی**

**من گەلێ بەرز و تۆ یەجگار نەوی** ( دیوانی بێدڵ، ل٥٧).

لەم پارچەیەشدا دوو شوێن بەکارهێنراون ئەوانیش (ئاسمان) و( زەوی)ین کە هەردووکیان شوێنی واقیعی و گشتی و هۆگرن، بەکارهێنانی ئەم دوو شوێنە لەلایەن شاعیرەوە بۆدەربڕینی ئاستی ژێرەوەی واتا و مەبەست و دەلالەتەکانیان بووە، دیارە ئەو دێرانە گفتوگۆیەکن لەلایەن خودی شاعیر و کچێك، کە تێیدا کچەکە خۆی بەگەورەتر و باشتر و دەوڵەمەندتر لە شاعیر لەقەڵەم دەدات، بۆ گەیاندنی ئەو مەبەستانەش شاعیر ئاسمان دەکاتە دەلالەتێك بۆ بەرزی و دەوڵەمەندی و زەویش دەکاتە دەلالەت و مەبەستێك بۆ هەژاری و نزمیی خۆیەوە. شوێن لێرەدا خەسڵەت و سیفاتەکانی خۆی ونکردووە و خەسڵەت و سیما و واتا و دەلالەتی نوێی بۆ داتاشراوە و زانیاریی نوێی بۆ دروستکراوە و ئەمەش بۆ ئەوەی کە ئاستی جیاوازییەکانی نێوانیان بە وەرگر و خوێنەر بگەیەنێت.

**٣ـ شوێن وەکو بنچینە و بناغەی پێکهێنانی دەق:**

شاعیر لە بەشێك لە دەقەکانیدا وەها کەوتۆتە ژێر کاریگەریی شوێنەوە، کە دەقەکەی سەرانسەری لەسەر بنچینە و بناغەی شوێن بنیاد نراوە، بەو واتایەی ئەو دەقانەی  کە بەتەواوەتی دەسەڵاتی شوێنیان بەسەردا زاڵە و شوێن بووە بە تەوەر و چەقی ڕووداوەکان، دەتوانین بە (دەقی شوێن) ناویان ببەین، کە دەقی شوێنیش ئەو دەقەیە کە شوێن تێیدا فەرمانڕەوایە و خۆی سوڵتانی دەقە و بنچینە و بناغە و پانتایی دەق پێکدەهێنێت. بوونی شوێن لە دەقی شوێندا وەها زاڵ و ڕەهایە کە پەیام و مەبەست و ستراتیژییەتی دەقیش لەخۆ دەگرێت و لە ڕووی تەکنیکیشەوە تەواوی وێنە شیعرییەکانی دەقەکەشی لەسەر بنیاد دەنرێت.

لەم جۆرە دەقانەدا شاعیر ڕوئیا و هزر و فەلسەفەی خۆی لەسەر پێگەی شوێن دروست دەکات و شوێن دەکاتە سەکۆیەك بۆ دەربڕینی بیروڕایەکانی و گەیاندنی مەبەست و پەیامەکانی بەوەرگر و خوێنەر.

لەم چوارچێوەیەدا (بێدڵ)ی شاعیر بەشێك لە دەقەکانی دەتوانین بە دەقی شوێن ناو ببەین، بەوپێیەی شاعیر سوودێکی زۆری لە شوێن وەرگرتووە بۆ دامەزراندنی چەقی ڕووداوەکانی نێو دەقەکانی و  گەیاندنی هزر و فەلسەفە و

ڕوانینەکانی بە ئەویدیکەوە. بۆ نموونە شاعیر لە دەقێکیدا بەناونیشانی ( ١٩ی حوزەیران)ەوە دەڵێت:

**بەبیرم دێ شەوی هەژدە لەسەر نۆزدەی حوەزیران بوو**
**خرۆشابوو سلێمانی لە هەر لا شین و گریان بوو**
**ژن و پیاو جوان و پیر هەتاکو رۆژ گەزەنکی دا**
**درشت و وردی ئەم شارە خەریکی خۆپیشاندان بوو**
**بە ئاهی سەرد و ناڵینی دەروونی دایکی دڵسۆزی**
**وەتەن ئەشکی دەرِشت و ئاسمان تەم سینە بریان بوو......**

( دیوانی بێدڵ، ل٢١)

لەم دەقەدا شاعیر کاتێك لە سلێمانی بووە و تەرمی هەر چوار ئەفسەرە شەهیدەکە گەیشتووە و سلێمانی خرۆشاوە و خۆپیشاندانێکی گەورەیان سازکردووە، دیارە ئەم رووداوە لە سلێمانی کاریگەری لەسەر شاعیر داناوەو بەمەش شوێن بەهاوبەشی لەگەڵ رووداودا بوونەتە بنچینە و بناغەی پێکهێنانی دەقەکە و چەقی دەق لەسەر شوێن و رووداو وەستاوە و بنیادنراوە. هەر چەندە لەم دەقەدا زیاتر رووداو بەرچاوترە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا شوێنی رووداوەکە بووەتە تەوەری پێکهێنانی پانتایی دەق، چونکە (( شوێن خاوەنی ناسنامە و هەڵگری دەلالەت و دەسەلاٌت و سیستم و کەش و رەهەند و سروشتی خۆیەتی))[٤٥]. و بەبێ ئەو هیچ یەکێك لە توخم و تەکنیکەکانی دیکە توانای دروستکردن و بنیادنان و بەرەو پێشبردنی ژیانی دەقیان نییە و لەم شیعرەشدا رووداو لەسەر بناغەی شوێن بنیادنراوە و باسی لێوەکراوە، چونکە ((رووداوەکانیش لە بۆشاییدا روونادەن و ئەگەر لە شوێنیش دابیبڕی و جیای بکەیەوە، گێڕانەوەیان مەحاڵ دەبێت)) [٤٦]. بۆیە دەتوانین بڵێین ئەم دەقە (دەقی شوێن)ە و شاعیر بە لێزانی و لێهاتوویی سوودی لە شوێن و رووداوەکانی ئەو شوێنەی وەرگرتووە و لە دەقێکی شیعریدا تەوزیفی کردوون.

لە دەقێکی شیعریی دیکەدا بەناونیشانی ( نەورۆزی ١٩٧١) شاعیر دەڵێت:

**نیشتمانێ هەندە دیار بێ**
**(کاف) و (واو) وەکو مار بێ**
**(ڕێ)ی خەنجەری جەوهەردار بێ**
**ڕۆڵەی ئامادە بێ و چەکدار**
**(دال)ی شەشاگردی بەر پشت**
**ڕۆڵەکانی خۆ بدەن بە کوشت**
**پیر و جوان و ورد و درشت**
**هەر لە زەنگین هەتا هەژار**
**(سین) و (تێ)شی وەك چیا بێ**
**شێر و پڵنگی تیا بێ**
**گوللەیان لا وەکو با بێ**
**دوژمن گەر یەك بێ گەر هەزار**
**(ئەلف)ی تفەنگی سەر شان بێ**
**مەڵبەندی کورد و گۆران بێ**
**سەرۆك مستەفای بارزان بێ**
**جا چۆن دەبێ نەبێ ڕزگار**
**(نون)ی وەکو مانگی ئاسمان**
**ڕۆڵەکانی بەدڵ و گیان**
**تێ بکۆشن بۆ نیشتمان**
**بەرەو مەرگ بچن بەغار.....** ( دیوانی بێدڵ، ل ٢٩-٣٠)

لەم دێرە شیعرانەدا شوێن بووە بە بنچینە و بناغەی پێکهێنانی دەق و پەیام و مەبەست و ستراتیژییەتی دەق بەهۆی شوێنەوە گواستراوەتەوە بۆ وەرگر و خوێنەر و شوێن ڕۆڵی کەناڵی گەیاندنی بینیوە لەم گواستنەوەیەدا. دەق لێرەدا لەسەر بنچینە و بناغەی شوێنێك کە (کوردستان)ە نیشتمانی شاعیرە خولقێنراوە. ئەو شوێنە نەك هەر بەخۆی وەکو شوێن بووە پێکهێنەری پانتایی دەق، بەڵکو ناوەکەشی لە ناو دەقدا ڕۆڵی پێدراوە و ڕووداوەکانی نێو دەقی لەسەر بنیادنراوە، پیتەکانی ناوی شوێن کە (کوردستان)ە لەناو ڕستە و وشەکانی دەقدا بڵاوبۆتەوە

و تانوپۆی دەقیان لەئەستۆ گرتووە. شاعیر ویستوویەتی بە تەکنیکەوە بەشێك لە پەیامەکەی کە پارێزگاری و خۆشەویستن و فیداکارییە بۆ نیشتمان بە بەرامبەرەکەی بگەیەنێت. زانیارییەکانی ناو دەقیش لەسەر هەمان ریتم رۆیشتوون و بەپێی بنەما هزری و فەلسەفییەکانی شاعیر لەدەقەکەدا پەخش و بڵاوبوونەتەوە، لەمەشدا شوێن دووبارە رۆڵی خۆی بینیوە لەسەر گەیاندنی ئەو هزرانەدا. ئەم دەقە لە راستیدا لەژێر رکێفی راستەوخۆی شوێندایە، شوێن دەسەڵاتێکی رەها و زاڵی بەسەردا هەیە و ئەگەر شوێن نەبوایە، بێگومان ئەم دەقە رووناکی نەدەدیت و نەدەهاتە ناو کۆڕی ژیانەوە، لەبەر ئەوەش دەتوانین بە (دەقی شوێن)ی دابینێین و بڵێین کە ئەم دەقە یەکێکە لەو دەقانەی شاعیر، کە شوێن بووە بە هۆکاری لەدایکبوونی دەق.

لە دەقێکی دیکەدا بەناونیشانی ( بەزمانی هاوڕێیەکی خانەقینی)، شاعیر دەڵێت:

**لەم چەند رۆژانەی پشووی نیوەی ساڵ**
**ئاوی ئەڵوەندم هاتەوە خەیاڵ**
**لەگەڵ شارەکەی جوان و دڵگیرم**
**هەوارگەی کۆنی باب و باپیرم**
**بەناوی سەردان چووم بۆ خانەقین**
**بەڵکو لابەرم لە دڵ غەم و قین**
**ئەوەندەم خۆش بوو تا گەییمە ئەوێ**
**وام لێ بەسەر هات نەمێنمە شەوێ**............ ( دیوانی بێدڵ، ل٣٧)

لەم دەقەشدا شوێن رۆڵی سەرەکی گێڕاوە لەناو دەقدا و بەبێ بوونی شوێن، دەق بوونی نەدەبوو، چونکە بنچینەو بناغەی پێکهێنانی دەق شوێنەکەیە و بەهۆی شوێنەوە رووداو و کات و تەکنیکەکانی دیکە توانای ژیانیان وەرگرتووەو لەناو دەقدا هەناسەیان داوە. بنیادنانی دەق لێرەدا بەدوو قۆناغدا تێپەڕیوە، قۆناغی یەکەمیان شاعیر شارۆچکەی خانەقینی هاتۆتەوە بیری و نۆستالۆژیانە یادەوەریی رۆژانی ئەوێی کردۆتەوە، ئینجا ئەم قۆناغە بووە بە هەوێنی لەدایکبوونی دەقەکە. بەدیوێکی دیکەدا شاعیر سەرەتا شوێنێك هاتۆتەوە ناو

خەیاڵی کە پێشتر بە واقیعانە لێی بووە و تێیدا ژیاوە و دواتر یادەوەرییەکانی تایبەت بەو شوێنەی هاتۆتەوە خەیاڵ و ئینجا لە قۆناغی کۆتاییدا هەموو ئەو یادەوەری و بیرهاتنانەی لە چوارچێوەی دەقێکدا داڕشتووە. بەم پێیەش ئەگەر لە سەرەتادا شوێن بوونی نەبوایە، بێگومان ئەوا ئەم دەقەش ڕووناکی نەدەدیت. لە هەمان کاتیشدا زانیارییەکانی ناو دەقیش لەسەر هەمان پێوەرە و بەشێوەیەکی فلاشباك ڕووداوەکانی پێشتر کە شاعیر لەو شوێنەدا ژیاوە بۆ وەرگر و خوێنەر دەگێڕێتەوە.. ئەو شوێنە کاریگەری لەسەر ژینگە و سروشتی ڕووداوەکە دروست دەکات و لە پەرەسەندن و بەرەوپێشبردنی ڕووداوەکەدا تا گەیشتنی بە ترۆپك بەشدار دەبێت و تایبەتمەندییەکانی دەق لە ڕووی کەلتووری و جوگرافی و سروشتی و کۆمەڵایەتییەوە دەخاتەڕوو. ئەو زانیارییانە، زیاتر زانیاری و ئەزموونی کەسین و مەبەستی ئەوەیە کە هەم زانیاری لەبارەی شوێنەکە و دیاردەکانی بخاتە بەردەم خوێنەر و هەمیش بەشداریکردنی خوێنەر و وەرگرە لەو گێڕانەوانەدا. ئەم دەقەش، دەقێکی شوێنییە و شوێن تانوپۆی ڕووداوەکانی پێکهێناوە و دەسەڵات و جێ پەنجەی شوێن بەهەموو جەستەی دەقەکەدا جێگیر و دیارە.

**ئەنجام**

لە کۆتایی ئەم لێکۆڵینەوەیەدا گرنگترین ئەو ئەنجامانەی کە بەدەستهاتوون دەیخەینەڕوو:

١- شوێن یەکێکە لەو توخمانەی کە بەشداری لە تانوپۆی دەق دەکەن و لەکۆنەوە لەلایەن ڕەخنەگران و فەیلەسووفانەوە جێگەی تێڕامان و لێکۆڵینەوە بووە و هەر لە فەیلەسووفانی گریکەوە تا سەردەمی ڕۆشنگەری و ڕێنیسانس و هاوچەرخەوە، شوێن پێگە و ڕۆڵی دیاری لە نووسین و لێکۆڵینەوەکانیان گرتووە.

٢- شوێن لە شیعری کوردیدا، چ لە شیعری کلاسیکی و چ لە شیعری نوێ و هاوچەرخدا جێگەی تێڕوانین و بایەخدانی شاعیران بووە و لە گەلێك لە دەقەکانیاندا شوێنیان کردۆتە بنچینە و بناغەی پێکهێنان و بنیادنانی دەق و لە هەمان کاتیشدا پشتیان بە شوێن بەستووە و کردوویانەتە ڕێگە و شێوازێك بۆ گواستنەوەی پەیام و مەبەستەکانیان بۆ وەرگر و خوێنەر.

٣- (بێدڵ)ی شاعیر یەکێك بووە لەو شاعیرانەی کە سوودێکی زۆری لە وزە و هێزی شوێن بینیوە و وەکو توخمێك لە دەقەکانیدا تەوزیفی کردووە.

٤- بێدڵ وەکو شاعیرێك لە دەقەکانیدا شوێنی وەك تەواوکارییەکی وێنەی شیعری بەکارهێناوە و هەروەها شوێنی کردووە بە ڕێگەیەك بۆ گەیاندنی پەیام و مەبەست و هزر و فەلسەفە و تێڕوانینەکانی.

٥- بێدڵ توانیویەتی بەهۆی شوێنەوە (دەقی شوێن) بەرهەم بهێنێت کە دەقێکە شوێن تێیدا بنچینە و بناغەی پێکهێنانی دەق لە ئەستۆ دەگرێت و دەسەڵات و حوکمی ڕاستەقینەی دەقی لەدەست دەبێت و پانتایی و تانوپۆی دەق دروست دەکات، بەشێوەیەك کە ئەگەر شوێن نەبێت، ئەوا دەقیش بوونی نابێت.

## سەرچاوە و پەراوێز:


١. سەلام ناوخۆش، فەرهەنگی ئۆکسفۆرد (ئینگلیزی – کوردی )، سلێمانی، ٢٠٠٦، ل٣٥٢.

٢. ڕزگار کەریم، فەرهەنگی ژیر (عەرەبی – کوردی )، سلێمانی،٢٠١٠، ل ٦٩٦.

٣. فازل نیزامەدین، فەرهەنگی ئەستێرەگەشە (کوردی – عەرەبی)، دەزگای چاپ و بلاٌوکردنەوەی ئاراس، چاپی سێیەم، هەولێر، ٢٠٠٣، ل ٢١٦.

٤. هەژار موکریانی، فەرهەنگی هەمبانە بۆرینە (کوردی – فارسی)، چاپخانەی أنتیشارات، چاپی شەشەم، تاران، ١٣٣٨، ل ٤٧٩.

٥. هەمان سەرچاوە، ل ٤٧٩.

٦. شوێن و مانەوە (بەشی دووەم)، نەجات حەمید ئەحمەد، گۆڤاری نەو شەفەق، ژ ٥٠، کانوونی دووەم، ٢٠٠٧، ل ٤٦.

٧. ئاساییکردنەوەی شوێنی پیرۆز، محەمەد نوری ئەحمەد، گۆڤاری ئایندە، ژ٣٨، دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم، سلێمانی، ٢٠٠٢.

٨. سەباح ئیسماعیل، چەمك و ئیستاتیکای شوێن لە ئەدەبدا، دەزگای چاپ و بلاٌوکردنەوەی ئاراس، چاپی یەکەم، هەولێر، ٢٠٠٩، ل ٢٨.

٩. هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل ٢٩.

١٠. تانیا ئەسعەد محەمەد ساڵح، بینای شوێن لە دوو نموونەی ڕۆمانی کوردیدا (هێلانە. ئەژدیها)، دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم، چاپی یەکەم، سلێمانی، ٢٠١١، ل ٢ – ٣٠.

١١. شوێن لە ڕۆمانی درزدا (١ –٢)، حوسێن سابیر عەلی، گۆڤاری ڕامان، ژ ٤٥، دەزگای ڕۆشنبیری و ڕاگەیاندنی گولان، هەولێر، ٢٠٠٠، ل ٤٠.

١٢. جاستون باشلار، جمالیات المکان، ت: غالب هلسا، دار الحریة للطباعة، بغداد_ العراق، ١٩٨٠، ص٢٧.

١٣. فتحیة کحلوش، بلاغة المکان، قراءة في مکانیة النص الشعري، مؤسسة الآنتشار العربي، بیروت ـ لبنان، الطبعة الاولی، ٢٠٠٨، ص١٧–١٨.

١٤. هەمان سەرچاوە، ل٢٧.

١٥. جاستون باشلار، جمالیات المکان، ت: غالب هلسا، دار الحریة للطباعة، بغداد_ العراق، ١٩٨٠، ص٤٤.

١٦. صلاح صالح، قضایا المکان الروائي في الأدب المعاصر، دار شرقیات للنشر والتوزیع، الطبعة الأولی، ١٩٩٧، ص ١١.

١٧.فتحية كحلوش، بلاغة المكان، قراءة في مكانية النص الشعري، ص١٩.
١٨.سەنگەر قادر شێخ محەمەد حاجی، بنیاتی گێڕانەوە لە داستانی (مەم و زین)ی ئەحمەدی خانی و ڕۆمانی (شاری مۆسیقارە سپییەکان)ی بەختیار عەلی دا، دەزگای توێژینەوە و بلاوکراوەکانی موکریانی، چاپی یەکەم، دهۆك، ٢٠٠٩، ل١٢٣.
١٩. هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل ١٣٣.
٢٠. پەری ساڵح حەمید موفتی، گێڕانەوە لە کۆچیرۆکەکانی ئەحمەد محەمەد ئیسماعیل، تێزی دکتۆرا، زانکۆی سەلاحەددین کۆلیژی ئاداب، هەولێر، ٢٠١١، ل ١٠٥.
٢١. فتحية كحلوش، بلاغة المكان، قراءة في مكانية النص الشعري، ص١٩.
٢٢. ابراهيم خليل، بنية النص الروائي، دار العربية للعلوم ناشرون، الطبعة الأولى، ٢٠١٠، ص١٣٣.
٢٣.فتحية كحلوش، بلاغة المكان، قراءة في مكانية النص الشعري، ص٢٣–٢٤.
٢٤. صلاح صالح، قضايا المكان الروائي في الأدب المعاصر، ص ٤٢–٦٤.
٢٥. ابراهيم خليل، بنية النص الروائي، ص١٣٣–١٤٦.
٢٦.شوێن لە ڕۆمانی درزدا، حوسێن سابیر عەلی، ل ٤٢.
٢٧.پەری ساڵح حەمید موفتی، گێڕانەوە لە کۆ چیرۆکەکانی (ئەحمەد محەمەد ئیسماعیل، ل ١٢٩.
٢٨.هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل ١٢٩ .
٢٩. پەرێز سابیر، بینای هونەری چیرۆکی کوردی لە سەرەتاوە تا کۆتایی جەنگی دووەمی جیهانی، ل٣٢٩.
٣٠. زاهیر ڕۆژبەیانی، چیرۆکی هونەری کوردی شێوە و شێواز و بونیاد، چاپخانەی وەزارەتی ڕۆشنبیری، هەولێر، ١٩٩٧، ل ٢٢٧.
٣١. سەباح ئیسماعیل، چەمك و ئیستاتیکای شوێن لە ئەدەبدا، ل ٤٣.
٣٢.پەری ساڵح حەمید موفتی، شوێن لە چیرۆکەکانی ئەحمەد محەمەد ئیسماعیل دا، ل ٩.
٣٣.هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل ٢ – ٣٠.
٣٤. سەباح ئیسماعیل، چەمك و ئیستاتیکای شوێن لە ئەدەبدا، ل ٤٧.
٣٥.د. نەسرین فەخری، یاری لە کوردەواریدا، بەرگی سێیەم، سلێمانی ـ کوردستانی عێراق ٢٠٠٥، ل١٠١.
٣٦.عەبدوڵلا پەشێو، برووسکە چاندن، شیعر، چاپخانەی ڕۆشنبیری ـ هەولێر، ٢٠٠١، ل٤٣.

٣٧. کـەریم دەشـتی، دیـوانی کـەریم دەشـتی، بـەرگی سـێیەم، چـاپخانەی ڕۆژهـەڵات، هەولێر، ل ٧٦.
٣٨. سـەباح ڕەنجـدەر، دوو کتێـب لـەبارەی شـیعرەوە، دەزگـای توێژینـەوە و بڵاوکردنەوەی موکریانی، هەولێر ٢٠١١ ل ١٩.
٣٩.عەبدولموتـەلیب عەبـدوڵڵا، شـوێنکاتی یەکـەم لـە دووەم و ئێسـتای سـەگوەڕ، چاپخانەی ڕەنج، هەولێر ٢٠٠٤، ل ٧٤.
٤٠. حـەکیم مـەلا سـاڵح، ئـەنوەری مەسـیفی لـە سـێ ئـەزموونی شـیعریدا، چـاپخانەی ڕۆشنبیری، هەولێر ٢٠٠٦، ل٨٤.

* بێـدڵی شـاعیر نـاوی تـەواوی ( عەبـدوڵڵا محەمـەد عەبدوڵڵا)یـە لەسـاڵی (١٩٢٦) لـە گونـدی (قـەبلان)ی ناوچـەی (کەنـدێناوە) لـەدایك بـووە، سـەرەتای خوێنـدنی دەگەڕێتـەوە بـۆ حـوجرە و لای بـاوکی خوێندوویـەتی و دواتـر بـەنیازی تـەواوکردنی خوێنـدن دەیـان شـوێن و ناوچـەی جۆراوجـۆری کوردسـتان گـەڕاوە تـا ئیجـازەی مەلایەتی وەرگرتووە، لەساڵی (١٩٦٠) بە مامۆستای سەرەتایی دامەزراوە، بێجگە لە زمـانی کـوردی، زمـانی عـەرەبی و فارسـی زانیـوە و لەسـاڵی (١٩٧٥) دوای شـاڵاوی تـەعریب و ڕاگواسـتن گونـدەکان وێـران دەکرێـت و دەگوازێتـەوە هـەولێر و لەسـاڵی (١٩٨٦) هەر لە هەولێر کۆچی دوایی کردووە.

٤١. جميلة صدام، المكـان في شـعر أبـي نـواس، مجلـة (الآداب) الجـزء الأول ـ اللسـانيات، العدد (٩٠)، كلية الآداب ـ بغداد ٢٠٠٩، ل ١٧٩.
٤٢. صلاح صالح، قضايا المكـان الروائـي في الأدب المعاصـر، الطبعـة الاولى، دار شـرقيات للنشر والتوزيع، القاهرة ـ مصر ١٩٩٧، ص١١.
٤٣.جاستون باشلار، جماليات المكان، ت: غالب هلسا، دار الحرية للطباعة، بغداد ـ العراق ١٩٨٠، ص٦.
٤٤. ناز ئەحمەد سەعید، غوربەت و ڕەنگدانەوەی لە شـیعرەکانی (سـالم)دا، بڵاوکـراوەی (ڕۆڤار)، ژمارە (٧٧)، تشرینی یەکەمی ٢٠١٣، ل٤٨.
٤٥. سـەباح ئیسـماعیل، چـەمك و ئیسـتاتیکای شـوێن لـە ئەدەبـدا، دەزگـای چـاپ و بڵاوکردنەوەی ئاراس، چاپی یەکەم، هەولێر ـ کوردستانی عێراق، ٢٠٠٩، ل٢٤.
٤٦.صلاح صالح، قضايا المكان الروائي في الأدب المعاصر، ص١٢.

## ملخص البحث

المكان عنصر مهم من العناصر التي تصنع التكنيك والتكوين في عرض النص وتفتح لها مكانته. وفي نفس الوقت فأن المكان ومن دون عناصر ( الحدث والزمان والشخصية.... الخ) لا يمكن له أن يعيش أو يتنفس، لذلك يجد المكان أهمية مع هذه العناصر. المكان بنى مكانته وحجمه وجذوره منذ القدم والشعراء وفي مجالات كثيرة ولإيصال اهدافهم لجأوا اليه.

في كثير من الأماكن ( المكان) كتكنيك ساعد الشعراء واشترك في نسج كامل النص الشعري وأعطاه قوةً وطاقةً كثيرة ليجعل هذا الشعر مجيداً.

في هذا البحث نحاول أن نعرف مكانة وشخصية وحجم المكان ونبين الأبعاد ونشير الي انواعه ونوضح دوره وحركته في النص الشعري ونلمس هذا التعريف للمكان وبيان دوره وكمثال لشعر أحد الشعراء وهو الشاعر ( بێدڵ)، حيث أصبح المكان في كثير من شعره حجر اساس ودوره الفعال في اشعاره.

## Abstract

Location is an important element in poetry that makes the technique and composition for the presentation of text. At the same time, the place and without the elements (event, time and character.... etc) cannot live or breathe. Therefore ,place(location) has found its importance with these elements. Place built its position and its size and its roots a long time ago, and poets have resorted to its use in several areas.

In many places (place) such technique helped poets and participated in the entire poetic text and gave him the strength and energy to makes this glorious texture.

In this paper, we try to know the status of the character and size of the place an; show dimensions and refer to the kinds then explain its role and movement in the poetic text and we see this definition of the place and the statement of its role for samples we have selected Bêdl's poems, where the place in many of his poetry became the foundation stone and plays an effective role in the poems.

# ئۆتۆبیۆگرافی و بیۆگرافی وەك ژانرێكی نوێ لە ئەدەبی كوردیدا

د. موحسین ئەحمەد عومەر

## پێشەكی

تا كۆتایی سەدەی نۆزدەم و سەرەتای سەدەی بیستەم، شیعر تاقە جۆری ئەدەبی كوردی بوو، دەتوانین بڵێین ئەم هەڵكەوتە تا ئێستاش بە چەشنێك بەردەوامە، بەو مانایەی جۆربەجۆر بوون و هەمەچەشن بوونی ئەدەبی كوردی یان دەوڵەمەندبوون بە ئاراستەی فۆرم و جۆری تر وەك پرۆسەیەكی ئەدەبی و كولتووری بە درێژایی سەدەی بیستەم بەردەوام بووە. هەموو ئەو جۆر و فۆرمە ئەدەبییانەی بە پەخشان دەنووسرێن وەك چیرۆك، رۆمان، وتار...هتد، لەسەرخۆ و بە شێنەیی سەرهەڵدەدەن و گەشە دەكەن، ئەمەش بە درێژایی سەدەی بیستەم بەردەوام دەبن. لە ناو ئەمانە دەركەوتن و گەشەسەندنی ئۆتۆبیۆگرافی و بیۆگرافی (یان ئۆتۆبایۆگرافی و بایۆگرافی) جۆرەكانی تری لەمانە نزیك بە هەمان ئاستی شیعر و نوێبوونەوەكان دەگەڕێتەوە بۆ سەرەتاكانی سەدەی بیستەم. هەر لە دوای بزووتنەوەكانی شێخ مەحموودی حەفید دوو كەسایەتی كوردیمان هەن "رەفیق حلمی و ئەحمەد خواجە" بەسەرهات و سەرگوزەشتە "mémoires"ی خۆیان لە بارەی سەردەمەكەوە نووسیوە: ١- یاداشت، رەفیق حلمی ٢- چیم دی، ئەحمەد خواجە (بەڵام ئەم دوو تێكستە بە داخەوە زۆر درەنگتر لە چاو سەردەمی بەسەرهاتەكان بڵاوبوونەتەوە، بۆیە كاریگەریشیان درەنگ كەوتۆتەوە) ئەمە سەرەتایەكی زۆر روون و بەرچاوە. پاشان ئێمە ماوەیەكی بێدەنگمان هەیە، ئەمەش تا رادەیەك تەواوی ساڵانی چلەكان دەگرێتەوە تا كۆتایی هەشتاكانی سەدەی بیستەم. بەڵام لە دوای ساڵی ١٩٩٢ەوە لێشاوێكی زۆری تێكستی: ژیاننامە Autobiographie یاداشت یان گەشتی ژیان Biographie، بیرەوەری و یادەوەری souvenirs و بەسەرهات و سەرگوزەشتە mémoires و رۆژانە یاداشت

Journal-Intime و دەفتــەری یاداشــت Carnets ، ...هتـد، بڵاودەبێتــەوە، تــا رادەیــەكیش وەك مــۆدێكی چــاولێكەری لێ دێ ، زۆركــەس بــە لاســاییكردنەوەی كەسانی تر بیرەوەری و بەسەرهاتی خۆیان تۆمار دەكەن، هەندێكیش لە روانگـەی پێویسـتیی سـەردەم و گـوتنی هەقیقـەت ئـەم كارەیـان كـردووە، لەگـەڵ ئەمـەش نازانین ئەوەی بیرەوەری خۆی دەنووسێتەوە ئایا دەتوانێ هەقیقـەت بگێڕێتـەوە، ئەم لایەنە هـەردەم وەك پرسـیاری وەڵام نـەدراوە دەمێنێتـەوە، بـەڵام بـە گشـتی دەشێ فاكتەری نووسـینەوە و هانـدانی تۆمـاركردنی رووداو و بەسـەرهاتەكان زۆر بن، دەشێ بـۆ هەنـدێك لـە روانگەیـەكی تـەواو ئیـدیۆلۆژی بـێ (كـە نموونـەی لـەم جۆرەش زۆرن لە ناو ئەو بیبلۆگرافیایەی ئێمە ئامادەمان كـردووە و بەشـێكە لـەم لێكۆڵینەوەیە) لـە روانگـەی ئـەم كەسـەوە دەشـێ گـوتنی هەقیقـەت بـەیانكردن و گەیاندنی ئیدیۆلۆژییەكەی خۆی بـێ، بـۆ یـەكێكی تـر، بـە تایبـەتی بـۆ سـەركردە سیاسی و پێشمەرگەكان، گەیاندن و تۆماركردنی خەبات و تێكۆشـینی كوردایـەتی خۆیان، گێڕانەوەی بەسەرهات و سەرگوزەشتەیان، گوتنی هەقیقەت بێ.

ئەم جۆرە ئەدەبییە نوێیە لە ئەدەب و رۆشنبیریی كوردیدا، بـە شـێنەیی و لەسەرخۆ گەشەی كـردووە، تـا ئێسـتاش لێكۆڵینەوەیـەكی زۆر كـەم لـەم بـوارەدا كـراوە، ئەمــەی بەردەســت هەوڵێكــە بــەو ئاراســتەیە، بــاس لــە ســەرهەڵدان و دەركەوتنی ئۆتۆبیۆگرافی و بیۆگرافی و جۆرەكانیان دەكەین لە ئەدەبی جیهانی و كوردی، ئینجـا ناسـاندنی تیـۆری، پاشـان لێكدانـەوە و شـیكردنەوەی جۆرەكـانی ئۆتۆبیۆگرافی و بیۆگرافی و وەك تێرم و زاراوەیەكی ئەدەبی و جێگیركردنیان وەك زاراوە لە زمانی كوردیدا. بێگومان لـەم بارەیـەوە ئـەم جێگیركـردن و وەرگێڕانـەی جۆرەكانی ئۆتۆبیۆگرافی و بیۆگرافی بۆ سەر زمانی كوردی، كامـەیان بەرانبـەر بـە كامەیان بە پڕی و بێ هیچ گومانێك دەگونجێ، بە سروشت و هەڵكەوتی نـاوەڕۆكی جۆرەكانی ئۆتۆبیۆگرافی و بیۆگرافی و هەڵكەوتی تیۆرییان، هەر جۆرەی بە تـەنیا دەستنیشـان كـراون. پاشـان خشـتەیەكی تیۆریمـان كـردووە بـۆ جیاكردنـەوە و ناسینەوەی جۆرەكانی ئۆتۆبیۆگرافی و بیۆگرافی، دانانی هەر تێكستەی لە شوێنی خۆی بـەپێی تایبەتمەندییـە تیۆرییـەكان كـە لـەم لێكۆڵینەوەیـەدا هـاتووە. ئینجـا شیكردنەوەیەكی پراكتیكیمان پێشكەش كردووە، ئەمەش لەسەر بنچینەی بابـەت

و شێواز و زمانی تێکستەکان. دواجار بیبلۆگرافیای تێکستی ئۆتۆبیۆگرافی و بیۆگرافیمان پێشکەش کردووە، ئینجا سەرەنجام و پەراوێز و سەرچاوەکان.

**١- سەرهەڵدان و گەشەسەندن :**

ئۆتۆبیۆگرافی و بیۆگرافی بە پلەی یەکەم دوو فۆرمی ئەدەبی و کولتووری رۆژئاواییە و زیاتر لە ناو ئەدەبیات و شارستانیی رۆژئاوا سەری هەڵداوە و بایەخی پێدراوە و گەشەی سەندووە تا گەیشتۆتە ئاستی جۆرێکی ئەدەبی سەربەخۆ. بەڵام ( ئۆتۆبیۆگرافی لە ناو کولتووری رۆژهەڵات و لە روانگەی ئایینی ئیسلام وەك دیاردەیەکی ناپەسند سەیری کراوە. بۆ یەکەمین جار بلاوبوونەوەی لە رۆژئاوا، وردە وردە لەگەڵ "سەردەمی بووژانەوە" Rennaissance " پاشان بە تایبەتی لە نیوەی دووەمی سەدەی هەژدەیەمدا ( لەو سەردەمەی بە "سەردەمی رۆشنایی" ناسراوە بە روونی دەرکەوتووە و لێرەوە گەشەی کردووە.)[1] لێرەوە یەکەمین ئۆتۆبیۆگرافی "دانپیانانەکان" Les Confessions "ی ژان ژاك رووسۆ Jean Jacques Rousseau ، کە بە دوو بەرگ بلاوبووەوە، بەرگی یەکەم لە ساڵی ١٧٨٢و بەرگی دووەم لە ساڵی ١٧٨٩، واتە ساڵی شۆڕشی فەرەنسی. ئەم ئۆتۆبیۆگرافییەی رووسۆ لە بارەی ٥٢ ساڵی یەکەمی ژیانیەتی، هەر لە منداڵییەوە تا دەگاتە ساڵی ١٧٦٧. ژیانی خۆی رۆژ بە رۆژ و ساڵ بە ساڵ دەگێڕێتەوە. خۆی، ژیانی زاتی خۆی، بیرکردنەوەی، سەنتەری گێڕانەوەکانی داگیرکردووە، خۆی هەڵکەوتێکی خەیاڵی Fictif وەرگرتووە بۆ گێڕانەوەکانی، نەك سەردەمەکە و رووداوەکان لە ژیانی ئەو، بەڵکو ژیانی تایبەتیی خۆی بە پلەی یەکەم دێ، ئەمەش یەکێکە لە بنەما سەرەکییەکانی ئۆتۆبیۆگرافی کە دواتر زیاتر گەشەی پێدەدەین. بە گشتی دەتوانین بڵێین (ئۆتۆبیۆگرافی لە سەردەمی رۆشنایی فەرەنسی سەری هەڵداوە و گەشەی کردووە، ئەمەش بە پلەی یەکەم دەگەڕێتەوە بۆ سەرهەڵدان و بووژانەوەی فەردییەتی بۆرژوازی، [2] بێجگە لەم لایەنە سەرەکییانە، دەشێ کۆمەڵێ: فاکتەری دیکەی ئەدەبی و کۆمەڵایەتی و شارستانی و مێژوویی لە پاڵ پەیدابوونی ئەم جۆرە ئەدەبییەوە هەبێ)[3] هەرچی دەربارەی مێژووی ئۆتۆبیۆگرافی و بیۆگرافییە لە کۆنتر، بێگومان (ئۆتۆبیۆگرافی

و بیۆگرافی هەر تەنیا دۆزینەوەیەكی سەدەی هەژدەهەم نییە، ئەم جۆرە ئەدەبە سەرەتاكانی بۆ مێژوویەكی زۆر كۆن دەگەڕێتەوە، بۆ سەرەتاكانی شارستانی مرۆڤایەتی دەگەڕێتەوە، لەم بارەیەوە هەندێ ناو هەن لە مێژوودا ئۆتۆبیۆگرافیی خۆیان نووسیوەتەوە وەك : كسێنۆفۆن (٤٤٠ پ.ز– ٣٥٥پ.ن) (گەزنەفون یان زەینەفون لە سەرچاوە كوردییەكان) و ژولیوس سیزار (١٠٠ پ. ز– ٤٤ ن) ، سان ئۆگوستین (٣٥٤–٤٣٠ ن). لە سەردەمە كۆنەكان ئۆتۆبیۆگرافی بە شیعر نووسراوەتەوە، بەلاّم دەركەوتن و جێگیربوونی تایبەتمەندییەكانی ئەم جۆرە ئەدەبییە دەگەڕێتەوە بۆ "سەردەمی رۆشنایی Epoque Des Lumières"[٤]. لەمەش مەبەست بلاّوبوونەوەی ئۆتۆبیۆگرافییەكەی ژان ژاك رووسۆیە (دانپیانانەكان) هەڵبەت مێژووی ئۆتۆبیۆگرافی و بیۆگرافی دەشێ لێكدانەوە و شیكردنەوەی زۆرتر هەڵبگرێ، بەلاّم لەم لێكۆڵینەوەیە ئێمە بەمەندە كۆتایی دەهێنین، ئەوەی گرینگتر و پڕ بایەخترە، بەستنەوەی ئەم بابەتەیە بە سەرهەڵدان و دەركەوتنی تاكەكەس Individu ، ئەرنست كاسیرەر لە كتێبە بەناوبانگەكەی "فەلسەفەی سەردەمی رۆشنایی La philosophie des Lumières كە لە ساڵی ١٩٣٢ بلاّوبووەتەوە، (بە هێزەوە پشتگیری لەوە دەكا كە سەدەی هەژدەهەم سەردەمی دەركەوتن و سەرهەڵدانی تاكەكەسە Individu، ئەم سەرهەڵدانەش لە یەك كاتدا ئیدیۆلۆژی و فەلسەفی و كۆمەلاّیەتییە، دەزانین كە لەگەڵ كۆژیتۆی دێكارتی (من بیر دەكەمەوە كەواتە من هەم) پێشتر بیر و بیركردنەوەی فەلسەفی بەرەو ئەوە چووە تاكەكەس دڵنیایی لەسەرخۆی بكاتەوە و خۆی بناسێنیێ، بەلاّم لەگەڵ تێكستی بایلێ Bayle (٢٦٤٧– ١٧٠٦ن) و فۆنتانێل Fontanelle (١٦٥٧– ١٧٥٧ن) لە دەوروبەری سالاّنی ١٦٨٠ و ١٦٩٠ هەوڵ و تاقیكردنەوە و دەستپێشخەرییە فەلسەفییەكان تاكەكەس وەك بابەت و كەرستەی سەرەكی مەعریفە دەناسێنن[٥] دەركەوتنی زاراوەی ئۆتۆبیۆگرافی وەك لێكسیكێكی زمانی فرەنسی و ئەدەبی فرەنسی دەگەڕێتەوە بۆ سەرەتای سەدەی نۆزدەم، بە رای فیلیپ لۆژۆن بۆ دەوروبەری ساڵی ١٨٠٠ دەگەڕێتەوە. لە فەرهەنگی رۆبێرت دەركەوتنی ئەم زاراوەیە دەگەڕێتەوە بۆ ساڵی ١٨٣٢ و وەك جۆرێكی ئەدەبی سەربەخۆش ناسێنراوە هەڵبەت لە پاڵ بیۆگرافی.[٦]. بەلاّم لە "فەرهەنگی گشتی

زمانی فرەنسی"ی هاتزفیلد Hatzfeld و دارمستێتەر Darmesteter ، وشەكە ساڵی ١٨٧٨ لە لایەن ئەكادیمیای فرەنسییەوە وەرگیراوە. (دەركەوتنی یەكەمین ئۆتۆبیۆگرافی لە فرەنسا دەگەڕێتەوە بۆ بڵاوبوونەوەی "دانپیانانەكان"ی ژان ژاك رووسۆ، ئەم كتێبە دوو بەرگییە لەوساوە بووەتە پێوەر بۆ جۆری ئەدەبی ئۆتۆبیۆگرافی كە هەموو مەرجەكانی ئەدەبی و هونەری هەڵگرتبیٚ) [٧]

بەڵام لە ناو مێژووی ئەدەبی ئینگلیزی و ئەو ئەدەبەی بە ئینگلیزی دەنووسریٚ [٨] بیۆگرافی (یان بایۆگرافی) هەمان رۆڵی ئۆتۆبیۆگرافی دەگێڕیٚ. لە ئەدەبی ئینگلیزی (بیۆگرافی جۆرێكی ئەدەبی كۆنە، بەپێی لۆژیك و بەپێی مێژوو بەشێكە لە مێژووناسی "هیستۆریۆگرافی Historiographie") [٩]. مێژووی بیۆگرافی لە ئەدەبی ئینگلیزی دەگەڕێتەوە بۆ سەدەی هەژدەهەم بە هەمان شێوەی دەركەوتنی لە ئەدەبی فرەنسی. (هەندیٚ جاریش سەدەی هەژدەهەم بە سەدەی سامۆیێل جۆنسن ناودەبریٚ كە نووسەری كتێبی "بیۆگرافی شاعیرانی ئینگلیزی ساڵانی (١٧٧٩–١٧٨١) " یە. بەڵام باشترین بیۆگرافی لە نووسینی جێمس بۆسوێل –ە كە لە بارەی ساموییێل جۆنسن – ە و لە ساڵی ١٧٩١ بڵاوبووەتەوە.)[١٠]

مێژووی ئۆتۆبیۆگرافی و بیۆگرافی و گشت ئەو جۆرانەی لەمانە نزیكن وەك یاداشت یان گەشتی ژیان Biographie، بیرەوەری و یادەوەری souvenirs ، رۆژانە یاداشت Journal Intime ، بەسەرهات و سەرگوزەشتە mémoires ، دەفتەری یاداشت Carnets ، (بێگومان تا رادەیەك وتار essai و گێڕانەوە و سەربردەش Récit، دەگرێتەوە، بەڵام ئێمە لەم دوو تێرمەی دوایی نادوێین، چونكە كێشەیەكی تری پەیوەند بە ئۆتۆبیۆگرافی و بیۆگرافی دوورتر لە ئاراستەی لێكۆڵینەوەكەی ئێمە دەورووژێنن). لە مێژووی ئەدەبیات و كولتووری هاوچەرخی كوردی هەمووی دەگەڕێتەوە سەرەتای سەدەی بیستەم. سەردەمی سەرهەڵدانی رێكخراو و بزووتنەوە كوردییەكان، بە هەمان شێوە سەرەتای سەرهەڵدانی ناسیۆنالیزمی كوردی، دەتوانم بڵێم ئەم سەرەتای سەدەی بیستەمە سەردەمی سەرهەڵدانی نوێی تاكەكەسی یان فەردییەتی كوردییە : فەردییەتی رۆشنبیری كوردی. نموونەش بۆ ئەمە نووسین و تۆماركردنی رووداو و بەسەرهاتەكانی ئەو

سەردەمەیە لە لایەن رەفیق حلمی : لە"یاداشت"و ئەحمەد خواجە : لە "چیم دی"، کە دوو نموونەی تاکەکەسی هوشیار و رووناکبیری ئەو سەردەمەن و هەستیان بە پێویستی بیرکردنەوە و نووسین و تۆمارکردنی سەرگوزەشتەی خۆیان کردووە. mémoires ئەم دوو سەرچاوەیە ئەگەرچی درەنگتر بلاوبوونەتەوە رووداوەکانی سالانی نێوان ١٩١٥ تا سالانی ١٩٣٥ دەگێرنەوە. پاشان دوای ئەم مێژووە، ئێمە ماوەیەکی بێدەنگمان هەیە کە هیچ جۆرە ئۆتۆبیۆگرافییەك و بیۆگرافییەك بلاونەبۆتەوە، ئەمەش تا کۆتایی هەشتاکان درێژ دەبێتەوە، بەلام لە دوای سالی ١٩٩٢ ەوە لە ناکاو دەکەوینە ناو لێشاوێك لە بلاوبوونەوەی یاداشت و بیرەوەری و سەرگوزەشتە، ئەوەی تا ئێستا من تۆمارم کردووە لەم بیبلۆگرافیایە دەگاتە ٦٨ تێکست. بێگومان ئەمانەش پێویستییان بە هەلسەنگاندن هەیە لە رووی ناوەرۆك و شێوازی نووسین و نرخ و بەهای ئەدەبی.

### ٢- ناساندن و شیکردنەوەی تیۆری:

فیلیپ لۆژۆن پسپۆری ئەدەبی ئۆتۆبیۆگرافی و خاوەن کتێبی بە ناوودەنگی (پەیماننامەی ئۆتۆبیۆگرافی – Le pacte autobiographique ) کە بە یەکێ لە کتێبە سەرەکییەکان دادەنرێ لەم بارەیەوە، بەم جۆرەی خوارەوە پێناسەی ئۆتۆبیۆگرافی دەکا : (گێرانەوەی رابردوو بە پەخشان لە لایەن کەسێکی هەقیقی لە بارەی بوونی خۆی، بە تایبەتی ژیانی تاکەکەسی یان وردتر مێژووی کەسایەتیی خۆی بگێرێتەوە.)[11] ئەم پێناسەیە چوار بوار یان رەگەز (عنصر) رەپێش دەکا کە پەیوەندییان بە چوار جۆری دیاریکراوەوە هەیە : (١- فۆرمی شێواز "یان زمان" ئەمەش پەیوەندییان بە بوارەکانی زمان و پەخشانەوە هەیە. ٢- بابەت : ژیانی زاتی، مێژووی کەسایەتییەك. ٣- ئەو بارەی دانەر (یان نووسەر) تیایەتی: ناسنامەی دانەر (نووسەر) "کە دەمانگێرێتەوە بۆ کەسە هەقیقییەکە" و ئەو کەسەی دەگێرێتەوە. ٤- هەلکەوتی گێرەرەوە: ئەمەش پەیوەندی بە گێرەرەوە و کەسایەتیی سەرەکی و روانگەی گێرانەوە بۆ رابردووەوە هەیە. )[12]. بە رای فیلیپ لۆژۆن هەموو گێرانەوەیەك یەکێ لەم مەرجانەی سەرەوەی تێدابێ دەچێتە خانەی ئۆتۆبیۆگرافی، کەچی هەندێ جۆری

تر هەن بە رواڵەت لە ئۆتۆبیۆگرافی نـزیكن بـەڵام هـیچ مـەرجێكی سـەرەوەی تێـدا نییە، بۆیە وەك جـۆری ئـەدەبی دوورن لـەم ژانـرە : وەك یاداشـت، گەشـتی ژیـان Biographie، بـیرەوەری و یـادەوەری souvenirs ، رۆژانـە یاداشـت Journal Intime ، بەسەرهات و سەرگوزەشتە mémoires ، دەفتەری یاداشت Carnets، هــەروەها رۆمــانی كەســایەتی یــان رۆمانێــك لەســەر كەســایەتییەك بــێ، شــیعری ئۆتۆبیـۆگرافی، بـەڵام لـە روانگـەی ئـەوەی كـە دەبێتـە مـەرجێك كـە دەشـێ لـە زۆربەیان بدۆزرێتەوە ئەویش سەربردە و گێڕانەوەیە Récit . ئەم دەستەواژەیە بە مانای چیرۆكیش دێ، بە مانای چیرۆكێكی كورتیش دێ، بەڵام من تەنیا پێم باشـە "سەربردە و گێڕانەوە"ی بۆ دابنێم.( گێڕانەوە وەك رایەڵێكە لە هـەموو فـۆرمێكی گێڕانەوەدا هەیە، وەك رۆمان، داستان، چیرۆك، كورتە رۆمان...هتد)[13] .

بـە رای فیلیـپ لـۆژۆن مـەرجی سـەرەكی ئۆتۆبیـۆگرافی بـوونی "ناسـنامە Identité" یە، ناسنامەی نووسـەر (دانـەر) و گێـڕەرەوە و كەسـایەتیی سـەرەكی گێڕانـەوەی ئۆتۆبیـۆگرافی یـەك كـەس بـێ. ئینجـا ئـەم مەرجـەی "ناسـنامە"یە كۆمەڵێك كێشەی تر دەورووژێنێ وەك : ( ئەم ناسنامەیە گێڕەرەوە و كەسـایەتیی سەرەكی ئۆتۆبیۆگرافی چۆن لە خۆیان دەردەبڕن لە نێو تێكست (مـن، تـۆ، ئـەو) ئەگـەر تێكسـت لەسـەر زمـانی كەسـی یەكـەم بـێ ئـەم ناسـنامەیەی نووسـەر، كەسایەتی گێڕەرەوە چۆن لە خۆیان دەردەبڕن ؟ لێرەوە ئێمە راستەوخۆ لـە نـاو حاڵەتێكین كە تەواو پێچەوانەی رۆمـانین. بـەڵام هەرچـی بیۆگرافییـە (بـایۆگرافی) وەك كۆپییەكی ئەم "ناسنامە" وایە، چونكە ئـەو كێشـەی ناسـنامەی تێـدا نییـە، نووسەرەكەی كەسێكە و كەسایەتی بابەتەكەش كەسێكی تر."[14] نووسەر جـۆرج گوسدۆرف لە لێكۆڵینەوە ناسراوەكەی بـە نـاوی (ئۆتـۆ–بیـۆ–گرافـی) هەوڵیـداوە بنچـینە فەلسـەفییەكانی نووسـینی ئۆتۆبیـۆگرافی داڕێـژێ. ئەمـەش لـە رێگـای شـیكردنەوە و هەڵسـەنگاندنی ئـەم سـێ تێرمـەی سـەرەوە كـە ئۆتۆبیـۆگرافی پێكدەهێنن. (لە روانگەی ئـەو ئۆتـۆ واتـە ناسـنامە، منـی هۆشـیار بەسـەر خـۆی، ئەمەش بابەتێكی ئاڵۆزە و لەسەرخۆ دروستبووە، هەڵبەت لە رێگای چوونی بە ناو بوونێكی تایبەتی و ئۆتۆنۆم. هەرچی بیۆ– یە بریتییە لە گەشەسەندنی ئەم بوونـە زیندووە، بیۆ بەردەوامی و درێژەدانە بەو ناسنامە بێوێنە و تایبەتمەندە. لە نێـوان

ئۆتۆ و بیۆ پەیوەندییەكی سەخت لە نێوان ئۆنتۆلۆژی و فینۆمینۆلۆژی (بوون و دیاردە)دا هەیە، لە نێوان بوون و ژیان، لە نێوان ناسنامە و ژیان. لە نێوان "من" و تۆماركردنی ئەم "من"ە لە ناو واقیعدا كە پڕە لە كێشەی ڕۆژانە، نشووستی و خەونی زۆری لەباربراو. سەرەنجام ئۆتۆ– بیۆ كە سەرچاوەی كێشە و خەونە بەدی نەهاتووەكانە، سەرچاوەی بوونە، دەشێ لە نووسینەوەدا گرافی graphie بكەنە ژیانێكی نوێ. لێرەوە ئۆتۆ لە ناو بیۆ بڕیاری نووسین دەدا: لەم حاڵەتەدا ئۆتۆبیۆگرافی واتە بووژانەوە، دەستپێشخەرییەكە لەسەر "خۆ — soi" دۆزینەوە، خۆبنیاتنانەوە، خۆدروستكردنەوە.)[15] كێشەی سەختی نووسین و گوتن و ڕووبەڕووبوونەوەی "خۆ" بەشێكە لە كێشەی ناساندن و پێناسەی ئۆتۆبیۆگرافی. ئەو نووسەرەی لەسەر خۆی دەنووسێ، لە ئەنجامی گوتن و گێڕانەوەی ژیانی خۆی دەبێ هەموو شتێك بڵێ و هەندێ جاریش ناچارە هەموو شتێك بڵێ، بچێتە دوا سنوورەكانی بوونی خۆی، ئەمەش دیسان لە لایەكی تر لەگەڵ كێشەی نووسین تێكەڵ دەبێتەوە، نووسەر ئەوەندەی بەرانبەر لاپەڕەی سپی دانیشێ و بیر لە خۆی بكاتەوە، چی بنووسێ چی نەنووسێ، چی شارەزایانە بشارێتەوە، دووچاری كێشەیەكی ئۆنتۆلۆژی دەبێتەوە، واتە دووچاری پرسیاركردن دەبێتەوە لە ژیانی خۆی، لە بوونی خۆی، گەشەكردن و هەڵچوون و بە ناو زەمەندا چوون و چوونە ناو ساڵەكانی ژیانی كە هەمووی لەبەرچاوە، پرسیاری ئەوە دەكا، دەكرا ژیانی ئاوا نەبێ، ئاوا نەبوایە، بە جۆرێكی تر بوایە، ئەمانە و دەیان پرسیاری تر. لە لایەكی تر لە ڕوانگەی گوسدۆرف نووسینەوەی ئۆتۆبیۆگرافی بۆ كەسەكە خۆی نووسینی مەرگی خۆیەتی، گونجاندن و چاككردن و خۆشكردنی ئەو شوێنەیە كە دواجار لێی نیشتەجێ دەبێ، بۆ نموونە : ژان ژاك ڕووسۆ سەرەتا "دانپیانانەكان Les Confessions" ی خۆی دەنووسێتەوە، پاشان كتێبێكی تری ئۆتۆبیۆگرافی بە ناوی: "خەونەكانی كەسێكی تەنیا بە دەم پیاسەوە Rêvries du promeneur solitaire" دەنووسێ كە لە هەمان ساڵی شۆڕشی فەرەنسی ١٧٨٩ بڵاوبووەتەوە، واتە حەوت ساڵ دوای "دانپیانانەكان". ئەم كتێبەی دووەم وەك تەواوكەری یەكەم دێتە بەرچاو، ئەمەش وەك ئەوە وایە، ئەو شوێنەی لە هەنگاوی یەكەم دەچێ لێی نیشتەجێ دەبێ پێویستی بە دەسكاری هەبێ كە لە هی دووەم ئەم

دەسكارییەی كردووە. ئەمەش واتە پێداچوونەوە بە خۆ و رێكخستنەوە و خۆ گونجاندنەوە. لە نێوان نووسەر و كەسایەتی نووسراو، لە نێوان "من"ی نووسەر و "من"ی نووسراو هەردەم فەزایەك و بۆشاییيەك هەیە، ئەم دوو كەسە هەرگیز ناگەنە یەكتری، یەكێكیان لە ناو نووسین و رستەكان دەمێنێتەوە، ئەویتر بەردەوام دەنووسێ ئەگەرچی گونجان و هەڵكەوتێكی تەریب لە نێوانیاندا هەیە. لە لایەكی ترەوە هەر لە روانگەی گوسدۆرفەوە ئۆتۆبیۆگرافی (تاكەكەس بۆ جوانی و خۆ دەرخستن)[١٦] پیشان دەدا. ئەمەش بەو مانایە دێ (نووسینی بوون، بوون وەردەگێڕێ بۆ نووسین، ئینجا ئەگەر ئەو نووسینە بەپێی یەك بە دوای یەك هاتنی شتەكانەوە نووسرابێ لە پێشكەشكردنی شت و رووداو و كردەكان، "من" وەك هەقیقەتێكی نوێنەرایەتیكراو رەپێش دەكا، وەك ئامادەگییەكی مەییو figée لە ناو نەمری نووسین. جێگیربوونی "من" لە ناو وشەكان چیتر بوونی خۆی راناگەیەنێ، چونكە جەوهەری ئەو بریتییە لە جوولە و بزاڤ.)[١٧] رەخنەگری ناسراوی قوتابخانەی رەخنەیی ژنێڤ "ژان ستارۆبنسكی" پێناسەیەكی تری ئۆتۆبیۆگرافیمان پێشكەش دەكا، بێگومان لە زۆر رووەوە لە زۆر خاڵ لەوەی لێرە گوتراوە نزیكە، بەڵام تایبەتمەندیی خۆشی هەیە. ژان ستارۆبنسكی لە یەكێ لە لێكۆڵینەوەكانی بە ناوی "شێوازی ئۆتۆبیۆگرافی كە لە ژمارە ٣ گۆڤاری شیعریی poétique سالی ١٩٧٠ بلاوبووەتەوە بە روونی ئۆتۆبیۆگرافی وەك ژانرێكی سەربەخۆ دەناسێنێ و دەڵێ ( ئۆتۆبیۆگرافی بیۆگرافییەكە لە لایەن كەسەكە خۆی نووسراوەتەوە.) [١٨] ئەمەش زۆر بە وردی مەرجەكانی نووسینی ئۆتۆبیۆگرافی جارێكی دیكە دەهێنێتەوە پێش كە لە بەرایی باسمان كرد، مەسەلەی "ناسنامە" و "گێڕانەوەی ژیانێك" و "كەسێك" دەگرێتەوە. بەو مانایەی بیۆگرافی بریتییە لە نووسینەوەی ژیانی كەسێك لە لایەن كەسێكی تر، هەرچی ئۆتۆبیۆگرافییە یەك كەس رۆڵی دوو كەس دەبینێ، ئەو كەسە خۆی باس لە ژیانی خۆی دەكا، خۆی كەرستە و ماددەی گێڕانەوەكانیەتی، لە لای ستارۆبنسكی چەند مەرجێك هەن دەبێ لە ئۆتۆبیۆگرافیدا هەبێ (١- دەبێ ناسنامەی گێڕەرەوە و پاڵەوان یان كەسایەتی گێڕانەوە یەك بن. ٢- دەبێ زیاتر گێڕانەوە بێ نەك وەسفكردن. ٣- دەبێ كرۆنیكی بێ.) [١٩] واتە لە سەرەتای

ژیـانی ئـەو كەسـەوە گێڕانـەوە بگرێتـەوە تـا دەگاتـە كۆتـایی ژیـانی، ڕۆژی نووسینەوەی ژیانی بەپێی یەك بە دوای یـەك هـاتنی ڕۆژ و مـانگ و سـاڵەكان وەك خۆیان نەك بازدانی تێدا بكرێ. بەڵام لە لای ستارۆبنسكی "شێواز" لە گێڕانـەوەی ئۆتۆبیـۆگرافی بـە پلـەی یەكـەم دێ. ئـەم شـێوازە لەسـەر بنچـینەی دوو "مـن" دامـەزراوە، یـەكێكیان دەگێڕێتـەوە، ئـەویتر كەرسـتە و بابـەت و نـاوەڕۆكی منـی یەكەمە. لێرەوە شێوازێكی هونەری پێشنیاز دەكا، بێگومان هەر گێڕانەوەی سادە و ساكار ناچێتە خانەی بەهای هونەری و ئەدەبی، بەڵكو دەبێ شێوازێكی هونەری هەبێ، ئەم شێوازە هونەرییەش دەبێ تا ئەوپەڕی سنووری خۆی بـبردرێ. لـە لای ستارۆبنسكی ژان ژاك ڕووسۆ بە باوكی جۆری ئەدەبی ئۆتۆبیۆگرافی دادەنرێ، بـە داهێنانێكی ئـەوی دادەنـێ. ئـەو بـوو بـۆ یەكـەمین جـار "زات" بـوونی تاكەكـەس "من"ی هێنا ناو مێژوو، شیعرییەتی گێڕانەوە و كێشەی تاكەكەسـی — فەردییـەت — Individualisme و هەوڵـدان بـۆ گـوتنی هەقیقـەت لەگـەڵ "دانپیانانـەكان"ی ڕووسۆ دەست پێدەكات. هەموو ئەمانەش دەگەڕێنەوە بۆ "سـەردەمی ڕۆشـنایی" بە ماوەیەكی كەم پێش شۆڕشی فرەنسی. "دانپیانانەكان" ی ژان ژاك ڕووسـۆ لـە ساڵی ١٧٨٢ بەرگی یەكەم و ساڵی ١٧٨٩ بەرگی دووەم بڵاوبووەوە.

لە لایەكی ترەوە، ستارۆبنسكی درێژە بـە پێناسـە تایبەتمەندییەكـەی خـۆی دەدا بـۆ ئۆتۆبیـۆگرافی، ڕوانینـەكانی خـۆی هـەمووی دەبەسـتێتەوە بـە ژان ژاك ڕووسۆ، ئەو لەو بڕوایەدایە لەو ساتەوەی ڕووسۆ ویستوویەتی ئۆتۆبیۆگرافی خـۆی بنووسێتەوە (وەك ئەو حاڵەتە دێتە بەرچـاو مـرۆڤ چـیتر بـوونی نـەمێنێ، ئەمـەش واتە، نەمانی دڵنیایی ڕەخنەیی، نەمانی بەرهەمهێنانی پڕۆژە، نەمانی پەیوەنـدیی ڕاستەوخۆ لەگەڵ "بوون — وجود éxistence " ئەم سێ هەڵكەوتـەش ئـەوەمان فێر دەكەن كە ئۆتۆبیـۆگرافی بـە شـێوەیەكی بنچـینەیی ئـەو شـوێنەیە پرسـیاری ئێستێتیكی نووسین دەردەكەوێ و پرسیاری فینۆمینۆلـۆژی لـە بـوون و وجـودیش دەكرێ، كە پەیوەندی بە كێشەی ئۆنتۆلۆژی "من"ەوە هەیە. )[٢٠] یەكێكی تر لەو ئۆتۆبیۆگرافیایانەی سەردەمی نوێ دوای ئەمەی ڕووسۆ، كە ڕەسەنایەتییەكی بێ وێنە پێشـكەش دەكـا و لـە هـەمان لـەو ئاسـتەیە كـە "دانپیانانـەكان" ی ڕووسـۆ هەیەتی و بە هـەمان ئاسـتیش دەیـەوێ هەقیقـەت بڵـێ، ئۆتۆبیـۆگرافی "وشـەكان

Les mots"ی "ژان پـۆل سـارتر"ە. سـترەكتوری ئۆتۆبیـۆگرافی سـارتر كـە گێڕانەوەی ژیانی خۆیەتی لە لایەن خۆیەوە ناوی ناوە "وشەكان". سارتر ناوی لە ژیاننامەكەی نەناوە "ژیانم"، "مندالّیم" یـان "بـیرەوەری" بـەڵكو زۆر بـە كـورتی ناوەی ناوە "وشەكان". (وشەكان بۆ یەكەمین جـار سـالّی ١٩٦٣ بلاّوبووەتـەوە.) ئەمەش وەك هونـەری نووسـین و گێڕانـەوە زۆر جیـاوازە لـە هـی رووسـۆ كـە وەك ئۆتۆبیۆگرافییەكی مۆدێـل بـاس دەكـریٚ. (ئـەوەی سـارتر راسـتەوخۆ چـوونە نـاو فەزای نووسینی پێـوە دیـارە. بێجگـە لەمـەش كتێبەكـە ئـەوەی پێـوە دیـار نییـە دابەشـی چـەند بەشـێك كرابـیٚ و هـەر یەكـەی بەشـێك لـە ژیـانی بـەپێی زەمـەنی هەڵكشانی ژیانی سارتر دابەش كرابیٚ، بەڵكو دابەشی دوو بـەش كـراوە، ئەمانـەش خوێندنەوە و نووسینن. ئۆتۆبیۆگرافی سارتر بـەپێی مـۆدێلی ئـەدەبی نووسـراوە. نووسـەر ئۆتۆبیۆگرافییەكـەی بـە گـوێرەی پەیوەندییـەكانی خـۆی لەگـەڵ وشـە و نووسین نووسیوە.)[21] ئەمەش لە تایبەتمەندییەكانی ئەم ئۆتۆبیۆگرافیایەیە، لـە دوای ئەمەی رووسۆ، ئەمەی سارتریش دەشیٚ ببێتە مـۆدێلێكی تیـۆریی جیـا و لـە هەمان ئاستی ئەوەی یەكەم دابنریٚ.

### ٣– كێشەی زاراوە و جۆرەكانی ئۆتۆبیۆگرافی و بیۆگرافی :

لە زمانی رۆژئاواییەكان، بە تایبەتی لە فرەنسی و ئینگلیزی، ئۆتۆبیـۆگرافی (لە فرەنسی) بیۆگرافی (لە ئینگلیزی) وەك ژانرێكـی ئـەدەبیی سـەربەخۆ سـەیری دەكریٚ، ئێمە بەرانبەر بە ئۆتۆبیۆگرافی "ژیاننامە" یان "ژیننامە" زۆر بـە نزیـك و گونجاو دەزانین و تا رادەیەك لە پێكهاتەی ئۆتۆبیۆگرافی نزیكە ئەگەر "ئۆتۆبیـۆ" بەرانبـەر بـە "ژیـان" دابنـێین و "نامـە"ش بەرانبـەر بـە "گرافـی"، بـەو مانایـەی ئۆتۆبیۆگرافی جۆرێكی ئەدەبیی سەربەخۆیە و تایبەتمەندیی خۆی هەیـە، ئەمـەش لەوەدا كۆدەبێتەوە یەكێك ژیانی خۆی دەگێڕێتەوە، خۆی نووسەرە و هەر خۆشی بابەتی نووسین و گێڕانەوەكانیـەتی، بێجگـە لەمـەش بـەپێی بنچینە تیۆرییـەكانی بـەرایی دەبـیٚ لـە ئۆتۆبیـۆگرافی یـەك بـە دوای هـاتنی شـت و رووداو و زەمـەنی باسكراو هەبیٚ، دەبیٚ كرۆنیكی بیٚ، ئەمەش هەر لە سەرەتاوە تا كۆتایی. هەرچـی زاراوەی بیۆگرافییـە (بـایۆگرافی) ئەمـەیان لـە ئـەدەبیاتی ئینگلیـزی هـەمان ئـەو

هەڵکەوتەی هەیە ئۆتۆبیۆگرافی لە ئەدەبی فرەنسی هەیەتی، ئێمە بەرانبەر بەمە "یاداشت یان گەشتی ژیان"مان داناوە، هەڵکەوتی بیۆگرافی گێڕانەوەی ژیانی یەکێکە لە لایەن یەکێکی تر، لەم گێڕانەوەیەش نووسەر بەپێی شێواز و بیرکردنەوەی خۆی دەنووسیٚ و دەگێڕێتەوە، بەڵام دەبیٚ ژیانی ئەو کەسەی کە دەگێڕێتەوە چەقی گێڕانەوەکان و یاداشتەکە داگیر بکات، نەچێتەوە سەر بەسەرهات و سەرگوزەشتە mémoires کە ئەمەی دوایی جۆرێکی ترە و ژیانی ئەو کەسەی دەگێڕدرێتەوە بە پلەی یەکەم نایەت بەڵکو رووداو و بەسەرهاتەکان بە پلەی یەکەم دێن. بێگومان پەیوەندی ئەمانە بە رۆمان و گێڕانەوەی رۆمان و چیرۆك جیایە، هەڵبەت دەشیٚ ژیانی کەسێك بکرێتە رۆمان، بەڵام ئەمە بیۆگرافی نییە، گێڕانەوەیەکی ئەدەبییە، دەشیٚ ژیاننامەی یەکێکیش بە شێوازی ئەدەبی بنووسریٚ بەڵام تایبەتمەندییەکانی ئۆتۆبیۆگرافی تێدابیٚ. (ئەو کاتەی ژیاننامە لە سنووری ژانریانەی خۆی دەرباز دەبێت و فۆرمی رۆمان وەردەگرێت، ئێمە لەگەڵ جۆرێکی ئەدەبی رووبەرووین کە بە رۆمانی ژیاننامە ناسراوە. بە شێوەیەك دەکریٚ بگوتریٚ هەموو رۆمانێك لایەنێکی بەهێزی ژیاننامەی "ئۆتۆبیۆگرافی" تێدایە و ئاستی شوێنپێی ژیانی نووسەر لە رۆمانێکەوە بۆ رۆمانێکی تر جیاوازە. ئەگەر هەندیٚ رۆمان راستەوخۆ رەنگدانەوەی ژیانی نووسەرانن، لە هەندیٚ رۆماندا ئەم ئاستە دادەبەزێتە سەر کۆمەڵێك برگەی تایبەتی لە ژیانی نووسەردا و گوازتنەوەیان بۆ ناو دنیای رۆمان. بۆ نموونە "ساڵە هەورییەکان"ی عەلی ئەشرەف دەروێشیان و رۆمانی "وێنەی هونەرمەند لە تافی لاویدا" بە قەڵەمی جەیمس جۆیس دەکریٚ وەك دوو رۆمانی ژیاننامەیی سەیر بکرێن و ئاوێنەیەك بن لە ژیانی نووسەرەکانیان. ) [٢٢]

هەڵبەت ئەم لایەنە بوارێکی سەربەخۆیە و دەشیٚ بە لێکۆڵینەوەی تایبەتی زیاتر گەشەی پیٚ بدریٚ، ئەوەی کە بە پلەی یەکەم لەم بەشە بۆ ئێمە گرینگە، مەسەلەی جێگیرکردن و بەرانبەر یەکتردانانی لێکسیکی ئۆتۆبیۆگرافی و بیۆگراف و هەموو جۆرەکانی ترە کە لەم دووە نزیکن، ئەمەش بەپێی تایبەتمەندییە تیۆرییەکانی هەر یەکێك. ئێمە ئۆتۆبیۆگرافی و بیۆگرافی وەك خۆی و بەپێی تایبەتمەندییەکانیان بەکاریان دەهێنین، بەڵام لە پاڵ ئەمانە کۆمەڵیٚ جۆری تر

هەن وەك: "رۆژانە یاداشت Journal Intime " ، ئـەم جـۆرە رۆژانـە یاداشـتە بـۆ ئەوە نییە بلاو بكرێتەوە، چونكە دەشـێ پـڕ بـێ لـە وتـە و وشـەی ناشایسـتە كـە شایانی ئەوە نین بە خوێنەران پیشان بدرێن، بەلام ئەگەر رۆژێك لە رۆژان بە هـۆی میراتەوە بكەوێتە دەست كەسێك و پیشان بدرێ، پایـەی ئـەو كەسـە پیشـاندەدا. بـەلام دەبیـنین زۆركـەس "رۆژانەیاداشـتی" خۆیـان نووسـیوەتەوە و بلاویشـیان كردۆتەوە، وەك رۆماننووسی فرەنسی ئەندرێ ژید، ژوولیەن گرین، تاهـا حوسـەین و زۆری تـر. هۆكـاری ئـەم بلاوكردنەوەیـەش بـە رای گوسـدۆرف ئەوەیـە (ئـەمان هەسـتیان كـردووە بـیرەوەری و رۆژانەیاداشـتەكانیان بەشـێكە لـە كـارە ئەدەبییەكانیان. وەك خۆراكێكن بۆ ئەم كارانە. )[٢٣] رۆژانە یاداشـت جۆرێـك نییـە وەك ئۆتۆبیۆگرافی لە ئێستاوە بگەڕێتەوە رابـردوو، بـەڵكو راسـتەوخۆ رۆژ بـە رۆژ دەنووسرێ و رەگ و ریشەی ئەم جۆرە نووسینە لە ئێستادایە. هەرچی بـیرەوەری و یادەوەرییە souvenirs كـە دەشـێ یاداشـتیش بەرانبـەری بگـونجێ، نـزیكترین جۆری نووسینی سەر بە "من" و "خۆ – soi " یـە كـە نزیكـە لـە ئۆتۆبیـۆگرافی. بـیرەوەری و یـادەوەری پرۆژەیەكـە وەك ئۆتۆبیـۆگرافی هـەموو شـتێك نـاڵێ، ئۆتۆبیـۆگرافی گشـتگیرترە، هەرچـی بـیرەوەری و یادەوەرییـە لـە ژێـرەوەی ئـەم گشتگیرییەیە و دەیەوێ لێی نزیـك بێتـەوە. ئـەوەی بـیرەوەری و یادەوەرییـەكانی دەگێڕێتەوە (كە نووسەرەكەی خۆی دەگێڕێتـەوە و خـۆی و ژیـانی خـۆی بابـەتی گێڕانەوەكەیـەتی) هەڵبژاردەیـەك دەكـا لـە شـت و رووداو و كردەكـانی ژیـانی و دەیەوێ بە خوێنەری رابگەیـەنێ. وەك شـایەتحاڵ و شـەرحی حـاڵ دێتـە بەرچـاو. هەڵبـەت لۆمـەی ئـەوەی لێ نـاكرێ بۆچـی بـەرزتر هەڵناكشـێ و گێڕانـەوەكانی بگەیەنێتە ئاستێكی گشتیی تر وەك ئۆتۆبیۆگرافی.

جـۆرێكی ترمـان هەیـە كـە بـە mémoires ناسـراوە، بەرانبەرەكـەی ئێمـە "بەسەرهات و سەرگوزەشتە"مان داناوە، ئەمەیان جۆرە تێكستێكە كـە لـە لایـەن كەسێكەوە دەنووسرێتەوە كە رۆڵێكی گرینگـی بینیـوە لـە مێـژوودا وەك ژەنـەرال دوگۆل و وینستۆن چەرچل و چەندانی تر كە شایەتحاڵی رووداوی گرینگ بوونە لـە سـەردەم و ژیانیـان، رۆڵێكـی پـڕ كاریگـەرییان هـەبووە. لـە "سـەربردە و سەرگوزەشتە" نووسەر لە رێگای ژیـانی خـۆی بـاس لـە رووداوەكـانی سـەردەم و

بەسەرهاتەكان دەكا. لەم جۆرەیان مێژووی تاكەكەس بە پلەی یەكەم نایەت بەڵكو رووداو و بەسەرهاتەكان بە پلەی یەكەم دێن و گرینگترن. نووسەر ناسنامەیەك دروست دەكا جیایە لەو ناسنامەیەی لە ئۆتۆبیۆگرافیدا هەیە، لەمەیان نووسەر هەڵكەوتێكی گێرەرەوەی راپۆرت و رووداو و بەسەرهاتەكانی هەیە. "بەسەرهات و سەرگوزەشتە" لەگەڵ "بیرەوەری و یادەوەری" دوو جۆر تێكستن رووداوێك دەگێرنەوە كە روویانداوە و لەم دوو جۆرە تێكستە "من" ماددە و بابەتی سەرەكی نییە وەك لە ئۆتۆبیۆگرافی، بەلاٚم روانینی ئەو "من"ە بەر مێژوو و رووداوەكان دەكەویٚ و تێكەڵیان دەبیٚ، واتە مێژووی تاكەكەس تێكەڵ بە مێژووی گشتی دەبیٚ، مێژوویێكی گەورەتر دروست دەكەن.

جۆرێكی ترمان هەیە بە ناوی Carnets ، ئێمە "دەفتەری یاداشت"مان بەرانبەری داناوە، لەم جۆرەیان نووسەر رۆژانە تێبینی و یاداشتەكانی خۆی تێدا تۆمار دەكا. دەشیٚ دەفتەری بیرەوەریش گونجاو بیٚ. ئەمەش رۆژبەرۆژ دەنووسریٚ و هەڵكەوتێكی هەیە زیاتر لە ئێستادایە، ژیانێك ناگێرێتەوە بەڵكو تێیدا هەست بە ئەزموونی تاكەكەس دەكەین. "دەفتەری یاداشت"ی نووسەری فرەنسی ئەلبێر كامو Albert Camus لە ناو ئەدەبی جیهانی زۆر ناسراوە.[٢٤]

دیسان جۆرێكی ترمان هەیە ئەویش "وتار"ە Essai، ئەم وشەیە لە زمانی لاتینی لە exagium -ەوە هاتووە كە بە مانای هەڵسەنگێنراو و تاقیكراوە دیٚ، شتێك پێوانە كرابیٚ mesurer ، یان شتێك راستكرابێتەوە régler " . لە روانگەی فیلیپ لۆژۆن وتار لەم رووەوە لە ئۆتۆبیۆگرافی نزیكە چونكە لە "ناسنامە"دا لەو "ناسنامە"یە نزیكە كە لە ئۆتۆبیۆگرافیدا هەیە، لە وتاردا نووسەر روانینی زاتیی خۆی و ئەزموونی خۆی دەگەیەنێتە خوێنەر، بە ئازادی و ئیرادەی خۆی لە ئامانجی خۆی دەگەریٚ. جۆرێكی ترمان هەیە كە بە Bloc-notes ناسراوە، بەرانبەرەكەی بە كوردی دەكاتە "دەفتەری تێبینی". ئەم جۆرەیان تا ئێستا لە ناو كورد نەكەوتۆتە بەرچاوم و نەمزانیوە "دەفتەری تێبینی" لەم جۆرە لە پاش نووسەران و شاعیران بەجێمابیٚ. بەلاٚم ئێمە كەمتر باس لەم دوو جۆرە دەكەین، واتە "وتار" و "دەفتەری تێبینی"، هەروەها نەمان خستۆتە ناو خشتە تیۆرییەكەمان كە لە خوارەوە پێشكەشمان كردووە. كەواتە ئێمە تەنیا ئەم

لێكسـیكە بچـووكەمان هەیـە لـەم بارەیـەوە، ئەمـەش بـەم جـۆرەی خوارەوەیـە : ژیاننامە Autobiographie، یاداشت یان گەشتی ژیان Biographie، بـیرەوەری و یــادەوەری souvenirs ، رۆژانــە یاداشــت Journal Intime ، بەســەرهات و سەرگوزەشتە mémoires ، دەفتەری یاداشت Carnets . وتار Essai ، سەربردە و چیرۆك Récit ، دەفتەری تێبینی Bloc-notes .

## ٤- شیكردنەوە Analyse :

بەپێی ئەم خشـتە تیۆرییـەی خـوارەوە تـەواوی ئۆتۆبیـۆگرافی و جۆرەكـانی تـری لێـك جیـا كراونەتـەوە، ئەمـەش هـەموو ئـەو تێكسـتانە دەگرێتـەوە كـە لـە سەرەتای سەدەی بیستەمەوە بلاْوبوونەتەوە تا ئەمرۆ، لەبـەر زۆریـی تێكسـتەكان بۆ هەر یـەكێك لـە جۆرەكـان یـەك تێكسـت شـیدەكەینەوە و تایبەتمەندییـەكانیان دیاری دەكەین و ئەمەش وەك نموونەیەك بۆ گشت تێكسـتەكان لـە رووی شـێوازی ئەدەبی و ناوەرۆك و نرخ و بەهای هونەری و ئەدەبی. هەروەها لە خشـتەكە تـەنیا ناوی تێكست و نووسەرەكەی نووسراوە. لە هەنگاوی دووەم بیبلۆگرافیای تەواوی تێكستەكانمان نووسیوە و لە كۆتایی ئەم بەشەدا دامانناوە.

ئۆتۆبیۆگرافی و بیـۆگرافی بـەو پێـوەرە تیۆرییـە بنچینەییانەی لەسـەرەوە پێشكەشمان كردووە، لە ئەدەبی كـوردی و رۆشـنبیری كـوردی زۆر كەمـە، ئەگـەر هەر دەگمەن نەبێ. بە سەرنجدانی خشتە تیۆرییەكە دەبینین تەنیا دوو تێكستمان هـەن كـە وەك ئۆتۆبیـۆگرافی خۆیـان دەناسـێنن، ئـەوانیش "گەشـتی ژیـانم"ی مەسـعود محەمـەد و "نووسـین بـە ئـاوی خۆڵـەمێش"ی شـێركۆ بێكەسـە، كـە تـا رادەیەك ئەمـەی دوایـیش هـەموو مـەرجێكی ئۆتۆبیـۆگرافی تێدا نییـە و زیـاتر لـە بیرەوەری souvenirs نزیكە، بـەو مانایـەی هەنـدێ جـار چـەقی گێرانـەوە لەسـەر خودی نووسەر لادەچێ و بەرەو رووداو و كەسانی تر دەڕوا، ئەم دیاردەیـە لـە لای تێكسـتەكەی مەسـعود محەمـەدیش هەیـە، بـەلاْم ئـەم دوو تێكسـتە زۆرتـرین تایبەتمەنـدیی ئـەوەیان تێدایـە بـە "ژیننامـە "ئۆتۆبیـۆگرافی" دابنـێین، ئـەم تایبەتمەندییانە لە ئەوانی تر، لە هیچ یەكێكیاندا نییە.

نەبوون و کەمیی ئۆتۆبیۆگرافی لە ئەدەبی کوردی بەو مانا تیۆرییانەی لێرە لە سەرەوە پێشکەشمان کردووە، بەرەو کێشەیەکی گەورەترمان دەباتەوە کە پێیدەوترێ نەبوونی یان لاوازیی فەردییەتی کوردی Individualime kurde ، هەروەکو چۆن دروستبوونی ئەم فەردییەتە رۆڵی سەرەکی هەبووە لە سەرهەڵدانی ئۆتۆبیۆگرافی لە کۆتاییەکانی سەردەمی رۆشنایی Epoque des Lumières فرەنسی و کردنەوەی ئەم دەرگا و ئاراستەیە بە ئۆتۆبیۆگرافییە مەزنەکەی ژان ژاك رووسۆ :"دانپیانانەکان".

بەپێی نەخشەکەمان تا ئێستا یەك دانە بیۆگراف "یاداشت یان گەشتی ژیان" مان هەیە، ئەویش بە ناوی "پێشمەرگە پۆلاّیینەکە" یە لە نووسینی عەبدوڵلا کەریم مەحموود، ئەمەش زیاتر بایەخی بە ژیان و بەسەرهاتی ئەو پێشمەرگەیە داوە کە بابەتی بیۆگرافییەکەیە، زۆر کەم چۆتە ناو فیکر و روانین و سەردەمی منداڵی و گێڕانەوەی ئەو ژیانە بەشێوەی کرۆنیکی، زیاتر لە بەسەرهات و سەرگوزەشتە mémoire نزیکە وەك لە بیۆگرافی، زمانێکی راپۆرتی و دوور لە شێوازی نووسینی هونەری و ئەدەبی هەیە.

بێگومان ئەو تێکستانەی لە سەرەتای مێژووی سەرهەڵدانی ئۆتۆبیۆگرافی و بیۆگراف بلاّوبوونەتەوە (کە بە درەنگەوە بلاّوبوونەتەوە) هەر دوو کتێبەکەی "یاداشتەکان"ی رەفیق حلمی و "چیم دی" ئەحمەد خواجەیە. ئەمەی رەفیق حلمی بە هیچ شێوەیەك نە ئۆتۆبیۆگرافییە و نە بیۆگرافی بەڵکو دەچێتە خانەی بەسەرهات و سەرگوزەشتە mémoires، بەلاّم ئەوەی ئەحمەد خواجە ئەویش بابەتی سەرەکی بەسەرهات و سەرگوزەشتەیە بەلاّم لە جۆری "دەفتەری یاداشت Carnets" ە، نووسەر ژیانی خۆی ناگێڕێتەوە بەڵکو رووداوەکانی سەردەمەکەی و پەیوەندییەکانی لە ناو بزووتنەوەی شێخ مەحموودی حەفید رۆژبەڕۆژ تۆمار کردووە، بە هەمان شێوە رەفیق حلمیش رووداوەکانی هەمان سەردەم و دواتریشی تۆمار کردووە.

هەرچی "بیرەوەرییەکانی مەحموود سەنگاوی"یە کە لە لایەن خۆیەوە نووسراوە، یەکێکە لەو نموونە جوانانەی بۆ جۆری "دەفتەری یاداشت Carnets "، نووسەر هەر لە سەرەتاوە بایەخی تۆمارکردن پیشان دەدا، بە رای ئەو ژیانی پێشمەرگەیەك پڕیەتی لە رووداوی سەرنجڕاکێش، ئەمەش شایانی ئەوەیە تۆمار

بکرێ، نووسەر رۆژانـە یاداشـتەکانی بـە زمـانێکی جـوان و مـاقوولٚ نووسـیوە. بـە هـەمان شـێوە تێکسـتی "بەسـەرهاتی رەفیـق حلمـی" لـە ئامـادەکردنی "ناهیـدە رەفیق حلمی" دەچێتە خانەی بەسەرهات و سەرگوزەشتە mémoires بـەلاٚم ئـەو بـە شـێوەی "دەفتـەری یاداشـت Carnets" ئامـادەی کـردووە، واتـە گێڕانـەوەی رووداو و بەسەرهاتەکان رۆژ بە رۆژ و سالٚ بە سـالٚ، ژیـانی رەفیـق حلمـی بووەتـە دەروازەیەك بۆ باسکردنی سەردەمەکە، بە پێچەوانەوە قورسایی نەخراوەتـە سـەر ژیانی زاتی رەفیـق حلمـی. ئـەم کتێبـە وێنـە و بەڵگەنامـەی زۆری لەگـەلٚ هـاوپێچ کراوە.

بە پێچەوانەوە ئێمە هیچ تێکستێکمان لە جـۆری "رۆژانـە یاداشـت Journal Intime" نییـە رۆژ بـە رۆژ تۆمـار کرابـێ. زۆربـەی هـەرە زۆری تێکسـتەکانی ئـەم بیبلۆگرافیایە لە جـۆری "بەسـەرهات و سەرگوزەشـتەن mémoires "، واتـە لـەو تێکستانەن کە نووسـەرەکانیان ژیـانی خۆیـان بـە ئاراسـتەی مێـژووی سـەردەم و رووداوەکان دەگێڕنەوە، ئەگەرچی خۆیـان ژیـانی خۆیـان دەگێڕنـەوە، بـەلاٚم لـەم گێڕانانەوە بەسەرهات و سەردەمەکان بە پلەی یەکەم دێن. لە ناو هەموو ئەمانەش ئێمە دوو تێکستمان هەن کە لە رووی شـێوازی گێڕانـەوە و زمـان و نـرخ و بـەهای ئەدەبی لـە ئاسـتێکی بـالاٚدان، ئەمانـەش هـەردوو تێکسـتی: ١- بیرەوەرییـەکانی سەعید ناکام بە قەڵـەمی سـەعید ناکـام خـۆی. ٢- چێشـتی مجێـور، بـە قەڵـەمی هەژار موکریانی.

هەرچـی دەربـارەی "بـیرەوەری و یادەوەری"یەکانـە souvenirs ، تـەنیا چەند تێکستێکی کەم هەن کە نووسەرەکانیان لە روانگەی ژیانی زاتی خۆیان باس لـە سـەردەم و رووداوەکـان دەکـەن. ئـەم جۆرەیـان لـە رووی تیـۆری لـە هـەموو جۆرەکانی تر لە ئۆتۆبیۆگرافی نزیکترە، ئەمەش بە هـەمان ئاسـتی ئۆتۆبیـۆگرافی لـە نـاو تێکسـتەکان تـەنیا چـەند دانەیـەکمان هـەن کـە سـیفەتەکانی بـیرەوەری هەڵگرتبێ. لە ناو ئەمانە ئەوەی کە بە پلەی یەکەم دێ لە رووی شێوازی گێڕانەوە و زمان و نرخ و بەهای ئەدەبی تێکستی "لە کوێ وە بۆ کوێ ؟"ێ شـاعیر هـێمن موکریانییە کە باس لە بیرەوەرییەکانی ژیانی خۆی دەکا لە سەردەمی منداڵییـەوە تا ئاوارەبوون و گەیشتن بە تەمەنی سەرووی پەنجاساڵی. لەمەشـەوە دەبـێ ئـەو خاڵە دڵنیایی لەسەر بکرێتەوە، کە تێکستی ئەدیب و نووسەرەکان بە پلەی یەکەم

دێـن، هەڵبــەت لــە رووی شـێوازی هونــەری و نـرخ و بـەهای ئـەدەبی، ئەوانـەی سەروكاریان لەگەڵ زمان و ئەدەبیات و رۆشنبیری كوردی راگوزاری بووە، هەڵگری ئەو بەها و نرخانە نین، گێڕانەوەیان سادە و ساكارە، هەست بە رەوانی و شێواز و هونەری گێڕانەوە ناكەین، ئـەم ناتـەواوی و خەوشـە لـە زۆرێـك لـە "بەسـەرهات و سەرگوزەشتەكاندا" mémoires هەیە.

هــەروەكو لەســەرەوە گوتوومانــە لــەم ٦٨ تێكســتەی لێـرە پێشــكەشمان كردوون، زۆربـەیان دەچـنە خانـەی "بەسـەرهات و سەرگوزەشـتە mémoires". تیایاندا ژیانی سەردەم پێش ژیانی نووسەرەكانیان دەكەوێ، ژیـانی نووسـەرەكان بە پلەی دووەم یان بە شاراوەیی دیارن. ئەگـەر سـەرنجی ناونیشـانی تێكسـتەكان بـدەین ئـەم روانینــە زۆر بــە جـوانی دەردەكـەوێ، وەك : گەشـتێك بـە كۆمـاری مــەهاباد، لــە كــاروانێكی دوور و درێــژدا، ســەفەری كوردایــەتی، بــەرەو خــۆر، سەربردەی ژیانم، رۆژژمێری پێشمەرگەیەك، لە كەناری دانوبەوە تا خڕی ناوزەنگ، ....هتد. زۆربەی ناونیشانەكان مێـژوویین، ئەمـەش لایـەنی دوورخسـتنەوەیانە لـە ئۆتۆبیۆگرافی.

هەرچی ناونیشانی تێكستەكەی نووسەر حوسێن عارفە "سـاڵێك لـە تەمـەن" ئەمەیان دەچێتە خانـەی "دەفتـەری یاداشـت carnets" ، بـەو مانایـەی نووسـەر بەشێك لە ژیـانی رۆژ بـە رۆژ تۆمـار كـردووە، خوێنـەر دەباتـەوە نـاو ئـەو سـاڵەی ژیانی.

بـوونی دۆكیومـەنت لەگـەڵ ئۆتۆبیـۆگرافی و بیـۆگرافی و جۆرەكـانی تـر، بـە پلەی یەكەم بایەخدانە بەو رووداوانەی لە ژیانی ئەو كەسە روویانداوە و ئەو كەسە بینیویەتی، لە كاتێكدا ئەوەی بە لای ئێمەوە گرینگە ژیـانی نووسـەرەكە خۆیـەتی بەو شێوەی دەیگێڕێتەوە یـان یـەكێكی تـر دەیگێڕێتـەوە. رەنگـە بـوونی هەنـدێ وێنەی نووسەر خۆی بۆ ئۆتۆبیۆگرافی و بیۆگرافی بایەخێكی هونـەری و تـەكنیكی هەبێ، ئەمەش ئەگەر وێنەی دەستی یەكەم بێ بایەخی زۆرترە، واتە دۆكیومـەنتی رەسەن بێ و بۆ یەكەمین جار بـەكارهێنرابێ. دەشـێ ئەمـەیان بـە هـەمان ئاسـتی تێكسـتەكە نـرخ و بـەهای هـەبێ، بـەڵام كـە بەڵگەنامـە و دۆكیومـەنت هـاوپێچ و هاوكێشەی تێكستەكان دەكرێ رووداوێك یـان بەسـەرهاتێك دەگێڕنـەوە، لێـرەوە دیسان رووداو و مێژوو و بەسـەرهات بـە پلـەی یەكـەم دێـن و ژیـانی نووسـەر بـزر دەبێ.

### ٥. خشتەی تیۆری دابەشکردنی ئۆتۆبیۆگرافی و جۆرەکانی :

| ژ | Autobiographie ژیاننامە | Biographie یاداشت گەشتی ژیان | Journal-Intime ڕۆژانە یاداشت | Souvenirs بیرەوەری یادەوەری | Memoires بەسەرهات سەرگوزەشتە | Carnets دەفتەری یاداشت |
|---|---|---|---|---|---|---|
| ١ | گەشتی ژیانم/ مەسعود محەمەد | | | چلچرا/ بیرەوەری/ مەهاباد قەرەداغی | گەشتێك بە کۆماری مەهابادا/ بیرەوەرییەکانم لە رۆژهەڵاتی کوردستاندا/ عەقید بەکر عبدولکەریم حەوێزی | چیم دی/ ئەحمەد خواجە |
| ٢ | نووسین بە ئاوی خۆڵەمێش/ژیاننامە و بیرەوەری/ شێرکۆ بێکەس | | | کاکەمەمێکی تر/ بیرەوەری/ کاکەمەم بۆتانی | لە کاروانێکی دوور و درێژدا/ فاتح رەسول | ساڵێك لە تەمەن/ حوسێن عارف |
| ٣ | | پێشمەرگە پۆلاّیینەکە/ عەبدوڵلا کەریم مەحمود | | *لە کوێوە بۆ کوێ ؟ / منیمن* | ٢٥ رۆژ لە زیندانی فاشییەکانی بەغداد/ سەید قادر جەباری | چەند وێستگەیەك / د. کەمال سەعدی مستەفا |
| ٤ | | | | ژینا نیگارا من/ جگەرخوێن | بیرەوەرییەکانم و تۆپخانەی شۆڕشی ئەیلولی مەزن/ خدر دەباغ | بیرەوەرییەکانی سەنگاوی/ مەحمود سەنگاوی |
| ٥ | | | | چەند وێستگەیەکی | ٣٦٦٥/ بیرەوەری گەنجێکی کوردستانی | |

| | | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|
| | | | | تەمەنم/ ویداد خالیس ئەلقازی | لە زیندانەکانی عێراقدا/ بەرهەم عەلی | |
| ٦ | | | | گرەوی چاوەکانی ئەم/ ئەحلام مەنسوور | بەرەو خۆر/ فازیل رەئووف | |
| ٧ | | | | | گەڕان بە دوای راستیدا/ تالیب مۆریاسی | |
| ٨ | | | | | راستییەکان دەڵێمەوە/ خدر مەرەسەنە | |
| ٩ | | | | | راستییەکان چەواشە ناکەم/ غەفوری میرزا کەریم | |
| ١٠ | | | | | بەسەرهاتووی کاکە رەشید شەوقی/ ئامادەکردنی سدیق سالح | |
| ١١ | | | | | سەفەری کوردایەتی، بیرەوەرییەکانی شار و شاخ/ شاخەوان عەباس | |
| ١٢ | | | | | یاداشت/ رەفیق حلمی | |
| ١٣ | | | | | سەربردەی ژیانم/ مەلا عەولای حاجی سمایل | |
| ١٤ | | | | | ئاوێنەی راستییەکان /خدر مەرەسەنە. | |
| ١٥ | | | | | رۆژژمێری پێشمەرگەیەك/ محەمەد حاجی مەحموود | |
| ١٦ | | | | | بیرەوەرییەکانی دارکنارەکە/ سەدیق سەعید | |

| ١٧ | | | | | بەسەرهاتی سیاسی کورد (یاداشتەکانی) / میرزا مەنگوڕی | |
|---|---|---|---|---|---|---|
| ١٨ | | | | | یاداشتەکانی شێخ لەتیفی حەفید لەسەر شۆڕشەکانی شێخ مەحمود/ شێخ لەتیفی حەفید | |
| ١٩ | | | | | پەنجەکان یەکتری دەشکێنن/ نەوشیروان مستەفا | |
| ٢٠ | | | | | لە کەناری دانوبەوە بۆ خڕی ناوزەنگ/ نەوشیروان مستەفا | |
| ٢١ | | | | | لە شنرۆیوە بۆ ستۆکهۆڵم، چەند لاپەڕەیەك لە بیرەوەرییەکانم لە شۆڕشی ئەیلوولدا/ حەمەی فەرەج هەڵەبجەیی | |
| ٢٢ | | | | | پاداشتەکانم، ئەزمونی ژیانم لە بواری ئیدارە و تیشکێك بۆ سەر رابردوو/ محەمەد سەعید مەحموود | |
| ٢٣ | | | | | بیرەوەرییەکانی نەجمەدین مامۆ هەریری/ نەجمەدین مامۆ هەریری | |
| ٢٤ | | | | | ئەزمون و یاد/ پشکۆ نەجمەدین | |
| ٢٥ | | | | | وەك خۆی/ فەخرەدین تاڵەبانی | |
| ٢٦ | | | | | ژیلەمۆی گەرمیان / شێخ سەعیدی شاکەلی | |
| ٢٧ | | | | | لە هەواری | |

| | | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|
| | | | | | یادەوەرییەکانمدا/ بیرەوەری/ حاجی مەمۆ | |
| ٢٨ | | | | | بۆ تاریکستان/ بابا عەلی ئیسماعیل بەرزنجی | |
| ٢٩ | | | | | لە دەنکەوە بۆ گوڵە گەنمەکان/ (بیرەوەرییەکانی...) عەریف سلێمان | |
| ٣٠ | | | | | بەشێك لە یاداشتەکانم د.عیزەدین مستەفا رەسول | |
| ٣١ | | | | | ئاڵەکۆك/ غەنی بلوریان | |
| ٣٢ | | | | | بیرەوەری پێشمەرگەیەك/ سەید کاکە | |
| ٣٣ | | | | | *ململانێ لەگەڵ ژیاندا، یاداشت/ د. عەبدلستار تاهر شەریف* | |
| ٣٤ | | | | | ٢٥ رۆژ لە زیندانی فاشییەکانی بەغدا/ سەید قادر جەباری | |
| ٣٥ | | | | | بیرەوەرییەکانی ئەحمەدی حەماغای پشدەری/عەبدلڕەقیب یوسف و سدیق سالح | |
| ٣٦ | | | | | چەند لاپەڕەیەك لە بیرەوەرییەکانم د.جەمشید حەیدەری | |
| ٣٧ | | | | | *کورد و ژیانێکی پڕ لە ئەندێشە/د. پاکیزە رەفیق حلمی* | |

| ٣٨ | | | | | بیرەوەری/ محەمەد رەسول هاوار | |
|---|---|---|---|---|---|---|
| ٣٩ | | | | | بیرەوەری تاڵ و سوێری نامۆییم/ ئەسعەد عەدۆ | |
| ٤٠ | | | | | *كێومالێ بە ناو بیرەوەرییەكانمدا/ غەفوری میرزا كەریم* | |
| ٤١ | | | | | بیرەوەرییەكانی ئەحمەدی حەماغای پشدەری | |
| ٤٢ | | | | | رۆژگاری من/ یاداشتی دكتۆر مارف خەزنەدار | |
| ٤٣ | | | | | هەندێك لە بیرەوەرییەكانی. بەهییە مەعروف/ بەهییە مەعروف بەرزنجی | |
| ٤٤ | | | | | رۆژانی ئاوارەییم لە سویسرا/ جەمال نەبەز | |
| ٤٥ | | | | | كاروانی بێ كۆتایی/مەحموود مەلا عزەت | |
| ٤٦ | | | | | ئاوێنەی شكاو/ هێدی | |
| ٤٧ | | | | | بیرەوەرییەكانی سەعید ناكام/ سەعید ناكام | |
| ٤٨ | | | | | پوختەیەك لە بیرەوەرییەكانم/ عەبدولڕەحمان گۆمەشینی | |
| ٤٩ | | | | | چەند یادەوەرییەكی رۆشنبیرانە/ زەید مەحموود عەلی | |
| ٥٠ | | | | | چێشتی مجێور/ هەژار | |
| | | | | | | |

| ٥١ | | | | | بەسەرهاتی رەفیق حلمی/ ناهیدە رەفیق حلمی | |
|---|---|---|---|---|---|---|
| ٥٢ | | | | | ئاوێنەی ژیانم، یاداشتەکانی شاکر فەتاح/ شاکر فەتاح | |
| ٥٣ | | | | | بیرەوەرییەکانم لە ١٩٤٣ بۆ ١٩٧٧/ زراری سلێمان بەگ دەرگەڵەیی | |
| ٥٤ | | | | | یادەوەرییەکان/ مستەفا چاورەش | |
| ٥٥ | | | | | رۆژانی سەخت/ ئەرسەلان بایز | |

٦_ بیبلۆگرافیای تێكستی ئۆتۆبیۆگرافی و بیۆگرافی و جۆرەكانی :

١- ویداد خالیس ئەلقازی . چەند وێستگەیەكی تەمەنم. چاپخانەی شەهاب. هەولێر. ٢٠١٢.

٢- عەبدولمەجید نورەددین جەلی زادە (ئامادەكردنی : د. كەمال مەعرووف) بیرەوەرییەكانی مامۆستا عەبدولمەجید نورەددین جەلی زادە. چاپخانەی شەهاب. هەولێر. ٢٠١٢.

٣- نەجمەدین مامۆ هەریری. بیرەوەرییەكانی نەجمەدین مامۆ هەریری. بەرگی یەكەم. چاپخانەی رۆژهەلآت. هەولێر. ٢٠٠٩.

٤- د. مارف خەزنەدار. رۆژگاری من. (یاداشتی د. مارف خەزنەدار) بەرگی یەكەم. هەولێر. ٢٠٠٩.

٥- پشكۆ نەجمەدین. ئەزموون و یاد. بەشی یەكەم. ١٩٧٨-١٩٨٣ (شوێنی چاپی لەسەر نییە) ٢٠٠٨.

٦- فەخرەدین تاڵەبانی. وەك خۆی. چاپخانەی كارۆخ. سلێمانی. ٢٠٠٦.

٧- شێخ سەعید شاكەلی. ژیلەمۆی گەرمیان. بووژانەوە. بەرگی چوارەم. (بەرگەكانی ترم دەست نەكەوت)، سلێمانی . ٢٠٠٧.

٨- حاجی مەمۆ. لە هەواری یادەوەرییەكانمدا. بیرەوەری. زنجیرەی یەكەم. چاپخانەی كوردستان. (شوێنی چاپی لەسەر نییە) ٢٠١٣.

٩- د. كەمال سەعدی مستەفا. چەند وێستگەیەك. ژیان و بیرەوەری. چاپخانەی منارە. هەولێر. ٢٠١٤.

١٠- بابا عەلی ئیسماعیل بەرزنجی. بۆ تاریكستان. بیرەوەری. چاپخانەی بەدرخان. ٢٠٠١.

١١- مەهاباد قەرەداغی. چلچرا. بیرەوەری. بلآوكراوەی دەزگای ئاراس. هەولێر. ٢٠٠٧.

١٢- عەریف سلێمان. (بیرەوەرییەكانی...) لە دەنكەوە بۆ گوڵەگەنمەكان. چاپخانەی هاوسەر. بەرگی یەكەم. چاپی دووەم. هەولێر ٢٠٠٧.

١٣- عەبدوڵلا كەریم مەحموود. پێشمەرگە پۆلآیینەكە. چاپی یەكەم. ٢٠٠١. چاپخانەی خاك. سلێمانی. ٢٠٠١.

١٤- د. عیزەدین مستەفا رەسول. بەشێك لە یاداشتەکانم. بەرگی یەکەم. چاپخانەی حەمدی. بلاوکراوەی دەزگای سەردەم. سلێمانی. ٢٠٠٦.
١٥- غەنی بلوریان. ئاڵەکۆك. بەسەرهاتەکانی سیاسی ژیانم. ستۆکهۆڵم. ١٩٩٧.
١٦- شێرکۆ بێکەس. نووسین بە ئاوی خۆڵەمێش. ژیاننامە و بیرەوەری. بلاوکراوەی غەزەلنووس. سلێمانی. ٢٠١٣.
١٧- سەید کاکە. بیرەوەری پێشمەرگەیەك. چاپی دووەم. چاپخانەی زانکۆی سەلاحەددین. هەولێر ٢٠٠٠.
١٨- محەمەد رەسول هاوار. (ئامادەکردنی: سدیق سالح). بیرەوەری . سەرجەمی بەرهەمی. بەرگی یەکەم. بنکەی ژین. سلێمانی. ٢٠٠٧.
١٩- گەلاوێژ . بیرەوەرییە هەرگیز لە بیرنەکراوەکانی من. بەشی یەکەم. چاپخانەی ئاراس. هەولێر. ٢٠٠٩.
٢٠- سەید قادر جەباری. ٢٥ رۆژ لە زیندانی فاشییەکانی بەغدا. چاپخانەی تیشك. سلێمانی. ٢٠٠١.
٢١- عەبدلرەقیب یوسف، سدیق سالح. بیرەوەرییەکانی ئەحمەدی حەماغای پشدەری. چاپخانەی ئازاد. سلێمانی. ٢٠٠١.
٢٢- عەلی مەردان. گەلای پاییز. بیرەوەری. (ئامادەکردنی : عەبدلقادر عەلی مەردان) رێکخستن و لێکۆڵینەوە : ئەحمەد سەیید عەلی بەرزنجی. (ساڵ و شوێنی چاپی بەسەرەوە نییە.) بلاوکراوەی دەزگای ئاراس. هەولێر. ٢٠٠٨.
٢٣- احمد خواجە. چیم دی. ٣ بەرگ. چاپخانەی شەفەق. بەغدا. ١٩٦٨.
٢٤- د. پاکیزە رەفیق حلمی. کورد و ژیانێکی پڕ لە ئەندێشە. بەرگی یەکەم. ٢٠٠٠.
٢٥- هێمن موکریانی. لە کوێ وە بۆ کوێ ؟ تاریك و روون. چاپی ساڵی ٢٠٠٤.
٢٦- ئەحلام مەنسوور. گرەوی چاوەکانی ئەم. ئەزموون. بلاوکراوەی دەزگای ئاراس. هەولێر. ٢٠٠٨.
٢٧- مستەفا چاوڕەش. یادەوەرییەکان. چاپخانەی سەردەم. سلێمانی. ٢٠١٤.
٢٨- زراری سلێمان بەگ دەرگەڵەیی. بیرەوەرییەکانم لە ١٩٤٣ بۆ ١٩٧٧. چاپخانەی رەهەند. سلێمانی. ٢٠١٢.

٢٩- ئەرسەلان بایز. ڕۆژانی سەخت. (ناوی چاپخانەی لەسەر نییە) سلێمانی. چاپی یەكەم. ٢٠٠٥.
٣٠- ناهیدە ڕەفیق حلمی. (ئامادەكردنی..) بەسەرهاتی ڕەفیق حلمی. پێداچوونەوەی لە ڕووی زمانەوانی و پێنووسەوە. كەژاڵ ئەحمەد، بەشی یەكەم. چاپخانەی وەزارەتی ڕۆشنبیری. سلێمانی. ٢٠٠٥.
٣١- مەحموود سەنگاوی. بیرەوەرییەكانی مەحموود سەنگاوی. چاپی یەكەم. چاپخانەی تیشك. سلێمانی. ٢٠٠٤.
٣٢- كاكە مەم بۆتانی. كاكەمێكی تر. بیرەوەری. بڵاوكراوەی بنكەی ئەدەبی و ڕووناكبیری گەلاوێژ. چاپخانەی سیما. سلێمانی. ٢٠٠٥.
٣٣- د. جەمشید حەیدەری. چەند لاپەڕەیەك لە بیرەوەرییەكانم. ١٩٤٩-١٩٦٦. چاپی یەكەم. ستۆكهۆڵم. ١٩٩٣.
٣٤- عەقید بەكر عەبدلكەریم حەوێزی. گەشتێك بە كۆماری مەهاباددا. بیرەوەرییەكانم لە ڕۆژهەلاتی كوردستاندا. ١٩٤٤-١٩٤٧. بەشی یەكەم. پێشەكی و پێداچوونەوەی كەمال عەلی، چاپی یەكەم. ٢٠٠٠. چاپ و ئۆفسێتی دەزگای سەردەم. كۆیە. كوردستان. ١٩٩٣. (ئەم كتێبە گوایە ساڵی ١٩٩٣ نووسراوە. چونكە هەر دوو مێژووی لەسەرە.)
٣٥- ئەحمەد دلزار. پاشكۆی بیرەوەرییەكانم. بەشی دووەم. بڵاوكراوەی گۆڤاری بیری نوێ. هەولێر. ٢٠٠١.
٣٦- فاتح ڕەسول. لە كاروانێكی دوور و درێژدا. كورتەی خەبات و ئەزموونی پەنجا ساڵ. بڵاوكراوەی ئاپێك. ستۆكهۆڵم. ١٩٩٧.
٣٧- خدر دەباغ. بیرەوەرییەكانم و تۆپخانەی شۆڕشی ئەیلولی مەزن. بەرگی یەكەم و دووەم. دەزگای موكریانی. چاپی یەكەم. هەولێر. ٢٠٠٢.
٣٨- بەهییە مەعرووف بەرزنجی (خاتوو) هەندێك لە بیرەوەرییەكانی ...، ئامادەكردنی لوتفیە ئیبراهیم سالح. وەزارەتی ڕۆشنبیری. بەڕێوەبەرێتی گشتیی چاپ و بڵاوكردنەوە. چاپی یەكەم. سلێمانی ٢٠٠٢.
٣٩- بەرهەم عەلی. ٣٦٦٥ ، بیرەوەری گەنجێكی كوردستانی لە زیندانەكانی عێراقدا. چاپی یەكەم. چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە. كوردستان. ٢٠٠١.

٤٠- فازیل رەئووف. بەرەو خۆر. بەرگی یەكەم، چاپی یەكەم. ٢٠٠١. چاپخانەی وەزارەتی رۆشنبیری. هەولێر. ٢٠٠١.

٤١- تالیب مۆریاسی. گەڕان بە دوای راستیدا، یاداشتنامەی پێشمەرگەیەكی ماندوونەناس. بەرگی یەكەم. رووداوەكانی نێوان سالآنی ١٩٥٣-١٩٩٦. چاپخانەی پاك.

٤٢- خدر مەرەسەنە. راستییەكان دەلێمەوە. بەرگی یەكەم و دووەم. چاپی دووەم. كوردستان. ٢٠٠٣.

٤٣- غەفوری میرزا كەریم. راستییەكان چەواشە ناكەم. چاپی یەكەم. ٢٠٠٢. چاپخانەی رەهەند. سلێمانی. ٢٠٠٢.

٤٤- جەمال نەبەز. رۆژانی ئاوارەییم لە سویسرە. بلآوكراوەی بنكەی گەلاوێژ. چاپخانەی داناز. سلێمانی. چاپی یەكەم. ١٩٩٩.

٤٥- سدیق سالح (ئامادەكردنی) بەسەرهاتووی كاكە رەشید شەوقی. سەرگوزەشتە. چاپخانەی وەزارەتی رۆشنبیری. چاپی یەكەم. سلێمانی. ٢٠٠٣.

٤٦- سەعید ناكام. بیرەوەرییەكانی سەعید ناكام. بلآوكراوەی ئاراس. چاپی یەكەم. چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە. هەولێر. ٢٠٠٣.

٤٧- هێدی. (خالید ئاغای حیسامی) ئاوێنە شكاو یان بیرەوەری هێدی. بلآوكراوەی دەزگای ئاراس. چاپی یەكەم، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە. هەولێر. ٢٠٠٤.

٤٨- مەحموود مەلا عزەت. كاروانی بێ كۆتایی. گۆشەیەك لە یاداشت و بیرەوەرییەكان. چاپی دووەم. سلێمانی. ٢٠٠٠.

٤٩. رەفیق حلمی . یاداشت. چاپی سێیەم. دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم. سلێمانی. ٢٠٠٣.

٥٠- مەلا عەولای حاجی سمایل. سەربردەكانی ژیانی سیاسیم. بەرگی یەكەم. چاپخانەی ئەلرەشاد. بەغداد ١٩٩٠.

٥١- خدر مەرەسەنە. ئاوێنەی راستییەكان. چاپی دووەم.. سلێمانی. چاپخانەی قانع. ٢٠٠٤.

٥٢– محەمەد حاجی مەحموود. رۆژژمێری پێشمەرگەیەك. ٣ بەرگ. چاپی یەكەم. چاپخانە و ئۆفسێتی بێسارانی. سلێمانی. ١٩٩٩.
٥٣– زەید مەحموود عەلی. چەند یادەوەرییەكی رۆشنبیرانە. چاپی دووەم. چاپخانەی ئۆفسێتی هەولێر. ٢٠٠٠.
٥٤– ئەسعەد عەدۆ. بیرەوەری تاڵ و سوێری نامۆییم. هۆڵەندا. ٢٠٠٠.
٥٥– سدیق سەعید. بیرەوەرییەكانی داركنارەكە. وەزارەتی رۆشنبیری، بەڕێوەبەرێتی گشتیی چاپ و بلاّوكردنەوە. چاپخانەی وەزارەتی رۆشنبیری. سلێمانی. ٢٠٠٣.
٥٦– شێخ رەئووفی شێخ كەریمی بەرزنجی. بیرەوەری و ئامۆژگاری. چاپخانەی دارا. هەولێر ١٩٩٨.
٥٧– میرزا محەمەد ئەمین مەنگوڕی. بەسەرهاتی سیاسی كورد. (یاداشتەكانی..) بەرگی یەكەم و دووەم. بلاّوكراوەی وەزارەتی رۆشنبیری. چاپخانەی راز. چاپی یەكەم. سلێمانی. ٢٠٠١.
٥٨– هەژار (عەبدلرەحمان شەرەفكەندی) چێشتی مجێور. ئامادەكردن و سەرپەرشتی چاپ: خانی شەرەفكەندی. چاپی یەكەم. پاریس. ١٩٩٧.
٥٩– شێخ لەتیفی حەفید. یاداشتەكانی شێخ لەتیفی حەفید. ساغكردنەوەی : كەمال نووری مەعرووف. چاپی یەكەم. بلاّوكراوەی مەكتەبی ناوەندی و راگەیاندنی پارتی دیموكراتی كوردستان. ١٩٩٥.
٦٠– كۆمەڵێك نووسەر. (ئامادەكردنی حەمە نووری تۆفیق) پیاونامە، گوڵبژێرێكی ژیاننامەی شەهیدی نەمر عەلی عەسكەری. چاپی یەكەم. سلێمانی. ٢٠٠٤.
٦١ – شاكر فەتاح. ئاوێنەی ژیانم. یاداشتەكانی شاكر فەتاح. سەرجەمی بەرهەمی شاكر فەتاح. بەرگی یەكەم. كۆكردنەوە و رێكخستنی: ئەحمەد سەید عەلی بەرزنجی. چاپی یەكەم. چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە. هەولێر. ٢٠٠٣.
٦٢– نەوشێروان مستەفا ئەمین. پەنجەكان یەكتری دەشكێنن. چاپی سێیەم. سلێمانی. ١٩٩٨.

٦٣- حەمەی فەرەج هەڵەبجەیی. لە شنرویێوە بۆ ستۆكهۆڵم. چەند لاپەڕەیەك لە بیرەوەرییەكانم لە شۆڕشی ئەیلوولدا. بەرگی یەكەم. چاپی دووەم، وەزارەتی رۆشنبیری. سلێمانی. ٢٠٠٤.
٦٤- حوسێن عارف. ساڵێك لە تەمەن. چاپی یەكەم. دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم. سلێمانی. ١٩٩٩.
٦٥- غەفور میرزا كەریم. كێوماڵێ بەناو بیرەوەرییەكانمدا. چاپخانەی هەمیشە. سلێمانی. ٢٠٠٠.
٦٦- عەبدلرەحمان گۆمەشینی. پوختەیەك لە بیرەوەرییەكانم. چاپخانەی ئۆفسێتی قانع. چاپی یەكەم. سلێمانی. ٢٠٠٣.
٦٧- شاخەوان عەباس. سەفەری كوردایەتی. بیرەوەرییەكانی شار و شاخ. ١٩٧٤-١٩٨٠. (شوێنی چاپی لەسەر نییە) ٢٠٠٢.
٦٨-محەمەد سەعید مەحموود. یاداشتەكانم. ئەزموونی ژیانم لە بواری ئیدارە و تیشكێك بۆ سەر رابردوو. دار الحكمة. لەندەن. ٢٠٠٤.
٦٩- مەسعود محەمەد. گەشتی ژیانم. چاپی سێیەم. ٢٠٠٩.
٧٠- د. عەبدلستار تاهر شەریف. ململانێ لەگەڵ ژیاندا. یاداشت. بەرگی یەكەم. چاپی یەكەم. كەركوك. ٢٠٠٥.

## ئه نجام

ئۆتۆبیۆگرافی و بیۆگرافی جۆرێكی ئەدەبی نوێیە لە ئەدەبی كوردی. سەرهەڵدان و گەشەسەندنی دەگەڕێتەوە بۆ سەرەتای سەدەی بیستەم. ئەم ژانرە بە هەموو جۆرەكانیەوە وەك ژیاننامە Autobiographie، یاداشت یان گەشتی ژیان Biographie، بیرەوەری و یادەوەری souvenirs ، رۆژانە یاداشت Journal Intime ، بەسەرهات و سەرگوزەشتە mémoires ، دەفتەری یاداشت Carnets . وتار Essai ، سەربردە و چیرۆك Récit ، دەفتەری تێبینی Bloc-notes. بە درێژایی ئەم سەد ساڵەی رابردوو گەشەی كردووە و دەوڵەمەند بووە. زۆربەری هەرە زۆری ئەو ئۆتۆبیۆگرافیانەی لە ناو ئەدەبیاتی كوردی بلاوبوونەتەوە لە جۆری "بەسەرهات و سەرگوزەشتەن nmémoires . ئەو جۆرە ئۆتۆبیۆگرافیایە زۆر كەمە كە ژیانی نووسەرەكە خۆی چەقی گێڕانەوەكانی داگیر كردبێ، خۆی ژیانی بابەتی گێڕانەوەكانی بێ، وەك ناسنامەیەكی زاتی خرابێتە ڕوو، بە پێچەوانەوە ئەوەی كە زۆرترە لە جۆری بەسەرهات و سەرگوزەشتەیە، ئەمەش لە روانگەی ئێمە دەگەڕێتەوە بۆ لاوازیی تاكەكەسی كورد وەك زات و بوون، وەك ئۆنتۆلۆژی و فینۆمینۆلۆژی، ئەوەی كە گرینگە و زیاتر گەشەی كردووە زات و بوونی مێژوویی ئینسانی كوردە، هەربۆیە بەشی هەرە زۆری ئۆتۆبیۆگرافییەكان رووداو و بەسەرهاتە گشتییەكان دەگێڕنەوە كە لەم سەد ساڵەی دوایی بەسەر كورددا هاتوون.

## پەراوێز :

١- د. موحسین ئەحمەد عومەر. فەرهەنگی ئەدەبی. بلأوكراوەی رەخنەی چاودێر. سلێمانی ٢٠١٢ . ٣٠٨

٢- لە لایەكی ترەوە ئۆتۆبیۆگرافی وەك لایەنێك لە : مافەكانی مرۆڤ حسێبی بۆ دەكرێ، ئەم روانینەش زیاتر دوای شۆڕشی فرەنسی گەشەی كردووە. بەو مانایەی هەموو كەسێك ئەو مافەی هەیە روانین و رای خۆی بەیان بكا و بیگەیەنێتە كۆمەلأنی خەلك.

٣- سەرچاوەی پێشوو. لا ٣٠٨.

4- Encyclopaedia Universalis. Dictionnnaire des genres et notions littéraire. Préface par François Nourissier. Albin Michel. Paris. 1997. P. 49.

5- Miraux. Jean –Philippe. L'autobiographie. Ecriture de soi et sincérité. Armand Colin. Paris. 2007. P 23-24.

6- Nouveau Petit . LE ROBERT. Dictionnaire de la langues Française. Paris. 1995. P. 161

7- Miraux. Op.cité. p. 26.

٨- ئەو ئەدەبەی لە لایەن ئەمریكییەكان و ئوستورالییەكان و كەنەدییەكان دەنووسرێ بە ئەدەبی ئینگیزی دانانرێ، بەلكو بە ئەدەبی كەنەدی و ئەمریكی و ئوسترالی دادەنرێ یان دەوترێ ئەو ئەدەبەی بە ئینگلیزی دەنووسرێ، بە هەمان شێوە ئەو ئەدەبەی بە فرەنسی لە هەرێمی كێبێكی فرەنسیی زمانی كەنەدایی دەنووسرێ دەوترێ ئەدەبی كێبێكی.

9- Wellek, René et Warren Austin. La théorie Littéraire. Editions du Seuil, Paris. Collection Poétique. 1971. P. 101.

10- ABRAMS. M. H. A Glossary of Literary Terms. Heinle and Heinle. USA. P. 22.

11- LEJEUNE, philippe. Le pacte Autobiographique. Essai. Editions du Seuil. Paris. 1996. P. 14.

12- Ibide. P.14.

١٣- د. موحسین ئەحمەد عومەر. فەرهەنگی ئەدەبی. سەرچاوەی پێشوو. لا ٢٤٦ .

14- LEJEUNE, philippe. Op.cité. p. 15.

15- Miraux. Op.cité. p. 11-12.

16- Ibide. P. 12.

17- Ibide. P. 12.

18- Ibide. P.15.

19- Ibide. P. 15.

20- Ibide. P. 124.

21-Ibide. P. 124.

٢٢- د. هاشم ئەحمەد زادە. زمان و ناسنامە. بڵاوكراوەی دەزگای ئاراس. هەولێر. ٢٠١٢. ل١٢٧
23- Miraux. Op.cité. 13.

٢٤- بەم دواییيە وەرگێڕانە كوردییەكەی بڵاوبووەتەوە.

### بیبلۆگرافیای سەرچاوەكان


1- Encyclopaedia Universalis. Dictionnnaire des genres et notions littéraire. Préface par François Nourissier. Albin Michel. Paris. 1997.

2- Miraux. Jean –Philippe. L'autobiographie. Ecriture de soi et sincérité. Armand Colin. Paris. 2007.

3- Nouveau Petit LE ROBERT. Dictionnaire de la langues Française. Paris. 1995.

4- Wellek, René et Warren, Austin. La théorie Littéraire. Editions du Seuil, Paris. Collection Poétique. 1971.

5- ABRAMS. M. H. A Glossary of Literary Terms. Heinle and Heinle. USA.

6- LEJEUNE, philippe. Le pacte Autobiographique. Essai. Editions du Seuil. Paris. 1996.

٧- د. هاشم ئەحمەد زادە. زمان و ناسنامە. بڵاوكراوەی دەزگای ئاراس. هەولێر. ٢٠١٢.

٨- د. موحسین ئەحمەد عومەر. فەرهەنگی ئەدەبی. بڵاوكراوەی رەخنەی چاودێر. سلێمانی ٢٠١٢ .

## ملخص البحث

تعتبر السيرة والسيرة الذاتية من الانواع الادبية الحديثة في الادب الكوردي. لقد نشأ وتطور هذا النوع الادبي في بدايات القرن العشرين الى يومنا هذا. يتضمن هذا النوع الادبي السيرة الذاتية، السيرة، المذكرات، اليوميات، السير الحدثية، المقالة والسرد...الخ. لم يتم التطرق من قبل الى السيرة الذاتية وانواعها في الادب الكوردي الا قليلا. ان اكثرية السير الذاتية الموجودة حاليا ليست سوى احداث، قلما نجد سيرة ذاتية يتحدث فيها الكاتب عن نفسه وحياته. ويعود هذا الامر الى الضعف في فردية الانسان الكوردي، على الصعيدين الذاتي والحضاري. ان الذي طغى وانتشر بشكل جيد في الادب الكوردي هو الذات والوجود التاريخي للفردية الكوردية، وهذا يفسر كون السير الذاتية الموجودة ليست الا سير حدثية.



## Abstract

L'autobiographie est un nouveau genre littéraire qui trouve sa place dans la langue et littérature kurde. La naissance de ce genre littéraire date au début du XXème siècle. Ensuite, elle s'est développée et s'est répandue durant ces dernières années. Aujourd'hui, nous trouvons les genres littéraires telles que: l'autobiographie, la biographie, les souvenirs, les mémoires, les carnets, le journal-intime et le bloc-notes…etc. Il y a plus de 68 textes dont la majorité d'entre eux, sont de mémoire. Rare sont les textes qu'on n'y trouve pas des auteurs qui parlent d'eux-mêmes. Cette absence due à la faiblesse de l'individualisme kurde. Par contre, l'individualisme historique kurde est très présent

# ئافرەتی کورد
# لە بەرهەم و تابلۆکانی ڕۆژهەڵاتناساندا
# لە سەدەی حەڤدەیەمەوە تاکو سەدەی بیستەم

**سازان سەباح پیربال**
بەشی شوێنەوار – کۆلێژی ئەدەبیات –
زانکۆی سەلاحەددین – هەولێر

**پوختە**

ڕۆژهەڵاتناسان بەشێکی فراوانی کارەکانیان تەرخانکردووە بەتایبەتی بۆ ئاشنابوون بە کارەکانی ئافرەتی کورد ، وێنەی جوانی ئافرەتی کورد و هەڵسوکەوت و کارەکانی لە نێو ماڵ و سیاسەتدا، زەخیرەیەکی مەزنی کارەکانیان بووە ، سەرچاوەکانی ڕۆژهەڵاتناسان بە شانازییەوە باسی پلە و پێگەی ئافرەتی کوردیان کردووە ، لەگەڵ ئەوەشدا لەو سەردەمدا کورد کیانێکی سەربەخۆ و خاوەنی ویست و ئیرادەیەکی سیاسی و کۆمەڵایەتی و ئابووریی خۆی نەبووە، بەڵکو هەمیشە لە ژێردەستی عوسمانی و سەفەویدا بووە.

ئافرەتی کورد لەگەڵ هەموو ئەو کۆسپ و تەگەرانەی هاتۆتە پێشی، هێز و توانایەکی زۆر و بێ وێنەی لە پێکهاتەی ڕەوت و چالاکییەکانیدا هەبووە، بۆیە توانیویەتی ڕۆڵی تایبەتیی خۆی لە ژیانی ڕۆژانەیدا بگێڕێ .

ئەوەش دیاردەیەکی ڕوونە کە ئافرەتی کورد لەگەڵ ژنانی کۆمەڵگای ڕۆژهەڵات جیاوازییان هەبووە. لە نێوان دید و بۆچوونی ڕۆژهەڵاتناسان دەتوانین بگەین بە جۆرێك لە هەستکردن و خاڵێکی گرنگ ئەویش ئازادی و سەربەخۆیی ئافرەتی کوردە وەکو مۆرکێکی تایبەت بە کۆمەڵگای کوردی.

خاڵە هاوبەش و لەیەکچووەکانی تابلۆ جۆراوجۆرەکانی ڕۆژهەڵاتناسەکان ئەگەرچی لە کات و سەفەر و شوێنی جیاوازدا کێشراون یان گیراون و لەسەریان نووسراوە، بەڵام ڕووکراوەیی، میوان دۆستی، داوێن پاکی، زیت و چەلەنگی، خشڵ پۆشی و ڕەنگامەیی جلوبەرگ، کە زۆر جار ڕەنگەکان ڕەنگی کراوە و دڵخۆشن لە دنیای ئافرەتی کوردی دەبینرێن و دووبارە دەبنەوە.

## بەشی یەکەم

## کورتەیەك لە مێژووی کورد لە سەردەمی عوسمانیدا :

ئەو ماوەیە مێژووی کورد ، ماوەیەکی داهێزرانییە لە ژیانی نەتەوەیی و نیشتیمانی کورددا، ئەمەش لەبەر هۆیەکی سەرەکی بووە ئەو نالەبارییە ئەویش دابەشکردنی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست بەسەر دوو ئیمپراتۆریەتی دوژمن بەیەکی فارس و عوسمانیدا کە شەڕگەی سەرەکییان ناو جەرگەی کوردستان بوو[1] هۆکاری سەرەکیش شوێنگەی جوگرافی کوردستان کاریگەری گەورەی لەسەر دروستبوونی ئەم مێژووە هەبووە ، هەر ئیمپراتۆریەتێك ویستوویەتی گەورەترین پانتایی کوردستان داگیر بکات و بیخاتە بن دەستی خۆی ، لە سەدەی شازدەیەم کوردستان پێکهاتبوو لە چەند میرنشینێك کە جیاوازییان هەبووە لە لایەنی فراوانیی میرنشینەکە و جۆری دەسەڵاتیان، هەندێکیان دەسەڵاتیان سنووردار بووە وەکو میرنشینی بانە و هەندێکیشیان دەسەڵاتیان فراوان بووە وەکو میرنشینی ئەردەڵان و میرنشینی سۆران، محەمەدی رواندوز سنوورێکی ئێجگار فراوانی لە ژێر دەستدا بووە، ئەو میرنشینانەی کە لە سەدەی شازدەهەمدا هەبوونە بریتی بوون لە میرنشینی پازوکی، میرنشینی سیڤیدیا، میرنشینی چمشکزك، میرنشینی بەتلیس، میرنشینی ساسون، میرنشینی خیزان، میرنشینی هەکاری و میرنشینی بۆتان، ئەم میرنشینانە لە باکووری کوردستان بوونە، میرنشینەکانی ڕۆژهەڵاتی کوردستان، میرنشینی لوڕستان ، میرنشینی موکریان، میرنشینی بانە، میرنشنی دنبلی، میرنشینی برادۆست، میرنشینی کەلهوڕ ، میرنشینەکانی باشووری کوردستان، میرنشینی بادینان، میرنشینی سۆران، میرنشینی بابان، میرنشینی ئەردەڵان، میرنشینی داسنی[2]، ئەو میرنشینانە بەڵگەی ئەوەن کە کوردستان دەسەڵاتی سیاسی ڕێپێدراوی لەو ماوەیەدا هەبووە. بەڵام پەرتەوازەیی هێزی میرنشینەکان و ناکۆکییان و نەبوونی هێزێکی یەکگرتووی کوردی و ئەمانە هۆکارن بۆ ئەوەی ناوچە کوردییەکان ببێتە مەیدانی چالاکی جموجووڵی عوسمانی و سەفەوی ، شا ئیسماعیل لە ساڵی ١٥٠٦ز هێزێکی زۆری نارد بۆ ناوچە کوردییەکان توانی چەندین سەرکەوتن و ملکەچی بەشێك لە میرنشینەکان بەدەست بهێنێت لەوانە میرنشینی هەکاری و میرنشینی چمشکزك،

میرنشینی ئەگیل و چەندین میرنشینی تر، بەڵام ئەوە مانای ئەوە نییە ڕووبەڕووی هیچ بەرەنگارییەکی میرنشینە کوردییەکان نەبووبێتەوە، بۆ نموونە میرنشینی بۆتان توانی نزیکەی ٧٠ کەس لە سوپای سەفەوییەکان بکوژێ[٣]، عوسمانییەکانیش سوڵتان سەلیمی یەکەم دەسەڵاتی وەرگرت لە ساڵی ١٥١٢ز–١٥٢٠ز کەوتە ململانێ لەگەڵ شا ئیسماعیلی سەفەوی ویستی سۆزی کوردەکان بۆ خۆی رابکێشێت بۆ گەیشتن بە ئامانجەکانی سوودی لە پەیوەندیی مەلا ئیدریسی بەتلیسی وەرگرت پیاوێکی ئاینی بوو، ئیدی تای تەرازوو بەلای عوسمانیدا بوو، کۆمەڵێ سەربازی بەخشی بە میرنشینەکانی بۆ پاراستنی ئاسایشی دەوڵەتی عوسمانی دەسەڵاتی بە میرەکانیش بەخشی[٤]، بەهۆی بایەخی ئابووری ناوچەکە و جیاوازیی مەزهەبی بە تایبەت ئەو توندڕەوییەی سەفەوییەکان پەیڕەویان دەکرد بۆ سەپاندنی مەزهەبەکەیان، بەم جۆرە سوڵتان سەلیم لە دژی شا ئیسماعیل و سەفەوییەکان شەڕی ڕاگەیاند کوردەکانیش بەشداری ئەم شەڕەیان کردووە ئەمیش شەڕی چالدێران لە دەشتی چالدێران لە ساڵی ١٥١٤ز دەکەوێتە باکووری ڕۆژهەڵاتی دەریاچەی وان ، بەم شێوەیە هەردوو سوپا لە دەشتی چالدێران بەیەك گەیشتن سوپای عوسمانی سەرکەوتنی بەسەر سەفەوییەکان بەدەست هێنا، سوپای سەفەوییەکان پاشەکشەیان کرد، سوڵتانیش هەتا کەنارەکانی دەریای الرس بەدوای شا ئیسماعیل چوو، ئەم شەڕە وای لە دەوڵەتی عوسمانی کرد کە بەشێکی زۆری ناوچە ستراتیجییەکان بخاتە ژێر ڕکێفی خۆی وەکو ئەنادۆڵ و قەفقاس و سوریا و ئێران داگیر بکات[٥]. دوای ئەم شەڕە بووە هۆی دابەشبوونی کوردستان زۆرینەی کەوتە ژێر رکێفی دەوڵەتی عوسمانی بەپێی ڕێککەوتنامەی (ئاماسیە) هەندێ ناوچەش هەر لە ژێر دەسەڵاتی سەفەوی مایەوە هەردوولا دانیان بە دەسەڵاتی یەکترنا لەسەر ئەو ناوچانەی کە داگیریان کردبوو، میرنشینە کوردەکان چوونە ژێر رکێفی عوسمانییەکانەوە بەپێی ئەو ڕێککەوتنامەی کە بەرژەوەندی کوردی لەخۆگرتبوو لەوانە پاراستنی سەربەخۆیی میرنشینە کوردییەکان، دانپیانانی عوسمانی بە مافی میراتگەلی بۆ میرە کوردەکان لە فەرمانڕەواکردنی میرنشینەکان. لەسەر میرە کوردەکانە کۆمەکی دەوڵەتی عوسمانی بکات لەکاتی شەڕدا، دەوڵەتی عوسمانیش ئەم میرنشینانە دەپارێزێت

لە مەترسی دەرەکی، بەڵام ئەم ڕێککەوتنامەیە کاری پێنەکرا[٦]، لە ساڵی ١٨٣٣ز سوڵتانی عوسمانی سوڵتان مەحمودی دووەم بڕیاری دا میرنشینە کوردییە سەربەخۆکان وەکو میرنشینی بابان و میرنشینی ئەردەڵان و میرنشینی رواندز لە ناو ببات و بیانخاتە پاڵ دەوڵەتی عوسمانی، دوای ململانێیەکی زۆری میری میرنشینەکان بەرامبەر دەوڵەتی عوسمانی کەوتن و تێکشکان، دوای رووخانی ئەم میرنشینانە بارودۆخ لە دواکەوتن بوو، هۆکاری ئەم دواکەوتنەش دەگەڕێتەوە بۆ دەزگاکانی دەوڵەتی عوسمانی کە لە دوای ڕووخانی میرنشینەکان لە شارەکان و لە دەڤەرەکان دایانمەزراندبوو، ئەم دەزگایانە گەندەڵی کارگێڕی و ستەمکاری و ناسەقامگیرییان لەگەڵ خۆیان بۆ دەڤەرەکان هێنا[٧]، لە کۆتاییەکانی سەردەمی عوسمانی، (صديق الدملوجي) فەرمانبەر بوو لە ناوچەکانی بادینان باسی ئەم بارودۆخە دەکات دەڵێ: "ئەم وڵاتەی دەکەوێتە دەستی بیانییەوە چاوەڕێی ئەوەی لێ ناکرێ کار بۆ پەرەسەندن و ئاوەدانکردنەوە بکات، بەڵکو لە پێناو بەهێزکردنی دەسەڵاتی خۆی بە شێوەیەکی ستەمکارانە حوکم دەکات، ئەمەش کاریگەری لەسەر دابەزینی ئاستی ئاوەدانی شارەکان دەکات."[٨] لە ڕووی ڕەگەز و ئایینیشەوە هەمەجۆر بوون چونکە لە پاڵ کوردە موسڵمانەکان کوردی ئێزیدی و جوولەکە و کریستیان و هەروەها ئەرمەنیشی لەخۆ دەگرت، لە ڕووی ئابووریشەوە ناوچە کوردییەکان بایەخیان کەم نەبوو بەهۆی ئەوەی ناوچەیەکی باراناوییە لە کشتوکاڵ و ڕەز و باخەکان دەوڵەمەند بووە جگە لەوە دەوڵەمەند بوو لە سامانی کانزایی، بە تایبەت شاری ئامێدی، هەروەها گرنگییان بە پەیوەندیی بازرگانی دەدا، جگە لەوە کوردەکان بە پیشەی ترەوە خەریك بوون وەکو ڕستن و چنین[٩].

## بەشی دووەم
## کوردستان و ئامانجەکانی سەردانی ڕۆژهەڵاتناسان

زانستی ڕۆژهەڵاتناسی : لەو چەمکانە دەکۆڵێتەوە کە پسپۆڕ و شارەزایانی ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا، توێژینەوەی جۆراوجۆر لەسەر ئەو لایەنە هەمەجۆرانە بە ئەنجام دەگەیەنن کە تیایدا پسپۆرن، بێگومان ڕۆژهەڵاتناسان چەندین ئامانجی تایبەتییان بۆ ئەو لێکۆڵینەوانە هەبووە بۆ ئەو ناوچە جیاجیایانەی کوردستان، کە بەکورتی هەندێ لەو ئامانجانەیان دەخەینە ڕوو:

١- ئامانجی سیاسی: کوردستان لەڕووی سەربازی و سیاسییەوە بایەخێکی گرنگی بێ سنووری هەیە، وەك مێژوو بە بەڵگە سەلماندوویەتی دەسەڵاتداران و فەرمانڕەوایانی دراوسێ و دەوروبەر بەمەبەستی فراوانکردنی سنووری دەسەڵاتی خۆیان، هەمیشە نەخشە و پلانی جۆراوجۆریان بۆ داگیرکردنی دارشتووە، بۆ نموونە: ڕووسیای قەیسەری هەر لە ڕۆژگارەکانی دێرینەوە چەندین ناوچەی لەسەر سنوورەکانی دەوڵەتی ئێران و تورکیا وەك ناوچەی ئازەربایجان و قەوقاز داگیر کردووەو وەك نموونەی لاساییکردنەوەی هەندێ لە وڵاتە ئەوروپاییەکان وەك بەریتانیاو فەرەنسا، مەبەستی گەیشتن بەئامانجی سیاسی و ئابووری و ئایینی بۆ ناو جەرگەی نیشتمانی کورد، کە پێگەیەکی ستراتیژی بووە، لەوانە فەرەنسا کە کونسوڵی خۆی بۆ کوردستان ناردووە بۆ دەسڕاگەیشتنی بە ناوچەکانی تری ڕۆژهەڵات.

٢- ئامانجی ئایینی: ڕۆژهەڵاتناسان ئامانجی هاتنیان لە سەرەتادا بۆ بڵاوکردنەوەی بیروباوەڕی ئایینی، یان پاڵپشتیکردنی ئایینی مەسیحی بووە، کە کوردستانیش پێگەیەکی گرنگی ئەو ئایینە بووە[١٠].

٣- ئامانجی زانستی: لە سەدەی هەژدەیەمەوە، گەشت و سەردانی ڕۆژهەڵاتناسان لە مێژوونووسی و جوگرافیناسی و نووسەری و ڕۆژنامە نووسی و نیگارکێشی پێکهاتبوون ، ئەوانە هەندێکیان توێژێکی دوور لەبەرژەوەندی سیاسی و مادی بوون، سەدەی هەژدەهەم چەندین نووسەری فەرەنسایی بۆ مەبەستی لێکۆڵینەوە لەسەر زمان و ئاین و جلوبەرگی کوردی بەناوچەکانی کوردستاندا گەڕاون، ئەمەو هەر لەو سەردەمەشدا چەندین لەو ڕۆژنامەنووسانە کە بە دیمەنی

جوان و ڕازاوەی سروشتی کوردستان سەرسام بوون و شەیدای بینینی ناوچەکە بوون و کاتەکانیان تەرخان کردبوو بۆ سەردان و گەڕان بەناو ناوچە شاخاوی و پێدەشتەکان، نیگاری دیمەنی سروشتی جوان و لادێیە سەرنجڕاکێشەکانی کوردستانیان کێشاوەو تابلۆکانیان لە گالەری و مۆزەخانەی وڵاتەکانیان وەك پێشانگا خستۆتە ڕوو و پاراستوویانە، ئەمەو زۆر لە بازرگانەکانیش وەك مارکۆپۆلۆ کە بە ڕەگەز ئیتالییە، کە گەشتی جیهانی ئەنجامداوە هاتۆتە کوردستان و لە کۆتاییەکانی سەدەی نۆزدەشدا زۆربەی وڵاتان چەندین پەیمانگا و دەزگایان لە وڵاتانی خۆیان کردۆتەوە بۆ گرنگیدانی زیاتر بە کولتوور و زمانی کوردی[11].

٤- ئامانجی ئابووری: کوردستان کە شوێنێکی ستراتیژی و بازرگانی و هەڵکەوتنی لەسەر چەندین ڕێگای بازرگانی بووە، لە سەدەکانی ١٦، ١٧، ١٨ هەندێ لە ڕۆژهەڵاتناسان بەمەبەستی بازرگانی و گەیشتن بە وڵاتانی تری دەوروبەری کە شاری حەڵەب و ئەسفەهان بەیەکتری دەبەستێتەوە بەتایبەتی ناوچەی هەریر، کە ئەم ڕێگایانە هەموو کوردستانیان کردبوو بە مەڵبەندێکی دەوڵەمەند و زێڕینی ڕۆژهەڵاتناسان و وای کردبوو لە وڵاتانی دوورەوە لەبەر ئەو گرنگییانە سەردانی کوردستان بکەن[12].

## ئافرەت لە بەرهەمەکانی هەندێ ڕۆژهەڵاتناساندا:

میزوپۆتامیا ناوچەی نێوان دوو ڕووبار هەروەکو باسی لێوە دەکرێ، وڵاتی بەرینی کوردان بووە و سەرەڕای ئەوەی زۆربەی ئاین و بیر و باوەڕەکانی تێدا هاتوونە کایەوە، بۆ یەکەم جارماڵیکردنی ئاژەڵ و کشتوکاڵ لەو ناوچەیەدا بەدەستی ئافرەتانەوە ئەنجامدراوە هەر بۆیە ژنان کراونەتە خوداوەند و گەیەنراوەتە ئاستی پەرستنی خوداوەندی بە ئیلاهی بوون دانراوە. هەموو زانست و لێکۆڵەرەوەکانی ئارکیۆلۆژی ئەم ڕاستییەیان سەلماندووە و بە گوێرەی یادداشتەکانی تۆما بوا ژنانی (گوتی) خاوەنی هێز و گەلێ جار سەرکێشیی سوپا و هێرشەکانی گەلانی دراوسێیان کردووەو ڕۆڵێکی گەورەیان بینیوە، بەوەش دەردەکەوێت، کە دیسانەوەش ژنان ڕۆڵی خۆیان لەو سەردەمدا گێڕاوە، بەڵام زۆر

بە کەمی باسی لێوە کراوە[١٣] ئەوەی ڕاستی بێت، ئەگەر چاوێك بە نووسینەکانی ڕۆژهەڵاتناساندا بخشێنین، دەبینین هیچ سەرنجێکمان ناکەوێتە بەرچاو کە لەناو کۆمەڵگای کوردەواری باسی ڕەفتاری ناوازەو نارێکی ژنان بکات.

ئافرەتی کورد، هەمیشە ئازا بووە لە ئیش و کار و هەڵسوکەوت و ڕەفتاری و کلتووری خۆی پاراستووە لە پێشوازیکردنی میوان، زۆر جار میوان لە ماڵی خانەخوێ ماوەتەوە، هیچ کاتێك پێشوازیکردنی میوان کێشە نەبووە بەجۆرێك هەموو پێویستییەکانی میوان لە پێخەف و کەلوپەلی حەسانەوە لە دۆلابی تایبەت هەلگیراوە و لەکاتی هاتنی میواندا خێزان ئەرکی پێخەف دەرهێنان و ڕاخستن و پاشان هەلگرتنیان لەئەستۆ گرتووە، جگە لە ڕێوڕەسمی میوانداریکردنی یەکتری هەلی تریشیان بۆ چوونە دەرەوە بۆ ڕەخسابوو.

یەکێك لەو ڕێوڕەسمە میللییانەی ئافرەتی کورد، هەفتانە چوونە حەمام بووە، ئافرەتانی کورد پێیان وابوو چوونە حەمام گەشتێکە، بۆیە کە دەچوون بۆ حەمام هەموو پێویستییەکانیان لەگەڵ خۆیاندا دەبرد لەوانە پەشتەماڵ و ڕایەخ و خاولی و دەسماڵ و تاسی حەمام و سابوون و قاپ قاپەی حەمام، هەروەها خواردنێکی سووك، بێجگە لەمەش سەر و پرچ و پەنجەکانیان لە خەنە دەگرت[١٤].

مستەر ریچ لە گەشتنامەکەیدا بۆ کوردستان باس لە ڕەوشت بەرزی ئافرەتی کورد دەکات و دەڵێ: (ئافرەتان بەیانییان زوو لە سەربانی ئەم خانووە نزمانەیان کە هەر پێنج شەش پێ لە زەوی بەرزە بەسەر کۆڵانەکانیان دەڕوانن، کە لەناو نوێن دێنە دەرێ، سەرباری ئەم ئازادییەی کە هەیانە، بەڵام ئافرەتانی نەتەوە و وڵاتانی دراوسێی دەوروبەر بەقەد ئافرەتی کورد ڕەوشت بەرز نییە)[١٥].

ڕۆژهەڵاتناسەکانیش لە زۆربەی نووسینەکانیاندا لە کاتی سەردانەکانیان بۆ ناوچە کوردییەکان باسیان لەگەڵ تایبەتمەندیی ئافرەتی کورد کردووە وەك لایەنی کۆمەڵایەتی ژیانی و ڕۆژانە و داب و نەرێتیان لە شێوازی جلوبەرگ و ڕەوشتی بەرز و جۆری هاوسەرگیرییان و گەلێ بابەتی تر، کە توێژینەوەکانیان پێ دەوڵەمەند کردووە هەروەك مینۆرسکی لە کتێبی (الاكراد)دا دەڵێت:" بۆ دیاریکردنی ڕەوشی هەر میللەتێك باسکردنی ڕەوش و ژیانی ئافرەتیان شتێکی گرنگ و پێویستە"[١٦] جگە لەوە تۆما بوا باس لە دەست ڕەنگینی ئافرەتی کورد دەکات دەڵێ:

"ئافرەتی کورد کرێکارێکی دەستڕەنگین بووە لـە ڕازاندنـەوەی ئـەو کەلوپەلانـەی ناوماڵ بە وێنە و نەخش و زەخرەفە" مارك سـایکس پیـاوێکی سیاسـیی بـەریتانی بووە هەتا جەنگی جیهانی یەکەم لـە ئیسـتەنبول ماوەتـەوە دوای ئـەوە سـەفەری کردۆتە ناوچەکانی ئاسیا و هاتۆتە ناوچە کوردییەکان بە ئەسپ زۆر شوێن گەڕاوە دێتە سەر ئازادیی ئافرەتی کورد دەڵێ: " ئافرەتی کورد ئازادییەکی تەواوی هەیـە لە دەرەوەی ماڵدا و کات بەسەربردنی لـە کـاتی بـێ ئیشـیدا، ئـەم ئازادییـەش لـە یاسـای ئـەخلاقی بـووە و ئـەخلاقی زۆر شـاز بـووە لەگـەڵ ناوچـەکانی دراوسـێی جیاوازە"[١٧] و مارتین برۆینسن لە کتێبەکەی باسی ئافرەتی کورد دەکات دەڵـێ: (گەرچـی کۆمەڵگـەی کـوردەواری بــە درێــژایی مێــژووی زانــراوی خــۆی هــەر کۆمەڵگەیەکی نێرسالار بووە و بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا نموونەی ژنـی ئـەوتۆ بەرچـاو دەکـەون کـە پایـە و پلـەی بـەرزیان هـەبووە و ببـوون بـە ڕابـەر و سـەرکردەی سیاسـی). لـەناو ئـەو نموونانـە باسـی عادیلـە خـانمی هەڵەبجـە دەکـات پـاش مێردەکەی دەسەڵات دەگرێتە دەست جگە لەوە باسی قەرە فاتم دەکات و باسـی ڕۆڵی ئەم ژنە دەکات کە لە نێو جەنگ و سیاسەت و بوێریدا بێ هاوتایە[١٨].

(W.R. Hay) دەبلیـو ئـار هـەی حـاکمی سیاسـی هـەولێر لـە سـەردەمی داگیرکاری بریتانیا، لە ساڵی ١٩١٨ز. دا هاتۆتە ناوچەکانی کە کەوتوونەتـە نێـوان زێی گەورە و بچووك و سلێمانی ، لـە کتێبەکـەی دوو سـاڵ لـە کوردسـتان لـە نێـو باسەکانیدا دێتە سەر بازرگانی و کشتوکاڵ باسی دەوری ئافرەت دەکات چـۆن بـە هەرەوەزی لەگەڵ منداڵ و پیاودا بەشداری کردووە لە کشتوکاڵ، دێتە سەر وەرزی دروێنــە کــە بــە دەســت کــار دەکــەن و ئــافرەت تێـدا بەشــداربوونە و لــەکاتی کۆکردنەوەش ژنان کۆیانکردیتەوە.

لـە درێـژەی باسـەکانی بـەو ناوچـانە دەچـێتە ناوچـەکانی ڕوانـدز و میـوانی دیوەخانی سمایل ئاغا بوو لە نووسینەکەی باسی ئافرەتێك دەکات بە ناوی فاتمـە خان کە داوای بینینی کردووە کە مێردەکەی بەر لە داگیرکردنی بریتانیا کـوژراوە، کرابووە سەرۆکی ئەو دۆڵەی کە ئەو لێی بووە، باسی ئەم ئافرەتە دەکات دەڵـێ: " فاتمە خانم بەرامبەر ژنان بیر و باوەڕی پێشکەوتووانەی هەبووە"[١٩].

## هەندێ لایەنی ئافرەتی کورد لە تێکست و تابلۆکانی ڕۆژهەڵاتناساندا :

١. بوێری و پلە و پایەی ئافرەتی کورد لە تێکستەکانی ڕۆژهەڵاتناساندا:

سەرچاوەکان ئاماژە بەوە دەکەن سۆمەرییەکان و هوری و گـوتی و کاسـی و هیتی کە خەڵکی ڕەسـەنی ناوچـەکانی میسـۆپۆتامیا و ئەناتۆڵدا بووینـە ئـافرەت گەلێ ڕۆڵی بەرچاوی بینیوە، کە زۆرترینیـان هـی پیـاوان بـووە، وەك سیاسـەت و ئـاین ، لـەناو سـۆمەرییەکان هەنـدێ جـار ئـافرەت پاشـا بـووە، زۆربـەی مـاف و ڕۆڵەکانی پیاوی هەبووە، وە لەناو گوتییـەکانیش ئـافرەت ڕۆڵـی گرنگـی هـەبووە، یەکێك لە پاشای گوتییەکان شاژنێك بووە بەناوی (نـەواریتوم) ئـەم شـاژنە هێنـدە دەسەڵاتدار بووە کە توانیویەتی دژی دەسـەڵاتداری ناوچـەکانی لارسـا دە هـەزار سـەرباز بنێرێـت، لـەناو هوریـەکانیش ئـافرەت مـافی خاوەنداریـەتی و میراتـی و مامەڵەکردنی بازرگانی هەبووە.

بێگومان کۆمەڵێ بەڵگە ئەوە دەردەخات کە کورد تەواوکەری ئەم فەرهەنگە دێرینەیە، ئەم نەریتە لـە هـەموو سـەردەمەکانی مێـژووی کۆمەڵگـەی کوردەواریـدا دەرکەوتووە یەکێك بووە لە تایبەتمەندی لە نەتـەوەکانی دراوسـێی جیاکردۆتـەوە هەمیشە سەرنجی ڕۆژهەڵاتناسانی ڕاکێشاوە، لە سەدەی یەکەمی زاینیدا کاتێك کە مانوبازی پاشای هەزبانیی کورد مرد، هێلینای ژنی وەکـو شـاژن هـەر نازناوەکـەی مـابوو هـەر شانبەشـانی کوڕەکـەی حـوکمڕانی دەکـرد لـە سیاسـەت و زۆربـەی کاروباری دەوڵـەتی هەزبانیـدا بەشـداری بەرچـاوی هـەبووە، جگـە لـەوە زەرینـای ئامێدی ئەم ئافرەتە لە سەدەی شەشەمی زاینی ژیاوە و کچی شـێرۆخانی ئامێـدی بووە لە کاتی هاتنی سوپای ئیسلام سەرکردایەتی بەشێکی سوپای کـوردانی دژی هاتنی موسڵمانەکان کردووە. ژنانی کورد لە کوردستان لـە سـەدەکانی چـوارەم و هەشـتـەم و نۆیـەمی کۆچـییەوە لـە ڕووی ئایینییـەوە ڕۆڵـی گرنگیـان هـەبووە و خزمەتی بەرچاویان کردووە، جەلالە خانمی لوڕستانی لـەدایکبووی ٣٨٧ی کۆچـی تـا نزیکـەی (١٤) ژنـی دیکـەی کـوردی یارسـتان کـە زۆربـەیان لوڕسـتانین یـا هەورامانین، هەرچەندە بەرهەمی کورتیان بـەجێماوە بـەڵام ئەوەنـدەش بەسـە بـۆ دەرکەوتنی پلە و پایەی مەقامی ژنانی کوردستان، شایانی باسە سـەدان ئـافرەتی تـریش ڕۆڵـی خۆیـان لـەو بـوارەدا بینیـوە، بۆیـە ڕۆڵـی ئـافرەتی کـورد لـە ڕووی



وێنەی ژمارە (١) فاتە رەش

کۆمەڵایەتییەوە شان بە شانی پیاو لەناو کۆمەڵگادا بەرز نرخێنراوە چ جوان و ماقووڵە ژنە کوردستانییەك بەر لە هەزار ساڵ زیاتر بچێتە ئەنجومەنی پیاوان و ژنان سەربەست و سەرفراز لە عیرفان بدوێ وەك دەڵێن ئەم ژنانە لە سەردەمی خۆیاندا تەمیرەیان ژەنیوە لە تەك پیاواندا ئاهەنگی ئاسمانیی عیرفانی و سۆفیگەری و سروودی خۆیان خوێندووە[٢٠].

جگە لەوەش لەناو قوتیلەکان[٢١]، کە بە کۆنترین باوباپیرانی تیرەی کورد دەژمێردرێن، سەرکردایەتی سوپا تەنها هی ژنان بووە، ، ئەمەزۆن دەوڵەتێك بووە لە ناوچەکانی کوردستانی ئەمڕۆدا بووە کە حوکمڕانەکان ئافرەت بووە، لەسەدەی یەکەمی پێش زاییندا ئەمەش لە لایەن یۆنانییەکان شێوەی داستانی وەرگرتووە (داستانی ئافرەتانی ئەمەزۆن) داکۆکییەکی سەرسەختیان دژ بە داگیرکەرە ڕۆمییەکان کردووە و لەناو ئەو هێزانەدا ژنانی شەڕکەر تێدا لە ڕیزی لەشکرەکەدا بوون. هەر لەو شەڕەدا ژنان بە جلە ڕەنگاوڕەنگەکانی ئازایەتی کەم وێنەیی خۆی بۆ شکاندنی لەشکری ڕۆم نواندووە[٢٢].

(فاتەڕەش) (وێنەی ژمارە ١) قارەمانێکی کورد بووە کە لە شەڕی نێوان عوسمانی و رووسی لە ساڵی ١٨٥٣ز. بە ٣٠٠ سوار بەشداری تێدا کردووە، ڕۆژهەڵاتناسە رووسی و ئینگلیزەکان بە (پرنسیسی کورد) ناویان هێناوە، هەتا لە گۆڤاری جیهانی ژنان وێنەیان بڵاوکردۆتەوە لە ژێرەوەی وێنەکان دەنووسرا ((لە محرابی قارەمانیدا، ژنێکی قارەمان فاتەڕەش (قەرە فاتە) لە شەڕی عوسمانی و ڕووسی بەشداری کردووە لە بیرمان نەکردووە)). لە سەردەمی کۆماری تورکیادا هەندێ ڕووناکبیر بەمیراتی تورکیایان داناوە[٢٣].

میرنشـینیی زەنـد کـە دوا میرنشـینی کـورد بـووە لـە ڕۆژهـەڵاتی ناوەڕاست (١٧٥٠ز–١٧٧٩ز)، تیایدا ژنان بەشێوەیەکی چرو چالاك بەشدارییان لـە هەڵمەتـە سوپاییەکان کردووە، دامەزرێنەری ئەم میرنشینە (محەمەد کەریم زەند) بـووە کـە خۆی و ئەفسەر و سەربازەکانی شانبەشانی بووکـەکانی خـۆی چـوونەتە مەیـدانی جەنگـەوە، ئەمــەتا بەشـداریکردنی ژنــان لــە خــەباتی چــەکداریدا تــا ئێســتاش بەردەوامە[٢٤].

خانزادی سۆران  خوشـکی مـیر سلێمانی میرنشـینی سۆران، پـاش ئـەوەی والیـی بەغـدا مـیر سـلێمان دەکـوژێ، خـانزاد خـانم وەك مـیری سـۆران دەبێتـە جێگـرەوەی بـرای و کاروبـاری میرنشـینەکەی لــە بەڕێوەبردنـدا ڕاپەڕانـدووە. لەهەمووی گرنگتر، ئەوەیە دەڵێن خانزادی میری سۆران خۆی ڕاستەوخۆ لە هەموو شەڕەکاندا بەشدار بووە[٢٥].

هەندێ لە ڕۆژهەڵاتناسان لـە توێژینەوەکانیانـدا لـەکاتی سـەردانیکردنیان بـۆ ناوچـە کوردییـەکان، ئاماژەیـان بەپلـە و پایـەی ئـافرەتی کـورد داوە و زۆر بـە بەرزییـەوە باسـیان کـردووە، (کلۆدیـوس جـیمس ریـچ) ئەمـەش ڕۆژهەڵاتناسـێکی بـەریتانی بـووە لــە ســاڵانی ١٨٢٠ز هاتۆتــە ناوچــەکانی کوردســتان و زۆربــەی گەشـتەکەی بـۆ ناوچـەکانی میرنشنی بابـان  و ئـەردەڵان بــووە، بــەڵام ئەوەنــدەی توانیویـەتی باسـی تێکـڕای ناوچـــەکانی کوردســـتانی کــردووە، لــە کتێبەکەیــدا (گەشـــتەکەی ریـــچ بـــۆ کوردستان) لە لاپەڕە (٢٩٢) دێتە سـەر ڕەوشـی ئـافرەتی کــورد دەڵـــێ: "ڕەوشـــی ئافرەتی کورد لە کوردستاندا لە ئافرەتی تورکیـا و ئێرانـدا



وێنەی ژمارە (٢) ژنێکی کورد شەڕ دەکا لە شەڕی نێوان فارس و کوردان (ئەرمینیا)

باشـــترە، ژن و مێـــرد وەك یـــەکن جیاوازییـــان نییـــە"[٢٦] (تۆمـــا بـــوا)ش، ڕۆژهەڵاتناسێکی فەرەنسییە و ماوەیەکی ئێجگار زۆر لە ناو کورداندا ژیاوە، زمانی کوردی بە باشی زانیوە، لە ساڵی ١٩٠٠ز هاتۆتە کوردستان و کتێبەکـەی بـە نـاوی ( the kurds) (مع الاکراد) لـەم کتێبـەدا زۆر بـە وردی باسـی ژیـانی کـوردەواری کـردووە، لـە بەشـی پێنجـەم لاپـەڕە ٣١ بـۆ ٤١ بـاس لـە ئـافرەتی کـورد و ژیـانی خێزانداری دەکـات، بـەگوێرەی وتـەکانی تۆمـا بـوا ((ژنـانی گـوتی خـاوەنی هێـزو دەسـەڵات بووینــە زۆر جـار بەسـوپاوە هێرشـیان کردۆتــە سـەر دراوسـێکانیان، ئەمانەش ئازایەتی و نەبەردی ژنی کورد دەنوێنن)). جگە لەوەش دێتە سەر ئـەوە و دەڵێ: (( ژنان شان بە شـانی پیـاوان کاردەکـەن، سـەرەڕای ئەنجامـدانی کـاری دەرەوە کـاری نێوماڵیشـیان لـە ئەسـتۆدایە، خـاڵێکی گـرنگیش هەیـە کـە دەبێـت ئامـاژەی پێـوە بکـەین ئـەویش ئەوەیـە لـە نێـو کوردانـدا ژنـان لـەپاش مردنـی مێردەکانیان جێگەی مێردەکانیان دەگرنەوە بۆ هەڵسووڕاندنی کاروباری ماڵـەوە و دەرەوەش، بگرە زۆر جار لە شەڕەکانیش بەشدارییان کردووە))[٢٧] (مینۆرسـکی) کە ڕۆژهەڵاتناسێکی ڕووسی بووە، سەردانی زۆربەی ناوچە کوردییەکانی کـردووە، زۆر کتێبی لەسەر مێژووی کوردستان نووسیوە و باسی لە ژنی کورد کـردووە ((لـە نێو ژنانی کوردیدا سەرۆك هۆزیش هەڵکـەوتووە و دەسـەڵاتیان هـەبووە))، ئەمـەو درێـژە بـە وتـەکانی دەدا دەڵـێ" ئـافرەت لای کـوردان خـاوەن کەسـایەتین گـەلێ کوڕیان بە ناوی دایکیانەوە بانگ دەکرێن"[٢٨].

(ج. ئـار. درایڤـەر) یـەکێك بـوو لـە یەکـەمین ئـەو مامۆسـتایانەی زانکـۆی بەریتانیا، کە بەشێکی ژیانی خـۆی بـۆ مێـژووی کـورد تـەرخان کردبـوو لـە سـاڵی ١٩٢٣ز هاتۆتە ناوچەکانی کوردستان، باس لە ئازادی و ڕەوشـت بـەرزی ئـافرەتی کورد دەکات دەڵێ:" ژنانی کورد ئازادن لە هەڵسوکەوتدا بە ئازادی دێن و دەچـن، ژن و ژنخوازی لە نێویان هەیە و بە ئـازادی دەزگـیران دەگـرن و شـوو دەکـەن"[٢٩] (هێنی هارۆلد هانسن)ی دانیمـارکی کتێبێکـی بـە نـاوی ( the Kurdish womans life) (ژیانی ئافرەتی کـورد) نووسـیوە، ئـەم کتێبـە بەرهـەمی چـوار مـانگ و نیـو مانەوەیەتی لە ناوچـە کوردییەکانـدا، کـە لـە هـاوینی ١٩٥٧ز هاتۆتـە کوردسـتان، بەتایبەت ڕاسپێردراوە لێکۆڵینەوەیەکی مەیدانی لەسەر ئـافرەتی کـورد بکـات، لـە

کاتی مانەوەیدا لە کوردستان توانیویەتی سەردانی زۆر ناوچە و شارو گوندەکانی کوردستان بکات و لە بارەی هەموو لایەنەکان و پێگە و شوێنی ئافرەتی کورد لەکۆمەڵگەی کوردەواری و ئیسلام بخاتە ڕوو، هەروەها لە کتێبەکەیدا باسی لە ئافرەتی گوندنشین و شارنشین کردووە، هەروەك لە لاپەڕە (٣٦٦) باسی پێگەی شوێنی ئافرەتی کورد کردووە و دەڵێ: (ئافرەتی کورد ئازادن، زۆر مۆرك و شێوازی شارستانی ئیسلامی لە نێو ئافرەتی کورددا هەیە، لەگەڵ هی ناوچەکانی تری ئیسلام جیاوازن، ژن و پیاو بەلای کوردانەوە ئازادن یان یەکسانن)[٣٠].

کتێبێکی تریشی هەیە بەناوی (کچانی خوداوەند، گەشتێك بۆ ناو ئافرەتانی موسڵمان لە کوردستاندا) کە لە ساڵی ١٩٥٧ز بەشێوەیەکی زۆر تایبەت باسەکەی تەرخانکردووە بۆ ژنانی کورد و باسی جۆری بووك گواستنەوەو جلوبەرگ و ڕێورەسمی مردن و ژنانی موسڵمان کردووە.

هەروەها مێجەر سۆنیش، کە بەشێوەی بازرگانێکی فارسی و بەناوی (غولام حوسێن شیرازی)یەوە ساڵی ١٩٠٩ز سەردانی کوردستانی کردووە هەموو ناوچەکانی کوردستان گەڕاوە و پەیوەندیی زۆری لەگەڵ سەرۆك هۆز و کەسایەتییە بالاّکانی کوردستان پەیدا کردووەو هەڵەبجەی بینیوە، پتر لە شەش مانگ لە ماڵی وەسمان پاشا و نزیك لە عادیلە خان و تاهیر بەگی کوڕیدا ماوەتەوە، بیرەوەری و باسێکی قەشەنگی لەو بارەیەوە لە کتێبە ناودارەکەیدا (رحلة متنكرة الى بلاد مابين النهرين وكردستان) تۆمار کردووە (خاوەنی گەشتە بەناوبانگەکەی بۆ عێراق و کوردستان ساڵی ١٩٠٩ز) یەکێکە لەوانەی زۆر سەرسامی خەسڵەت و ڕەفتاری ئافرەتانی کورد بەگشتی و ئافرەتانی جاف بەتایبەتی بووە. ناوبراو زۆر بە بایەخ و ستایشەوە باسی لە ڕێز و دلۆڤانی و کراوەیی و سەربەستی و چالاکیی ئافرەتانی جاف کردووە، کە تێیدا باسی عادیلە خانی ژنی وەسمان پاشای جاف و توانا و دەسەلاّتە کارگێڕی و کۆمەلاّیەتی و بازرگانییەکانی، دەسکەوتە شارستانی و بیناسازییەکانی لە هەڵەبجەدا دەکات. عادیلە خان کچی عەبدولقادر بەگی ساحێبقران و خێزانی وەسمان پاشای جاف ناسراو بە نازناوی (خانم)، یەکێکە لە ئافرەتە هەرە ناودارەکانی مێژووی کوردستان و ناوچەکە کە لە مێژوودا بەلێوەشاوەیی و سام و توانا ناوبانگی دەرکردووە.



وێنەی ژمارە (٣) عادیلە خاتوون
لەگەڵ سۆن و خێزانەکەی

کاتی خۆیشی لە کۆتایی سەدەی نۆزدەیەمدا، کە وەسمان پاشا ئەم ئافرەتە هەڵکەوتووەی بەهاوسەری خۆی هەڵبژاردووە، مەبەستی سەرەکی ئەوە بووە، لە خانەوادەی ڕەسەن و بە شکۆی (خانم) کە سەر بە وەزیرەکانی میرنشینیی ئەردەڵانی جاران بووە، نزیک بێتەوە و ئاشنایەتییان بکات. لە هەڵەبجەدا نیشتەجێ دەبێت یەکسەر دەست دەکات بە پتەوکردن و جێگیرکردنی هێز و دەسەڵاتی خۆی، ئەویش بە پشتبەستن بەتواناى خۆی و شۆرەت و ناوبانگیی خانەوادەکەی، هەروەها بەسوودوەرگرتن لەو ئازادییەی، کە وەسمان پاشا بۆی فەراهەم کردبوو بەگشتی خانم خاوەنی خەسڵەتگەلێکی بەرز و دەسەڵات و شکۆ و سامی تایبەتی خۆی بوو. ئەمە وێرای ئەوەی خولیا و زەوقێکی ئەدەبی و هونەری و بیناسازیی بەرز و توانایەکی بازرگانی و ئابووریی سەیری شك دەبرد .

ئەمانەش بەگشتی وایانکرد، خانم مایەی بایەخ و سەرسامیی خەڵکانێکی زۆری ئەو سەردەمە بێت بەگشت چین و توێژ و پلە و پایە فەرمی و کۆمەڵایەتی و ڕۆشنبیرییەکانیانەوە، نەخاسمە توێژەر و ڕۆژهەڵاتناسەکان کە مەتحی کەسایەتی و بەهرەمەندی و لێهاتوویی و سەخاوەت و دەسەڵاتی ئەم زاتەیان کردووە[٣١].



وێنەی ژمارە (٤) عادیلە خاتوون
لەگەڵ خێزانی میجەرسۆن

ئەدمۆندز پیاوێکی سیاسیی بەریتانییە لە ساڵانی

١٩١٠ – ١٩١٢ز. هاتۆتە عیراق و زۆرترین لیکۆڵینەوە و پشکنینی شوێنەواری لەسەر شوێنەوارەکانی عیراق و ناوچەکانی کوردستان کردووە، لە کتێبەکەیدا (باس لە حەپسە خانی نەقیب دەکات کە هاوسەری شێخ قادری برای شێخ مەحموودی حەفید بووە و بە ژنێکی زیرەك و نێودار پێناسەی دەکات و دەڵێ: لە سیاسەتی ناوچەکەدا ڕۆڵی گەورەی بینیوە سەرگەورەی ژنانی شاری سلێمانی بووە، یەکێك لە کارەکانی کە ئەنجامی داوە، تێکۆشاوە قوتابخانەیەکی ئێواران بۆ ژنان دروست بکات. هەر لە سولێمانییەوە هاریکاری کۆماری مهابادی کردووەو تەنانەت پێشەوای نەمر نامەی سوپاسگوزاری بۆ ناردووە.

(ئیدمۆندز) لە نووسینەکانیدا باس لەوە دەکات، کە هێز و توانایەکی زۆر لە پێکهاتەی ژنی کورددا هەیە، هەمیشە هەوڵدەدەن خۆیان پێشبخەن، لەم بارەیەوە دەڵێ: (هەمیشە لە یەکەم ڕۆژی دەستبەکاربوونمانەوە لە ناوچە کوردییەکاندا بێ وچان داوامان لێ دەکرێ قوتابخانەیەك بۆ کچان بکەینەوە و نەك تەنها لە شار و شارۆچکەکان تەنانەت لە گوندەکانیش) و هەروەها باس لە ئازادیی ئافرەتی کورد دەکات دەڵێ: " ژنی کورد زۆر لای ئاساییە لەهەر شوێنێك بێت بەبێ شەرم پێشوازی لە دۆستێکی ئازیزی خێزانەکەی دەکات". درێژە بە سیفەتەکانی ژنی کوردەواری دەدات و دەڵێ: "گشت دەسەڵاتی وەسمان پاشا، لەپاش مردنی، کەوتووەتە دەستی خانمی ژنی، کە لەڕاستیدا شاژنی (تاج پێ نەدراوی) شارەزوور بووە. ئینگلیزەکانیش لەلایەن خۆیانەوە نازناوی بەرزی هیندیی ( خان بەهادووریان) پێ بەخشیوە"[٣٢].

مینۆرسکییش ئاماژەی بە دیدەنیی خانم لە هەڵەبجەدا (ساڵی ١٩١٤ز) کردووە و بە فەرمانڕەوای ڕاستەقینەی هەڵەبجەی، لە پێش و پاش مردنی مێردەکەی، داناوە، هەروەها ستایشی لە سەخاوەت و میوانداریی کردووە.

لە نێو ئافرەتاندا نووسەر و شاعیرانیش بەدەردەکەون لەوانە مەستوورە خانمی ئەردەڵانی (١٨٠٥ز–١٨٤٨ز)، کە بە ماه شەرەف خانم ناسراو بوو لە شاری سنە هاتۆتە دنیاوە، خەسرەو خانی ئەردەڵانی میری میرنشینیی ئەردەڵان بووە. مەستوورە لە شیعردانان چ بە فارسی و چ بە کوردی زۆر خاوەن دەسەڵات بووە، بەداخەوە زۆربەی ئەم نووسینانەی لەناوچووە. جگە لەمەش مێژووی ئەردەڵانی

نووسیوەتەوە لە سەدەی نۆزدەیەمدا لە ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا کەم ڕوویداوە، (ڤاسیلڤیا) خانمە ڕۆژهەڵاتناسی ڕووسی، باس لەم شێرە ژنە دەکات دەڵێ: (مەستوورە خانم شوێنێکی گرنگی لە نێو مێژووی ئەردەڵاندا هەیە) کە کتێبەکەی بە فارسی چاپ کراوە هەمان ئەم ڕۆژهەڵاتناسە کردوویەتی بە ڕووسیی بڵاوی کردۆتەوە(٣٣).

**جوانیی ئافرەتی کورد:**

پاك و خاوێنی و جلوبەرگ و زێڕ و خشڵ و تاتۆی ئافرەتان لە تابلۆکانی ڕۆژهەڵاتناساندا بەپێی چینەکانی کۆمەڵگا، بووەتە بابەتێکی گرنگی توێژینەوەکانیان لە کاتی سەردانیکردنی ڕۆژهەڵاتناسان بۆ کوردستان باسی جوانی و پاك و خاوێنی ئافرەتی کوردیان کردووە لەوانە ڕۆژهەڵاتناسی دانیمارکی هانسن لە کتێبەکەی (ژیانی ئافرەتی کورد) لەکاتی سەردانەکەی بۆ کوردستان باسی جوانیی ئافرەتی کورد دەکات و دەڵێت: (ئافرەتی کورد جوان و ئێسك سووکن، بەڵام کاریگەریی خۆر بەسەر ڕوخساری ئافرەتاندا دیارە ئەمەش لە جوانیی ئافرەتی کوردی کەم کردۆتەوە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا چاوگەشی و قژدرێژی و ڕەنگینیی جلوبەرگی ئافرەتی کورد هەموو ئەو دیاردە فیزیکی و هونەرییانەی کە لە تابلۆکانی ڕۆژهەڵاتناساندا دەبینرێ نیشانەی سەرنجڕاکێشانی ئافرەتی کوردە(٣٤).

(مارك سایکس) پیاوێکی سیاسی و ئەفسەرێکی بریتانی بوو لەکاتی لێکۆڵینەوەکەی باسی ئافرەتی کوردی کردووە دەڵێ: تا ٤٠–٥٠ساڵی نیشانەی سیس بوون بەڕوخساریان دەرناکەوێ(٣٥).

دکتۆر ج. م لیز جێگری حاکمی سیاسیی هەڵەبجە بووە، بەم جۆرە باسی جوانی عادیلە خانمی کردووە: (ئەم ژنە کەمێك کورتە باڵا و نازك بەدەن بووە خەت و خاڵ و چاوی ڕەشی بێ سورمەی ئیزهاری قووتی باتنی دەکرد، هەموو بزووتنی لە پیاوێکی دلێر دەچوو، کە من ئەوم بینی بە شێست ساڵ گەیشتبوو، بەڵام لەبەر چاو وا دەزانرا لە چل ساڵ بچووکترە، لە ڕەنگی درەخشانی سەری کوڵمە و ڕووی لە ژنی پاریس دەچوو، بۆ جوانی و قەشەنگی پەرچەم و زولف و ئەگریجە و پرچی سەری ڕەش و ڕاست و درێژو بێ عەیب بوو(٣٦).


تابلۆی ژمارە (٥) تاتۆ لە دەست و مەچەکی ئافرەتی کورد

ئەگەر سەیرێکی وردی هەندێ لە تابلۆکانی رۆژهەڵاتناسان بکەین، دەبینین ئافرەتی کورد، لە کۆندا زۆر جۆرە تاتۆیان کردووە هەتا ئێستاش زۆر ئافرەتی پیری بەتەمەن دەبینین کە تاتۆ (کوتان) بە دەموچاو و دەست و پلیانەوە دیارە، ئەمەش خۆی لە خۆیدا بۆ جوانی بووە و بۆ راکێشانی سەرنجی نێر بووە بۆ لای خۆیان، جۆرەکانی کوتانیش وەکو کوتانی دەوروبەری دەم و دەست و سینگ، هەیە بە تاك و هەیە بە کۆ، ئەمەش بە دەرزییەکی ئاسایی ئەنجامدەدرێت کە لە تەنی و شیر هەڵدەکێشرێ، هێنری فێلد لە توێژینەوەیەکی بە ناونیشانی (Tattooing in North Africa, The Middle East and Balkans ) کە باس لە تاتۆ دەکات دێتە سەر تاتۆی کورد، باسی ئافرەتی ئێزیدی کردووە، کە تاتۆ دەکەن لەسەر دەست و پێیان بە شێوەی نەخش و نیگار، و بە زێڕو زیو خۆیان ڕازاندۆتەوە و خۆیان لە ماکیاژ بەدوور گرتووە، بە بەراورد لەگەڵ ئێستادا، ئەوەی زیاتر کە باو بووە لەنێو ئافرەتی کورددا، بۆ ڕەشکردنی چاویان (کل)یان بەکار هێناوە. بەتایبەت ئافرەتانی خێزانە دەوڵەمەند و بەگزادە و دەسەڵاتدارەکان زۆر گرنگییان بە جلوبەرگ و خشڵ و زێڕ و پاك و خاوێنی داوە ، بسکیان هەبووە و زۆربەیان پرچیان هۆنیوەتەوە و کەوتۆتە سەر پشتیان، ئافرەتی کورد بۆ جوانکردنی پرچیان خەنەیان بە ڕێژەیەکی زۆر بەکارهێناوە، خەنە گەڵای دارخەنەیە وشك دەکرێتەوە و دەکوترێ لە بازاڕ دەیکڕن[٣٧].

لە تابلۆی (ژمارە ٥ ) دەبینرێت کە ئافرەتێکی کوردە و وێنەکە دەگەڕێتەوە سەدەی نۆزدەیەم، ئافرەتەکە جلێکی کراوەو سادەی پۆشیوە و لەچەکێکی لەسەرناوە کە بەشان و پشتی هاتۆتە خوارەوە و بەدەست لەچەکەکەی گرتووە، وەکو ڕاوەستانێك کە زیاتر مێینەیی خۆی پێشاندەدا، دەموچاو و دەست و

مەچەکی خۆی تاتۆ کردووە، ئەمەش وێنەیەکی جوان و سەرنجڕاکێشە، لە نێو ئافرەتان باو بووە کە بە تاتۆ نەخشی جۆراوجۆر لەسەر دەموچاو و دەستیان دەکرد ئەمانە سەرنجی ڕۆژهەڵاتناسانی بە تایبەت ڕاکێشاوە. هەروەها خشڵ ڕەگەزێکی تری ڕازاندنەوەی جلوبەرگ بووە وەکو (تاسکڵاو، خڕخاڵ، حێل و مێخەك، سەرپەرچەم، گۆبەرۆك و گەردانە و گوارە و خەزێم و بازن و لووتەوانە و کەمەرە و هەیاسە و پشتەسەر و کڵاوی بەدراو و لوولە، ملوانکەی خونچە)، ئەم جۆرە خشڵانە ئافرەتان بۆ ڕازاندنەوە و نیشاندانی جوانی خۆیان لەبەریان کردووە.

لە وێنەی (ژمارە ٦) کە دەگەڕێتەوە سەدەی نۆزدەیەم، وێنەگرە ڕۆژهەڵاتناسەکە بەهۆی سەرسامبوونی بە جلوبەرگی کوردی وێنەی ئافرەتی کوردی کێشاوە کە سەر بە خێزانی میری کوردانە و ئەمە تەنها دەسەڵاتدار و میر و ماڵی هەندێ لە کەسە زۆر دەوڵەمەندەکان دەبینران، چینە هەژارەکان لە پێناو پەیداکردنی نانی ڕۆژانەیان هەوڵیاندەدا و زەحمەتیان دەکێشا، جۆرە جلوبەرگێکی کوردی لەبەرە لە ناوچەکانی کوردستانی باکوور جۆرە



وێنەی ژمارە (٦)
ئافرەتی کورد



جلوبەرگێکیان لەبەر دەکرد لە هیچ ناوچەیەکی تری کوردی ئەم جۆرە جلوبەرگانەیان لەبەر نەدەکرد شەش حەوت جلی ڕەنگاوڕەنگیان بەسەر یەکەوە لەبەر دەکرد و سەرو کڵاویان زۆر گەورەیە کە پێکهاتووە لە چۆغە و چەند دەسرێکی ڕەنگاوڕەنگ لە دەوری دەبەستن دوو سێ تەختەی تەنك دەخەنە بەر کڵاویان بۆ ئەوەی قیت و قنج بوەستێ بە زێڕ و زنجیر ڕازێندراوەتەوە وەکو ئەولیا چەلەبی لە سیاحەتنامەکەی خۆی دەڵێ " تاسکڵاوی ژنانی دیاربەکر زنجیریان زێڕ و زیوە جزمە لە پێ دەکەن و خشڵیان هەر زێڕ و زیوە "(٣٨) و زۆر بە جوانی دەردەکەوێت، بەشێوەیەکی سەرنجڕاکێش وەستاوە ئەمەش ئەوە دەردەخات کە ئافرەتی کورد زۆر گرنگی بە جوانیی خۆی داوە، بەتایبەت خێزانە باڵا دەستەکان زۆر گرنگییان بە زێڕ و زیو و جلوبەرگی جوان و ڕەنگامە داوە و سەرپۆشیش لە ناوچەیەکی کوردەوارییەوە

بۆ ناوچەیەکی تر، لە عەشیرەتێکەوە بۆ عەشرەتێکی تر، لە ئاینێکەوە بۆ ئاینێکی تر، گۆڕانکاری لێکراوە زۆر جار ئافرەتان ئەوەندە سەرپێچەکانیان گەورە و درێژ بووە بۆ ئەوەی زیاتر بەژن و باڵایان دەرخەن، لە کاتی خەویشدا سەرپێچی گەورەیان لەسەر ناوە، بۆیە هەندێ ئافرەت سەرینیان بچووك بووە[٣٩]، وەکو لەم تابلۆیەدا بەسەرپۆشی چەند پارچەیەکی ڕەنگاوڕەنگ جامانەیەکی گەورەی دروست کردووە کە بەرزییەکی سەرسوڕهێنەری هەیە هەتا بیست ساڵ پێش ئێستاش ئەم جۆرە سەرپۆشانە لەسەر دەکران بەڵام ئێستا ئەو مەوادانەی کە بۆ دروستکرنی ئەم جۆرە جامانە پێویستن کەم بەدەست دەکەون و بەهۆی بڵاوبوونەوەی مۆدەی مۆدیرن ئەم جۆرە جامانە کلاسیکییانە لەناوچوونە.

هەروەها تابلۆی (ژمارە ٧) کچی کافرۆش ئەمەش نیشانەیەکی جوانی ئافرەتی کوردە، ئەم تابلۆیە لای تورك و فارس و عەرەبیش دەبینرێت، لە ئەوروپای نوێ بە مۆنالیزای کوردی دەناسرێت، زۆر جار ئەم تابلۆیە لە ماڵ و دووکانەکانیش هەڵدەواسرێت، کچی کافرۆش ئافرەتێکی کوردیی ڕیزپەڕ بووە لە جوانیدا و لەبەر جوانییەکەی دزراوە ئەو زەمان، ئەمرۆش ئەم بەسەرهاتە بە شێوازی جیاواز باس دەکرێ. ئەم وێنەیە ڕۆژهەڵاتناسێك کێشاویەتی بەڵام نازانرێ کێ کێشاویەتی ئەم تابلۆیە نیشانەی جوانیی ئافرەتی کورد دەردەخات کە پێستێکی کاڵی پڕ، قژێکی ڕەشی درێژ، جلوبەرگێکی شکۆمەندی جوانی ڕەنگامەی پۆشیوە پێکهاتووە لە هێڵەگێك و کراسێك، و چەند ملوانکەیەکی مرواری لە ملە بۆ ڕازاندنەوەی خۆی، ئەمەش بۆتە جێگای سەرنجی ڕۆژهەڵاتناسەکان. هەمیشە ڕۆژهەڵاتناسەکان هەموو ئەو جیاوازییانەی کە دەیانبینی وێنەیان کێشاوە و



تابلۆی ژمارە (٧) کچی کافرۆش

لێکۆڵینەوەیان لەسەر کردووە بۆ دەرخستن و نیشاندانی ئەم جیاوازییانە.

تابلۆی (ژمارە ٨) ڕۆژهەڵاتناس (راسینت) گرتوویەتی کە دەگەڕێتەوە سەدەی نۆزدەیەم، ئافرەتێکی سیواسییە لە کوردستانی باکوور، ئافرەتەکە راوەستاوە بۆ دەرخستنی جوانیی خۆی و دەستی لەسەر کەمەری داناوە و دەموچاوێکی خڕی پێست کاڵی هەیە، جلەکەی بە هەمان شێوە لە چەند پارچەیەك پێکهاتووە لە کەوایەك لە قوماشێکی رەنگامەی گرانبەها دروستکراوە، کە لە ملەوە دەست پێدەکات و درێژ دەبێتەوە تاکو پێیەکانی لە پێشەوەیدا کراوەتەوە و قۆڵەکانیشی درێژە و فەتحەی هەیە کە نەخشێنراوە بە داوی رەنگاوڕەنگ چنراون، ئەم کەوایانە داپۆشراون بۆ ئاهەنگەکان و جەژنەکان، لەسەر ئەمانەش کەمەری پشتێنی بەستووە کە لە قوماشێکی سادە پێکهاتووە، سەرپۆشێکی گەورەی لەسەرناوە پێیدەڵێن تەربووش، کە شێوازەکەی تەربووشی عوسمانییە، چونکە تەربووشی عوسمانی جیا دەکرێتەوە لەگەڵ تەربووشی میسری، تەربووشی عوسمانی کۆتایەکەی دێتە خوارەوە بۆ سەر شانی یان پشتی وەکو لە وێنەکەدا دەبینرێت، بە چەند پارچە قوماشێکی رەنگاوڕەنگ وەکو شێوەی جامانە بەستاویەتی، هەندێ جار ئەم جۆرە سەرپۆشانە ڕازێندراونەتەوە بە زێڕ و زیو بۆ جوانکردن ئەمەش نیشاندانی کلتووری کوردییە، چونکە جلوبەرگ بەشێکە لە کلتوور. ئافرەتەکە کەوشی لەپێیە کە لە پێستی گیانەوەر دروستکراوە، پاژنەی نییە و سووکە ئەمەش بۆ ئەوەی بەئاسانی بجوولێتەوە و بۆ بەسەرکەوتنی چیا و شوێنی بڵند دەشێ، لە پێشەوە نووکی بەرز بۆتەوە بۆ سەرەوە. لە کۆمەڵگەی ڕۆژهەڵاتیدا بە تایبەت لە نێو چینە دەوڵەمەندەکاندا جلوبەرگ زۆر گرنگە بە جۆرێك کە جلوبەرگ یەکێك بووە لە بەڵگە بەهێزەکان بۆ دیاریکردنی پێگەی کۆمەڵایەتیی تاك لە ژیانی گشتی، بایەخی جلوبەرگ لە بەکارهێنانی جۆر و جیاوازییەکانی ئەو قوماشە



**وێنەی ژمارە (٨)**
**ئافرەتی کورد لە سیواس**

ڕستراوانەی کە دەستدەکەوتن دەردەکەوت، زۆربەی جلوبەرگی ئەو بنەماڵە دەوڵەمەندانە لەناو ماڵان بە دەست دەچنران[٤٠].

## ژیانی ڕۆژانەی ئافرەتی کورد:

هەندێ لە تابلۆکانی ڕۆژهەڵاتناسان ژیانی ڕۆژانەی ئافرەتی کورد نیشان دەدەن کە ڕۆژانە چۆن ژیان دەگوزەرێنن و دەوری خۆیان دەبینن لە کار و فەرمان و بەرپرسیاری ژیانی خێزاندارییان، ئافرەتی کورد هەر لە کۆنەوە کارا بووە لە ئیش و کاری ڕۆژانەی ماڵەوە و دەرەوەی ماڵدا، گەورەکردن و پەروەردەکردنی منداڵ یەکێ لە کارە سەرەکییەکانی ئافرەتی کوردە، کاری ئافرەتیش بەپێی کۆمەڵگەکەی دەگۆڕێت چ کۆمەڵگەی شار یان گوندنشین بێت، کارەکانیش دابەش دەکرێت لە نێوان ئافرەت و پیاودا، بۆ نموونە ئافرەت لە گونددا زۆر کاری زیاتر بووە لە ئافرەتی شار، لەبەر ئەوەی گوزەرانیان بەندە بە شوانکاری و کشتوکاڵ، ئەمەش وا دەکات کە کارەکان زۆربەی بکەوێتە سەر ئافرەتەکە، جگە لە کاری ماڵەوە، ماڵ خاوێنکردن و چێشت لێنان و و جل شوشتن و قاپ شوشتن و نانکردن و هتد ... کاری دەرەوەش دەکات شوانکاری و کاری کشتوکاڵ وە ئاو هێنان لە کانی و جگە لەوەش مەڕ دۆشین و دروستکردنی ماست و پەنیر و دۆ و ڕستن و چنین لە پێستی ئاژەڵەکان دروستیان دەکرد[٤١].



تابلۆی ژمارە (٩) ئافرەتی کورد لەسەر کانی

کاتێک کە چاوپیاخشاندنێك بە تێکستەکانی ڕۆژهەڵاتناسان دەکەین دەوری گرنگی ئافرەتی کوردمان بۆ دەردەکەوێت ، (هانسن) لە کتێبەکەی باس لەوە دەکات و دەڵێ "ئیش و کاری ماڵەوە و دەرەوە دابەش کراوە لە نێوان ئافرەت و

پیاو، ئافرەتی دەرەبەگ ئەمیش کار دەکا، بەڵام خزمەتکاری هەیە و یارمەتی دەدەن، بەڵام هەندێ کار هەیە ئافرەتی دەرەبەگ نایکا وەکو بێری و ئاوکێشان و نانکردن..." هەروەها لە چەند دێرێکی تر دەڵێ "ژن ئاو بە جەڕە لە حەوزێك یان کانییەك دەهێنن، ئەمەش کارێکی زۆر سەختە، جگە لەوە دەچنە شاخان دار بە کۆڵ دەهێننەوە، جل شوشتنەکانیشیان لەسەر کانیاوەکان بووە، لەوێ دەیانشوشت و هەڵیاندەخست"، کارێکی تریش کە زۆر سەختە، ئافرەتی کورد دەیکا ئەویش سەربانەکانیان بە گڵ سواخ دەدا، ئەمەش زۆر جار بە هەرەوەز دەیانکرد[٤٢].

ژیانی ڕۆژانەی ئافرەتی کورد بەشێکی گرنگی باس و تابلۆکانی ڕۆژهەڵاتناسەکان بوو، بەتایبەت چوونە سەر کانی و ئاو هێنان و جل شووشتن هەر لەسەر کانی چونکە ئەمە کارێکی سەخت بوو، وەکو لایارد (ئاوستن هنری لایارد) کە سەفەرەکانی لە ساڵانی ١٨٤٠ز دا دەست پێکردووە، سەردانی زۆر لە ناوچە کوردییەکانی کردووە وەکو ئامێدی و زاوێتە و هەموو ناوچە یەزیدییە نشینەکان و هاوار و بیتوێن و مەخمور و خابوور، پەیوەندییەکی پتەوی لەگەڵ یەزیدییەکان و مەسیحییەکان داناوە، لە تابلۆی (ژمارە ٩) ئافرەتی کورد لە کاتی ئاوهێنان و ئیشکردنیان لەسەر کانیدا دەردەکەون، شایەنی باسە ژنانی ئێزیدی بە کراس و سەرو کڵاوەوە سپییە مەگەر ئێستا گۆڕابێ، کراسی سپییان پۆشییە و لە لۆکە دروست دەکران، بەڵام شەرواڵیان سپی نییە، چارۆگی سەریشیان سپییە (کەتانۆکی پێدەڵێن)[٤٣] خەریکی پڕکردنی جەڕەکانیانن بۆ هێنانیان بۆ ماڵ و بەکارهێنانیان بۆ ئیش و کاری ماڵ.

هەروەها (مەدام بی چانتر) ئەمەش شوێنەوارناسێکی فەرەنسییە زۆر ناوچەکانی کوردستانی گەڕاوە، وەك ئەرمینیا و ناوچە کوردییەکانی تورکیا و ئێران و چیای ئارارات، کتێبەکەی بە ناونیشانی (atravlells armaneie russe) کە لە ساڵی ١٨٩٣ز لە پاریس چاپ کراوە[٤٤].


تابلۆی ژمارە (١٠) ئافرەتی کورد لە کاتی بێریدا

لە تابلۆکانی (ژمارە ١٠، ١١) ئافرەتی کورد لە کاتی بێرییە کە زۆربەی بەرهەمەکانی شیری لێ دروست دەکات شیر و ماست و پەنیر و نڤیشك (کەرە)، ئەمەش ماست دەکەنە ناو مەشکە ئافرەتەکە ڕایدەژەنێ، هەندێ جار گۆرانیشی لەگەڵدا دەڵێ تاکو ئاوەکە لە کەرەکە جیا دەبێتەوە و دەبێتە کەرە. وەکو مینۆرسکی دەڵێ: " ئافرەت کارە گرانەکانی ماڵەوە دەکەن لە کانییەوە ئاو دەهێنن، بە چیا بەرزەکان هەڵدەگەڕێن، مەڕ دەدۆشن و دار و گیا دەهێنن وەك ئالیکی ئاژەڵ، سەرەڕای ئەمەش هەمیشە منداڵەکانیان بە کۆڵەوەیە"[٤٥].

لێکۆڵەرێکی تورك لە ئەڵمانیا دەژی (لالێ یلچین) لێکۆڵینەوەیەکی لەسەر ژنی کورد لە هەکاری کردووە بە تورکی و ئەڵمانی چاپکراوە، باس لە ڕەوشی ئافرەتی کوردی هەکاری دەکات، لە بەشێکی ئەم لێکۆڵینەوەی باس لەوە دەکات دەڵێ " ئافرەتی کورد سەرەڕای کارە قورسەکانی کە ڕۆژانە دەیکا، گەلێك پارچە جل لەبەر دەکات، ئینجا کار دەکات"[٤٦]. مینۆرسکی لە کتێبی (الاکراد) دەڵێ "بۆ دیاریکردنی ڕەوشی هەر میللەتێك باسکردنی ئافرەتیان شتێکی گرنگ و پێویستە، کورد لەچاو گەلانی دەوروبەر زۆر لەگەڵ ژنەکانیان هێمن و لەسەرخۆن، ژنان کارە گرانەکانی ماڵەوە دەکەن، لە کانییەوە ئاو دەینن، بە چیا بەرزەکان هەڵدەگەڕێن و مەڕ دەدۆشن، دارهێنان و کۆکردنەوەی سووتەمەنی و چیلکە بۆ سووتەمەنی لەئەستۆی ئافرەتی ماڵەوەدایە، لەگەڵ ئەمەش زۆر جار منداڵەکەش لە کۆڵیەتی، شیردۆشینی مەڕ و بزن و مانگا و لەوەڕاندن و ئیش و کاری کشتوکاڵیش[٤٧] هەروەکو لەم وێنەیەدا کە دەگەڕێتەوە سەدەی نۆزدەیەم، دەبینرێت کە چەند ئافرەتێکی کوردی لە کوردە کۆچەرییەکانن لە زۆزانن نزیك ڕەشماڵەکانیان ( کە لە مووی بزن دروست دەکرا) دەژیان، چونکە ئاو هەڵنامژی و



وێنەی ژمارە (١١) ئافرەتی کورد لە کاتی کوتینی ساوەر بە دەستار و لەکاتی بێریدا

لــــە پـــــاڵ چــــیاکان و دەشتایەکان هەڵیاندەدا، بە یارمەتی کۆمەڵێ ستوونی لە دار دروســـتکراو لـــە زەوی جێگیریـــان دەکـــرد و بـــە گوریس دەیانبەستەوە، بۆ ئـەوەی بەرگـەی بـا و بـاران بگـرێ. بـە زۆری ڕەشمـاڵی کوردان گەورە بوو، ناوەوەی ئەم ڕەشماڵانەیان ڕادەخست بە لباد و مافوور. ئەم ئافرەتانە لە کاتی دۆشینی ماڵاتەکانیاندان ئەمەش هەمیشە بە هاوکاری سـەرجەم ئەندامەکانی خێزان کارەکان ڕادەپەڕێنران. مـەڕ و بـزن و مـاڵات لـە ژیـانی زۆر لـە خێزانی کوردەواری سەرچاوەی بژێوی ژیان بووە، ڕاستەوخۆ و ناڕاستەوخۆ وەکـو ماست و پەنیر و نڤیشك و کەشك و گۆشت و خوری و موو و کەرە و ...هتد.

کۆمەڵێ لە سەرچاوەکان باس لە پەنیری کوردی دەکەن، (یاقوت الحموي) زۆری پێ خۆش بووە پەنیر و لۆری کوردان، پەنیری ناوچەی جزیرە و بۆتان وەکو سەرچاوەیەك نێردراوە بۆ موسڵ و زاخۆ. بێجگـە لـەوەش ڕۆژهەڵاتناسـان لـەکاتی سـەردانەکانیان ماسـتی کوردییـان زۆر خـواردووە و زۆر لایـان خـۆش بـووە، وەك (جاکسۆن) کە یەکێکە لە گەڕیـدەکانی ئینگلیـز، هاتۆتـە عـیراق و لـەوێوە چـۆتە باکووری کوردستان لە سەفەرنامەکەی جاکسۆن بۆ باشووری کوردستان لـە سـاڵی ١٧٩٧ز باس لە زنجـیرە چـیای حـەمرین دەکـات، تـا دەگاتـە شـاری نسـێبین، لـە هەندێ شوێندا باس لە مەزنیی قـەڵای هـەولێر دەکـات، هـەروەها بـاس لـە شـاری موسـڵیش دەکـات و دەڵـێ: (زۆربـەی دانیشـتوانی ئـەم شـارە کـوردن، لـەکاتی سەردانەکانی بۆ گونـدەکانی کوردسـتان ماسـتی خـواردووە چـونکە زۆر حـەزی لێ بـووە دەڵـێ: (کـە گەیشـتینە شارۆچـکەیەك کـە پێیـدەڵێن قەرەتەپـە دووبـارە دەستمان بـە خـواردنی نـان و ماسـت کـردەوە کـە لـەلای مـن خـواردنێکی خـۆش بـوو)[٤٨] هـەروەها جگـە لـەم کارانـە ئـافرەتی کـوردی زۆر کـار و چـالاکی تـری لەئەستۆدا بووە بۆ ڕاییکردنی پێداویستییە بنـەڕەتی و گرنگـەکانی خێـزان وەکـو

ئامادەکردنی پێست بۆ پێڵاو دروستکردن و ڕستنی موو و خوری بۆ جلوبەرگ و پۆشاك و گوریس و دوورمان. هەروەها بۆ گۆڕینەوەیان لەگەڵ ئەو پێداویستییە ماڵییانەی کە پێویستن وەکو قاپ و قاجاغ و پێداویستیی تر.

کچان هەر لە منداڵییەوە فێری ئەو کارانە دەکران، لە کاتی بەتاڵیدا یانیش زۆربەی کاتەکانیان تەرخان دەکرد بۆ دروستکردنی ئەم کەلوپەلانە بۆ ئامادەکردنی ئەو بارگانەی کە کچان لە کاتی بووکێنی لەگەڵ خۆیان دەیانبرد بۆ ماڵی مێرد، پێداویستییەکان لە سەرچەف و خاولی، سەرشان، مل پێچ، سەرپۆش، دەستەسڕ، بەرگە سەرین، راخەر، بەرماڵ ئامادە دەکران. لە هەمان کاتدا چنین هۆکارێك بوو بۆ دەستەبەرکردنی داهاتێکی سەربەخۆ، هەندێ لە ژنان داهاتی تایبەت بەخۆیان هەبووە، ئەم داهاتەش لە ڕێگەی چنینی دەستەسڕ و دەستماڵ و شتی ترەوە دەستیان دەکەوت بەهۆی دەڵاڵەکانیان دەبردران بۆ بازاڕ بە مەبەستی فرۆشتنیان[٤٩].



**وێنەی ژمارە (١٢) ئافرەتی کورد لە کاتی تەشی ڕستندا**

لە وێنەی (ژمارە ١٢) ئافرەتی کورد بە جلوبەرگێکی جوان و کراوە کە پێکهاتووە لە کۆڵوانە و سەڵتە و تەنوورەیەکی کورت بە سەرپۆشێکی کوردی پێیدەڵێن ڕەشك ئەمەش جۆرە کڵاوێکە لە قوماشی ڕەنگ ڕەشی چوارگۆشەیی لوولدرای دروستکراوە[٥٠] تەشی دەڕێسێ شارەزایانە کاری ڕستن و چنین دەکات، هەروەکوو (تۆما بوا) دەڵێ: ((ژنان گشت جۆرە بەڕ و مافوورێکی نایاب دەچنن وێنەی جوان و هەمەڕەنگیان تیادا دروست دەکەن وەکو سپی و سۆر و سەوز و زەرد، کە زیندوویەتی ژیان دەردەبڕن))[٥١].

هێنری بیندەر رۆژهەڵاتناسێکی فەڕەنسییە لەکاتی سەردانەکەی بۆ کوردستان کاتێ چۆتە ئامێدی تێبینی ئەوەی کردووە کە ئیش و کاری خەڵك ڕستن و چنینە، باسی ئەوە دەکات کە لە کەلێنی دەرگای ماڵێك بینیویەتی ژنان بە شێوەیەکی سەرەتایی جۆرە قوماشێك دروست دەکەن[٥٢].



**وێنەی ژمارە (١٣) ئافرەتی کورد لە کاتی شانەکردنی گەنمدا**

لێرەدا پێویستە ئەوە باس بکەین کە ئافرەتی کورد پشتگیری پیاوەکەی کردووە بۆ بەرەو پێشبردنی زۆربەی کار و ئەرکی ژیانی ڕۆژانە، لەم پێناوەدا ئەرك و زەحمەتی زۆری کێشاوە. بەتایبەت لە گوند و شارەدێ و لەنێو خێزانە هەژارەکاندا، بەلاّم هەرچی ئافرەتی خێزانە خواپێدراوەکان و بەگ و ئاغاکانە، هەمیشە لە ماڵەوە خزمەت کراون و چەندین ژن لەبەردەستیان کاری کردووە و چێشتیان بۆ لێنراوە و ماڵیان بۆ خاوێنکراوەتەوە و منداڵیان بۆ بەخێو کراوە .

لە تابلۆی (ژمارە ١٣) ئافرەتی کورد لە کاتی شانەکردنی گەنمدایە بۆ جیاکردنەوەی لە پووش لە خەلە و خەرمان، چەندان ئەرك و فەرمانی جۆراوجۆر هەیە لە ژیانی وەرزێری خێزانە گوندنشینە دووره دەستەکان، بێ ماندووبوون و ئارەق ڕشتنی ئافرەت بە ئەنجام ناگەن، لەم جۆرە کارانەش سەرەند کردن، تیرە باکردن و چەندان کاری تر کە زۆر جار ئافرەتی کورد بەدڵخۆشییەوە ئەم کارانەی ئەنجام دەدا و لەگەڵ زۆران لەم کارانە گۆرانی فۆلکلۆری پڕ لە خەم و ئاواز دەگوتران کە لەگەڵ ڕتمی کارەکان تەبا و کۆك دەگونجان. جلوبەرگێکی کوردی چەند پارچەی لەبەر پێکهاتووە لە کراس و کەوا لەسەر ئەمانە سەدریەیەکی کارکردنی لەبەرە کە لە پشتێن بەستوویەتی بۆ ئەوەی پارێزگاری لە جلەکانی ژێرەوەی بکات لە پیسبوون.

## پەراوێزەکان


١. میهرادی، ئیزیدی، چەردە باسێك لە بارەی کوردانەوە، و: ئەمین شوان، کوردستان، سلێمانی، ٢٠٠٧، ل٣٣.

٢. سعدي عثمان حسين، كوردستان والامبراطورية العثمانية دراسة في تطورها السياسي (١٥١٤–١٨١٥)، اربيل، ١٩٩٥، ص١٩، الجواهري، عماد احمد، صراع القوى السياسية في المشرق العربي من الغزو المغولي حتى الحكم العثماني، الموصل، ١٩٩٠، ص ١١١.

٣. محمد امين زكى، خلاصەیەکی کورد و کوردستان، بەغداد، ١٩٣٩، ل٢٦٧.

٥. سيار كوكب الجميل، دراسات في السيطرة العثمانية على الموصل والجزيرة سنة ١٥١٦، ص ٢٠١.

٦. شاکر خەسباك، کورد و مەسەلەی کورد، وەرگێڕانی: ئەمجەد شاکەلی، لە بڵاوکراوەکانی دەزگای ئاراس، ٢٠٠٥.ل٢٩.

٧. پ.د . سەعدی عوسمان هەروتی، کورد و کوردستان لە بەڵگەنامە و سەرچاوە مێژووییەکان، هەولێر، ٢٠١٤، ل٩٠.

٨. صديق الدملوجي، امارة بهدينان الكردية وامارة العمادية، ط٢، مراجعة وتقديم: عبدالفتاح علي يحيى، اربيل، ١٩٩٩، ص١٣٦–١٣٧.

٩. هینری بیندەر، سەفەرنامەی هینری بیندەر لە کوردستان، میزوپۆتامیا، ئێران، وەرگێڕانی ئەبوبەکر خۆشناو، سلێمانی، ٢٠٠٦، ٢٥٤–٢٥٥.

١٠. سعيد، ادوارد، الاستشراق، ترجمة كمال ابو ديب، مؤسسة الابحاث العربية، ١٩٩٥، ص ٧٤.

١١. فواز، مصطفى نجيب، بدايات اهتمام الغرب بالمشرق العربي، مجلة الفكر العربي، العدد الثامن والثمانون، ١٩٩٧، بيروت، ص١٥١.

١٢. زقزوق، محمود حمدى، الاستشراق والعملية الفكرية للصراع الحضاري، القاهرة، ١٩٩٧، ص٧٧–٧٨.

13. Bayrak,mehmet:Osmanlida kurt kadini, p 68, 69.

١٤. سندی، بەدرخان سندی، کۆمەڵگای کوردی لە دیدی ڕۆژهەڵاتناساندا، و: ئیسماعیل ئیبراهیم سەعید، دهۆك، ٢٠٠٨، ل١٦٤.

١٥. ریچ، گەشتەکەی ریچ بۆ کوردستان ١٨٢٠، وەرگێڕانی: محەمەد حەمە باقی، تەورێز، ١٩٩٢، ل٢٦١.

١٦. ڤلادیمێر مینورسکی، الاكراد، ترجمة: معروف خزنەدار، بغداد، ١٩٦٨، ص ٣٤–٣٥ – ٣٩.

17. Sykes.m, The caliphs last heritage,p342 .

18. Martin van bruinessen, women rulers in Kurdish history , amrerica-brookiyn,1993p 25-39

١٩. دبليو ئار هەی ، دوو ساڵ لە کوردستان. گەشتێکی نهێنی بۆ میزۆپۆتامیا، وەرگێڕانی: لوقمان باپیر، هەولێر، ٢٠١٠، ل ١٠١ – ٢٣٠.

٢٠. سۆران حەمە ڕەش، کورد کێیە؟ مێژووی کورد و ڕەچەڵەکی زمانەکەی لە سەرەتای شارستانییەتەوە هەتاوەکو سەدەی دەیەمی زاینی، لەندەن، ٢٠١٣، ل ٣٣٨–٣٥٠.

٢١. قوتیلەکان: دەستەیەکی ئاری نەژادن زۆر کۆنن کە زیاتر لە پێنج هەزار ساڵ پ.ز لە ناوچەکانی زاگرۆس نیشتەجێ بوونە بوێرانە و ئازایانە چالاکییە سیاسییەکانی خۆیان ئەنجام داوە.

Romann grishman, Iran fram the earlist time to the Islamic conquest, peliean,1954, p 44.

٢٢. میهرادی ئیزیدی، هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل١٣٨.

٢٣. Bayrak، هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل ٢٣ - ٢٧.

٢٤. میهرادی، هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل٤٣٨.

٢٥. هەورامی ، هەمزە شوکر، ڕۆژئاوا و مەکری کوردناسی ، گۆڤاری کوردناسی ، ٢٠٠١٣، ل٣٢.

٢٦. ریچ، هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل٢٩٢

٢٧. توما بوا، لمحة عن الاكراد، ترجمة: محمد شريف عثمان، نجف، ١٩٧٣، ص٣١– ٤١.

٢٨. مينورسكي، المصدر السابق، ل٣٩–٤٣.

29. G.R.Driver:The religion of the kurds,vol.ll,pt,ll.pp197-213.

٣٠ . هانسن، ژیانی ئافرەتی کورد، وەرگێڕانی: عەزیز گەردی، هەولێر، ١٩٩٧، ل ٣٦٦.

٣١. ايلي. ميجرسون، رحلة (متنكر) الى بلاد ما بين النهرين وكوردستان، ترجمة: فؤاد جميل، بغداد، ١٩٧٠، ص ٣١٥–٢٠، ٣٤٣.

٣٢. س . ج . ادمونز، كرد، ترك، عرب (سياسة ورحلات وبحوث عن الشمال الشرقي من العراق ١٩١٩–١٩٢٥)، ط٢، ترجمة: جرجيس فتح الله، اربيل، ١٩٩١، ص ٢– ١١٤.

٣٣. مامۆستا هەژار: مێژووی ئەردەڵان، مەستوورە، هەولێر، ٢٠٠٥.

٣٤. هانسن: هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل١٩٤.

35 .Mark Sykes: The Kurdish tribes of the ottoman empire, irland, 1908, p82

٣٦. کوردستان موکریانی، باری سیاسی ئافرەتی کورد لە باشووری کوردستان، هەولێر، ٢٠٠٧، ل٨.

٣٧. هانسن ,هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل ١٩٤ – ١٩٥.
٣٨. ئەولیا چەلەبی، کورد لـە مێـژووی دراوسـێکانیدا، سـیاحەتنامەی ئـەولیا چـەلەبی، چـاپی دووەم، وەرگێڕانی: سەعید ناکام، بەغدا،١٩٨٧، ل ٥٠.
٣٩. الوائلي، عبد ربه سكران ابراهيم، اكراد العراق ١٨٥١–١٩١٤، دراسـة في التـاريخ الاقتصـادي والاجتماعي والسياسي، بغداد، ٢٠١٣، ص ٢٧٥.
٤٠. بـەدرخان سـندی، کۆمـەڵگای کـوردی لـە دیـدی ڕۆژهەڵاتناسـیدا، وەرگێـڕان: ئیسـماعیل ئیبراهیم، دهۆك، ٢٠٠٦، ل٤٨٨–٤٩٠.
٤١ سندی، هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل ١٥٦.
٤٢. هانسن، هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل ٩٩ – ١١١.
٤٣. عبدالرقیب یوسف، تابلۆکانی شەرەفنامە، چاپی سێیەم، سلێمانی، ٢٠٠٥، ل١٨٩.
٤٤.پیربـاڵ، سـازان صـباح، الازیـاء الكردیـة في لوحـات المستشـرقين، رسـالة ماجسـتير، اربیل،٢٠١١، ل ٢٦– ٢٨.
٤٥ . مینورسکی، هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل١٠٦–١٠٧.
٤٦.Bayrak ، المصدر السابق، ل٨٢.
٤٧. مینورسکی، المصدر السابق، ل١٠٧.
٤٨. جاکسۆن، سەفەرنامەی جاکسۆن بـۆ باشـووری کوردسـتان لـە سـاڵی ١٧٩٧، وەرگێڕانـی: ڕەسول بەختیار، هەولێر، ٢٠١٣، ل٦٢.
٤٩. جینفەر سکێرس، کەلتووری شارنشینی لە شارەکانی ڕۆژهـەڵات، وەرگێڕانـی: شـەهلا وەلی جەبار، هەولێر، ٢٠١٢، ل١٦٠.
٥٠. عەبـدوڵڵا غـەفور، کـورد لێکۆڵینەوەیـەك لـە کـەلتووری مـاددی سـەردەم، هـەولێر، ٢٠١١، ل٢٠٦.
٥١. توما بوا، مع الاكراد، ترجمة: ئاواز زنگنه، بغداد، ١٩٧٥، ل٣٤–٣٥.
٥٢. هینری بیندەر، سەفەرنامەی هینری بیندەر، کوردستان، میزوپۆتامیا، ئێـران، وەرگێڕانـی: ئەبوبەکر خۆشناو، سلێمانی، ٢٠٠٦، ل ٢٥٤– ٢٥٥.

## ملخص البحث

ان المستشرقين خصصوا قسما كبيرا من نشاطاتهم لتعريف اعمال المرأة الكوردية ، الصورة الجميلة للمرأة الكوردية واحساس وسلوك واعمالهن في البيت والسياسة على وجه الخصوص واصبحت ذخيرة كبيرة لنشاطاتهن كما ان مصادر المستشرقين تتناول بفخر واعتزاز مكانة المرأة الكوردية في الوقت الذي لم يكن للكورد في تلك الحقبة كيان مستقل او يملك ارادة سياسية واجتماعية واقتصادية بينما كان وباستمرار تحت الوصاية العثمانية والصفوية.

ورغم ان المرأة الكوردية قد واجهت الصعوبات والعراقيل فانها تتمتع بقوة وامكانية منقطعة النظير في تكوينها ونشاطاتها ، لذلك استطاعت ان تمارس دورها الطبيعي في حياتها اليومية.

وهذه ظاهرة واضحة بأن المرأة الكوردية لها اختلاف كبير مع نساء المجتمعات الشرقية . ونستطيع ان نتوصل من افكار وآراء المستشرقين الى استنتاج نقطة مهمة الا وهي حرية واستقلال المرأة الكوردية كميزة خاصة بها في المجتمع الكوردي.



## Abstract

The orientlists devoted a considerable part of their works to introduce the activities of Kurdish women, the beauty of the Kurdish women and particularly their sensitivity , manner and activities at home and policy which became a big supply of their vividness. The oriental resources proudly deal with the position of Kurdish women at the time when the Kurds were deprived from an independent entity and political, social and economical will at that era and they were continuously under the control of the Ottoman and Saffawids.

In spite of the Kurdish woman confronting troubles and obstacles, she enjoyed a non-equivalent powerful ability in their entity and activity. So, she could practice her natural role in her daily life.

It is a clear phenomena that the Kurdish woman is different from the oriental societies women. From the thoughts and views of the orientalists, one can conclude a significant point i.e. the freedom and independence of the Kurdish woman as a private characteristic of her in Kurdish society.

# هەڵوێستی لیوای هەولێر بەرانبەر کودەتای یەکەمی بەعس (٨ی شوباتی ١٩٦٣)

پ.ی.د.ئیسماعیل محەمەد حەساف          م. ی. شوان محەمەدئەمین تەها خۆشناو

بەشی مێژوو – کۆلێژی ئەدەبیات–
زانکۆی سەلاحەددین– هەولێر

## پێشەکی

هەولێر وەکو پایتەختی ئێستای هەرێمی کوردستانی عێراق لە مێژووی نوێ و هاوچەرخیدا رۆڵێکی دیاری گێڕاوە لە پێشهات و پەرەسەندنە سیاسییەکاندا. هاوکات وەکو شارێکی گرنگی باشووری کوردستان، لە چوارچێوەی شارەکانی دیکەدا، پاشخانێکی شۆڕشگێڕی هەبووە، لەلایەك بەهۆی پێگە جوگرافییە هەمەچەشنەکەی لە رووی تۆپۆگرافیاوە (دەشت و شاخ و دۆڵ) بەشێك بووە لە رووداو و بزووتنەوە و راپەڕینە کوردییەکان و بەشێوەیەکی راستەوخۆ و ناڕاستەوخۆ لە بارودۆخی گشتی دانەبڕاو بووە. لەلایەکی ترەوە تایبەتمەندیی دانیشتوانەکەی لەوەدایە کەمتر ژیاننامە و یادداشتەکانیان دەنووسنەوە و مێژووە سیاسییەکەی نادیدە بووە، بۆیە ئەوەی جێگای تێڕامانە کەمتر وردەکاری لەسەر رۆڵی دانیشتوانی شارەکە لە پێشهات و پەرەسەندنە سیاسییەکاندا نووسراوە، دەکرێ لێکۆڵینەوەی لەسەر بکرێت و بەوردی لەسەر کاردانەوەی ئەو شارە لە هەمبەر هەر رووداوێکی مێژووییدا توێژینەوەیەکی لەسەر بنووسرێ.

کودەتای یەکەمی بەعس لە (٨ی شوباتی ١٩٦٣) رووداوێکی گەورەیە لە مێژووی گەلانی عێراقدا، تێیدا بۆ یەکەم جار بەعسییەکان بۆ ماوەی نۆ مانگ (٨ی شوباتی ١٩٦٣–١٨ی تشرینی دووەمی ١٩٦٣) دەسەڵاتیان گرتە دەست و بە ئاگر و ئاسن بەربوونە گیانی بزووتنەوەی دیموکراسی و نیشتمانی لە تەواوی عێراقدا، توانییان بە خێرایی پەرچەکرداری گەلانی عێراق سەرکوت بکەن. لەبەر گرنگیی رووداوەکە و کاردانەوەی رووداوەکە لە لیوای هەولێر، ئەم لێکۆڵینەوە بەئەنجام گەیشتووە. ئەم لێکۆڵینەوەیە جگە لە دەروازە، کە بە کورتی ئاماژە بە رەوشی

سیاسیی شاری هەولێر و پەیوەندیی کورد و بەعس کراوە لە سەردەمی یەکەمی کۆماریدا (١٤ی تەمووزی ١٩٥٨–٨ی شوباتی ١٩٦٣) توێژەر هەوڵی داوە وردەکارییەکانی ڕۆژی ڕوودانی کودەتاکە لە ناو شاری هەولێر و هەندێ شوێنی سەر بە لیواکە لە سێ تەوەردا بخاتە ڕوو. هاوکات جگە لە بزاوتی حیزبی شیوعی و ئەندام و هەوادارانی لە هەولێر، هەڵوێستی پارتی دیموکراتی کوردستان و دانیشتوانی لیواکەش بەشێوەیەکی گشتی وێنا بکات و کاردانەوەکانی بخاتە ڕوو. لەم باسەدا سوود لە چەندین سەرچاوەی جیاجیا و زانستی وەرگیراوە، لەوانە هەندێك دۆکیۆمێنتی فەرمی دادگای سەربازی حکومی بلاۆنەکراوە و دیداری ئەو کەسانەش لەبەرچاو گیراوە کە لە نێو ڕووداوەکاندا بوون و ئاگاداری ڕەوشەکە بوون و نەخشیان لە پێشهاتەکاندا هەبووە و بە وردیش مامەڵە لەگەڵ زانیارییەکانیان کراوە، لەگەڵ بەکارهێنانی کتێب و یادداشت و دەستنووس و لێکۆڵینەوەش بەکارهاتووە.

## دەروازە

دوای ئەوەی حکومەتی عەبدولکەریم قاسم (١٤ی تەمووزی ١٩٥٨–٨ی شوباتی ١٩٦٣) لە نیوەی دووەمی فەرمانڕەوایی خۆیدا دەستبەرداری حوکمڕانیی دیموکراسییانە لە عێراق بووەوە و بەرەو پیادەکردنی سیاسەتی تاکڕەوی و تۆقاندن و ڕاوەدوونانی هێزە نیشتمانییەکان و نیشتمانپەروەرانی کورد لە پێناو بەدەستهێنانی مافە نەتەوایەتییەکانیان هەنگاوی نا، ئاراستەی دەسەلاّتداریێتی بەرەو ئاقارێکی ترسناك ڕۆیشت[1].

شۆڕشی کورد بە سەرۆکایەتی مستەفا بارزانی (١٩٠٣–١٩٧٩) لە (١١ی ئەیلوولی ١٩٦١) هەڵگیرسا، تێیدا شاری هەولێر ڕۆڵێکی سەرەکی لە بەردەوامیی شۆڕشەکە بینی، دوای ئەوەی پۆلیس و پێشمەرگەکانی شارەکە ڕوویان لە چیای سەفین کرد و بنکە و بارەگاکانیان لەوێ کردەوە[2]. جگە لەوەش هۆکاری سەرەکی ڕووخانی حکومەتی قاسم، بەردەوامبوون و بەهێزبوونی شۆڕشی کورد بوو، چونکە ڕزگارکردنی پانتاییەکی فراوانی کوردستان و هێرشی دڕندانەی حکومەت و بۆمباباران و تۆپبارانکردنی ئەو ناوچانە بووە هۆی لێکترازانی ڕیزەکانی سوپا لەلایەك و لاوازبوونی ژێرخانی ئابووریی عێراق لەلایەکی ترەوە[3].

لەکاتێکدا زۆربەی هێزەکانی سوپای عێراقی سەرقاڵی شەڕی کوردستان بوو، زیانێکی زۆریش بەر هێزە سەربازییەکانی قاسم کەوتبوو. بەدرێژایی ساڵی (١٩٦٢) پەیوەندیکردنی دانیشتوانی شارەکان بە شۆڕشی کوردستان لەبرەودا بوو، لە ئەیلوولی (١٩٦٢) دا ژمارەی قوربانییانی شەڕی سەپاوی قاسم گەیشتبووە (٤٠٠٠) سەرباز و (٣٠٠٠) جاش و هەزاران دیل، ئەوەش وای لە حکومەتی قاسم کردبوو هێزەکانی خۆی بە ئاراستەی کوردستان بە بەردەوامی زێدەتر بکات و بێ ئەوەی رەچاوی لاوازبوون و لاسەنگبوونی هێز و تێکچوونی هاوکێشە سەربازییەکانی ناوخۆی وڵات بکات[٤].

لە راستیدا هەڵوێستی لقی کوردستانی حیزبی شیوعی عێراقی دژی هەڵگیرسانی شۆڕشەکە بوو، لەگەڵ ئەوەی دوای بۆردومانکردنی ناوچەی بارزان بەیاننامەیەکی نارەزاییەتییان بڵاوکردەوە و سەرکۆنەی بۆردومانە هەرەمەکییەکەیان کرد، بەڵام ئەم هەڵوێستە و هەڵوێستەکانی دواتریش روون و ستراتیژی نەبوو، چونکە پێیانوابوو ئەو بەرەیە خەباتی بە کۆمەڵ دژی ئیمپریالیزم لاواز دەکات، تەنانەت هەندێکیان لەپاڵ سوپای عێراقی چەکیان دژی شۆڕشی کورد هەڵگرتبوو، هەرچەندە لقی هەولێری حیزب لەسەر ئاستی سەرکردایەتی و کادیرە مامناوەندییەکان جۆرێك میانرەوتر بوون بە بەراورد لەگەڵ لقی سلێمانی و شارەکانی تر[٥].

هەرچەندە بەعسییەکان و ناسیۆنالیستە عەرەبەکان لە ماوەی حوکمڕانیی قاسمدا پەراوێز خرابوون، بەڵام دژی شۆڕشەکە بوون و شۆڕشەکەیان بە بزووتنەوەیەکی جیاخوازی لەقەڵەم دا و بارزانیشیان بە بەکرێگیراو و دوژمنی سەرسەختی بزووتنەوەی یەکێتیی نەتەوەی عەرەب تۆمەتبار کردبوو، بەڵام دواتر هەڵوێستیان گۆڕا لە ساڵی (١٩٦٢) دانیان بەبوونی گەلی کورد نابوو، باسی مافە نەتەوایەتییەکانی گەلی کوردیان کردبوو، بێ دەستنیشانکردنی مانا و ناوەڕۆك و رەهەندەکانی ئەو مافانە [٦].

کاتێکیش گەرموگوڕی و گڕی شۆڕشی کوردستان کڵپەی سەندبوو، بەعسییەکان توانییان لە رێگەی سەرهەنگی خانەنشین کەریم قەرەنی[٧] پەیوەندی بە سەرکردایەتیی شۆڕشی کوردەوە بکەن، کە لە (تشرینی یەکەمی ١٩٦٢) لە

لایەن تاهیر یەحیا[٨]راسپێردرابوو، زانیاریی بداتە سەرانی کورد سەبارەت بە جوولەیەکی سەربازی و داخوازی هەماهەنگیکردن و بەڵێنی چارەسەری ئاشتییانەی مەسەلەی کورد و داننان بە مافە رۆشنبیرییەکانی گەلی کورد و حوکمڕانیی نامەرکەزی بخاتە ڕوو، لەگەڵ ئەوەی سەرکردایەتی سیاسیی شۆڕشی کورد پێداگیری و جەختیان لەسەر داننان بە مافە نەتەوایەتییەکان و ئۆتۆنۆمی لە چوارچێوەی عێراقدا کردەوە، بەلآم تەنها ڕەزامەندییان لەسەر داخوازییەکان و ئاگربەست و بەشداریکردنیان لە حوکمڕانیی نوێدا لە داهاتوودا نیشان دا [٩].

لە نامەیێکی تاهیر یەحیادا، کە بۆ ئیبراهیم ئەحمەدی سکرتێری پارتی ناردبوو تێیدا دانی بە ئۆتۆنۆمی نابوو. هەروەها داوای لێکردبوو شەش پاڵێوراوی پارتی بۆ بەشداری پێکردن لە حکومەتی داهاتوو کاندید بکەن[١٠]. لە (١٨ی نیسانی ١٩٦٢) دوای ئاگاداریی بارزانی و لێژنەی ناوەندی پارتی، ئیبراهیم ئەحمەد وەڵامی نامەکەی دایەوە و پاڵپشتیی کورد و ئامانجی شۆڕشی کوردی خستبووە ڕوو، کەوا بریتییە لە: ڕووخانی ڕژێمی قاسم و دەستەبەربوونی ئۆتۆنۆمی بۆ کوردستان، چەسپاندنی سیستمێکی دیموکراسی لە عێراقدا[١١]. هاوکات شۆڕشی کورد ناوی شەش پاڵێوراوەکەی بۆ ناردن، کە دووانیان لە سنووری لیوای هەولێر بوون، ئەوانیش: عومەر مستەفا (١٩٢٣-١٩٩٢) و بەکر عەبدولکەریم بوون، لە پاڵ هەریەك (جەلال تاڵەبانی، عەلی عەسکەری، فوئاد عارف و باباعەلی شێخ مەحموود) بۆ وەرگرتنی پۆستی وەزارەت لە حکومەتی نوێدا[١٢]. لە ( کانونی دووەمی١٩٦٣)دا کۆبوونەوەیەکی نهێنی لە بەغدا بە هاوکاری و بەشداری فوئاد عارف لە نێوان نوێنەری پارتی دیموکراتی کوردستان ساڵح یوسفی[١٣] و رازڕاگری گشتی سەرکردایەتی بەعس عەلی ساڵح سەعدی[١٤] ڕێکخران تێیدا بەڵێندرا داخوازییەکانی گەلی کورد لە چوارچێوەی ئۆتۆنۆمیدا جێبەجێ بکرێ[١٥]. هەروەها ڕێککەوتن لەسەر ئامادەسازی بۆ کودەتایەك دژی قاسم[١٦].

کودەتاکە خێرا ئەنجام درا، بێ ئەوەی ڕێککەوتنەکە بنووسرێت و تۆمار بکرێت[١٧]. بەم جۆرە پەیوەندییەکانی پارتی و حیزبی بەعس لە چاوەڕوانیدا بوو تا ڕۆژی کودەتاکە و کۆتایی بەحوکمی قاسم هات کە تەنها چوار ساڵ و شەش مانگ و بیست و چوار ڕۆژی خایاند[١٨].

قۆنــاغێكی نــوێ دەســتی پێكــرد و رووداوەكــانی دوایــیش دەریخســت كودەتاچییەكان لە بنەڕەتدا خاوەنی بەرنامەیەك نەبوون بۆ چارەسەری دۆزی كورد، بەڵكو هەنگاوە تاكتیكییەكانیان بۆ بەهێزكردنی هەژموونی خۆیان بوو. دڕندانە كەوتنە وێزەی گەلانی عێراق و هەوڵی سڕینەوەی هێزە دیموكراسییەكانی وڵاتیان دا[١٩].

لە ماوەی نووسینی ئەم توێژینەوەیەدا لیوای هەولێر لە رووی دابەشبوونی كارگێڕییەوە بەم شێوەیەی خوارەوەیە: قەزای ناوەندی هەولێر هەریەك لە ناحیەی هەولێر (عەینكاوە) و ناحیەی قوشتەپە دەگرێتەوە، قەزای كۆیسنجەق ناحیەی تەقتەق دەگرێتە خۆ، قەزای مەخمور، ناحیەی قەراج و كەندێناوە (دیبەگە) و گوێڕ دەگرێتە خۆ، قەزای شەقلاوە، ناحیەكانی خۆشناو (هیران) و سەلاحەددین (پیرمام) و هەریر دەگرێتە خۆ، قەزای رواندز هەریەك لە ناحیەی دیانە (سۆران) و ناحیەی باڵەك (گەلاڵە) و ناحیەی برادۆست (سیدەكان) دەگرێتەخۆ، دوا قەزاش قەزای زێبار ناحیەكانی مێرگەسۆر و ناحیەی بارزان و ناحیەی مزووری بالا (شێروان مەزن)ی لەخۆ گرتبوو[٢٠]

### تەوەری یەکەم: هەولێر و کودەتای ٨ی شوباتی ١٩٦٣:

هەروەکو سەردەمی پاشایەتی پێش کۆتایی هاتنی سەردەمەکە چەندین راپۆرت و هۆشداری درایە دەربار و کۆشکی پاشایەتی، ماوەیێکی کەم بەر لە روودانی کودەتاکەش چەندین هۆشداری و راپۆرت لە لایەن حیزبی شیوعییەوە درایە حکومەتی قاسم وریابێت و پیلانێك لە ئارادایە بۆ کۆتاییهێنان بە حکومەتەکەی[٢١]، کەسایەتی شاری هەولێر هادی چاوشلی[٢٢] ئەو کاتە بریکاری وەزارەتی ناوخۆ بوو، ئەوە دووپات دەکاتەوە بەر لە روودانی کودەتاکە چەندین راپۆرتمان، لە لایەن خۆبەخش و خۆشەویستانی قاسمەوە، بۆ دەهات جەختیان لەوە دەکردەوە کە هەوڵی کودەتای سەربازی دژی حکومەتی قاسم لە ئارادایە، بەڵام قاسم بایەخی بەم راپۆرتانە نەدەدا و پێی بێزار دەبوو[٢٣].

حیزبی شیوعیش بە ماوەیێکی کەم بەر لە روودانی کودەتاکە، چەندین جار مەترسی ئەگەری روودانی کودەتایەکی بۆ بەرپرسانی باڵای حکومەت لە شێوەی راپۆرت خستبووە روو، بەڵام قاسم و حکومەتەکەی بێباك و بێئاگایانە هەڵسوکەوتیان دەکرد[٢٤].

ئەوەش کورتبینیی سیاسی و بێ ئاگایی قاسم و حکومەتەکەی نیشان دەدات بەرانبەر بە کەم زانینی دوژمنانی، لە بارێکدا نەیارانی ناوخۆ و دەرەوەی بە پلانێکی تۆکمەوە بەرنامەیێکی دارێژراوی گونجاویان، لەکاتێکی دیاریکراو و کورتدا، بۆ لەناوبردنی دەسەڵاتەکەی دارشتبوو.

هەوڵەکان سەریان گرت و بەئەنجام گەیشتن کاتێك هاوپەیمانێتی بەعسی- ناسری بۆ کۆتاییهێنان بە حوکمڕانیی قاسم و گرتنەدەستی دەسەڵات سەرکەوت[٢٥]، کاتژمێر (٠٩:٢٢) نۆ و بیست و دوو خولەکی بەیانی رۆژی هەینی (٨ی شوباتی ١٩٦٣) کودەتاچییان دەستیان بەسەر پەخشی ئێستگەی رادیۆی بەغدا لە (ئەبی غرێب)دا گرت[٢٦] هەر زوو راگەیەندراوی ژمارە (١)ی کودەتاکە بە ناوی (بەیانی ژمارە یەکی شۆڕش) خوێندرایەوە، کۆتایی حوکمڕانی عەبدولکەریم قاسم راگەیەنرا و ئەنجومەنێك بە ناوی ئەنجوومەنی سەرکردایەتی بۆ شۆڕش دامەزراو لە بەیانەکەدا هاتبوو: **"حکومەت کار دەکات بۆ واڵاکردنی ئازادییە دیموکراسییەکان و پاڵپشتیکردنی سەروەریی یاسا و هێنانەکایەی یەکێتیی**

**نیشتمانی گەل بەو شێوەیەی کە پتەوکردنی برایەتی عەرەب و کورد دەیخوازێت و دەستەبەری بەرژەوەندییە نیشتمانییەکەیان و خەباتی هاوبەشیان دژی ئیمپریالیزم بەهێز بکات و رێز لە مافی کەمینەکان بگرێت..."**[٢٧].

وەکو لە بەیاننامەکەدا دیارە تەنها ئاماژەیەکی بێ ناوەرۆك بە ناوهێنانی کورد کرا، بێ ئەوەی ئاماژە بە مافەکان و ناوەرۆکی ئەو مافانە بکرێت کە پێشتر لەگەڵ سەرکردایەتیی شۆڕشی کورد لە دانوستانەکان لەسەری رێککەوتبوون.

ئەو رۆژە بەیاننامە دوای بەیاننامە لە شێوەی قیژە و قیرە و هاتوهاوار لە رادیۆ دەخوێنرایەوە[٢٨]. بە بەیانی ژمارە (٦) سنوور و فڕۆکەخانەکان داخران، بە بەیانی ژمارە (٨) لە کاتژمێر (٣)ی دوای نیوەڕۆ قەدەغەکردنی هاتوچۆ بۆ دانیشتوان راگەیەنرا[٢٩]. ئەو رۆژە تا کاتژمێر (١٢)ی نیوەڕۆ هەشت بەیاننامە لە ئێستگەی بەغدا خوێنرایەوە[٣٠] بە بەیانی ژمارە (١٧) سەرهەنگی روکنی خانەنشین عەبدولسەلام عارف بۆ یەکەم سەرۆك کۆماری سەردەمی نوێ هەڵبژێردرا و پلەی موشیری روکنی پێبەخشرا و بە بەیانی ژمارە (١٨)ش یەکەم کابینە بە سەرۆکایەتی ئەحمەد حەسەن بەکر پێکهات[٣١].

بەم شێوەیە سەردەمێکی نوێ دەستی پێکرد و بەکردەوە بەعسییەکان جڵەوی حوکمڕانییان گرتە دەست.

**١- هەڵوێستی جەماوەری شارەکە بەرانبەر کودەتاکە:**

دوای ئەوەی بارێکی نائاسایی باڵی بەسەر تەواوی گەلانی عێراقدا کێشا، لە ناو شاری هەولێر خەڵك لە بازاڕ و گەڕەکەکاندا گردببوونەوە و بەسەرسوڕمانەوە گوێیان لە هەواڵەکان گرتبوو، هەندێکیان چاوەڕوانی هەڵوێستی لایەنگرانی قاسم و پەرچەکرداری حیزبی شیوعی بوون[٣٢]، هەندێکی تر لە سەرەتا چاوەڕوانی موژدەی دەستەبەربوونی مافەکانی گەلی کورد بوون و وای بۆدەچوون کۆتایی بە قەیرانەکە دێت، ئیتر تەناهی و ئاسایش و چارەسەری ئاشتیخوازانەی دۆزی رەوای کورد دێتەئاراوە[٣٣].

واتە هەڵوێستی شارەکە بە گشتی، لەسەر ئاستی جەماوەری، لە سەرەتادا جیاواز و تێکەڵ بوو، دانیشتوانی شار لە پێشوازیی پێشهات و پەرەسەندنی نوێدا بوون، بە گشتی زۆرینەی خەڵك بە هاتنە سەر دەسەڵاتی

بـەعس خۆشـبین نـەبوون، بـەلاّم ڕێکخسـتنەکانی پـارتی و بەشـێك لـە جـەماوەر ئومێدیان بە گۆڕانکاریی ئەرێنی هەبوو، لەبەر ئـەوەی بەشـێکی زۆری دانیشـتوانی هەولێر پاڵپشت و هاوسۆزی شۆڕشی نەتەوەیی کورد بوون و هاوهەڵوێستی ئەنـدام و لایەنگرانی پارتی دیموکراتی کوردستان بوون، بەوپێیەی کۆتـایی بـە دەسـەلاّتی قاسم هات و جۆرە ڕێککەوتنێك لە نێوان سەرکردایەتی شۆڕشی کورد و حکومـەتی نویێ هەبوو، ئومێدی ئەوەیان دەخواست ڕەوشـەکە ئـارام ببێتـەوە و دەرفـەتێکی لەبار بۆ ئاشتەوایی ڕەخسابێت.

بەشـێکیش لـە تورکمانـەکانی شـاری هـەولێر بـە هـاتنی بـەعس خۆشـبین و گەشـبین بـوون، ئەوانـەی لـە سـەردەمی قاسـم بەرژەوەندییـەکانیان کـەوتبووە مەترسـییەوە، بەتایبـەتی لـە دوای ڕووداوی (تـەمووزی١٩٥٩)ی کـەرکووك، لـە هــەولێریش لــە لایــەن شــیوعییەکانەوە هــەولێك لــە ئــارادا بــوو بــۆ لێــدان و سەرکوتکردنیان، هەرچەندە نەگەیشتە ئاستی شەڕو پێکدادان، بەلاّم زۆرێك لـەوان ڕق و کینەیان بەرانبەر دەسەلاّتی شیوعییەکان لە شەقام هـەلگرتبوو، چـاوەڕوانی تۆڵەسەندنەوە بوون[٣٤].

هاوکات هەندێ لەو سەرۆك هۆز و دەرەبەگانەی سنووری لیـوای هـەولێر لـە یاسای ریفۆرمی کشـتوکاڵی زەرەرمەنـد ببـوون، بـە ئومێـدی دووبـارە گەڕانـەوەی شـــکۆ و ســـەردەمی ئاغـــا و کوێخوایـــەتی و بەدەســـتهێنانەوەی زەویـــوزار و گوندەکانیان بە ڕەوشی نوێ خۆشبین بوون[٣٥].

دانیشـتوانی شـارەکە لـە گـەڕەك و بـازاڕ و شـەقامەکاندا گوێیـان لـە رادیـۆ گرتبوو، لە چاوەڕوانی هەڵوێستی فـەرمی سـەرکردایەتیی شۆڕشـی کـورددا بـوون، ئێـوارەی ئـەو ڕۆژە بانگـەوازی ڕاگرتنـی شـەڕ لـە لایـەن پـارتی ڕاگەیـەنرا[٣٦]، بەتایبەتی دوای خوێندنەوەی برووسکەی پشتگیری و پیرۆزبایی پارتی دیمـوکراتی کوردستان بە ناوی ئەندامی لێژنـەی ناوەنـدی پـارتی و ڕاگـای خانەنشـین (العمیـد المتقاعـد) فوئـاد عـارف بـۆ (ئەنجوومـەنی نیشـتمانی سـەرکردایەتیی شـۆڕش) ناردبوویان و تێیدا هاتبوو: **"شۆڕشەکەتان لەگەڵ شۆڕشی مەزنی گەلی کورد دژی سـتەمکاری قاسـم یـەکیان گرتەوە...چـاوەڕوانی هــەنگاوی بــەکردەوەین لــە بزووتنەوەکەتان بەرەو چارەسەری مەسەلەی کورد لەسەر بنەمای ئۆتۆنۆمی، کە دەتوانێت بنەماکانی برایەتی تاهەتا بچەسپێنێ"**[٣٧].

دیاره کودەتای توندوتیژی بەعسییەکان و هاوتاکردنی لەگەڵ شۆڕشی گەلی کورد کارێك بوو پەلەی تێدا کرا[٣٨]، لەوانەشە بۆ پاراستنی سەرو ماڵی ئەندام و لایەنگرانی پارتی بووبێت لەناو شاری بەغدا و شوێنەکانی تر لە زەبروزەنگ و لێشاوی بەعسییەکان.

**٢– هەڵوێستی حیزبی شیوعی و پلاندانان بۆ رووبەڕووبوونەوە لە شاری هەولێر:**

رۆژی کودەتاکە پەرچەکرداری حیزبی شیوعی لەناو شاردا بەهێزبوو، بە تایبەتی بانگەواز و بەیاننامەی (١) و (٢)ی فەرمی حیزبی شیوعی لە رۆژی کودەتاکە لە بەغدا دەرچوو[٣٩]، گەیشتە دەست لێژنەی محەللی شاری هەولێر و دژی حیزبی بەعس بلاوکرایەوە و داوای چەك هەڵگرتن دژی کودەتاچییان کرا[٤٠].

لە بەرانبەردا کودەتاچییان بەیانی ژمارە (١٣)یان دەرکرد و لە ئێزگە خوێنرایەوە، تێیدا هاتبوو: "**شیوعییەکان هاوبەشی تاوانەکانی عەبدولکەریم قاسم بوون بۆ تێکدانی ریزەکانی گەل و ملکەچ نەبوون بۆ فەرمان و رێنماییە فەرمییەکان، بۆیە فەرماندە سەربازییەکان و هێزەکانی پۆلیس و پاسەوانانی نەتەوەیی (الحرس القومي)[٤١] دەستکراوە دەبن و هەموو ئەوانەی ئاسایش تێك دەدەن قڕوبڕ بکەن و داواش لە رۆڵە دڵسۆزەکانی گەلەکەمان دەکەین هاوکاریی دەسەڵات بن و هەواڵی ئەوانەمان پێبدەن بۆ ئەوەی سەرکوتیان بکەین**"[٤٢]

لە رۆژانی یەکەمی کودەتاکە سەرانی بەعس بە پلە یەك سەرقاڵی لەناوبردنی نەیارانی خۆیان بوون، پێکدادان و شەڕی شەقامەکان لە نێوان یەکەکانی حەرەس قەومی و شیوعییەکان و پشتیوانانی قاسم بەشێوەیەکی توندوتیژ روویاندا، ئەوەش وایکرد تەنها بیر لە مەسەلەی گێڕانەوەی ئاسایش و چەسپاندنی حوکمڕانی خۆیان بکەنەوە و مەسەلەی گرنگی تر، وەك مەسەلەی کورد، فەرامۆش بکەن و وەکو مەسەلەیەکی تاکتیکی و لاوەکی هەژماری بکەن[٤٣].

لە راستیدا ئاساییە ئەم بەیاننامەیە زەنگێکی مەترسیدار و کارەساتێکی گەورەی لێبکەوێتەوە، چونکە بڕیاری قڕکردنی شیوعییەکان لەکاتێکدا بوو، ئەوان جەماوەرێکی گەورەیان لە تەواوی عێراقدا لە نێو شەقامدا هەبوو، لە شاری هەولێر رێکخستنەکانی حیزبی شیوعی تا ئاستێکی زۆر کارا بوون و تا ئەو رۆژە

لایـەنگری حکومـەتی قاسـم بـوون و بـە باشـی لـە ڕێکخسـتن و چـالاکییەکانیان بەردەوام بوون و نەچووبوونە بەرەی شۆڕشی کوردەوە.

لە بەیاننامە ئاراستەکراوەکەی حیزبی شیوعیدا داخوازی کرابوو پیلانگێـڕە ناپاك و بەکرێگیراوەکانی ئیمپریالیزم تەفروتوونا بکەن و بەخشندەیی و بەزەییيان پێدانێتەوە، بـەناوی شـیوعییەکانەوە داوا لـە میللـەت کرابـوو، لـە پۆلیسـخانەکان دەسـت بەسـەر چـەکەکاندا بگـرن و هێـرش بکەنـە سـەر کودەتاچـییان و لەناویانبەرن[٤٤].

ڕێکخسـتنەکانی لێژنـەی محـەللی هـەولێری حیزبـی شـیوعی بـەدەنگ بەیاننامەکەوە چـوون و کەوتنـە جموجـۆڵ و هەڵوێسـت وەرگـرتن و کۆبوونـەوە و پلان دارشتن، لێژنەی ناوخۆی هەولێر بـە سەرپـەرشـتی (عەبدولسـتار خزەیـر)[٤٥]، ئەندامی کۆمیتەی ناوەندی، (ئـەو کاتـە لـە روانـدز بـۆ کـاری ڕێکخسـتن گـەڕابۆوە هەولێر)، بۆ باری نائاسایی کۆبوونەوەی بە پەلەی کرد، لـە مـاڵی تۆفیـق ئەحمـەد ناسـراو بـە (هـەژار) ئـەو کاتـە پـاڵێوراوی لێژنـەی ناوەنـدی بـوو، هـەروەها بـە ئامادەبوونی هەریەك لە نەجمەددین مامۆ هـەریری، عەبدولمەجید عەبـدولڕەحمان ناسراو بە (مـام قـادر) (١٩٣٢–٢٠١٢) بەرپرسـی ڕێکخسـتنەکانی شـاری هـەولێری حیزبی شیوعی، فەتاح تۆفیق ناسراو بـە (مـەلا حەسـەن) و جـەبار تۆفیـق[٤٦] لـەو کۆبوونەوە خێرایەدا ئەم بڕیارانەی خـوارەوە درا و ئـەم فـەرمان و ڕێنماییيانـە بـۆ ڕێکخراوەکانی خوارووی حیزبی شیوعی لە گەڕەکەکانی شار نێردرا:

١– بە پەلە ڕێکخراوەکان ڕۆڵی خۆیان ببینن هەموو جـۆرە چـەکێك بەرانبـەر کودەتاچـییان بـەکاربهێنن و بەهـەموو توانایـەك دەسـت بەسـەر چـەکی بنکـە و پۆلیسە ئێشکگرەکاندا بگرن.

٢– سـەرکردایەتی جـەماوەر بکـەن و بـە هـەموو توانـا خـەڵك بڕژێننـە سـەر شەقامەکان و خۆپیشاندان لە شەقامە گشتییەکان بەردەوام بێت.

٣– پەیوەنـدی بـە هـەڤاڵان و جـەماوەری پـارتی بکـەن و هـەوڵی بەسـتنی پەیوەندی و هاوکاری یەکتر بن.

٤– بەربەسـتی قەدەغـەکردنی هاتوچـۆ بشـکێنن و دوژمنایـەتی ئاشـکرای کودەتاچییان رابگەیەنن.

٥- پەیوەندی بە رێکخستنەکانی حیزبی شیوعی لە ناو سەربازان بکەن و هەوڵ بدەن دەست بەسەر چەك و جبەخانەی هەولێردا بگرن [٤٧].

ئەگەر بڕوانینە خاڵەکانی بڕیارەکانی کۆبوونەوەکە تێبینی دەکەین جۆرێك لە پەلەکاری و پەرتەوازەیی هەیە، تا ئاستێکی زۆریش هەوڵەکانیان واقیعبینانە نین، هەوڵدراوە رێکخراوەکانیان لە حاڵەتێکی تەنگەتاویدا جەماوەر بڕژێننە سەر شەقامەکان و زاڵدەستیی خۆیان بنوێنن، لە کاتێکدا لە پایتەخت و ناوەندی دەسەڵات کودەتا سەرکەوتوو بووە، هەروەها بەشێکی زۆری جەماوەری هەولێر لە چاوەڕوانیدا بوون تا ئاستێك هیوای بە حکومەتی نوێ هەبوو، بە هۆی هەماهەنگی و رێککەوتنی پێشوەختە لەگەڵ پارتیدا، هەروەها دەردەکەوێت قەیران و گرفتی دابینکردنی چەك و تەقەمەنی هەبووە خۆیان بۆ ئەو پێشهاتە ئامادە نەکردبوو، لەگەڵ ئەوەی لایەنگری حکومەتی قاسمیش بوون، بەڵام لە هەوڵی جێبەجێکردنی بڕیارە حیزبییەکانیشیان نەوەستان و هەوڵ درا لە شاری هەولێر بە کردەوە ناوەڕۆکی بەیاننامەکە جێبەجێبکەن.

## تەوەری دووەم: کاردانەوەی کودەتای ٨ی شوباتی ١٩٦٣ لە ناو شاری هەولێر:

لەگەڵ کۆبوونەوە و ئامادەسازییەکانی لێژنەی محەللی حیزبی شیوعی و کۆمیتەی ناوخۆ بڕیاری رووبەڕووبوونەوە درا، لە گەڕەکەکانی ناو شاری هەولێر بە شێوەی جیاجیا و بە قەبارەی جیاجیا خۆ پیشاندانەکان دەستی پێکرد، بەم شێوەیەی خوارەوە:

### ١- گەڕەکی سەیداوە:

دوابەدوای هەوڵەکانی حیزبی شیوعی بۆ بەرەنگاربوونەوە و ئەو کارڕاییانەی بۆ خۆئامادەکردن و ئامادەسازی رووبەڕووبوونەوەدا دەریانکرد، یەکەم گەڕەکی گونجاو بۆ ئەنجامدانی راسپاردە و بڕیارەکان سەیداوە[٤٨] بوو. ئەمەش بەهۆی بەهێزیی پێگەی جەماوەری و رێکخستنەکانی حیزبی شیوعی لەو گەڕەکەدا، هەروەها بوونی بنکەی پۆلیسی سەیداوە هۆکارێکی دیکە بوو، بۆیە دوای کۆبوونەوەی دووەمی کۆمیتەی ناوخۆی هەولێر لە ماڵی کەمال شەعبی لە گەڕەکی

سەیداوە، بڕیاردرا دەست بەسەر بنکەی پۆلیسی گەڕەکەکەدا بگرن[٤٩] هەروەها بڕیاری لادانی تەحسین محەمەد خەلیلی بەرپرسی ڕێکخستنەکانی سەیداوە درا، راسپاردنی نەجمەددین مامۆ لە شوێنی ئەودا بە هۆی شارەزایی لە رووبەڕووبوونەوەی چەکداری و بواری سەربازی، فەرمانی کردەی گرتنی بنکەی پۆلیسی سەیداوە بە مامۆ سپێردرا[٥٠].

دوای کاتژمێر دوو و نیوی ئێوارە جەماوەر و ڕێکخستن و چەکدارەکانی حیزبی شیوعی لە گۆڕەپانی سەیداوە کۆبوونەوەیەکی جەماوەرییان کرد و هاتوهاوار و دەنگی جەماوەر بەرز بۆوە، یەکێك لە شیوعییەکان دەیگوت: بژی حیزبی شیوعی بژی عەبدولکەریم قاسم. جەماوەریش تێکرا بە چەپڵەڕێزانەوە دەیانگوت: هەربژی، ئنجا نەجمەددین مامۆ بە یاوەری سلێمان موورتکەیی وتارێکی پێشکەش کرد لە وتارەکەیدا ئاشکرای کرد ئێمە بە هەموو شێوەیەك دژی کودەتاچیانین و سەرکردایەتی حیزب فەرمانی کردووە دەست بەسەر بنکە و بارەگاکانی حکومەت و پۆلیسدا بگرین، ئێستاش هاتووین بنکەی پۆلیسی سەیداوە بگرین و لە هەموو گەڕەکەکانی تریش راپەڕینە دژی بەعسییەکان[٥١]، هەروەها گوتی: ئەو کودەتایە فاشییە گەڕانەوەیە بۆ سەردەمی تاریکی، دەستی ئیمپریالیزم و نۆکەرانی رۆژئاوای لەدواوەیە، هەموو لایەکمان دەبێ دژی بوەستینەوە و هێزەکانمان یەکخەین و لەناویان ببەین[٥٢].

لە کاتی وتارەکەدا خەڵکێکی زۆری ڕێکخستنەکان و چەکدارانی حیزبی شیوعی لە گەڕەکی سەیداوە و گەڕەکەکانی تر بەتەنگ بانگەوازەکە هاتن و دەبینران لەوانە: رەحمان جۆرا، زاهیر هەمزە، ئیبراهیم عەبدی ناسراو بە (برایمەکۆر)، ماڵی تەها چایەچی و کوڕەکانی حەسەن و جەوهەر و حەیدەر[٥٣]، محەمەد میرخان، تۆفیق هەریری، ئەحمەد جۆلا، نادر کۆیی، واحد سلێمان ناسراو واحیدە شەل، مەلا ئەحمەد ناسراو بە مەلا نەفتە، کەریم کوردە، تاهیر عوسمان، سەدیق برایم شینە، حامید عەبدولا و حوسێن کەریم نانەوا و عەزیز ئەحمەد رەسول و چەندانی تر بوون[٥٤]. جگە لە ڕێکخستنەکانی سەیداوە ژمارەیەك چەکدار لە گەڕەکەکانی تری هەولێر و گوندەکانی دەشتی هەولێرەوە هاتبوون و ئامادە ببوون، سەرەتا بڕیاردرا هێرش بکەنە ناو بنکەی پۆلیسی سەیداوە لەو

کاتەدا تەنها پۆلیسەکان لەویٚ بوون و عەریف دەروێش ئەفەندی بەرپرسی بنکەی ئێشکخانەکە لەویٚ نەبوو، بۆیە پۆلیسەکان دەرگاکەیان داخست و گوتیان تا بەرپرسەکەمان نێتەوە بڕیار لەدەستی ئێمە نییە و دەرگاکە ناکەینەوە، دوای نیو کاتژمێر دەروێشەفەندی دێتەوە بنکەکە ڕووبەڕووی جەماوەر و لایەنگرانی حیزبی شیوعی بووەوە و لەلایەن سلێمان موورتکەیی دەمانچەکەی لیٚ سەنرا و پاسەوانەکەی چەك کرا، بەلاٚم گوتی: من دژی کودەتام و لەگەڵ ئێوەم و لایەنگیری حکومەتی قاسمم چەکەکەم بدەنەوە تاکو بچمە بنکەو پۆلیسەکانیش رازی بکەم، ئیتر باوەڕیان پێکرد، توانی بچێتە بنکەکە و پەیوەندی بە بەڕێوەبەرایەتی پۆلیسی گشتی کرد و پێیان ڕاگەیاند: خۆت بەدەستەوە نەدەی هیچ شتێك لە هەولێر ڕووی نەداوە و کاتیان بکوژە تا هێزتان بۆ ڕەوانە دەکەین و دەگەینە لاتان، دوای ئەو ڕاوێژە، نێوبراو لەسەربانی بنکەکە بەدەنگی بەرز بە ئاپۆرەی جەماوەرەکەی گوت: شیوعییەکان راکەن و خۆتان رزگاربکەن ئێستا هێز دەگاتە سەرتان، تکاتان لێدەکەم خۆتان دەربازکەن[٥٥].

ئەوسا جەماوەر وروژا و لەچەند لایەك هێرش کرا، لەلایەن کەسێك بە ناوی کەریم کوردە هێڵی تەلەفۆنەکە پچڕێنرا، بەلاٚم دوای ئەوەی پەیوەندی بە هێزی پۆلیسی گشتی کرابوو. تەقە دەستی پێکرد لەلایەن چەکدارانی شیوعی لەسەربانی خانووی چەندماڵێکەوە بنکەکە گوللەباران کرا، لەو کاتەدا هێزی پۆلیس بۆ فریاکەوتنی بنکەکە گەیشتە شوێنەکە، رایانگەیاند رژێمی عەبدولکەریم قاسم کۆتایی پێهاتووە ئارامی بپارێزن، نەجمەددین مامۆ بەرپرسی جووڵانەوەکە لەگەڵ جەماوەردا سووربوون لەسەر بەرگریکردن و گرتنی بنکەی پۆلیس و داخوازییەکانی حیزبی شیوعی، داوای لە پۆلیسە عەرەبەکان کرد دژی کودەتاچییان بوەستن و هاوکاری جەماوەربن، بەلاٚم پۆلیسەکان تەقەیانکرد پاسەوانی تایبەتی مامۆ بەناوی ئەحمەد جۆلاٚ لەو شەڕەدا دەستی برینداربوو، پێکدادانەکە بە چڕی دەستی پێکرد، پۆلیسێکی عەرەب بەناوی (خلف...) کوژرا، لەگەڵ برینداربوونی کەسێك بەناوی تەها کۆیی ناسراو بە (تەها پینەدۆز) و برینداربوونی پۆلیسێکی تر، بەلاٚم هێزی پۆلیس و حکومەت توانی کۆتایی بە ڕەوشەکە بێنێت و بلاٚوە بە جەماوەر بکەن و لە ماوەیەکی دیاریکراو شکست بە جووڵانەوەکە بێنن[٥٦].

وەکو دیارە ئەو هەوڵە نەزۆکە بەرنامەییێکی تۆکمە و رێکوپێکی بۆ دانەڕێژرابوو، بەڵکو زیاتر کاردانەوەییێکی رەمەکی و تەنگەتاوی پێوە دیاربوو، لە لێدانی بنکەکەش بیٰ بەرنامە تەقەیان کرد و کۆڵیان دا، دوای چەند کاتژمێرێك هێزی پۆلیس و سەربازی هاتنە گەڕەکەکە و بەربوونە گیانی خەڵك و درندانە رەفتاری توندیان بەرانبەر خەڵکەکە نواند و شیوعییەکانیش رایان کرد و خۆیان دەرباز کرد[٥٧].

دوابەدوای پاشەکشەکردنی چەکدارەکان و رێکخستنەکانی حیزبی شیوعی لە سەیداوە، چوونە گوندی موورتکەی گەورە لەویٰ ژمارەیەك چەکدارانی دەشتی هەولێر پەیوەندییان بە پاشماوەی چەکدارەکان کرد، پلانێکی نوێیان دارشت بۆ هێرشبردنە سەر بنکەی پۆلیس و ئاسایشی سەیداوە و پۆلیسی کارەبا و ماڵی بەڕێوەبەری پۆلیس، بۆ ئەو مەبەستە زیاتر لە (٧٠) چەکدار ئەو شەوە هاتنە ناو سەیداوە و بەسەر شوێنی دیاریکراو دابەش بوون، بەشێکیان لە ماڵی مامۆستا ئیسماعیل حەمەدەمین دیبەگەیی بوون بۆ ئەوەی دەست بوەشێنن و پاشەکشە بکەن، ئەو شەوە هاتنەوە سەیداوە تەقەیان لە بنکەی پۆلیس کرد[٥٨].

ئەوەش بووە هۆی پشێوی و ئاڵۆزییەکی زیاتر، چونکە حکومەت بە هێزێکی سەربازی گەورەوە هاتە گەڕەکەکە و پاڵپشت بە تانك و زرێپۆشەوە، هەر لە شەقامی سی مەتری لە گەڕەکی سێتاقان تا چوارڕیانی هۆڵی گەل، بە بلّندگۆ بانگەوازیان کرد و رایانگەیاند: کەس لەماڵی خۆی نێتە دەرەوە، وەکو پەرچەکردارێکیش رۆژی (٩)ی شوبات بەشێوەیەکی هەڕەمەکی تۆپبارانی گەڕەکی سەیداوەیان کرد و خانووی هاوڵاتیان عەلی عەبدولاّ ناسراو بە عەلی شوون هەڵگر و خانووی جەوهەر حەمەد عەلی بەرکەوت[٥٩].

رۆژی (١٠)ی شوباتیش خەڵکێکی زۆر گیران، دوای نیوەڕۆی هەمان رۆژ زۆربەی خەڵکی گەڕەکی سەیداوە بە تایبەتی گەنجان لە شێوەی نیمچە کۆڕەوێك، لە ترسی راوەدوونان و دەستگیرکردن ماڵەکانیان جێهێشت بەرەو باداوە و کەسنەزان و بنەسلاوە رایانکرد، تا حکومەت دوای دوو رۆژ بە بلّندگۆ بانگەوازی گەڕانەوەی خەڵکەکەی کرد ئینجا پەیتا پەیتا خەڵك بۆ سەیداوە دووبارە گەڕانەوە[٦٠].

ڕۆژی کودەتاکــە دەنگــۆی ئــەوە بڵاوبــووەوە لــەناو ســەربازگەی هــەولێر لایەنگرانی عەبدولکەریم قاسم و ڕێکخستنەکانی حیزبی شیوعی خۆپیشاندانیان کــردووە و هــەوڵیان داوە دەســت بەســەر چــەك و جبەخانــەدا بگــرن، هــەروەها پەیوەندی بە لیوای باپشتیان کراوە هێزەکانیان رادەستی حیزبی شیوعی بکەن، هەرچەندە ئەم پلانانە سەرکەوتوو نەبوون بـە گوتـەی نەجمەددین مـامۆ: چـونکە ڕێکخستنەکانی پارتی ئامادە نەبوون ئـەم ئەرکـە لەگـەڵ حیزبـی شـیوعی ئـەنجام بدەن و لە ژێرەوە ڕێککەوتنیان لەگەڵ بەعس هـەبوو، نـەمانتوانی دەست بەسـەر سەربازگەکەدا بگرین، دەنگۆی ئەو هەواڵانە کەمێك جۆش و خـرۆش و ئومێـدی بـە جووڵانەوە جەماوەرییەکە بەخشیبوو[٦١]، بـەڵام زراری سـلێمان بـەگی دەرگەڵـەیی ئەوکاتە خۆی بەرپرسی ڕێکخستنەکانی حیزبی شـیوعی بـوو، لـە بیرەوەرییـەکانی دەڵێت: **"من بەرپرسی قەزای ڕواندز بووم بۆ ئەوەی زوو کۆبوونەوەیەك بکەین بۆ دیاریکردنی ڕێگایەك، بەشداربووانی کۆبوونەوەکە ئەمانە بوون: مامۆستا محەمەد عەلی، مامۆستا ئەحمەد شێخۆ، خەلیل سـوڵتان مێرگەسـۆری، زرار دەرگەڵـەیی. چەند بڕیارێکمان دا لە گرنگترینیان من بەرپرسی سوپا کە ناوی (قادر عەبـدوڵا) بوو ببینم، بۆ ئەوەی پەیوەندی پێوە بکـەم و دەسـت بەسـەر سـوپا دابگـرین".**
بەردەوام دەبێت و دەڵێت:" **دوای هەوڵدانێکی زۆر نـاوبراو ڕۆیشـتبووە هــەولێر و نەماندۆزییەوە، دواتر ڕائید مەهدیمان دیتەوە کـە لێپرسـراوی شـیوعییەکان بـوو ئەوەندەی بڵێـی ترسـنۆك و بێدەسـەڵات بـوو، خـۆم بـۆ ئاشـکرا کـرد کـەوا مـن بەرپرسی قەزام هاتووم هاوکاریم بکـەن ئـەو شـەو دەسـت بەسـەر سـەربازگەکە بگرین، بەڵام ئەو پیاوە ئەوەندەی نەمابوو دڵی لە لێدان بوەستێت و گوتی: دەبێ هەر ئێستا لێرە بڕۆیت و نەمێنی من تۆ ناناسـم، کـە زانـیم چـار نییـە گەڕامـەوە ڕواندز و ئەوەبوو ئەنجامی باوەڕپێکراوی حیزبی شیوعی..."**[٦٢].

لـە نێـوان ئـەو دوو بۆچـوونەدا ئەگـەر بـەراوردێك بکـەین دەبیـنین بۆچـوونی دووەم زیاتر پەسەندە، چونکە لەلایەك لەو باوەڕەدا نین بـەم گەرموگوڕییـە و لـەو ماوە کورتەدا کە کودەتاکەی تێدا ڕووی دا هەموو ئەندام و لایەنگرانی پارتی لەناو ســوپا ئاگــاداری ڕێککــەوتنێکی ژێربــەژێر بــووبن لەگــەڵ بەعســدا و تخــوونی هاوکاریکردنێکی لەم شێوەیە نەکـەون، هەرچـەندە دواتـر برووسـکەی پشـتگیریش

خوێندرایـەوە ئـەوەش هـەر نابێتـە پاسـاو، چـونکە مـەرج نییـە هـەموو لایـەك گوێبیستی رادیۆ بووبن، هاوکات ئەگەر دەنگۆی ئەوەش لە هەولێر بڵاو بووبێتـەوە کەوا پارتی هاوکاری نەکردین بۆ دەستبەسەرداگرتنی سـەربازگەی باپشـتیان هـەر لە سۆنگەی هەواڵی رێککەوتنەکەدا بووە، لەگەڵ ئەوەشدا کەسی دووەم خـۆی لـە رواندز بووە و بەرپرسی رێکخستنەکان بووە، هاوکـات عەبدولسـتار خزەیـریش کـە بەرپرسی یەکەم بوو وەکو ئاماژەمان پێکرد هاتبووە هەولێر.

**٢- جموجۆڵی گەڕەکەکانی تری شاری هەولێر:**

لە گەڕەکـەکانی دیکـەی شـاریش جووڵانـەوەی جـەماوەری حیزبـی شـیوعی هەبوو، بـەرپرس و کـادیرانی حیزبـی شـیوعی بـە گـوێرەی پلانـە داڕێژراوەکـەیان دابەش ببوون، بەڵام ئاست و قەبارەی جموجۆڵەکە جیاواز بوو، گـەڕەکی تـەیراوە بە سەرپـەرشتی عەبدولمەجید عەبدولرەزاق (١٩٣٢-٢٠١١) ناسراو بـە (مـام قـادر) خۆپیشاندان کرا و جموجۆڵ هەبوو، لەناو شاری هەولێریش جەماوەر و هێزەکانی پـۆلیس و سـەرباز رووبـەڕووی یـەکتر بوونـەوە، هـەروەها لـە گـەڕەکی خانـەقاش هــەوڵێك لــە ئــارادا بــوو، بەسەرپـەرشـتی فــەرهاد برایمەفەنـدی دەسـت بەسـەر ئێشکگرخانەکە دابگیرێت، بە هاوکاری لەگەڵ رێکخستنەکاندا، هاوکات لە گەڕەکی تەعجیلیش بە فەرماندەی جەمیل قادر پشێوی سەری هەڵدا، بەڵام ئەوانە هیچـیان سەریان نەگرت و نەگەیشتنە ئاستی شەڕ و تەقە و پێکدادان، چونکە لـە بنەڕەتـدا هەوڵەکانی حیزبی شیوعی لە سەربازگەی هەولێر و دابینکردنی چـەك و تەقەمـەنی سەرکەوتوو نەبوون و کار لە کار ترازابوو[٦٣].

**تەوەری سێیەم: کودەتای ( ٨ی شوبات ) لە لیوای هەولێر و ئە نجامەکەی**

لەسەر ئاستی لیوای هەولێردا ناحیەی عـەنکاوە و قـەزای شـەقڵاوە ئـەو دوو شارۆچکەیە بوون پەرچەکرداری خێرایان لێکەوتەوە و جەماوەر و رێکخسـتنەکانی حیزبی شیوعی رژانە سەر شەقامەکان بەم شێوەیەی خوارەوە:

**١- ناحیەی عەنکاوە:**

لە ناحیەی عەنکاوە رێکخسـتن و جـەماوەری حیزبـی شـیوعی بـە مەبەسـتی بەدەستهێنانی چەك و بەرەنگاربوونەوەی کودەتاکە، کۆمەڵێك لە گەنجانی سەر بە رێکخستنەکانی حیزبـی شـیوعی کریسـتیانی ناحیەکـە، دوای ئـەوەی هاتنـە سـەر

شەقامەکان، پەلاماری بنکەی پۆلیسی عەنکاوەیان دا و چەند پۆلیسێکیان چەك کرد و شەڕ و پێکدادان رووی دا، لەو کاتەدا سوپا هاتە ناو عەنکاوە بە سەرپەرشتی سەرهەنگێکی سەربازی لیوای چوار بە ناوی (عقید خلیل جاسم) و تانك و زرێپۆش بەکارهات و کۆمەڵێك گەنجی شارۆچکەکە دەستگیر کران و کەوتنە پشکنینی ماڵەکان و گەڕان بەدوای چەکدا کۆتایی بە جووڵانەوەکە هات، لەوێش هەوڵەکەیان بێهوودە بوو[٦٤].

جێگەی ئاماژەیە دوای مانگێك لە (٨ی ئازاری ١٩٦٣) سەرهەنگ خەلیل جاسم بە فەرماندەی هێزێکەوە دووبارە دەستی بە تالان و ئەشکەنجەدانی خەڵکی گوندی عەنکاوە کرد[٦٥]. تەنانەت بە تۆمەتی شیوعی بوون هاوڵاتییەکی شارۆچکەی عەنکاوەی دوای ئەشکەنجەدان، بە ناوی ئیسحاق عیسا کوشت[٦٦]. سەرهەنگی ناوبراو بە هێزەکەیەوە لەو ماوەیەدا لە گوندەکانی دەوروپشتی هەولێریش بە پاڵپشتی تانك و زرێپۆشەوە خەڵکی بێتاوانی دارکاری دەکرد[٦٧].

بە گوێرەی دۆکیۆمێنتێکی فەرمی سەبارەت بەوانەی دژایەتی کودەتایان کردووە، لە (١٨/١٢/١٩٦٣) بڕیاری سزادانیان دراوە، دوای ئەوەی لێکۆڵینەوەیان لەگەڵ کراوە، تۆمەتبار کراون هەریەك لە: (یوسف بهنام شیشة، ئیلیا شمعون، عیسا یونس، مرقص بطرس، حنا یونس عیسا، جبار عزو، حبیب عزو مرقص، بویا سیو، حبیب اسحاق حنا، انیس هرمز، عودیش شابو، حبیب یوسف توما، شابو عودة شمعون، جورج هرمز، حنا یوسف الیشوع، سیدا هرمز سیدا، کورکیس بطرس، هرمز مرقص، حبیب کوکا حنا، حنا کوکا و فرنسیس یلدا فرنسیس، توما شعیا و بولص بطرس) بوون. لەپوختەی کێشەکەدا هاتووە: **"ئەو تاوانبارانەی ناویان هاتووە دژی شۆڕشی چواردەی رەمەزانی پیرۆز خۆپیشاندانیان کردووە، دەستیان بەسەر چەکەکانی هەندێك لە پۆلیسەکانی ناوخۆی گوندی عەنکاوەدا داگرتووە"**[٦٨].

لەگەڵ ئەوەی توێژەرێك ئاماژە بە ڕۆڵی ئەرێنی پیاوە ئاینییەکان دەکات بۆ هێوربوونەوەی رەوشەکە و ئەوانەی چەکیان هەیە رادەستی سەربازان بکەن و لە بەرانبەردا گیانیان پارێزراو بێت[٦٩]، بەڵام لە چەند دیدارێکدا، هەروەها بەپێی بەڵگەنامەکە ئاماژە بەو کەسانە کراوە شایەتییان لەسەر بەشداربووی

خۆپیشاندەران داوە و پاڵپشتی کودەتاکە بوون، لە نێویاندا پیاوێکی ئایینی بە ناوی رفائیل بنیامین هەیە[٧٠]. بەڵام نێوبراو لە یادداشتەکانی خۆیدا بەم شێوەیە باسی رووداوەکە دەکات:" **لە شارۆچکەی عەنکاوە بەداخەوە شیوعیەت تێیدا بەربڵاو بوو، بۆیە هەندێ لە گەنجان رێزی فەرمانەکانی حکومەتیان نەگرت بەشێکیان بەسەر پۆلیسەکانیان دادا، لەکاتێکدا ئەوان ئەرکەکانی خۆیان جێبەجێ دەکرد بۆ قەدەغەکردنی هاتوچۆ لە کاتژمێر ١٠ی بەیانییەوە تا کاتێکی نادیار، کێشەکە بەم جۆرە لە عەنکاوە سەری هەڵدا و موتەسەریفی هەولێر بەدرەدین عەلی هەڵسا بەناردنی هێزێکی زۆری پۆلیس و تانك بۆ گەمارۆدانی عەنکاوە و دەستگیرکردنی گەنجەکان، هێزەکە هاتە ناو عەنکاوە و دەستی کرد بەگەڕان و پشکنینی گەڕەکەکان و خانووەکان و زیاتر لە (٥٠٠) کەسیان بردە بنکەی پۆلیس و تا کاتژمێر (٩)ی شەو بانگهێشتی بنکەکە کرام بە هاوکاری ئەفسەری قەزا و بەڕێوەبەری ناحیەکە بۆ چارەسەری کێشەکە، چەند جارێك پەیوەندیمان بە موتەسەریفی هەولێر کرد و کێشەکەمان چارە کرد**"[٧١].

دەکرێت بەراوردێك بکرێت لەنێو بەڵگەنامە فەرمییەکەی حکومەت و یادداشتی کەسایەتیی نێوبراودا بکەین، دیارە گۆشەنیگا و دیدگای پیاوێکی ئاینی شارۆچکەکە زەحمەتە لەگەڵ بیروباوەڕ و ئایدیۆلۆجیای شیوعییەکان یەکبگرێتەوە و ناکۆکە لەگەڵ بیروباوەڕی ئاینییان، ئاساییە لەو قۆناغەدا دژایەتی حیزبی شیوعی کردووە، یاخود لەوانەیە لە رژێمی پێشوو لەبەر هەر هۆکارێك زەرەرمەند بووبێ، لەوانەشە هەوڵی نێوبراو لە پێناو پاراستنی گیانی دانیشتوانی ناحیەکە بووبێ چونکە نێوبراو وەکو لە خوێندنەوەی یادداشتەکانی دەردەکەوێ جگە لە رۆڵی ئاینی کەسێکە پێگەیەکی کۆمەڵایەتیشی هەبووە و خزمەتی شارۆچکەکەی کردووە.

لە بەڵگەنامەیێکی تردا بڕیاری حوکم بۆ بەشداربووان دەرچووە، لە بڕگەکانی بڕیارەکە ماوەی حوکمی پازدە ساڵ بۆ هەردوو راکردوو بە ناوەکانی بولس بطرس و توما شعیا دەرکراوە ، هەروەها یوسف بهنام و ئیلیا شمعون ماوەی پێنج ساڵ حوکمیان بۆ دەرچووە، تۆمەتبارانی تریش هەریەك لە حنا یونس عیسا، انیس هرمز، حبیب یوسف توما، شابو عودە شمعون، حنا یوسف یشوع، سەیدە هرمز،

گورگیس بطرس و حنا کوکا ماوەی دوو ساڵیان بۆ درا، و هەندێکیشیان ساڵێك و دوو لەوانەش بڕیاری ئازادکردنیان دراوە[٧٢].

**٢- قەزای شەقڵاوە:**

**هاوکات لە شارۆچکەی شەقڵاوەی سەر بە لیوای هەولێریش هەڵوێستی** دژایەتیکردنی کودەتا لە لایەن جەماوەر و ڕێکخستنەکانی حیزبی شیوعی لە ئارادا بوو، ئەو ڕۆژە ڕێکخستنەکانی حیزبی شیوعی بە بەشداری هەندێك لە جەماوەری شارەکە ڕژانە سەر شەقامەکان و کەوتنەخۆ بۆ ئەوەی پەلاماری سەربازگە بدەن، بە گوێرەی بەڵگەنامەیەکی فەرمی دادگای عورفی چوارەمی سەربازی بڕیاری سزادان دەرچووە بۆ ئەوانەی تۆمەتی ئەوەیان دراوەتە پاڵ بەشداری خۆپیشاندانیان لە دژی کودەتای (٨ی شوبات) کردووە، لەپوختەی کێشەکەدا هاتووە: **"ئەوانە خۆپیشاندانیان دژی شۆڕشی چواردەی ڕەمەزان کردووە، هێرشیان کردۆتە سەر سەربازگەی سوپای شەقڵاوە بەمەبەستی بەدەستهێنانی چەك و ئەو تۆمەتبارانەش ڕوخساری دیاری حیزبی شیوعین لە شەقڵاوە"**[٧٣].

ئەوانەی سزادران و بەشدارییان لەو خۆپیشاندان و پەلاماردانە کردبوو هەریەك لە: (عەبدولرەحمان حەسەن سەلمان، محەمەدەمین مەلا ئەحمەد حاجی برایم، عەبدولا قادر دەروێش، بابکە قەشە حەنا یوسف، عوسمان حاجی حەسەن سلێمان، جەمیل حوسێن سلێمان، محەمەد میرزا قادر، شمعون توما حنا و شمعون عودە صلیوە) بوون[٧٤].

وەکو لەناوەکاندا دەردەکەوێت لە قەزای شەقڵاوەدا کریستیانەکانی ئەوێش بەشدارییان کردووە لە پەرچەکردارەکەدا، چونکە بێترمە گەڕەکێکی کریستیان نشینە لە قەزاکەدا و وەکو زۆربەی ناوچەکانی باشووری کوردستان حیزبی شیوعی لە نێو مەسیحییەکاندا هەژمونێکی بەهێزیان هەبوو. ئەو بەشداربووانەش زۆربەیان بەرپرس و کادیر و ئەندامان و هەوادارانی حیزبی شیوعی بوون، لە گەڵ ئەوەشدا لە نێو خۆنیشاندەراندا لە هەموو شوێنەکاندا لایەنگرانی پارتیش بە ڕێژەیەکی کەم هەبوون و پێیان وابوو ئاسۆی هاتنە دەسەڵاتی بەعس ڕوون نییە[٧٥].

**٣- کاردانەوە و چارەنووسی شیوعییەکان لە لیوای هەولێر:**

جموجۆڵی حیزبی شیوعی لە لیوای هەولێر لە بەرانبەر کودەتاکە

کاردانەوەی هەبوو، لەپاڵ هەوڵەکانی بەغدا و بەسرا[٧٦]دا، لە لیوای هەولێریش ئەندام و لایەنگران و بەشێك لە جەماوەریش وەکو پەرچەکردارێك بەرانبەر کودەتاچییان وەستانەوە، بەڵام کاتی ئەوەیان نەبوو پلانێکی تۆکمە دارێژن، چونکە جووڵانەوەکە سەرکەوتنی بەدەست نەهێنا، بەڵکو دەسەڵات رێکارییە پەلەکانی خۆی بە شێوەیەکی دڕندانەتر بەرانبەر شیوعییەکان لەتەواوی عێراقدا بەکارهێنا و زیان و شکستی زۆرتری پێگەیاندن، کودەتاچییان وریایانە توانییان دەسەڵاتی خۆیان بە شێوەیەکی رێکخراو و بەرنامە بۆدارێژراو پیادە بکەن، دام و دەزگاکانی ئاسایش و سوپا و پۆلیس و کارگێڕیی ناوخۆ هاتنە نێوبازنەی دەسەڵاتی نوێ و هەموو شێوازێکیان بەکارهێنا و هەر زوو زاڵدەستیی خۆیان بەسەر جومگەکانی دەسەڵاتی ناوخۆ و شارەکان سەپاند و دەستیان نەپاراست. رۆژی (٨ی شوبات) بەرگری شیوعییەکان و نەیارانی سیاسیی بەعس و لایەنگرانی قاسم نەگەیشتنە ئامانج و بێ ئەنجام مایەوە.

بەرپرسانی بالای حیزبی شیوعی دەرکیان بەم راستییە کردبوو، کەریم ئەحمەد ئەو رۆژە لە کەرکووك هاتەوە هەولێر، لەگەڵ لێژنەی ناوخۆی هەولێر کۆبوونەوەی کرد و داوای لێکردن بۆ ئەوەی تووشی زیانی زیاتر نەبن پێویستە پاشەکشە بکەن و روو لە گوندەکانی دەوروبەری هەولێر بکەن، بۆ ئەو مەبەستەش گوندی موورتکەی گەورە، قەرەچناغە و سابلاغۆك وەك شوێنی دەستنیشانکراو بۆ گردبوونەوەی پاشماوەی هێزی چەکداری و لایەنگر و رێکخستنەکانی حیزبی شیوعی و خۆرێکخستنەوە دەستنیشان کرا[٧٧].

دیارە داخوازی جێهێشتنی شار و پاشەکشە پێکردنی هێزەکان بڕیارێکی هەڕەمەکی نەبوو، بەڵکو زادەی هەڵسەنگاندنێکی واقیعبینانە بوو، چونکە لە لایەك هیچ رێگاچارەیەکیان لەبەردەم بەرگریکردن نەمابوو وەکو دەرکەوت کار لەکار ترازابوو، لە لایەکی تریش جموجۆڵی چەکداری بەرانبەر دەسەڵاتی نوێ خۆبەهەدەردان و زیانی زیاتریان پێدەگەیشت.

ئیتر ئەم سێ گوندە بووە شوێنی کۆبوونەوەی پاشماوەی چەکداران و لایەنگرانی حیزبی شیوعی و ئەوانەی مەترسییان لەسەر بوو، رێکخراوەکانی ناو شاری هەولێر و عەنکاوە و دەشتی هەولێر خۆیان گەیاندە ناوچەکە، کەریم

ئەحمەد لە گوندی مووورتکەی گەورە کۆبوونەوەی پێکردن و جەختی لەسەر پێکهێنانی بەرەیەکی نیشتمانی دژی کودەتاچییان کردەوە و هەڵوێستی حیزبی شیوعی دژی کودەتاچییان دووپات کردەوە[٧٨].

دوا هەوڵی بەرگریکردن و دەستوەشاندنی رێکخراوە چەکدارییەکانی حیزبی شیوعی لە هەولێر شەوی (١٠ لەسەر ١١)ی شوبات بوو، هێزێکی (٦٥) چەکداری پێکهێنرا لە شێوەی تیپی پارتیزانیی بچووك هاتنە سەیداوە و چالاکییەکە دابەشکرا بۆ هەریەك لە محەمەد میرخان بۆ لێدانی مەخفەری سەیداوە، نەجمەددین مامۆ بۆ بنکە پاسەوانەکانی ماڵی بەرێوەبەری پۆلیسی پارێزگا و تۆفیق ئەحمەد (هەژار) بۆ بنکەی پۆلیسی ئازادی دانران، کاتژمێر (١٠)ی شەو تا (٣و نیو)ی بەیانی شەڕ و پەلامارەکان روویان دا و هێزێکی زۆری حکومەت بە پاڵپشتی تانك و زرێپۆش هاتنە گەڕەکەکانی رووناکی و ئیسکان و سەیداوە و پاشەکشەیان بە چەکدارە شیوعییەکان کرد و گەڕانەوە گوندی مووورتکەی گەورە[٧٩]. دوای ماوەیەك هێزێکی گەورەی حکومەت ئابڵووقەی گوندی مووورتکەی گەورەیان دا، بۆ گرتن و لێدانی سەرکردایەتی و ئەندامانی حیزبی شیوعی، بەڵام هەوڵەکەیان بێهوودە بوو، پاشەکشەیان کردبوو و ناوچەکەیان چۆڵ کردبوو[٨٠].

کاریگەری ئەو زەبرەی دوای (٨ی شوباتی ١٩٦٣) بەر حیزبی شیوعی کەوت رێکخستنەکانیان لە تەواوی عێراقدا لێکترازا، تەنها لێژنەی لقی کوردی مایەوە وەکو رێکخراوێکی یەدەگی لێژنەی ناوەندی حیزب دەستی بەکارەکانی کردەوە، کە پێکهاتبوو لە هەردوو کەسایەتی هەولێر (عەزیز محەمەد) سکرتێری لێژنەی لقەکە بوو، (کەریم ئەحمەد داود)یش، ئەندامی لێژنەی لقەکە و سەرپەرشتیاری رێکخستنەکانی هەولێر و کەرکوك بوو، بەرپرسی لێژنەی ناوخۆی موسڵیش لە ژێر سەرپەرشتی لقی کوردی بوو[٨١]. لەپاڵ ئەوانەشدا کەسایەتییەکانی تری لیوای هەولێر هەبوون هەریەك لە یوسف حەنا و ئەحمەد مەحموود و تۆفیق ئەحمەد و فاتیح رەسول و عادل سەلیم و ئەحمەد غەفوور بوون ئەو سێیانەی دوایی لە کەرکوك گیرابوون کاتێ کودەتاکە رووی دا[٨٢].

دوای ئەو نسکۆیە گەورەی بەسەر حیزبی شیوعیدا هات لە تەواوی عێراقدا، نووسینگەی رێکخراوی هەرێم (لقی کوردی) لەژێر رۆشنایی سیاسەتی حیزب بۆ

داهاتوو، لـە پاشمـاوەی هێزەکـانی کـە هاتبوونـە ناوچـە رزگارکراوەکـان چـەندین بنکەی چەکداری کـردەوە، لـە شـوێنی جیاجیـای کوردسـتان و لەناوچـەکانی ژێـر قەڵەمڕەوی شۆڕشی کورددا لە گوندەکانی (ئـاوەگرد و دەرگەڵـە و کلکـەسماق)دا، هەروەها دووبارە رێکخستنەکانیان لە ناو هەولێر و شارەکانی تـر بونیـات نایـەوە، چونکە رایەڵ و شیرازەی رێکخسـتنەکانی حیـزب پچـڕابوو، هەوڵیانـدا هەماهـەنگی لەگەڵ پارتی دیموکراتی کوردستاندا بکەن[٨٣].

شـیوعییەکان ئـەوەی بەسـەریان هـات لەگـەڵ هـەموو ئـەو پێشـبینی و پێشـهاتانەی بەرپرسـانیان باسـیان لێـوە کـردووە، بـەڵام بەهەنـد وەرنـەگرتنی ئەگەرەکان و بێئاگایانە خۆیان بەخوانی لەدەستچووی قاسم گیر کردبوو، هەروەها بـەهۆی هەڵنەسـەنگاندنی بابەتییانـەی پێشـهاتەکان بـاجی هـەرە گـەورەی رێکخراوەیـی و مرۆیـی و سیاسـییان دا، هـەزاران ئەنـدام و دەیـان کـادیری سەرکردەیان کوژرا و زیندانی کرا، پاشماوەکانیشیان پەنایان بردە بەر ئەو هێزەی لەگەڵیان ناکۆك و ناتەبا بوون[٨٤].

کادیرێکی پێشکەوتووی حیزبی شیوعیی سنووری لیوای هەولێر ئاماژە بـەوە دەکات حیزب نەخشەیێکی نەکێشابوو، لە رێبـاز و سـتراتیژیدا نـەبوو، لـە کاتێکـدا کودەتایەك روویدات و رووبکەنە ناوچە ئازادکراوەکانی کوردستان[٨٥].

**٤- هەڵوێستی پارتی دیموکراتی کوردستان بەرانبەر نسکۆی شیوعییەکان:**

جێگای ئاماژەیە بۆ ئەو هەماهەنگییە بەرانبـەر شـیوعییەکان کۆدەنگییـەك لە ناو هەڵوێستی پارتیدا نەبوو، بـۆ پـەنا و داڵـدەدانی شـیوعییەکان یـان لێـدان و دەسـتگیر و دەستبەسـەرکردنیان، مەکتـەبی سیاسـیی پـارتی لـە (١٣ی شـوباتی ١٩٦٣) برووسکەیەکیان بـۆ بنکـە و بارەگاکـانی پێشـمەرگە نـارد، تێیـدا هـاتبوو: **"جگە لە پێشمەرگەکانی (لەشکری شۆڕشگێڕی کوردستان) نابێـت هـیچ دەسـتە یـان کەسـێك چـەك هـەڵبگرێت وە یـا بـە چـەکەوە بسـووڕێتەوە بـە بـێ ئیزنـی سەرکردەی پێشمەرگە"**[٨٦]، هاوکـات لـە شـێوەی بەیاننامەیـەك نامەیـەکیان بـۆ بـارزانی نـاردبوو لـە خـاڵی حەوتەمـدا هـاتبوو: " **لێدانی شـیوعییەکان لـە لایـەن حکومەتەوە مەوقفی دەرەوە و ناوەوەی ئێمە بەهێزتر دەکات ئەگەر چی ئێمە لەو رەئیەشدا نین کە هیچ هاوکارییەکی خەباتیان لەگەڵ بکەین بە پێچەوانەی ئـەوە**

**کەڵك لەو هەلە وەرگرتنمان لاپەسەندە بۆ ئەوەی بە یەکجارەکی ریسوا و رووڕەشیان بکەین لەبەرچاوی میللەتەکەمان"**(٨٧).

وەکو دیارە لەگەڵ ئەو رەوشە ترسناکەی حیزبی شیوعی دووچاری هاتبۆوە، مەکتەبی سیاسیی پارتی هەڵوێستێکی توندیان بەرانبەر نواندن، بە جۆرێك لە زۆربەی ناوچەکانی کوردستان بە تایبەتی لە سنووری ناوچەی گەرمیان و دەربەندیخان و سنووری لیوای سلێمانی هەڵەبجە و قەرەداغ بەتوندی کەوتنە پیادەکردنی رێنماییەکان و ئازاردان و چەککردن و دەستگیرکردن و تەنانەت حاڵەتی کوژرانیشی لێکەوتەوە، چونکە رایان وابوو ئەوانە دژی شۆڕشی کوردن و لە کاتی شۆڕشی ئەیلولدا، چەکیان بۆ قاسم هەڵگرتبوو، هەروەها پارتییان بە ناو و ناتۆرەی بە کرێگیراو و نۆکەری ئیمپریالیزم ناوزەند کردبوو، بەلاّم لە سنووری ناوچەی بادینان و لیوای هەولێر رەوشەکە ئارامتر بوو(٨٨).

هەرچەندە لە سنووری لیوای هەولێریش هەندێ بارگرژی لێکەوتەوە، بەلاّم نەگەیشتە ئاستی ئەوەی قوربانی لێ بکەوێتەوە، بە تایبەت لێژنەی ناوچەی شارۆچکەی کۆیە مەفرەزەیێکی پێشمەرگەی پارتی بۆ گوندی داربەسەر رەوانە کرد و (٢٣) ئەندام و کادیری حیزبی شیوعییان دەستگیرکرد لە نێوانیاندا دوو کادیری هەولێری حیزبی شیوعی هەریەك لە: عەلی مەولوود و حوسێن مەیاس بوون، بەلاّم زۆری نەبرد لە ماوەیێکی خێرادا بە فەرمانی بارزانی ئازاد کران(٨٩).

لە تەواوی ناوچەکانی تری لیوای هەولێر لە سەفین و دەرگەڵە و رواندز پێشوازییان لێکراو شوێنی حەوانەوەیان بۆ دابینکرا، بە پێچەوانەی سنووری ناوچەی گەرمیان و سلێمانی(٩٠).

موحسین دزەیی دەڵێت: **"ئەوانەی گەیشتنە ناوچەکانی ژێر کۆنترۆڵی مەکتەبی سیاسی، دووچاری راوەدوونان و دەستگیرکردن و بەندیخانە هاتنەوە، یەکێك لە هۆڵەکانی بەندیخانەی ماوەتم بینی بە شیوعییەکان تەنرابوو"**(٩١).

بە گشتی لە ناوچەکانی هەژموونی مەکتەبی سیاسیی پارتی رێگە بە شیوعییەکان نەدرا ئازاد بن و لە زۆر شوێن لە چەك داماڵران، ژمارەیەکیشیان لێ کوشتن، بە پێچەوانەوە لە ناوچەی قەڵەمڕەوی رێبەر و سەرکردەی شۆڕش بارزانی شوێنی گردبوونەوە و بارەگایان بۆ کرایەوە (٩٢).

بارزانی پێی وابوو پێویستە ئەو هێزە ببێتە پاڵپشتی شۆڕشی کورد و سوودیان لێ وەربگیرێ، هەروەکو لە برووسکەیەکی بارزانیدا دەردەکەوێت ئاراستەی هێزەکانی پێشمەرگەی کردووە، تێیدا هاتووە: **"رێز لەو شیوعییانە بگرن بەرەو ناوچە ئازادکراوەکانی کوردستان دێن، بنکەو بارەگایان بۆ بکەنەوە، پێداویستییەکانیان دابین بکەن و بەچاوی پێشمەرگە سەیریان بکەن"**[٩٣].

جێگای ئاماژەیە برووسکە و بانگەوازەکەی بارزانی زیاتر لە ناوچەکانی بادینان و هەولێر و کۆیە و رانیە جێبەجێکرا[٩٤]. وەکو دیارە هەڵوێستی بارزانی زیاتر هەستکردن بوو بە بەرپرسیارێتی مێژوویی قۆناغەکە و واقیعبینانە بوو. لە دواییشدا دەرکەوت هێزەکانی حیزبی شیوعی لە شۆڕشی کورددا بەشدارییان کرد و سوودیان لێ وەرگیرا، هەرچەندە بارزانی دەیزانی ئەو هەڵوێستە بەعسییەکان توورە دەکات، بەڵام لە بنەڕەتدا بڕوای بە دانوستانەکە نەبوو، بەڵگەی ئەوەش هەڤاڵانی خۆی ئاگادار کردبۆوە جەنگی بەعسییەکان شەڕێکە دەبێت بیکەین و لێی دەرباز نابین، چونکە هەمیشە ناڕەزاییان بەرانبەر داڵدەدانی شیوعییەکان دەردەبڕی و داوای رادەستکردنیان دەکرد[٩٥].

بەم جۆرە شیوعییەکان هاتنە بەرەی دژی دەسەلأتدارانی بەغدا و بوونە هێزێك پشتیوانی شۆڕشی کوردیان کرد و بوونە بەشێك لە رەوتی بزووتنەوەی رزگاریخوازی نیشتمانی، ئیتر لە ناوچە ئازادکراوەکاندا بنکە و بارەگاکانیان کردەوە و بەشدارییان لە شەڕ و پێکدادانەکانی دژ بە رژێمەکانی بەغدا کرد تا رێککەوتننامەی (١١ی ئازاری ١٩٧٠) باشووری کوردستان شوێنی بڕیار و چالاکییەکانیان بوو.

## ئەنجام

لە شاری هەولێر و یەکە کارگێڕییەکانی سەر بە شارەکە هەڵوێستی شارەکە جیا بووە، بەڵام هەڵوێستێکی یەکلاکەرەوە نەبووە، لە رووی جەماوەرییەوە جۆرێك لە تێڕوانین و هەڵوێستی جیاواز هەبوو، زۆرینەی خەڵکی شارەکە بە هاتنی دەسەڵاتی بەعس خۆشبین نەبوون، تەنها ئەوانە نەبن لە سەردەمی پێشوو زەرەرمەند ببوون.

- حیزبی شیوعی گورزێکی کوشندەی بەرکەوت و رێکخستنەکانی پەرتەوازە بوون و شیرازەی رێکخراوەکە پچڕا، پارتی دیموکراتی کوردستان تا ئەو ساتە لە دژی حکومەتی قاسم لە جەنگدا بوو، هاوکات لە پەیوەندییێکی پێشوەختەدا بوو لەگەڵ سەرانی حیزبی بەعس بەر لە روودانی کودەتاکە، بۆیە رەنگدانەوەی ئەو رەوشە لەسەر هەڵوێستی جەماوەریش هەبوو.

- هەولێر تەنها شارێکی باشووری کوردستان بوو، پەرچەکرداری حیزبی شیوعی لە رۆژی کودەتاکە، لە دژی رووخان و لەناوچوونی دەسەڵاتی قاسم ئەنجام دا، لە تەواوی عێراقدا تەنها لە بەغدای پایتەخت و بەسرادا جموجۆڵ و کاردانەوەی حیزبی شیوعی هەبوو.

- لەناوەوەی شارەکە، گەڕەکی سەیداوە زۆرترین گردبوونەوە و بەریەککەوتنی تێدا رووی دا هەرچەندە بە زەبری هێز دامرکێنرایەوە، لەسەر ئاستی لیواکەشدا ناحیەی عەنکاوە و قەزای شەقڵاوە ئەو دوو شارۆچکەیە بوون کە هەوڵی بەرەنگاربوونەوەیان دا.

- شیوعییەکان دوای ئەو شکستە گەورەیە توانییان لە ناوچەکانی سەربە لیوای هەولێر خۆیان کۆبکەنەوە و سەرلەنوێ رێکخستنەکانیان رێکبخەنەوە، بڕیاری بارزانی بۆ حەوانەوە و داڵدەدانی شیوعییەکان کاریگەری ئەرێنی هەبوو لەسەر خۆڕێکخستنەوەی کادیر و سەرکردایەتی حیزبەکە و پەیوەندیکردن بە ئەندامانی تر لە تەواوی عێراقدا.

## سەرچاوە و پەراوێزەکان:

[١] م.س.لازاريف وآخرون، تاريخ كوردستان، ت.د. عبدى حاجى، اربيل، ٢٠٠٦، ص٢٧٧.

[٢] بۆ زانیاریی زیاتر دەربارەی رۆڵی هەولێر لە هەڵگیرسانی شۆڕشی ئەیلوول و بەردەوامبوونی، بڕوانە: شوان محەمەدئەمین تەها خۆشناو، هەولێر لە نێوان ساڵانی ١٩٥٨–١٩٦٣، چاپخانەی رۆژهەڵات، هەولێر، ٢٠١٢، ل ل ٢٥٥–٢٧٦.

[٣] ادمون غريب، الحركة القومية الكردية، دار النهار للنشر، بيروت، ١٩٧٣، ص٦٦.

[٤] بۆ زانیاریی زیاتر بڕوانە: كاوس قفطان، الحركة القومية التحررية الكردية في كردستان العراق ١٩٥٨–١٩٦٤، وزارة الثقافة، سليمانية، ٢٠٠٤، ص ص ١٧٧–١٩٠.

[٥] دەربارەی هەڵوێستی لقی کوردستانی حیزبی شیوعی و هەولێرییەکان بەرانبەر شۆڕشی ئەیلوول، بڕوانە: :شوان محەمەدئەمین خۆشناو، س.پ، ل ل٢٩٥–٣٠٧.

[٦] محاضرة جلال الطالبانى بعنوان: الاشتراكية والقضية القومية والمسالة الكردية في العراق، القيت في ندوة "الاشتراكية في الوطن العربى"بتاريخ ٢٢ ايار١٩٦٧، للمزيد راجع: كتابات في المسالة الكردية، ج.٢، مطبعة ژين، سليمانية، ٢٠٠٨، ص١٧١.

[٧] نێوبراو ئەفسەرێکی کورد بوو، خەڵکی شاری سلێمانی بوو.

[٨] تاهیر یەحیا ساڵی (١٩١٤) لەبەغدا لەدایك بووە، عەرەبی سونییە، بنەچەی خەڵکی تکریتە، لە ( ١٩٥٦–١٩٥٨) بووەتە ئەندامی لێژنەی باڵای ئەفسەرە ئازادیخوازەکان، دوای کودەتای ٨ی شوبات بووەتە سەرۆکی ئەرکانی سوپا (سوپاسالار) ، لەماوەی ساڵانی (١٩٦٣–١٩٦٨) چەند جارێك پۆستی سەرۆك وەزیرانی وەرگرتووە.بڕوانە: حنا بطاطو،......،ص ٣٢٣ ومابعدها.

[٩] هانى الفكيكي، اوكار الهزيمة–تجربتي في حزب البعث العراقي، ط٢، بيروت، ١٩٩٧، ص٢٩٤؛ سۆزان کەریم مستەفا، بەعسیزم و کورد١٩٤٧–١٩٧٥، سلێمانی، ٢٠٠٧،ل١٤٧.

[١٠] مەسعود بارزانی، بارزانی و بزووتنەوەی رزگاریخوازی کورد١٩٦١–١٩٧٥، بەرگی سێیەم، بەشی یەکەم، هەولێر، ٢٠٠٤، ل١٠٤.

[١١] سعد ناجي جواد، العراق والمسألة الكردية ١٩٥٨–١٩٧٠، لندن، ١٩٩٠، ص٧٦.

[١٢] كاوس قفطان، م.س، ص٢١٣–٢١٤؛ دانا ادمز شمدت، رحلة الى رجال شجعان في كوردستان، ترجمة وتعليق: جرجيس فتح الله، ط٢، اربيل، ١٩٩٩، ص٣٥٧؛ مەسعود بارزانی، س.پ، ل١٠٤.

[١٣] ساڵح عەبدوڵا یوسفی ساڵی (١٩١٧) لە دایك بووە، خوێندنی کۆلیژی زانستەکانی (شەریعە)ی ساڵی(١٩٤٢–١٩٤٣) تەواو کردووە، ساڵی (١٩٤١) پەیوەندی بە حیزبی هیوا

کردووە، بەرپرسی لقی موسڵ بووە، پاشان بووەتە ئەندامی حیزبی رزگاری و دوایش ساڵی (١٩٤٦) بووەتە ئەندامی پارتی دیموکراتی کوردستان، چەندین پلە و پۆستی حیزبی و حکومی وەرگرتووە ، لە شۆڕشی ئەیلوول (١٩٦١–١٩٧٥)دا ئەندامێکی چالاك بووە، دواتر حیزبی سۆسیالیستی کوردستانی دامەزراندووە، ساڵی (١٩٨١) بە دەستی بەعسییەکان لە بەغدا تیرۆر کرا، بۆ ژیان و رۆڵی سیاسی بڕوانە: عبدالسلام علي، صفحات من نضال الشهيد صالح اليوسفي، (د.م) ، (١٩٩٢).

(١٤) عەلی سالح سەعدی ساڵی ١٩٢٨ لەبەغدا لەدایك بووە، لە بنەڕەتدا کوردێکی فەیلییە، دەرچووی کۆلێژی بازرگانییە، ئەندامی پارتی سەربەخۆیی بووە، پاشان بۆتە ئەندام لە حیزبی بەعس، چەندین پۆستی حیزبی وەرگرتووە، لەوانە: ئەندامی سەرکردایەتی نەتەوەیی حیزب، ئەمینداری گشتی هەرێمی عێراقی حیزبی بەعس تا ئەیلوولی (١٩٦٣) ، پاشان بۆتە جێگری سەرۆك وەزیران و وەزیری ناوخۆ و وەزیری ئیرشاد لە حکومەتی بەعس کە دوای کودەتای (٨ی شوبات) پێکهات، بڕوانە: حنا بطاطو، العراق–الشيوعيون والبعثيون والضباط الاحرار (الكتاب الثالث)، ت: عفيف الرزاز، ايران، ٢٠٠٦، ص ص ٣٢٠، ٣٨٤.

(١٥) مەسعود بارزانی، س.پ ، ل١٠٣؛ علي سنجاري، القضية الكوردية وحزب البعث العربي الاشتراكي في العراق، دهوك، ٢٠٠٦، ص٢٦.

(١٦) دانا ادمز شمدت، م.س، ص ٣٥٨.

(١٧) محاضرة جلال الطالباني، م.س، ص١٧١.

(١٨) أمين سامي الغمراوي، الاكراد في شمال العراق، دار النهضة العربية، القاهرة، ١٩٦٧، ص٢٧١.

(١٩) لازاريف، م.س، ص٢٨٥.

(٢٠) اربيل في اربعة اعوام ١٩٦٤–١٩٦٧، بحوث عن الانجازات والمشاريع الحكومية التى تمت او تحت الانشاء في اربيل، جمعها ونظمها جماعة من شباب اربيل، ص ٢٦–٢٧.

(٢١) دیدار لەگەڵ هەریەك لە : کەریم ئەحمەد ( ٢٥/ ١/ ٢٠٠٩) لە هەولێر. نێوبراو ساڵی (١٩٢٢) لە هەولێر لە دایك بووە، خوێندنی سەرەتایی و ئامادەیی لە هەولێر تەواو کردووە، ساڵی (١٩٤٤) ئەندامێتی حیزبی شیوعی عێراقی پێ بەخشراوە، ساڵی (١٩٥٣) گەیشتۆتە پلەی سکرتێری حیزبی نێوبراو، زیاتر لە جارێك گیراوە، لەکاتی رابوونی شۆڕش دەستبەسەر بووە، لەساڵی (١٩٦٢) ئەندامی مەکتەبی سیاسی حیزب بووە تا ساڵی (١٩٩٢) ، یەکێکە لە دامەزرێنەرانی حیزبی شیوعی کوردستان، ئێستا لە شارۆچکەی کۆیە نیشتەجێیە.؛ نەجمەددین مامۆ هەریری (٢٠١٢/١٢/٤) لە هەولێر. نێوبراو ساڵی (١٩٢٧) لە دایك بووە، تا شەشی سەرەتایی خوێندووە، بایەخی بە نووسینی سیاسی لە رۆژنامەکانی حیزبی شیوعی

داوە، ساڵی (١٩٥٥) چـوویتە ریـزی حیزبـی شـیوعی عێرقـی، لـەدوای شۆڕشـی (١٤ی تەمووزی ١٩٥٨) چەندین بەرپرسیارێتی حیزبی وەرگرتووە و دوای کودەتـای (٨ی شـوبات ١٩٦٣) بەرپرسـی جووڵانـەوەی جـەماوەری بـووە لەشـاری هـەولێر دژی کودەتاکـە، سـاڵی (١٩٦٨) لە لایـەن حیزبـەوە بۆمـاوەی (٨) مـانگ نێردراوەتـە یـەکێتی سـۆڤیەت بـۆ خـولی کـادیران و زانسـتە کۆمەڵایەتییـەکان، جـاری دووەمـیش سـاڵی (١٩٨٠- ١٩٨٣) دووبـارە نێردراوەتـە بولگاریـا بـۆ خـولێکی تـری ئـەکادیمیای زانسـتە کۆمەڵایەتییـەکان، ئێسـتاش لەریزی حیزبی شیوعی کوردستاندایە و لە هەولێر دەژیت.

[٢٢] هادی چاوشلی ساڵی (١٩٢٠) لە شاری هەولێر لە دایك بووە، خوێندنی ناوەندی لە هـەولێر و ساڵی (١٩٤٣) کۆلێژی مافی لە بەغدا تەواو کردووە، سـاڵی (١٩٤٥) کـراوە بـە بەڕێوەبـەری ناحیـەی بازیـان و خورمـاڵ و پێنجـوێن و قـەرەداغ و بەرزنجـە لـە لیـوای سـلێمانی، سـاڵی (١٩٥٤) کـراوە بـە قایمقـامی قـەڵادزێ، دوای شۆڕشـی (١٤ی تـەمووزی ١٩٥٨) کـراوە بـە سـەرۆکی شـارەوانی هـەولێر، پاشـان کـراوە بـە پارێزگـاری سـلێمانی دواتـر گوێزراوەتـە وەزارەتی ناوخۆی عێراق و تاوەکو بووەتە بریکاری وەزارەتـی نـاوخۆ و لـە کودەتـای (٨ی شـوباتی ١٩٦٣) گـیراوە و لـە (١٩٦٤) ئـازاد کـراوە، سـاڵی (١٩٦٧) کـراوە بـە ئەنـدامی دەستەی بەڕێوەبردنی سـەندیکای پـارێزەرانی هـەولێر، خـاوەنی زیـاتر لـە (٢٠) کتێبـە لـە بواری مێژوویی و کۆمەڵایەتی و جوگرافی و کـارگێڕی، لـە (١٩٩٦/٦/٢٠) لـە شـاری هـەولێر کۆچی دوایی کرد. بڕوانە : ئینسکلۆپیدیای هەولێر، ب/١٠، دەزگـای چـاپ و بڵاوکردنـەوەی بەدرخان، ٢٠٠٩، ل٤٥٦٧.

[٢٣] طارق جامباز، هادی الجاوشلی والحركة التحررية الكوردية، هەولێر، ١٩٩٥، ص٢٢.

[٢٤] دیدار لەگەڵ کەریم ئەحمەد (٢٠٠٩/١/٢٥ ) لە هەولێر.

[٢٥] سعد ناجي جواد، العراق والمسألة الكردية ١٩٥٨- ١٩٧٠، ص٧٧.

[٢٦] ئەو مێژووە بەرانبەر (١٤ی رەمەزانی ١٣٨٢)ی کۆچی بوو، بۆیە زۆر لە نێوەندە فـەرمی و رۆژنامە حکومییەکان و لە نێـو ئـەدەبیاتی بەعسـییەکاندا بـە شۆڕشـی (١٤ی رەمـەزان) و بووکی شۆڕشەکان ناوزەند کرا، هاوکات لە ناو هێـزە نیشـتمانی و دیموکراسییەکانیشـدا بـە کودەتای (٨ی شوبات)ی رەش ناوی هاتووە.

[٢٧] الوقائع العراقية ع/٧١١، ١٩٦٣/٢/١٨." جعفـر عبـاس حميـدي، تـاريخ الـوزارات العراقيـة في العهد الجمهوري ١٩٥٨-١٩٦٨، ج/٦، ط/٢، بغداد، ٢٠٠٥، ص٦-٧.

[٢٨] فـاتح رەسـول، لـە کـاروانێکی دووروودرێـژدا کورتـەی خـەبات و ئـەزموونی پـەنجا سـاڵ، ستۆکهۆڵم، ١٩٩٧، ل١٥٢.

[٢٩] جعفر عباس حميدی، م.س ، ص١٠-١١.

(٣٠) شەوکەت مەلا ئیسماعیل، رۆژانێ لە مێژووی شۆرشی ئەیلوول ١٩٦١–١٩٧٥، نووسینگەی تەفسیر بۆ بلاوکردنەوە، هەولێر، ٢٠٠٧، ل١٤٩.

(٣١) بۆ پتر زانیاریی دەربارەی درێژەی بەیانەکان و پێکهاتەی کابینەکە بروانە: جعفر عباس حمیدی – م.س ، ص ص ١٧–٢٣.

(٣٢) دیدار لەگەڵ نەجمەددین مامۆ هەریری (٢٠١٢/١٢/٤) لە هەولێر.

(٣٣) دیدار لەگەڵ موحسین دزەیی رۆژی (٢٠١٣/١/١٦) لە هەولێر. نێوبراو ساڵی (١٩٣٢) لە گوندی دوگرتکانی سەربە ناحیەی قوشتەپەی پارێزگای هەولێر لەدایك بووە، قۆناغەکانی خوێندنی سەرەتایی و ناوەندی و دواناوەندی لە هەولێر خوێندووە، دوای ئەوە خوێندنی کۆلێژی مافی لە بەغدا ساڵی (١٩٥٥) تەواوکردووە، دوای شۆرشی ( ١٤ی تەمووز) کاروباری بازرگانی کردووە، ساڵی (١٩٦٣) پەیوەندی بە شۆرشی کورد کردووە، دوای کودەتای (١٧ی تەمووزی ١٩٦٨) چەند جارێك لە کابینەکان بووەتە وەزیر، دوای رێککەوتنامەی (١٩٧٠) بووەتە باڵیۆزی عێراق لە چیکۆسلۆڤاکیا و کەنەدا، دوای نسکۆی شۆرشی کورد لە (١٩٧٥)لە تاراوگە ژیاوە، دوای راپەرینی (١٩٩١) گەراوەتەوە کوردستان و ئێستا نوێنەری تایبەتی سەرۆکی پارتی (مەسعود بارزانی)یە و لە هەولێر دەژیت.

(٣٤) بۆ زانیاریی لەمەر رەوشی تورکمانەکانی هەولێر لە رۆژی (١٤ی تەمووزی ١٩٥٩) و کاردانەوەی ساڵیادی یەکەمی شۆرشەکە لە شارەکە بروانە: شوان محەمەدئەمین تەها خۆشناو، س.پ، ل ل ١٧٨–١٨٢.

(٣٥) حەسەن مستەفا، دەستنووسێکە لای توێژەر پارێزراوە، ل٢٣.

(٣٦) دیدار لەگەڵ هەریەك لە: محەمەد مەلا قادر، رۆژی (٢٠١٣/١٢/١١) لە هاوینە هەواری پیرمام (مەسیف). نێوبراو ساڵی (١٩٣٤) لە شاری هەولێر لەدایك بووە، دوای تەواو کردنی دواناوەندی خولی پەروەردەیی تەواو کردووە، ساڵی ١٩٥٨پەیوەندی بە پارتی کردووە، ساڵی (١٩٦١) چوویتە ریزی شۆرشی ئەیلوول و پەیوەندی کردووە، لەو ماوەیەدا پلە و بەرپرسیارێتی زۆری وەرگرتووە، ساڵی (١٩٧٥) بووە بە بەرپرسی لقی یەکی پارتی، دوای کۆنگرەی نۆیەم بە ئەندامی مەکتەبی سیاسی هەڵبژێردراوە، لە کۆنگرەی دوانزدەمیش بە ئەندامی لێژنەی ناوەندی هەڵبژێردرا، دوای راپەرینی (١٩٩١)یش چەندین بەرپرسیارێتی لە ناو پارتی و حکومەتدا وەرگرتووە، ئێستا لە هاوینەهەواری پیرمام دەژیت." دیدار لەگەڵ موحسین دزەیی رۆژی (٢٠١٣/١/١٦) لە هەولێر.

(٣٧) شیرزاد زکریا، الحرکة القومیة الکوردیة في کوردستان العراق ٨ شباط ١٩٦٣– ١٧تموز ١٩٦٨، دهوك، ٢٠٠٦، ص٧٦.

[٣٨] مستەفا بارزانی و مەکتەبی سیاسی پارتی رەخنەیان لە ناردنی برووسکەکە هەبوو، چونکە پێیان وابوو هێشتا هەڵوێستی بەعس روون نییە، تەنانەت بارزانی فوئاد عارفی ئاگادارکردەوە کەوا نوێنەری شۆڕشی کورد نییە و بۆی نییە وتەبێژی شۆڕشی کورد بێت. دیدار لەگەڵ محەمەد مەلا قادر، رۆژی (٢٠١٣/١٢/١١) لە هاوینە هەواری پیرمام (مەسیف).

[٣٩] بەیانی یەکەم کاتژمێر(١٠)ی ئەو رۆژە لە بەغدا دەرچوو، داوای چەك هەڵگرتن و پێکهێنانی لێژنەکانی بەرگری و لێدانی پیلانگێڕان کرابوو، بەیاننامە و بانگەوازی دووەمیش کاتژمێر(١١:١٥) خولەك لە لایەن سکرتێری یەکەمی حیزبی شیوعی دەرچوو دووبارە داواکرابوو دەست بەسەر چەکەکانی پۆلیس و سەرباز بگیرێت و هێرش بکەنە سەر پیلانگێڕان. بۆ زانیاریی زیاتر بڕوانە: حنا بطاطو، (الکتاب الثالث)، م.س، ص ص٢٩٢–٢٩٤.

[٤٠] دیدار لەگەڵ کەریم ئەحمەد رێکەوتی ٢٥/ ١/ ٢٠٠٩ لە هەولێر.

[٤١] پاسەوانی نەتەوەیی لەسەر زمانی خەڵکی کوردستان ناسراوە بە (حەرەس قەومی) بۆیە ئێمەش بەهەمان ناو بەکاری دێنین، رێکخراوێکی چەکداری حیزبی بەعس بوو، لەرۆژی کودەتاکە لە (٨ی شوباتی ١٩٦٣) بەپێی یاسای ژمارە (٣٥) بە بڕیاری (ئەنجومەنی سەرکردایەتی نیشتمانی شۆڕش) پێکهات، رۆڵێکی گەورەیان لە راوەدوونان و گرتن و ئەشکەنجەدانی شیوعی و پارتییەکان هەبوو، بە دەستدرێژی و ئەتککردنی دانیشتوانی شارەکان بەناوبانگ بوون، هەروەها دەستیان لە کاروباری کارگێڕی و سوپادا هەبوو، بۆ زانیاریی زیاتر بڕوانە کتێبی بەڵگەنامەیی حکومەت لەدوای (١٨ی تشرینی دووەمی ١٩٦٣) لە بەغدا دەرچوو بەناوی: المنحرفون من الحرس القومي في المد الشعوبي تحت اشعة ١٨ تشرين الثاني ١٩٦٣، سلسلة منشورات عربية، عدد: (١)، بغداد، ١٩٦٤.

[٤٢] الوقائع العراقية، ع: ٧٧١، ١٩٦٣/٢/١٨، ص٤.

[٤٣] سعد ناجي جواد، م.س، ص٧٩.

[٤٤] حنا بطاطو، م.س، ص ص٢٩٢–٢٩٤؛ ادمون غريب، م.س، ص٦٧.

[٤٥] نێوبراو ساڵی (١٩٣٠) لە عمارەی باشووری عێراق دایك بووە، بەشداری خۆپیشاندانی وەسبەی کانوونی (١٩٤٨) و خۆپیشاندانەکانی (١٩٥٢)ی کردووە ، ساڵی (١٩٤٩) بووەتە ئەندامی لێژنەی قوتابیانی حیزبی شیوعی لە عمارە، لەدوای شۆڕشی (١٤ ی تەمووزی ١٩٥٨) بووەتە ئەندامی لێژنەی هەرێمی لقی کوردستانی حیزبی شیوعی، ساڵی (١٩٦٤) پاڵێوراوی ئەندامی لێژنەی ناوەندی حیزبی شیوعی عێراقی بووە، ساڵی (١٩٦٥) لە بەغدا کاری کردووە، ساڵی (١٩٦٧) لە کۆنفرانسی سێیەمی حیزبەکە بووەتە ئەندامی لێژنەی

ناوەندی،ساڵی (١٩٦٩) لە موسڵ تیرۆر کراوە، بڕوانە: جریدة طریق الشعب، ع: ٥، اوائل تموز ١٩٦٩.

[٤٦] دیدار لەگەڵ نەجمەددین مامۆ هەریری رۆژی ٢٠١٢/١٢/٤ لە هەولێر.

[٤٧] نەجمەددین مامۆ هەریری، بیرەوەرییەکانی نەجمەددین مامۆ هەریری، چاپخانەی رۆژهەلات، کوردستان، هەولێر، ٢٠٠٩، ل٢٣٠-٢٣١.

[٤٨] سەیداوە لە لایەن شیوعییەکانی هەولێر لە سەردەمی قاسمدا بە مۆسکۆی بچووك ناوزەند دەکرا بە هۆی باڵادەستی حیزبی شیوعی و زۆریی جەماوەری حیزبەکە لە گەڕەکەکەدا. دیدار لەگەڵ نەجمەددین مامۆ هەریری (٢٠١٢/١٢/٤) لە هەولێر.

[٤٩] مەهدی محەمەد قادر، هەولێر لەنێوان یەکەم حوکمڕانی بەعسدا، گۆڤاری ئەکادیمیای کوردی، ژ/٢٢، هەولێر، ٢٠١٢، ل٤١٤.

[٥٠] دیدار لەگەڵ نەجمەددین مامۆ هەریری (٢٠١٢/١٢/٤) لە هەولێر.

[٥١] ئەسعەد خدر قادر گۆمەتاڵی، دەستنووسێکە لای نووسەر پارێزراوە، ل٣.

[٥٢] دیدار لەگەڵ نەجمەددین مامۆ هەریری (٢٠١٢/١٢/٤) لە هەولێر.

[٥٣] ئەسعەد خدر قادر گۆمەتاڵی، س.پ، ل٢-٣.

[٥٤] دیدار لەگەڵ هەریەك لە نەجمەددین مامۆ هەریری (٢٠١٢/١٢/٤) لە هەولێر؛ دیدار لەگەڵ عەزیز رەسول ئەحمەد لە (٢٠١٢/٩/١٥) لە هەولێر. نێوبراو ساڵی (١٩٣٧) لە دایك بووە، ساڵی (١٩٦٠) بووەتە ئەندامی حیزبی شیوعی، لە (١٩٦٣) بەشداری پێکدادانەکەی سەیداوە بووە و گیراوە، ساڵی (١٩٦٦) ئازاد کراوە، ئێستا لە هەولێر دەژیت.

[٥٥] ئەسعەد خدر گۆمەتاڵی، س.پ، ل٣-٤.

[٥٦] ئەسعەد خدر گۆمەتاڵی، ه.س، ل ل٣-٥؛ دیدار لەگەڵ هەریەك لە نەجمەددین مامۆ هەریری (٢٠١٢/١٢/٤) لە هەولێر؛ دیدار لەگەڵ د.عەلی جوکل، رۆژی (٢٠١٣/٤/٦) لە هەولێر. نێوبراو ساڵی (١٩٥٠) لە گوندی گردمەلا لەدایك بووە لە ساڵی (١٩٥٣) وە لە سەیداوە نیشتەجێبوون، قۆناغی خوێندنی سەرەتایی و ناوەندی و دواناوەندی لە هەولێر تەواو کردووە، لە دوای (١٩٧٠) کادیری پارتی دیموکراتی کوردستان بووە، ماستەر و دکتۆرای لە هەولێر زانکۆی سەلاحەدین لە بەشی زمانەوانی خوێندووە، ئێستا مامۆستای زانکۆیە لە کۆلیژی پەروەردەی بونیات زمانی ئینگلیزی.

[٥٧] رێباز، قەندیل بەغدای هەژاند، بەشی یەکەم و دووەم، چ/٢، چاپخانەی پەیوەند، سلێمانی، ٢٠٠٨، ل١٥-١٦.

(٥٨) دیدار لەگەڵ نەجمەددین مامۆ هەریری (٢٠١٢/١٢/٤) لە هەولێر؛ دیدار لەگەڵ عەزیز رەسول ئەحمەد لە (٢٠١٢/٩/١٥) لە هەولێر، نێوبراو یەکێك بوو لە ئەندامانی حیزبی شیوعی و خۆی بەشداربوو.

(٥٩) دیدار لەگەڵ د.عەلی جوکل، رۆژی (٢٠١٣/٤/٦) لە هەولێر؛ ئەسعەد خدر گۆمەتاڵی، س.پ، ل٦-٧.

(٦٠) ئەسعەد خدر گۆمەتاڵی، هـ.س، ل٩-١٠.

(٦١) دیدار لەگەڵ نەجمەددین مامۆ هەریری ٢٠١٢/١٢/٤ لە هەولێر.

(٦٢) زرار سلێمان بەگ دەرگەڵەیی، بیرەوەرییەکانم لە ساڵانی ١٩٤٣-١٩٧٧، چاپخانەی رەهەند، سلێمانی، ل ٣٢٢-٣٢٣

(٦٣) دیدار لەگەڵ کەریم ئەحمەد رێکەوتی (٢٠٠٩/١/٢٥) لە هەولێر؛ نەجمەددین مامۆ هەریری ٢٠١٢/١٢/٤ لە هەولێر؛ دیدار لەگەڵ تەحسین محەمەد خەلیل ناسراو بە (ابو دلشاد) لە هەولێر، (٢٠١٤/٤/١٣) لە هەولێر. نێوبراو ساڵی (١٩٣٤) لە دیانە (سۆران) لە دایك بووە. خوێندنی سەرەتایی لە سۆران و خوێندنی ناوەندی و دواناوەندی تەواو کردووە، لە ساڵی (١٩٥٨) پەیوەندی بە رێکخستنەکانی حیزبی شیوعی کردووە، بەرپرسی قوتابیان بووە، لە کودەتای (١٩٦٣) ئەندامی لێژنەی شاری هەولێر بووە، چەند مانگێك دوای کودەتاکە لە هەولێر بە نهێنی ماوەتەوە و دواتر پەیوەندی بە شۆڕش کردووە و بووەتە بەرپرسی رواندزی حیزبی شیوعی، لەگەڵ حیزبی شیوعی بەردەوام بووە و نەپچراوە، ئێستاش ئەندامی لێژنەی چاودێری و مەکتەبە لە حیزبی شیوعی لە هەولێر.

(٦٤) دیدار لەگەڵ نجیب حنا عتو ناسراو بە (ابو جنان) لە ٢٠١٣/٩/٢٧، لە عەنکاوە. نێوبراو ساڵی (١٩٤٤) لە عەنکاوە لەدایك بووە، خوێندنی سەرەتایی لە عەنکاوە و ناوەندی لە کەرکوك و دواناوەندی لە هەولێر خوێندووە، ساڵی (١٩٦١) لە پێنجی ئامادەیی گیراوە، ئەندامی حیزبی شیوعی بووە، لە (١٩٦٣) پەیوەندی بە پێشمەرگە کردووە، ساڵی (١٩٧٢-١٩٧٤) پەیمانگای زانستە کۆمەڵایەتییەکانی لە مۆسکۆ خوێندووە، کادیرێکی ناسراوی حیزبی شیوعی بووە، ئێستا خانەنشینە و لە سوێد دەژیت" دیدار لەگەڵ دوو کەسایەتی تری مەسیحی لە ئێوارەی (٢٠١٣/٩/٢٧) لە عەنکاوە، نەیانویست ناوەکانیان بنووسرێت، ئاماژەیان بەوەش کرد لە (٨ی ئازاری ١٩٦٣) عەقید خەلیل هاتەوە عەنکاوە و خەڵکێکی زۆری ئەشکەنجە دا و بەتۆمەتی شیوعیبوون کەسێکی بەناوی ئیسحاق عیسا دوای ئازار و ئەشکەنجەدان کوشت.

(٦٥) خەبات، ع/٤٦٩، حزیران ١٩٦٣، ص٥.

[٦٦] دیدار لەگەڵ دوو کەسایەتی مەسیحی لە ئێوارەی (٢٠١٣/٩/٢٧) لە عەنکاوە، نەیانویست ناوەکانیان بنووسرێت.

[٦٧] سەید کاکە، بیرەوەری پێشمەرگەیەك، چاپخانەی وەزارەتی رۆشنبیری، هەولێر، ١٩٩٧، ل١٨.

[٦٨] قرار التجريم، صادر عن المجلس العرفي العسكري الرابع، بتاريخ ١٩٦٣/١٢/١٨المرقمة ٦٣/٩٦٣، من وثائق الحزب الشيوعي الكردستاني–العراق.

[٦٩] بڕوانە: مەهدی محەمەد قادر، س.پ، ل٤١٥.

[٧٠] دیدار لەگەڵ دوو کەسایەتی مەسیحی هاوچەرخ و بەشدار لە رووداوەکە لە رۆژی٢٠١٣/٩/٢٧ لە عەنکاوە، نەیانویست ناوەکانیان بنووسرێت.

[٧١] روفائیل بنیامین یوسف، مذكرات الخوري روفائيل بنيامين يوسف ١٩٥٦–٢٠٠٦، عنكاوا، ٢٠٠٦، ص ٤٥–٤٦.

[٧٢] قرار الحكم، صادر عن المجلس العرفي العسكري الرابع بتاريخ ١٩٦٣/١٢/١٨المرقمة ٦٣/٩٦٣، من وثائق الحزب الشيوعي الكردستاني–العراق.

[٧٣] قرار التجريم، صادر عن المجلس العرفي العسكري الرابع بتاريخ ١٩٦٣/١٢/٣المرقمة ٩٦٣/٢، من وثائق الحزب الشيوعي الكردستاني–العراق.

[٧٤] قرار التجريم، صادر عن المجلس العرفي العسكري الرابع بتاريخ ١٩٦٣/١٢/٣المرقمة ٩٦٣/٢، من وثائق الحزب الشيوعي الكردستاني–العراق.

[٧٥] دیدار لەگەڵ هەریەك لە: نەجمەددین مامۆ هەریری (٢٠١٢/١٢/٤) لە هەولێر؛ د.عەلی جوكل، رۆژی (٢٠١٣/٤/٦) لە هەولێر؛ دیدار لەگەڵ نیعمەت عەبدوڵا پیرداود ، رۆژی (٢٠١٢/١٠/٢) لە هەولێر. نێوبراو ساڵی ١٩٥٠ لەدایك بووە ، خوێندنی سەرەتایی لە گوندی دەربەند و دواتر قۆناغەکانی خوێندنی ناوەندی و دواناوەندی لە هەولێر تەواو کردووە تا بڕوانامەی بەکەلۆریۆسی لە کۆلێژی ئاداب بەشی زمانی کوردی زانکۆی سەلاحەددین بەدەستهێناوە، ماستەر و دکتۆرای لە رێگەی ئینتەرنێت لەسەر کارگێڕیی گشتی هێناوە، پلە کارگێڕییەکانی بڕیوە لە فەرمانبەر بۆ بەڕێوەبەری گشتی و تا ئەندامی پەرلەمان. ئێستا سەرۆکی یەکێتیی پەرلەمانتارانی کوردستانە لەسەر لیستی یەکێتیی نیشتمانی کوردستان و لە هەولێر دەژیت.

[٧٦] بۆ زانیاری لە بارەی پەرچەکرداری شیوعییەکان لە شاری بەغدا و بەسرە بڕوانە: حنا بطاطو، م.س، ص ص ٢٩٠–٣٠٣.

[٧٧] دیدار لەگەڵ هەریەك لە: نەجمەددین مامۆ هەریری (٢٠١٢/١٢/٤) لە هەولێر " کەریم ئەحمەد (٢٠٠٩/١/٢٥) لە هەولێر.

(٧٨) دیدار لەگەڵ كەریم ئەحمەد رێكەوتی (٢٠٠٩/١/٢٥) لە هەولێر؛ نەجمەددین مامۆ هەریری، س.پ، ل٢٣٥-٢٣٦.

(٧٩) نەجمەددین مامۆ هەریری، هـ.س، ل٢٣٣-٢٣٤.

(٨٠) حوسێن مەیاس تێكۆشەرێكی بەختیاری رێگای كۆمەڵانی خەڵك، گۆڤاری k21، ژ:٩، هەولێر، ٢٠١٠، ل٢٣٥.

(٨١) عمار علي السمر، شمال العراق ١٩٥٨-١٩٧٥ دراسة سياسية، المركز العربي للابحاث ودراسة السياسات، بيروت، ٢٠١٢، ص٢٦٠-٢٦١.

(٨٢) عزيز سباهي، عقود من تاريخ الحزب الشيوعي العراقي، ج:٢، منشورات الثقافة الجديدة، دمشق، ٢٠٠٣، ص ٥٦٢-٥٦٣.

(٨٣) عبدالمجيد عبدالرزاق (مام قادر) ، مذكرات، اربيل، ٢٠١٢، ص١١٢-١١٣.

(٨٤) بارزانی مەلا خالید، چەند وێستگەیەك لە ژیانی پێشمەرگەیەكدا، (یادداشتێكی چاپنەكراوە لای نووسەر پارێزراوە) ، ل١٢٨.

(٨٥) فاتح رەسول، س.پ، ل١٦٣.

(٨٦) شازین هێرش، بەڵگەنامە (پارتی دیموكراتی كوردستان – عێراق لە چەندین بەڵگەنامەی مێژوویيدا ١٩٥٨-١٩٦٣) ، ب/١، سلێمانی، ٢٠٠٣، ل١٥٢-١٥٣.

(٨٧) شازین هێرش، هـ.س، ل١٥٢-١٥٣.

(٨٨) دیدار لەگەڵ هەریەك لە محەمەد مەلا قادر؛ نەجمەددین مامۆ هەریری؛ كەریم ئەحمەد

(٨٩) بۆ زانیاریی زیاتر بڕوانە: خورشید شێرە، خەبات و خوێن، چاپخانەی حاجی هاشم، هەولێر، ٢٠٠٨، ل ل ١١-١١٣.

(٩٠) دیدار لەگەڵ تەحسین محەمەد خەلیل (ابو دلشاد) ، ٢٠١٤/٤/١٣.

(٩١) محسن دزەيی، احداث عاصرتها، حاوره: طارق ابراهيم شريف، ج:٢، مطبعة وزارة التربية، اربيل، ٢٠٠١، ص٦٤.

(٩٢) بهاءالدين نوري، مذكرات بهاءالدين نوري -- سكرتير اللجنة المركزية للحزب الشيوعي العراقي، دار الحكمة، لندن، ٢٠٠١، ص ص ٣٤٨-٣٤٩.

(٩٣) بۆ دەقی برووسكەكە بڕوانە: رەفیق رەحمان مام خول، مستەفا بارزانی ژیان و رۆڵ و هەڵوێستی لە پێشهاتە سیاسییەكاندا، چاپخانەی شەهاب، هەولێر، ٢٠١٢، ل١١٧.

(٩٤) يوسف حنا يوسف (ابو حكمت)، مذكرات، وزارة الثقافة والشباب، اربيل، ٢٠٠١، ص ٨٠.

(٩٥) م.ن، ص٨١.

## ملخص البحث

يتناول هـذا البحـث مواقـف الجمـاهير الشـعبية والاحـزاب والتيـارات السياسـية لاسيما الحزب الـديمقراطي الكوردسـتاني والحـزب الشـيوعي العراقـي في لـواء اربيـل تجـاه انقـلاب البعـث (٨ شـباط ١٩٦٣)، وردود الأفعـال المترتبـة عليهـا جماهيريـا وحزبيا. ومن خلال إعتماد الباحث على بعض الوثائق الحكومية غير المنشـورة منهـا قـرارات التجـريم الصـادرة عـن المجلـس العـرفي العسـكري الرابـع المتضـمنة جـداول بأسمـاء الناشـطين الشـيوعيين الـذين تم القـاء القـبض علـيهم مـن قبـل السـلطات العراقيـة، حيـث نجـح الباحـث في تبيـان بعـض المواقـف الخاصـة بمنظمـة الحـزب الشيوعي في اربيل ووحداتها الإدارية.

وفي محـور آخـر تطـرق البحـث إلى موقـف المسـيحيين في بلـدتي عنكـاوة وشقلاوة المناهض للإنقلابـيين ومشـاركتهم في التظـاهرات الشـعبية بقيـادة منظمـات الحزب الشيوعي. بالإضافة إلى أن هذه الورقة البحثية قد سلطت الضوء على تطـور الاحداث السياسية لصالح البعثيين، ومن ثم قيـام مصـطفى البـارزاني قائـد الثـورة الكوردية بإصدار قرار بدعم وإحتواء كـوادر وناشـطي تنظيمـات الحـزب الشـيوعي في المناطق المحررة.

ان اهمية هذا البحث تنبع من ان الموضوع لم يتناوله اقلام البحـاث الا نـادرا لا سيما في لواء اربيل.

## Abstract

This article divided into an introduction and three topics. The introduction is a short historical account of the political situation in Erbil and also the beginning of the relationship between the Kurdistan Democratic Party and the Arab Socialist Baath Party before the coup in the 8 February 1963.

This research deals with the positions of the popular masses and the political parties and movements, particularly the Kurdistan Democratic Party and the Communist Party of the Iraqi brigade in Erbil toward the Baath coup, February 8, 1963 and the response to them turnout and partisan. Based on some government documents, including unpublished decisions, the criminalization of the customary military rules , containing the names of communist activists who have been arrested by the Iraqi authorities, where the researcher has succeeded in demonstrating some special situations Organization of the Communist Party in Erbil administrative units.

The research also touched upon the position of Christians living in Ankawah and Shaqlawa and their participation in the popular demonstrations led by the Communist Party organizations. In addition, this paper shed light on the evolution of political events for the benefit of the Baathists, and then d Mustafa Barzani, leader of the Kurdish revolution issued a decision to support and containment of cadres and activists of the Communist Party organizations in the liberated areas.

The importance of this research stems from the fact that this issue was not addressed especially in Erbil province.

# هەوڵە ئاشتەواییيەكانی دەوڵەتی عوسمانی لەنێوان هۆزە كۆچەرەكانی ڕۆژهەڵات و باشووری ڕۆژهەڵاتی ئەنادۆڵدا(*)

نووسینی: یاكوپ كەرەتاش(**)

وەرگێڕان لە ئینگلیزییەوە: د. شەماڵ حەوێزی

## پێشەكی

لە سەردەمی دەوڵەتی عوسمانیدا، هۆزەكان پێكهاتەی ناوچەیەكی بەرفراوان بوون بە ڕۆژهەڵات و باشووری ڕۆژهەڵاتی ئەنادۆڵیشەوە. شێوازی ژیانی كۆچەری لەم شوێنە جوگرافییەدا زاڵ بوو (لە ناوەڕاستی سەدەی نۆزدەهەمدا هۆزە كۆچەرەكان سێیەكی دانیشتوانی كوردستانیان پێكدەهێنا و خاوەن لەوەڕگا بوون. لە كۆتایی سەدەی نۆزدەهەم و سەرەتای سەدەی بیستەمدا نیشتەجێبوونی هۆزە كۆچەرەكان و دروستبوونی گوند بە شێوەیەكی كتوپڕ پەرەی سەند– وەرگێڕ). دەكرێ هەندێك ناوچەی تریشی بخەینە سەر، وەك ئەو شوێنانەی عەرەبە كۆچەرەكانی لێ دەژین (1). هۆز (خێڵ) واتە عەشیرەت وەك وشەیەكی عەرەبی، هەروەها تیرە و بەشەكانی تری پێكهاتەی هۆزیش لەخۆ دەگرێت. وشەكە بە گشتی لە زمانی توركی بە مانای توخمە كۆچەرییەكان بەكاردێت. لە یاسانامەكانی (Lawbooks) عوسمانیش(2) بە وشەی كۆچەر، یۆرووك، قەبیلە یان تایفە تەعبیر لە هۆز كراوە یان ناوی لێندراوە ( لە دەقە ئینگلیزییەكەدا وشەی tribe بە مانای هۆز و clan بە مانای عەشیرەت و تیرەش بەكار هاتووە، دیارە هۆز لە چەند عەشیرەتێك و عەشیرەتیش لە چەند تیرەیەك و تیرەش چەند بنەماڵەیەك پێكدێت – وەرگێڕ). بە گشتی هۆزەكان بەسەر تیرە دابەشدەكرێن، ڕەنگە لە هەندێك ناوچەدا هۆز هەبێت لە دە عەشیرەت یان پتر پێك بێت. هەر هۆزێك سەرۆكێكی هەیە كەپێی دەگوترێت بەگ، سەرۆك یان ئاغا،

ئەم ڕابەرانە ڕاپەڕاندنی ئەرکەکانیان لە باوکەوە بۆ کوڕەکانیان دەگوازرایەوە[٣]. هۆزەکانی ڕۆژهەلاتی ئەنادۆڵ باری پتر لەسەر بنەما و شێوەی هژموونی و دەسەلاتی ناوەندی دامەزراون، نەك لە سەر بنەمای شێوازی هەرەمی (Hierarchical structure)[٤] هۆی سەرەکی ململانێی نێوان هۆزەکان دەگەڕێتەوە بۆ کێبڕکێیان لەسەر لەوەڕگا و پاوان، هەروەها بۆ هەولی دروستکردنی هاوپەیمانێتی لەگەل هۆز یان دەولەتە هاوسنوورەکانیش (وەك ڕووسیا و ئێران) دەگەڕێتەوە. لە لایەکی ترەوە ڕووداوی سادەی وەك ڕفاندنی کچان (ژنهەلگرتن) پشێوی لەنێوانیاندا دروست دەکرد.[٥] کارتێکردنە غەمگینەکانی ئەم ڕووداوانە لە سەرچاوە سەردەمییەکان دەبیندرێن[٦].

هەولدرا لە ڕێگەی سیاسەتی نیشتەجێکردن و ئاوەدانکردنەوەی عوسمانی کۆتایی بەم بارودۆخە بهێندرێت، کە چەند سەدەیەك درێژەی هەبوو. بەلام بەهۆی کاریگەریی ئەو سیستەمەی کە چەندین سەدەیە بالادەستە، دابونەریتە تایبەتمەندەکان، هۆزەکانی ڕاستەوخۆ بە هەلومەرجی ژیانی کۆچەری گرێداوە. لەو شوێنانەی شێوەی پێکهاتەی کۆمەلگای عەشایری هەیە، زۆربەی کێشە خوێناوییەکان بەهۆی کێبڕکێیە لەسەر لەوەڕگا و پاوان. لەو کاتانەی کە دابونەریتی عەشایەری جێبەجێ نەدەکرا کێشە خوێناوییەکان بۆ ماوەیەکی دوورودرێژ بەردەوام دەبوون. لەم نموونەی کە باسی لێوە دەکەین چارەسەرێکە کە خەلکی ناوچەیەك (ئاگری) بۆ چارەسەرکردنی کێشەیەکی کۆمەلایەتی بەکاریانهێنا.[٧] "... خەلکی بایەزید (ئاگری) خاوەن ئاینێکی تایبەتی و لە نەتەوەیەکی دێرینن. وەرگرتن و پێدانی پارە لەجیاتی خوێنی کوژراو نەریتێکی باو و هاوبەش بوو لەنێوان ئەو هۆزانەی لە ناوچەکەدا دەژیان. بەپێی دابونەریتی عەشایری ئەگەر پیاوێك کەسێك لە هۆزێکی تر بکوژێت، ئەوا هەموو ئەندامەکانی هۆزی کوژراوەکە دەبنە دوژمنی هەموو تاکەکانی هۆزی بکوژەکە. ئەندامانی هۆزی کوژراوەکە لە هەر شوێنێك (جگە لە فەرمانگە حکومییەکان و ئەو شوێنانەی هێزەکانی ئاسایشی تێدا جێگیرە) دەرفەتیان بۆ بڕەخسابا ئەندامانی هۆزی بکوژەکەیان دەکوشتەوە. بەمەبەستی کۆتاییهێنان بەم دوژمنایەتییە سەرانی هەردوو هۆزەکە کۆدەبنەوە ( بۆ سولحکردن – وەرگێڕ) پارەی خوێن

(خوێنبەها) لـە لایـەنی بكوژەكـە وەردەگـرن و دەیدەنـە كەسـوكاری كوژراوەكـە. دوای پێدانی پارەی خوێنبەهاكە هەردوولا دوژمنكارەكە ئاشت دەبنەوە و كۆتـایی بە ناكۆكی و شەڕی نێوان دوو هۆزەكە دێت. بەڵام، گەر پارەی خوێنداری نـەدرێت ئەوا خێزانـە دوژمنكارەكـان ئاشـت نابنـەوە و دوژمنایەتییەكـە درێـژەی دەبێـت و تەشەنە دەكات. بڕە پـارەی خوێنـداری بـەپێی كەسـەكان دەگۆڕێـت. بـۆ نموونـە ئەگەر كوژراوەكە شوانكارەیەك بێت، ئەوا بە لای كەم (٥٠ ) سەر مـەڕە، هـەروەها ئەسـپێك، تفـەنگێك یـان هەنـدێك كەلوپـەل وەك بـەهای خوێنـداری دەدرێـت. بەهـەرحاڵ، ئەگـەر پیـاوە كوژراوەكـە ئەنـدامێكی دیـار، تایبـەت یـان جەربـەزەی هۆزەكە بێت ئەو كاتە پارەكە زۆر زیاتر دەبێت. ئەگـەر بكوژەكـە پیـاوێكی هـەژار بێـت، ئـەوا پـارەی خوێندارییەكـە لـە لایـەن سـەرجەم ئەنـدامانی هۆزەكـەی بـۆی كۆدەكرێتەوە. هەر یەكە و بـەپێی دەرامـەتی خـۆی بەشـداری لـەم هەرەوەزییـەدا دەكـات. ئەگـەر بكوژەكـەش خـاوەن كـاڵا بـوو، ئـەوا بەشـێك لـە كاڵاكـانی وەك خوێنبەها دەدرێت بە كەسوكاری كوژراوەكـە، ئـەوەی دەشمینێتـەوە بـۆ بـژێویی خێزانی بكوژەكە دەبێـت. دەوڵـەت هـیچ بەدواداچـوونێكی قـانوونی سـەبارەت بـە تاوانی كوشتنەكە ناكات تاكو بكوژی تر پەیدا نەبن ( واتە كێشەی خوێندارییەكە و تۆڵەسـەندنەوە پـتر تەشـەنە نـەكات – وەرگێـڕ) و پشـتیوانی لـە پرۆسـەی ئاشـتبوونەوە بكرێـت لـە ڕێگـەی دابونـەریتی (Legal) كۆمەڵایـەتی بـە پێـدانی خوێنبەها لە لایەن بكوژەكەوە..."

وەك لـە نموونەكـەدا دەردەكـەوێت، شـێوازی چارەسـەركردنی داراییيانـەی كێشەی خوێنداری بە ناوی خوێنبەها، سەرچاوەی لە باجی "فدیە" لە شـەریعەتی ئیسـلامییەوە وەرگرتـووە. خـاڵێكی گرنگـی تـر لێـرەدا ئەوەیـە كـە دادگاكـان و دەسەلاتی دەوڵەت لەم پرۆسەیەدا بەشدار نەبوون و كێشەكەش بەپێی دابونەریتـە باوەكان چارەسەر كرا، ئەمە چۆن لەلایـەن دەوڵەتـەوە قبوڵكرا، دواتـر بەدرێـژی باسی لێوە دەكرێت.

ئەم تۆژینەوەیە دەربارەی هەندێ پرۆسەی یاسایی نیوەی دووەمی سـەدەی نۆزدەهەمینە ڕەنگە سوودبەخش بێت كە ئامـاژە بـدەین بـە ڕێكخسـتنی دادوەری لـەم ماوەیـەدا. بەهـەرحاڵ ئـەو چاكسـازییانەی دەوڵـەتی عوسمـانی لـە بـواری

ڕێکخســـتنەوە (تـــەنزیمات) ئـــەنجامی دا، کـــارتێکردنێکی بەرچـــاوی لەســـەر سەنتڕالیزمی سیستەمی کارگێڕی هەبوو، بەڵام ئەو کارتێکرنەی لە سەر سێکتەری دادوەری نەبوو. بە هەمان شـێوە دادگـای شـەرعی، دەزگـای نەزمییـە، بازرگـانی، کۆنسولگەری و دادگاکانی ڕەوەندی دەزگایەکی یەکگرتوو نەبوون. لەم پشێوییەی لە هەیکەلی دادگا یاساییەکانی ناوچەکەدا هـەبوو، یەکـەمین ئامـاژەی عیلمـانی[٨] (secularization) بـەدی دەکـرا. لـەم میکانیزمـە یاسـاییە نوێیـە کـە لـەژێر کارتێکردنی فرەنسا (دادوەریی فەرەنسی – وەرگێـڕ) هاتـە کایـەوە، ئەنجوومەنـە کارگێڕییـە هەرێمییـەکان بڕێك بەرپرسـیارێتی یاسـاییان پێـدرا.[٩] لـەم ماوەیـەدا دادگاکـانی نیزامییـە دروسـتکران بـەناوی کۆمەڵـە (Assembly) لـە ڕوانگـەی هەڵبژاردنی ئەندام، دامەزراوەیی و کارگێڕییەوە لـە چەشـنی دادگـا ئەوروپییـەکان بوو.[١٠] بوونی دەسەڵاتی ئەنجوومەنی کارگێڕی لە کاروباری دادوەریدا، بووە هـۆی دەستێوەردانی سەرەڕۆییانەی والی، موتەسەڕیف (سەرۆکی هـەرێمی عوسمـانی) و حاکمی ناوچەکان[١١].

ئەرکـە دادوەرییـەکانی ئەنجوومـەنی هـەرێم بـۆ دادگـا تـازە دامـەزراوەکانی نەزمییـە بـە ڕێنوێنییـە هەرێمایەتییـەکانی نیزامنامـە (nizamname) – ی سـاڵی ١٨٦٤ گواسترانەوە. ململانێی دەسـەڵاتدارێتی لـە نێـوان دادگاکـانی نەزمییـە (کـە مـۆرکێکی عـەلمانییان هـەبوو – وەرگێـڕ) و دادگـا شـەرعییەکان بـۆ ماوەیـەکی دوورودرێـــژ بـــێ چارەســـەر مایـــەوە.[١٢] فدیـــە (ransom) یەکێکـــە لـــە بابەتـــە سـەرەکییەکانی ئـەم تۆژینەوەیـە، یەکێکیشـە لـە بیرۆکـە گرنگـەکانی شـەریعەتی ئیسلامی. فدیە لە شەرعی ئیسـلامدا دەکرێـت کـاڵا بێـت یـان پـارە (هەنـدێك جـار کچیش وەك فدیە لە خزمێکی کوژراوەکە مارە کراوە – وەرگێـڕ)، وەکـو سـزا یـان بەهای خوێن بە ڕەزامەندیی هەردوولای کێشـەکە دەدرێتـە ئـەوەی لێـی کـوژراوە، بریندارکراوە یان پەکخراوە. دەکرێ فدیە ئامێری کشتوکاڵ یان ئاژەڵ و پەلەوەری مـــاڵیش بێـــت و دەدرێتـــە ئەنـــدامێك یـــان پـــتر لـــە ئەنـــدامێکی خێزانـــی زیانلێکەوتووەکە.[١٣]

**كێشە عەشايرييەكان و هەوڵە ئاشتەواييیەكانی دەوڵەت:**

لە زۆر لە ئەرشـیڤی تۆمـاركراوی كۆتـایی سـەدەی نۆزدەهـەمین و سـەرەتای سەدەی بیستەمیندا، ژمارەیـەك نموونـە هـەن لەسـەر چـۆنییەتی چارەسـەركردنی كێشە و ناكۆكییەكانی نێوان هۆزەكان بەهاریكاری و هەوڵی ئاشتییانەی دەوڵەت و كەسایەتییە دەسترۆیشتووەكانی ناوچەكە بـەپێی دابونەریتـە عەشـايرييەكان. بـە مەبەسـتی تێگەیشـتنی تـەواو لـە مەسـەلەكە، هەوڵـدرا شـێوەی جێبـەجێكردنی چارەسەرەكان ڕوون بكرێتەوە لە ڕێگەی هێنانەوەی ژمارەیـەك نموونـەی جیاجیـا لە تۆمارەكانی ئەرشیڤدا دەربارەی ناوچـە و ڕووداوە جیاجیاكـان. بـۆ نموونـە لـە ساڵی ١٨٥٣ دا لە ئـەنجامی شـەڕ و پێكدادانی نێـوان هـۆزی بلّبـاس لـە سـنجاقی كۆیـەی سـەر بـە ویلایـەتی شـارباژێڕ و هـۆزی دزەیـی سـەر بـە ناوچـەی هـەولێر، قوربانی و تالآنی لێكەوتەوە. والی عەلی پاشـا لـە ڕێگـەی جموجـۆڵی سـەربازییەوە شەڕەكەی ڕاگرت. دوایی هەوڵی چارەسـەركردنی كێشـەكەی دوو هۆزەكـەی دا بـە ڕەچاوكردنی سەروەرەكانیان و ڕا و تەگبیریان. والی ژمارەیەك ئەفسـەری تایبـەتی نـارد بـۆ كۆكردنـەوەی ڕێنمـایی (نەسـیحەت) كـارا بـۆ هۆزەكـان ئامادەبكـەن بـۆ زامنكردنـی گەڕاندنـەوەی كەلوپەلـە تالآنكراوەكـان و كەسـایەتییە ناودارەكـانی عەشـیرەتەكانیش ئاگـادار بكرێنـەوە تـا پابەنـدی "بەڵێننامـە و ڕەوشـت بـەرزی بن". [١٤]

لە نموونەیەكی ساڵی ١٨٦٣ دا باس لەو ڕووداوە دەكات كە دوو ساڵی خایاند لەنێوان هۆزەكانی بۆتان، ئێزدی، ئەرتووشی و هۆیری بە درێژی بـاس لـە هەنـدێك كەلوپەلی تالآنكراو كراوە. بەپێی ئەم نموونەیە وێڕای هەبوونی كوژراو لە هەردوولا، مــەڕومالآت، ڕەشــەولآغ، خەنجــەر، تفــەنگ، پــارەوپوول، بازووبەنــد، تــاقمی نانخواردن، شمشێر و خشڵ. ئەمـە جگـە لـە سـووتاندنی دەیـان گونـد و خـانوو و بەتالآنبردنی هەزاران سەر ئـاژەڵ. گـەورەیی قـەبارەی ڕووداوەكـە بـاس لـە خـۆی دەكات. [١٥] كۆلۆنێل حاجی سالح بـەگ لـە لایـەن سـوپا و دەروێـش بـەگ لەلایـەن پیاوماقووڵانی هەرێمی وان نێردران بـۆ بەرقـەراركردنی ئاشـتی. لـە نامەیەكدا كـە لەلایـەن پیاومـاقووڵانی بەیتولشـەباب، هـەكاری و جۆلـەمێرگ نووسـرابوو شـەڕ و پێكـدادان لـەناو هۆزەكانـدا كۆتـایی پێهـات و ئـەمن و ئاسـایش بـۆ دانیشـتوان

دەستەبەر کرا، وەك ئاکامێکی سەرکەوتووانەی دەستپێشخەرییەکەی کۆلۆنێل صالح و دەروێش بەگ.[16] لایەنە بەشەڕهاتووەکان گوتیان ئارەزوومەندن بەپێی حوکمی شەرعی بەشێك لە کەلوپەلە بەتالانبردراوەکان بۆ خاوەنەکانیان بگەڕێننەوە. [17] وەك لەم نموونانەدا دەبینرێت ئەو ئەفسەرانەی حکومەت ناردنی بۆ ناوبژیوانی لەنێوان هۆزە بەشەڕهاتووەکاندا کەسانی بەڕێز و کاریگەر بوون و ئەنجامی خێراشیان بەدەستهێنا. بڵاوەپێکردنی هێزە بەگژیەکچووەکان بەبێ بەکارهێنانی سوپا بە دەسکەوتێك بۆ ئەفسەرە ناوبژیوانەکان دەژمێردرێت. هەروەها دەبێت ئەوەش بگوترێت کە ئەم سەرکەوتنە ئەو کاردانەوەی هەبوو کە شیاوی بوو. سالح بەگ مەدالیای مەجیدی (Mecidi) لە جۆری پلەی سێی پێدرا ؛ مەدالیای پێشتری سالح بەگیش بە دەروێش بەگ درا.[18] بێگومان ئەم جۆرە پاداشتکردنە دەبێتە مایەی هاندانی کەسانی تر بۆ ئەوەی هەمان ڕەفتار بکەن.

ناوچەیەکی تر کە نەتواندرا ڕێگە لە پێکدادانی نێوان هۆزەکانیدا بگیرێت، ڕۆژهەلات و باشووری ناوچەی ئەرزەڕۆمە. هۆزەکانی سێپکی، حەسەنانلی و حەیدەرانلو (لە ٢٠٠٠ خێزان پێکهاتبوو و لەنێوان مووش و ورمێ نیشتەجێ بوون – وەرگێڕ) کە لەنێوان بایەزید و مووش نیشتەجێ بوون و بەردەوام لەسەر پاوان و لەوەڕگا شەڕیان بوو.[19] لە شەڕێکی نێوان هۆزەکانی ئەم ناوچەیە لە ساڵی ١٨٦٩دا، ١٦ کەس لە هۆزی حەسەنانلی و ٢٠ کەسیش لە هۆزی سێپکی کوژران ( هۆزی سێپکی لە ٣٠٠٠ خێزان پێکهاتبوو و لە باکووری گۆلی وانێ نیشتەجێبوون – وەرگێڕ). بە مەبەستی کۆتاییهێنان بەم کوشتارە دوولایەنە بۆ هەر کوژراوێك ٧٥ زێڕی عوسمانی وەك فدیە دیاریکرا هەموو فدیەکەی حەسەنانلی دەکاتە ١٨٧٥، و ئەو فدیەی دەبێت هۆزی سێپکیش بیدات ١٢٠٠ سکە زێڕی عوسمانییە بۆ ١٦ کوژراوەکەی حەسەنانلی (ئەگەر بۆ هەر کوژراوێك ٧٥ زێڕی عوسمانی دیاری کرابێت، ئەوا هۆزی حەسەنانلی دەبێت بۆ ٢٠ کوژراوەکەی سێپکی ١٥٠٠ سکەی زێڕی عوسمانی فدیە بدات و هۆزی سێپکیش ١٢٠٠ سکە زێڕی عوسمانی بداتە هۆزی حەسەنانلی وەك فدیە بۆ ١٦ کوژراو – وەرگێڕ ). بڕیاردرا ئەم فدیانە بە کەسوکاری کوژراوەکان بدرێن. سەرباری ئەوەش، بەهۆی ژیانی کۆچەری ئەو هۆزانە، گێڕانەوەی کەلوپەلە تالانکراوەکان و دەسگیرکردنی تاوانباران، کارێکی

كردەنى نەبوو. بۆيە پێدانى فديە بەس بوو. بۆ ڕێگەگرتن لە دووپاتبوونەوەى ڕووداوى لەم چەشنە پێشنيازى پابەندكردنى سەرۆك هۆزەكان كرا. بۆ جێبەجێكردنى ئەم بڕيارەى ئەنجوومەنى دەوڵەت (شوراى دەوڵەت)، ياسايەك بۆ والى ئەرزەڕۆم نووسرا.[٢٠] بە پابەندبوونى سەرۆك هۆزەكان بە بەرپرسيارێتى، ئەم ئەركەش بۆ ئەوان وەك كردارێكى ناچارى (سوخرە) بوو، كەواتە ئەوان وەك ئەفسەرێكى پۆليسيان لێدێت و كارێكى گونجاو لەم پۆستە ئەنجامدەدەن.

بەپێى تۆمارێكى ساڵى ١٨٨٨، دەردەكەوێت كە لە هێڵى هەكارى– موسڵ پێكدادان بۆ چەند ساڵێك درێژەى هەبووە و ژمارەيەك سەرۆك هۆز و سەرانى سۆفييەكان ڕۆڵيان لە پرۆسەى ئاشتيدا هەبووە[٢١]

يەكێك لەم سەرانەى هەوڵێكى زۆر كاريگەرى لە ئاشتيدا هەبوو محەمەد ئەفەندى خەڵكى بامەڕنى بوو و پەيڕەوى تەريقەتى خاليدى (نەقشى – وەرگێڕ) بوو. محەمەد ئەفەندى هەوڵێكى زۆرى دا لە پێناو ئاشتى و كۆتاييهێنان بە شەڕوشۆڕ لەنێوان هۆزە عەرەب و هۆزە كوردەكاندا و خەباتيشى كرد لە پێناو ئەنجامدانى چاكسازى لەنێو هۆزە كوردييەكاندا. هەروەها لە پاڵ عوسمانييەكاندا بەشدارى لە شەڕدا كرد. بە ڕاسپاردە و ڕێنماييە كاريگەرەكانى هەوڵى دا كۆتايى بە شەڕ و پێكدادانى نێوان هۆزەكان بێنێت. لەگەڵ كوڕ و شوێنكەوتووانى خۆى زنجيرەيەك كۆبوونەوەى بەست لە پێناو هێنانەكايەى ئاشتى لە ناوچەكەدا.

كاتێك سەرنجى تۆمارەكان دەدەين دەبينين كە محەمەد ئەفەندى لەگەڵ كوڕەكانى و شوێنكەوتووانى توانى چارەسەرى كێشەكانى نێوان هەردوو هۆزى بەروارى و تييارى بكات بە بێ ئەوەى سەرباز بەكار بێنێت.[٢٢] هەروەها هۆزەكانى ڕازيكرد پەيماننامەى ئاشتى ئيمزا بكەن و پەيماننامەكەشى بۆ دەروازەى باڵا نارد.[٢٣]

ئەو كێشەيەى لە ساڵى ١٨٩٠– وە بۆ ماوەى چەندين ساڵ لەنێوان هەندێك كەسى سەر بە هۆزى جەلالى نيشتەجێى ئێران و هۆزى حەيدەرانلى كە لە سەرزەمينى دەوڵەتى عوسمانى ڕوويدا، بە هەوڵى كۆلۆنێل ڕوستوو بەگ لە وان و حەسەن ئەفەندى كۆتايى پێهات، بەهۆى سەركەوتنيان لەم ئەركەدا يەكەميان پلەكەى بۆ سەنيە (پلە دوو) بەرز كرايەوە و دووەميشيان بۆ پلەى ميرميرانليك

بەرزکرایەوە.[٢٤] بە مەبەستی کۆتاییهێنان بە کێشەی هەردوو هۆزی جەلالی و حەیدەرانلی، کە یەکێکە لە گەورەترین هۆزەکانی ڕۆژهەلاتی ئەنادۆڵ بڕیاری پێهکێنانی لێژنەیەك درا. دەسەلاتی دانانی ئەندامانی لێژنەکە بە دادوەری گشتی بتلیس یان وان بسپێردرێت.[٢٥] دوای ئەوەی پرس و ڕاکان تا کۆتایی هەمان ساڵ درێژەیان کێشا، بڕیار درا پەیوەندی بە ئێرانەوە بکرێت بۆ قەرەبووکردنەوەی خوێنی ئەو ١٩ کەسەی هۆزی حەیدەرانلی کە لەلایەن هۆزی جەلالییەوە کوژرابوون و سزادانی ئەو کەسانەی ڕووداوەکەیان هەڵگیرساندبوو.[٢٦] لە ڕووداوێکی دیکەی پەیوەست بە هۆزی جەلالییەوە، ئۆمەر ساڤکی پاشا موتەسەڕیفی بایەزید بە نانەوەی دووبەرەکی لەنێوان هەردوو هۆزی جەلالی و ئەدەمانلی لە بایەزید تۆمەتبار کرا (١٨٩٤). دوابەدوای ئەو لێکۆڵینەوەیەی لە لایەن شاکر پاشای پشکنەری ڕیفۆرمی ئەنادۆڵ ئەنجامدرا، دەرکەوت کە ئەو جموجۆڵەی لە لایەن موتەسەریفەوە کراوە خزمەتی ئامانجەکانی دەوڵەت ناکات و قبوڵیش ناکرێت، هەروەها پرۆسەی دوورخستنەوەی ئۆمەر ساڤکی پاشاش دەستی پێکرد. هۆزەکانی ناوچەکە لەسەر دەستی حەقی پاشای فەرماندەی سوارەکانی حەمیدی ( هێزێکی سوارە بوو بەشی زۆری لە هۆزە کوردە سونییەکان پێکهاتبوو ، لە ساڵی ١٨٩٠ بە بڕیارێکی فەرمی دەوڵەتی عوسمانی دامەزرا و ناوی سوڵتان عەبدولحەمیدی دووەمی لێندرا و فەرماندەکەشی تورك بوو – وەرگێڕ) بایەزید ئاشت کرانەوە.[٢٧]

ئیمپراتۆریەتی عوسمانی گرنگی بە پەیوەندییەکانی نێوان هۆزەکانی ڕۆژهەلاتی ناوەڕاست و دەوڵەت دەدا، پەرەی بە جۆرەها شێوەی پەیوەندی دا بۆ ڕاکێشانی مەیلی هۆزەکان. ئەو نووسراوەی ئەم مەسەلەیە پشتڕاست دەکاتەوە لە تۆمارەکانی سەدری ئەعزەم (Sadaret) ساڵی ١٨٩٠ وەگیر هاتووە. بە مەبەستی برەودان بە پەیوەندییەکان لەگەڵ هۆزە کوردی و عەرەبییەکانی ناوچەکە و پتەوکردنی پابەندبوونیان بە دەوڵەت، داواکرا هەندێك یارمەتییان بۆ خەرج بکرێت وەکو مووچە، پاداشت، میوانداری (خەرجی دیوەخان – وەرگێڕ)، پلە و نیشان بۆ شێخ و سەرۆکەکانیان. لە لایەکی ترەوە ئامادەیی ئەم هۆزانە بۆ خزمەتکردن لە سوپا وەك ئەرکێکی ئاینی و متمانەکردن بە سوپا، بێگومان پێویست بوو بۆ چارەسەرکردنی ئەو کەموکورتییانەی لە سوپای شەشدا هەبوون.[٢٨]

بەشداربوون لە فەوجەكانی سوارەی حەمیدی كە لە ساڵی ١٨٩١ (هەندێك سەرچاوە دەڵێن ١٨٩٠) دامەزرێندرا، سوودی بە هۆزەكانی ناوچەكە گەیاند. لە تۆمارێكی ساڵی ١٨٩٣ دا هاتووە، كەسێك بە ناوی حەیدەر لە هۆزی حەسەنلی لە ویلایەتی وان هەندێك ڕەفتاری خراپی هەبووە، دوایی دەستبەرداری بووە و بڕیاریداوە پەیوەندی بە یەكێك لە فەوجەكانی سوارەی حەمیدییەوە بكات. لە دۆكیۆمێنتێكدا كە لە دەروازەی بالاوە بۆ وەزارەتی كاروباری دەرەوە و دەسەڵاتی دادوەری ناردراوە، چاوپۆشی لە مافی گشتیی كەیسەكەی حەیدەر دەكرێت بە مەرجێك مافی كەسێتی كەیسەكە بمێنێت. هەروەها داوای بەڵێننامەیەكیش لە حەیدەر و خێزانەكەشی دەكرێت، كە نیشتەجێی گوندی قەرەدلن لە ئەدلجەڤازن[٢٩]. لەم نموونەیەدا دەردەكەوێت ئەو كەسەی ئازاری خەڵكی دەدا، گۆڕا بۆ كەسێكی خزمەتگوزاری دەوڵەت و ڕەفتارە زیانبەخشەكانی بە پێدانی هەندێك ئاسانكاری دادوەری كۆتایی پێهات.

ململانێیەكی توند لەنێوان هۆزی میران، كە هۆزێكی گەورە و گرنگی تری باشووری ڕۆژهەڵاتی ئەنادۆڵە و هۆزەكانی شەرناخ و باتمان لەلایەكی ترەوە هەبوو. ئەم ململانێیانە بە هۆی هەوڵەكانی بەحری پاشای حاكمی وان و ژمارەیەك كەسایەتی دەسترۆیشتووی هۆزەكان نەما. هەروەها گەڕاندنەوەی ئەو كەلوپەلانەی لە هۆزە ئاشتبووەكان تالان كرابوون بەپێی دابونەریتەكانی هۆز مەیسەر بوو. بەپێی سەربوردەی سەرلەشكرەكان (biography of Seraskerat) یەكە سەربازییەكان پێگەی خۆیان قایم دەكرد بۆ ئەوەی پێكدادانانە كۆنەكان دەستپێبنەكەنەوە.[٣٠] لەو پێكدادانانەی لەنێوان موستەفا پاشای سەر بە هۆزی میران و یەزیدی سەر بە هۆزی تەی ڕووی دا، موتەسەریفی وان بووە ناوبژیوان بۆ ئاشتكردنەوەیان بە پێی دابونەریتی عەشایری هەروەها هەردوولاش ئەو كەلوپەلانەی بە تالان بردبوویان گەڕاندیانەوە.[٣١]

لە تۆمارێكدا (ئاداری ١٨٩٤) كە پەیوەستە بە هەردوو هۆزی بەرزنجی (لە دەقە ئینگلیزییەكە لێرە لێكۆڵەر هۆزی بەرزنجی و بارزانی تێكەڵكردووە – وەرگێڕ) و تاڵەبانی، كە ئێستا لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا زۆر كاریگەرن. باسی نەمانی ئەو بێ متمانەیە كراوە كە لەنێوانیان هەبووە بەهۆی ئەو كوشتارەی لە

پێشدا ڕوویدابوو. بۆیەش شێخ سەعید ئەفەندی ( باوکی شێخ مەحموودی حەفید – وەرگێڕ) لە سلێمانی نیشتەجێ بوو و شێخ عەلی ئەفەندی تاڵەبانی لە کەرکووك نیشتەجێ بوو (شێخ عەلی سەر بە تەریقەتی قادرییە – وەرگێڕ). ڕق و کینەی نێوان هەردوو هۆز بە هەوڵ و تەقەلای موتەسەریفی کەرکووك (عەلی پاشا) چارەسەرکرا و ڕێگە لە پێکدادان گیرا. [32]چارەسەرکردنی کێشەکە لە ڕێگەی بەشداربوونی سەرۆك هۆزەکان گرنگیی خۆی هەبوو. بەهەمان شێوە وەك لە بەڵگەنامەکەدا هاتووە، ژمارەیەك ئەندامی هۆزەکان، بەهۆی "دەمارگیرییانەوە" تانەیان لە سەرۆك و شێخەکانیان دابوو، دواتر لە لایەن شێخەکانەوە هێورکرانەوە. تا چ مەودایەك ئەو هەوڵانەی دەوڵەت یارمەتیدانی یەکبوونی خەڵکی ئەم ناوچەیە دەیدات، دەبێت ڕەچاو نەکرێت.

زۆربەی هۆزەکانی وان نیشتەجێ بوون، والی بەحری پاشا بە پلەی یەکەم و دواتر هەموو فەرماندەکانی سوارەی حەمیدی و کەسایەتییە دەستڕۆیشتووەکانی ناوچەکە تەیار کرابوون بۆ ئەوەی ڕێگە لە ڕوودانی پێکدادانی عەشایری بگرن. بۆ نموونە، پێکدادانی نێوان هۆزەکانی شکاك، شکەفتی و مێرزیکی کە نیشتەجێی هەمان ناوچە بوون، هەوڵدرا بەپێی ڕێوشوێنی (ئیجرائاتی) خۆجێیی کۆتایی پێ بێت[33]. دواتر بەحری پاشا والی وان، داوای ڕێنوێنی کرد تا بتوانێت ڕەفتار بکات، دوای ئەوەی شەریف پاشای سەرۆکی هۆزی مێرزیکی ئاشتبوونەوەی ڕەتکردەوە و ڕازی نەبوو لە هیچ شوێنێکی تر نیشتەجێ بێت. پابەندبوونی هەردوولا بە ئیسلام ئاماژەیەك بوو بۆ وان، کە گرووپەکان بە هەبوونی کەسایەتییەکی شارەزا هەر چۆنێك بێت ئاشتدەبنەوە[34]

سەرەڕای ئەو هەموو هەوڵەی درا، لە هەندێك ناوچەدا ئاشتی بۆ ماوەیەکی درێژ سەقامگیر نەبوو. ئەم مەسەلەیە لە سەرەوە بە چەند نموونەیەك ئاماژەی پێکراوە. ڕووداوێکی تر کە ئەم مەسەلەیە پشتڕاست دەکاتەوە پێکدادانی نێوان هەردوو هۆزی میلان و سەمسیکی بوو لە وان. لە تۆمارێکی ساڵی ١٨٩٥ دا، نووسراوە کە ئاشتیی نێوان ئەم دوو هۆزە زۆری نەخایاندووە و سەقامگیربوونی ئاشتیش بە پێڕاگەیاندنەوە (Notifications) بەندە. وەك دوا هەوڵ سەرکردەکانی هەردوولا سوێندیان بە قورئانی پیرۆز خوارد کە چیتر پەلاماری

یـەكتر نـەدەن، هـەروەها سـەرۆك هۆزەكـان بـەپێی دابونـەریتی عەشـایری، وەك هەوڵێك بۆ پتەوكردنی پەیوەندیی دۆستـایەتی نێوانیـان سـەردانی مـاڵی یـەكتریان كرد.[٣٥]

لەو پێكدادانەی لەنێوان هۆزی مەجمە (Macma) و شەممەر، كە لە بەغدا لـە سـاڵی ١٨٩٦ ڕوویـدا ژمارەیـەك لـەو كەسـانەی بەشـدارییان لـە كێشـەكە كردبـوو دەســتگیركران، بــەلاّم لـــە نووســراوەكانی دادگــای بەدواچــوونەوەی بەغــدا و ئەنجوومەنی كارگێڕی هەرێمی بۆ وەزارەتی داد هاتووە كە دەستگیركردنی ئەمانـە كێشەكانی چارەسەر نەكرد. هەروەها جەختیان لەسـەر ئـەوە كـردووە كـە باشـتر وایــە كەیســەكە لــە ڕێگــەی دابونەریتــە عەشــایرییەكانەوە چارەســەر بكرێـت. تەسلیمكردنی كەیسـەكە بـۆ ئەنجوومـەنی كـارگێڕی وا دەگەیـەنێت كـە وەزارەتـی دادوەری چارەسـەرێكی گونجـاوی لەسـەر بنـەمای دابونەریتـە عەشـایرییەكانەوە دەوێت نەك بەپێی ڕێوشوێنی دادگاكان. هـەروەها وەزیـر گوتوویـەتی ئەگـەر هـەر چارەسـەرێكی گونجـاو بـەپێی دابونەریتـە عەشـایرییەكان هـەبوو بـۆ ڕێگـەگرتنی یـەكجارەكی لــە ڕاوڕووت و كوشــتار لــەنێوان هۆزەكانــدا.[٣٦] دیســان، بــەپێی تۆمارەكانی ئەنجوومەنی دەوڵەت پێكـدادانێك لـەنێوان هـەردوو هـۆزی دەبرانلـی و كەسكانلی لە حەلەب بەهۆی ڕفاندن ڕوویدا. لە دووەمین لاپەڕەی تۆمارەكەدا باس لە ناكۆكی و پێكدادان لـەنێوان هـەردوو هـۆزی دیـدانلی و گەنگـەنلی لـە سنجاقی ئۆرفای سەر بە ویلایەتی حەلەب كراوە. لە هەردوو كەیسـەكەدا داواكرابـوو بـەپێی دابونــەریتی عەشــایری چارەســەرێكی گونجــاو بدۆزنــەوە و ئــەو دۆكیومێنتانــەی لەلایەن دادگای گاردهاوسەوە (guardhouse) ئامـادەكراوە پشـتگوێ بخـرێن وەك بنەمایەكی ئەم پرۆژەیە دەردەكەوێت كە بۆ ماوەیەكی دوورودرێـژ كێشـەی نێـوان هۆز و هۆزەكان بەپێی دابونەریتی خۆیان چارەسـەر دەكـرا و هـەر هـەوڵێكیش لـە دەرەوەی ئەم دابونەریتانە بوایە بێ ئاكام دەبوو. حاكمی حەلەب لە ڕاپۆرتەكەیـدا بـۆ موتەسـەریفی ئورفـە و وەزارەتـی كاروبـاری نـاوخۆ بـۆ چارەسـەری كێشـەكە ئاماژەی بـە ڕێگەچـارەی سـەرەوە كردبـوو.[٣٧] شـیاوی ئامـاژە پێكردنـە كـە لـەم ڕووداوانــەدا هەوڵــەكانی حكومــەتی هــەرێمی پشــت ئەســتوور بــە دابونەریتــە عەشایرییەكان توانی ڕێگە لە هەڵگیرسانی پێكدادانێكی گەورەی ناوخۆیی بگرێت.

ئـەوەيش روونـە کـە ئـەم هەولآنـە خزمـەتێکی گـەورەی بـە پاراسـتنی پێکهاتـەی سۆسیۆ – کولتوور (پێکهاتەی کۆمەلآیەتی و رۆشنبیری) و کەلەپوور کرد.

نابێـت بـە چـاوێکی ریزپـەڕ (Anomaly) تەماشـای دۆزینـەوەی چارەسـەری گونجاو لەسـەر بنـەمای دابونەریتـە عەشـایرییەکان بکـەین. ئـەم رێوشـوێنانە پـتر لـەنێوان هـۆزە کۆچـەرەکاندا پـەیڕەو دەکـرا. ئـەو کێشـانەی لـەنێوان هـۆزە جێگیرەکاندا روویاندەدا، تاوانبارەکان دەستنیشان دەکران و دواتر بەپێی یاسـای تاوان دادگایی دەکران. ئەو کێشەیەی ساڵی ١٨٩٧ لەنێوان هەردوو هۆزی ئەلعززە و بـەنی تـەمیم لـە ناوچـەی خۆراسـانی سـەر بـە بەغـدا روویـدا، ئـەو شـێوازە دەسـەلمێنێت.[٣٨] ئـەو کێشـەیە بـەهۆی بـەزۆر بەشـوودانی ئافرەتێـك روویـدا و سەرەنجام کوژراو و بریندارى لێکەوتـەوە. سـەرەڕای ئەمـەش بـۆ دامرکاندنـەوەی پشێوییەکە جەندرمە تەقەی کرد، تەقـەکردنی جەندرمـە بـە مەبەسـتی سـەپاندنی دەسـەلآتی دادوەری بـوو. لـەم کەیسـەدا بەرپرسـانی ناوچـەکە پرۆژەیـەکیان پێشنیازکرد کە گونجاو بوو لەگەڵ دابونەریتە عەشایرییەکان و وەکو تەنازولێکیش لە بەرپرسیارێتی لەلایەن دادگاوە سـەبارەت مەسـەلەکە لـە قەڵـەم درا. سـەرباری تەقـەکردنی جەندرمـە، دیسـان ئـەوە رەچـاو دەکرێـت کـە لـە حاڵـەتی هـەر چارەسـەرێکی گونجـاو بـەپێی دابونەریتـە عەشـایرییەکان، ئـەم مەسـەلەیە وەك پێشینەیەکی خراپ بۆ ئەوانی تر دادەندرێت. لە تۆمارێکی تـر کـە بـۆ سـاڵی ١٩٠٠ دەگەڕێتـەوە، لـەو شـەڕەی لـەنێوان بـەنی تـەڕەفی سـەر بـە هۆزەکـانی هندیـە و تایەفەی سەیاد لە سنجاقی کەربەلا قەوما، تاوانی کوشتن ئەنجامـدرا، کێشـەکەش بەپێی دابونەریتی عەشایری چارەسەر کرا. لەم دۆکیومێنتەدا وەزارەتـی داد داوای کـردووە لـە کاتێکـدا کـە هۆزەکـان نیشـتەجێ بـن و تاوانبـارانیش دیـار کـرابن، کەیسەکان بەپێی یاسـاکانی تاوانکـاری (القـوانین الجنائیـة – وەرگێـڕ) چارەسـەر بکرێن. بەپێی داواکارییەکەی وەزیر کە ئاماژەی بە رێنماییيەکانی وەزیری ئەعزەم دەکات کە لە ٣١ ئاداری ١٨٩٨ دەرچووە تیایدا ئاماژە بەوە دەکات کە تەنیا ئـەو کەیسانەی تایبەتن بە هۆزە کۆچەرەکانەوە لەسەر بنـەمای دابونـەریتی عەشـایری چارەسەری گونجاویان بۆ دادەندرێت. شـیاوی گوتنـە ئـەم شـێوازە لەسـەر هـۆزە نیشتەجێکان جێبـەجێ نـەکرا.[٣٩] گـەر هـاتوو هۆزێـك نیشـتەجێ بـوو و ئـەوی تـر

كۆچەر، ئەوا بەپێی هەستیاریی بابەتەكە بڕیار لەسەر پەیڕەوكردنی دابونەریتی عەشایری دەدرا. بۆ نموونە لە ساڵی ١٩٠٢ هۆی سەرەكی شەڕی نێوان شەریفانلی و عوبەیدلەر كە سەر بە هۆزەكانی مونتەفیكن ( ناسرپە – وەرگێڕ) چوونی مێگەلە مەڕی شەریفانلی بۆ ناو لەوەڕگاكانی عوبەیدلەر بوو. لەبەر ئەوەی هۆزی شەریفانلی كۆچەر بوو، چارەسەرەكە لەسەر بنەمای دابونەریتی عەشایری كرا؛ هەر بۆیەش، هەوڵدرا بابەتەكە نەچێتە دەرەوە و تەشەنە نەكات و چاوپۆشیش لە باجە فەوتاوە مەزەندە كراوەكان بكرێت. هەروەها هەموو تاكەكانی هۆز لەو باوەڕەدا بوون ئەگەر بێتو تاوانبارەكان دەستنیشان نەكرێن ئەوا گیروگرفتەكان گەورەتر دەبن.[٤٠] لە ساڵی ١٩٠٣ ڕووداوێكی تر قەوما و شەڕێك لەنێوان سەرۆكەكانی هۆزی دزەیی ڕوویدا، هۆزەكە لە ناوچەی شەمامكی سەر بە ویلایەتی موسڵ نیشتەجێبوو و خەریكی كشتوكاڵ بوو لە سەر زەویوزاری میری (ئەمیریە – وەرگێڕ). بە مەبەستی كۆتاییهێنان بەم شەڕوپێكدانانە، وەزارەتی خەزێنە داوای بیر و بۆچوونی دەروازەی باڵا كرد بۆ چارەسەركردنی كێشەكە بەپێی دابونەریتی عەشایری. لە وەڵامدا دەروازەی باڵا گوتبووی كە ئەم هۆزە نیشتەجێیە و بەرپرسە لە پێدانی باجی گشتی، بۆیە مەسەلەكە بەپێی دابونەریتی عەشایری چارەسەر ناكرێت و پێویستە كەیسەكە بدرێتە دەسەڵاتی دادوەری.[٤١]

لە نموونەیەكی تری ساڵی ١٨٩٧ دەكرێ ئاماژە بەو ڕق و كینەیە بكەین كە بۆ ماوەی چەند سەدەیەك لەنێوان هەردوو هۆزی شەممەر و میللیدا هەبوو، كە بە هەرە گەورەترین هۆزی باشووری ڕۆژهەڵاتی ئەنادۆڵ دادەندران. لێژنەی ئاشتیی تایبەت بەم مەسەلەیە سەرۆكەكانی هەردوو لای كۆكردەوە و كەفالەت لە هەردوولا وەرگیرا، ئاشتبوونەوەیەك لەسەر بنەمای بەكارنەهێنانی هێزی چەكدار و ڕێگەگرتن لە تەشەنەكردنی كێشەكانیان كرا. هەردوولاش كەلوپەلە بەتاڵانبراوەكانیان بەپێی دابونەریتە عەشایرییەكان بۆ خاوەنەكانیان گێڕایەوە. بە جێگیربوونی ئاشتی، ئاسایش لە ناوچەكە سەقامگیرتر بوو[٤٢].

لە ساڵی ١٨٩٨ چەكدارە دروزییەكانی گوندی ئیكعاد و بەگی سەر بە ناوچەی چیای حەورانی (چیای دروز – وەرگێڕ) نزیك دیمەشق لەگەڵ موسڵمانەكانی ناو دیمەشق شەڕە تفەنگیان كردبوو. مەفرەزەیەك لە سوپای

پێنجەم تەرخانکرا و کۆتایی بە پێکدانانەکانی نێوان هەردوولا هێنا، مەسەلەکەش بەپێی ئەو دابونەریتانەی لەنێوان هۆزەکانی ناوچەکەدا پەیڕەو دەکرا، چارەسەرکرا.[٤٣] لە هەندێك تۆماردا ئاماژە بە بابەتێکی تر کراوە کە لە هەمان ساڵ ڕوویداوە و تاکو ساڵی دواتر درێژەی هەبووە. ئەویش ئەو ڕووداوەیە کە لەنێوان هۆزی بەنی حەسەن و ئەمیریالی لە بەغدا قەوماوە. هەروەها بۆ چارەسەرکردنی ئەم ڕووداوە ژمارەیەك کەسایەتی دیار و شارەزای ڕێوڕەسمی عەشایری ناردرانە ناوچەکە بۆ کۆکردنەوەی سەرانی هۆزەکان و جێگیرکردنی ئاشتی لە سەر ڕێسای خۆیان و سەرەنجام کۆتایی بەو ڕق و کینەیەی نێوانیان هات. ئەم جۆرە چارەسەرانەی لە سەر بنەمای دابونەریتی عەشایری بنیات دەنەدرێن لە جیۆپۆلیتیکی ناوچەکەوە سەرچاوە دەگرن.[٤٤] وەك لە چارەسەرکردنی ئەم ڕووداوانە بیندران و چارەسەرەکان بە ڕەچاوکردنی بارودۆخی ناوچەکە و خەڵکەکە بوو. بەوپێیەی ئامانجی سەرەکی کۆتاییهێنان بە ڕق و کینە بوو، هەوڵەکان بە تەواوی پراکتیکی بوون و ئەنجامێکی خێرا و کارایان بەدەستهێنا.

لە ساڵی ١٨٩٩ شەڕە تفەنگێك لەنێوان هۆزی حارلەکەنلی لە ناوچەی سیتەکی سەر بە وان و هۆزی هۆسنان ؛ لە حارلەکەنلی دوو کەس کوژران و لە هۆسنانیش یەك کوژرا و یەکیش بریندار بوو. هێزیکی پێکهاتوو لە پۆلیسی ناوچەکە و جەندرمە و ٢٠ سەرباز ناردرایە ناوچەکە، سەرانی هۆزەکە کۆبوونەوە و ئاشتبوونەوە. جەختکرا کە ڕێگە لە تەشەنەکردنی کێشەکە بگیرێت. کوژراوەکانیش بە خوێنبەها قەرەبوو بکرێنەوە و کاڵا تاڵانکراوەکانیش بەپێی دابونەریتی عەشایری چارەسەر بکرێن، بەم جۆرە کێشەی نێوان هەردوولا دامرکایەوە.[٤٥] لە ڕاپۆرتێکدا لە ئابی ١٨٩٩ هەمان شێوە کارگێڕی و ڕێکاری سەربازی بەدی دەکرێت لە دامرکاندنەوەی شەڕ و پێکدادانی نێوان هۆزەکانی تاڵەبانی (تیرەی تاڵەبانی لقێکی هۆزی زەنگنەیە – وەرگێڕ)، داودە، ئەلعوبەید، زەنگنە و بەیات کە لە دەوروبەری سلێمانی، کەرکووك و موسڵ نیشتەجێبوون؛ سەرەنجام سەرۆك هۆزەکان ملیان دا بۆ ئاشتی و دوژمنایەتیی نێوانیان ئیتر تەشەنەی نەکرد. لە ئەنجامی ئەم هەوڵانەدا ئاسایش لەم ناوچەدا سەقامگیر بوو.

خەڵكیش تا ڕادەیەك ئاسوودە بوون و هەموویان دوعایان بۆ پاشا (padishah) دەكرد.[٤٦]

هەوڵەكانی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی بۆ چارەسەركردنی كێشەكان بەپێی دابونەریتە عەشايرییەكان لە سەدەی بیستەمیشدا بەردەوام بوو. بۆ نموونە، بەپێی ئەو تۆمارەی وەزارەتی داد ساڵی ١٩٠١ بۆ سەرۆك وەزیرانی ناردووە دەربارەی ناكۆكیی نێوان هۆزی ئەبو حومێش و دانیشتوانی گوندی شامیتە كە دەكەوێتە ناو ژمارەیەك هۆزی عەرەب لە حەلەب كێشەكان بەپێی داب و نەریتە عەشايرییەكان چارەسەر كرا، بڕیاریش درا چیتر لێكۆڵینەوە لە ڕووداوەكە نەكرێت.[٤٧]

لە ڕاگەیاندراوێكی (سەرۆكایەتی ئەنجوومەنی دەوڵەت) لە سەرەتای سەدەی بیستەمدا بۆ تەڕابلس، موسڵ، وان، دیاربەكر و بەغدا داوای ئەو كەیسانە لە والی و موتەسەریفەكان كرابوو، كە بەپێی داب و نەریتی عەشایری مامەڵەیان لەگەڵدا كرابوو. لە وەڵامدا تەڕابلس گوتبووی لە هەموو شوێنەكان ڕێوشوێنی دادوەری پەیڕەوكراوە، جگە لە فزان نەبێت كە كۆچەری لێ بوو. ویلایەتی موسڵ لە وەڵامدا گوتبووی كە چارەسەركردنی كێشەكانی پێشوو لە ڕێگەی كەسانی كاریگەر بووە و میكانیزمی فدیە بەكارهێندراوە و ناوی لێندراوە *(تەئالف مابەین ئەلعەشائر— ئاشتەوایی نێوان هۆزەكان)* وە لە وەڵامەكەی واندا هاتووە كە كێشەكانی نێوان هۆزەكان كەسانی كاریگەر سوودبەخش بوون، بەڵام هیچ دۆكیومێنتێك دەربارەی ئەم كەیسانە نییە. موتەسەڕیف (حاكم) جەختی لەسەر هەمان ئەو ڕێوشوێنانە كردبۆوە كە پەیڕەوكران بەڵام هیچ بەڵگەنامەیەك لەبەردەستدا نییە. لە وەڵامەكەی ویلایەتی دیار بەكر هەندێك بەڵگەنامە هەن دەربارەی ئەو كەیسانەی بەپێی دابونەریتی عەشایری چارەسەر كرابوون و لە هەندێك شرۆڤەكردندا دەردەكەوێت كە سەرۆك هۆزەكان گەرەنتییان داوە بۆ پاراستنی ئاشتی. لە وەڵامەكەی بەغدادا ئەوە هاتووە كە هەندێك كەیس بەپێی دابونەریتە عەشايرییەكان چارەسەر كراون، بەڵام هیچ بەڵگەنامەیەك دەربارەی كەیسەكان نییە. سەرەڕای ئەمە، هەندێك ڕوونكردنەوە هەیە دەربارەی بەكارهێنانی

ڕێوشوێنی عەشایری بۆ چارەسەرکردنی کەیسەکان، کە لە ڕووی سیاسییەوە زۆر سوودمەند بوون.[٤٨]

فەرماندەی ویلایەتی بەسرە مێجەر جەنەڕاڵ فەریق موستەفا نووری لە نووسراوێکی فەرمیدا گوتوویەتی بۆ چارەسەرکردنی کێشەی کوژراوەکانی نێوان خەڵکی بەحرێن (کوێت و بەحرێن، کە ئێستا دوو دەوڵەتی سەربەخۆن، ئەو کات بەشێك بوون لە ویلایەتی بەسرە – وەرگێڕ)، پێوست دەکات پەنا بەرینە بەر دابونەریتی عەشایری. بەهەر حاڵ هەموو ڕێگەچارەیەکی کارا پەیڕەوکرا و هەموو هەوڵەکانیش قۆسترانەوە لە پێناو بەدەستهێنانی ئاکامێکی باش.[٤٩] هەروەها لە نووسراوەکەدا هاتووە کە شەڕ و پێکدادانی نێوان هۆزەکان بۆتە هۆی کۆچکردنێکی ناوخۆیی، بە چارەسەرکردنی کێشەکان کۆچبەرەکانیش دەگەڕێنتەوە سەر ماڵ و زێدی خۆیان و ئەمەیش یارمەتیدەر دەبێت بۆ بەرقەرارکردنی هاوکێشەیەکی کۆمەڵایەتی. ڕووداوێکی تر کە پاڵپشتی ئەم مەسەلەیە، دەگەڕێتەوە بۆ ساڵی ١٩٠٢ و پەیوەستە بە کۆتاییهێنان بە ڕق و کینەی نێوان خەڵکی مەدینە و خەڵکی بەنی مەنسوور. بەپێی ڕاپۆرتەکان دوای هەوڵ و تەقەلایەکی زۆر، کە ٨ مانگی خایاند، خەڵکی ئەم دوو ناوچەیە لە ڕێگەی پەیڕەوکردنی دابونەریتی عەشایری ئاشتبوونەوە و گەڕانەوەیان بۆ سەر ماڵ و حاڵی خۆیان مسۆگەر کرا.[٥٠] پێویستە ئەوەیش بگوترێت کە هەوڵ و تەقەلای کەسایەتییە کاریگەرەکان و پیاوانی دەوڵەت هەندێك جار ئەو ئەنجامە چاوەڕوانکراوەی لێ نەدەکەوتەوە. بۆ نموونە، هەوڵەکانی ئەو لێژنە و کەسایەتییە ناودارانەی نێردران بە مەبەستی جێگیرکردنی ئاشتی و نەهێشتنی کێشەی خوێناویی نێوان هۆزی شەحشیە و بەنی حوسەین، کە لە ویلایەتی یەمەن دەژین بێسوود بوو، چاوەڕێ دەکرا ڕێگە بدرێت هێزی سەربازی پتر بنێردرێت بۆ گرتنی تاکەکانی ئەو هۆزانەی شەڕە تەقەیان لە دژی ناردنی سوپا بەرپا کردبوو.[٥١]

بەپێی تۆمارەکانی ساڵی ١٩٠٣، کێشەکانی نێوان هۆزەکانی شۆلحان، عمران و جبرانلی کە نیوەیان ئەندامن لە سوارەی حەمیدیی مووش؛ ئەمانە لەنێوان سنجاقی گەنج و دیاربەکر نیشتەجێن. شیاوی گوتنە چیتر پێویستی بە ڕێکاری دادوەری نەدەکرد چونکە بەپێی دابونەریتی عەشایری ئاشت بوونەوە. ئەگەر

هاتباو ڕێکاری دادوەری دەستی پێکردبا ئەوا دەبوایە لێکۆڵینەوە لەگەڵ چەند هەزار کەسێك بکردرایە و ئەمەیش ماوەیەکی زۆر درێژی دەکێشا. بۆیە، تاکو ئاشتبوونەوەکە لەبار نەچێت واز لەو ڕێکارانە هێندرا. (٥٢)

پێکدادانێکی قورس لە بەهاری ساڵی ١٩٠٤ لەنێوان هەردوو هۆزی میلی و کاراکەجی، کە لە هۆزە هەرە گەورەکانی باشووری ڕۆژهەلاتی ئەنادۆڵن ڕوویدا. برایم پاشای سەرۆکی هۆزی میللی بووە هۆی ئەوەی ژمارەیەك گوندی هۆزی کاراکەجی چۆل بکرێن و خەڵکەکەشی دووچاری ڕاوڕووت بن. حایل بەگی سەرۆکی هۆزی کاراکەجی ئەم ڕووداوەی بە کارەساتەکەی کەربەلا شوبهاندبوو، کە ئیمام حوسێنی تێدا شەهید کرا. والی دیاربەکر هەوڵیدا ئەم کێشەیە چارە بکات و کەلوپەلە تالآنکراوەکانیش بەپێی ڕێوڕەسمی عەشایری بۆ خاوەنەکانیان بگەڕێنێتەوە. بەپێی کۆنووسێکی سوپاسالار لە تشرینی یەکەم، چاوەڕوان دەکرا سەرۆکی هەردوو هۆز بێنە یەنیشەهر و کۆتایی بە ململانێی نێوانیان بێنن و سوێند بخۆن کە ئاشتی دەپارێزن. (٥٣) لە نامەیەکی تردا کە لە لایەن ویلایەتی حەلەبەوە ناردراوە بۆ سکرتێری یەکەمی بیلآت (Chamberlain) دوو لێژنە پێکهات یەکێکیان لە حەلەب و ئەوی تریان لە دیاربەکر، هەردووکیان پێکەوە کۆبوونەوە و لە تشرینی دووەمی هەمان ساڵدا هەوڵیاندا هۆزەکانی میللی و کاراکەجیلی ئاشت بکەنەوە. سەرەنجام ململانێی نێوان هەردوو هۆز کۆتایی پێهات و ئەندامانی هەردوو لێژنەکەش بە پلەی شیاو پاداشت کران. (٥٤)

دەربارەی چارەسەرکردنی کەیسەکان بە شێوەی ڕێوڕەسمی عەشایری جاری وا هەبووە لەسەر خواستی خودی تۆمەتبار بووە. بۆ نموونە، لە ساڵی ١٩٠٤دا، شێخ قەهار سەرۆکی هۆزی موالی یاداشتنامەیەکی بۆ وەزارەتی داد ناردبوو، تیایدا داوای کردبوو دەربارەی ئەم تۆمەتانەی دراونەتە پاڵی و بۆ یەکلاکردنەوەی کەیسەکەی، دەستبەرداری بەدواداچوونی دادوەری بن و دابونەریتی عەشایری پەیڕەو بکەن. (٥٥)

لە ساڵی ١٩٠٧دا ڕەهەندێکی جیا خرایە ناو ئەرشیفە تۆمارکراوەکانی چارەسەرکردنی کێشەکان بەپێی دابونەریتی عەشایری. بۆیەش کێشەکانی نێوان هەردوو هۆزی بەنی سەعد و دەماگا، کە لە دەوروبەری حەلەب – ئەدەنە

